# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی

53

کانونی یەکەم

2007

ســــــــاڵی نۆیەم

–سەردەم گۆڤارێکە بە سێ مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.

–تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مافی بلاونەکردنەوەی هەیە و پێشەکی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.

–بەرهەمەکان بلاوبکرێنەوە یان نەکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.

–هەر نووسەرێك لە ئەنتەرنێتەوە بەرهەم وەردەگێڕێت سایتەکە و ڕۆژی بلاوبوونەوەی بنووسێت.

–هەموو پەیوەندییەك لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.


خاوەنی ئیمتیاز: **شێرکۆ بێکەس**

سەرنووسەر: **ڕەووف بێگەرد**

دەستەی نووسین

ڕێبین هەردی — شوان ئەحمەد

د. شاهۆ سەعید

دەرهێنان و کاری کۆمپیوتەری

تاڤگە فائق

بەرگ: نەرمین مستەفا

هەڵەچنی چاپ: ساکار ڕەووف



ناونیشان

سلێمانی – شەقامی سالم

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 2136659

دەزگای سەردەم *3129609*

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

Tel - Fax: 0044 7543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی ژمارە ( *14665/615*و *14665/616*) تاران

لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:

govarysardam@yahoo.com

govarisardam@sardamco.com

www.serdamco.info

www.serdam.net



دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە

# ناوەرۆك



## فایلی ژماره – لیبرالیزم



## ئەدەب



## دۆریس لیسینگ به بۆنەی وەرگرتنی خەلاتی نۆبڵی ئەدەب 2007



## وێستگەكانی سەردەم



**نرخی ( 1200 ) دیناره**

# ئیسلام و مۆدێرنیته

**د. عبدالکریم سروش**
**له ئینگلیزییه‌وه: د. هادی محه‌مه‌د**

*** پێشه‌کی و ناساندن له‌لایه‌ن "جاکوب کۆڵهۆفه‌ره‌وه":**

با پێشه‌کییه‌که به پیرۆزبایی کردن له پرۆفیسۆر سروش ده‌ست پێبکه‌م به بۆنه‌ی وه‌رگرتنی خه‌ڵاتی "ئیراسمه‌س *Erasmus*"، ئه‌م خه‌ڵاته له‌لای ئێمه مرۆڤگه‌رایی *Humanism* ده‌گه‌یه‌نێت و پێشم وایه خه‌ڵاتێکه بۆ شێوازی ژیانی سروش. پێم وایه مه‌قاله و کتێبگه‌لێکتان خوێندۆته‌وه که نووسه‌ره‌که‌یان به‌ناوی سروشه‌وه‌یه. پێموایه ئه‌گه‌ر رۆشنبیرێکی خۆماڵی بزوتنه‌وه‌ی چاکسازی دیموکراتی له ئێران هه‌بێت د. عبدالکریم سروشه. به‌هه‌رحاڵ، باگراونده مه‌عریفی و رۆشنبیرییه‌که‌ی سروش له‌گه‌ڵ دانوستانه‌که‌ی *Debate* ئه‌م جاره‌ماندا هاوتاو گونجاوو نمونه‌ییه. حه‌زده‌که‌م چه‌ند بوارێکی که‌می پسپۆڕییه‌کانی د. سروشتان بۆ ڕیزبکه‌م، د. سروش پسپۆڕه له بواری: عیرفان *Mysticism*، شعر *Poetry*، ئیلاهیاتناسی *Theology* ئیسلامی و کیمیا *chemistry* و ده‌رمانسازی *pharmacology* و فه‌لسه‌فه‌ی زانست. پێم وایه ئه‌م هه‌موو پسپۆڕییه له‌یه‌ك عه‌قڵدا بارێکی نمونه‌ییه بۆ هه‌وڵدان بۆ ئاشتکردنه‌وه‌ی عه‌قڵ و وه‌حی و ئه‌رکه ئاینییه‌کان و مافه‌کانی مرۆڤ و هه‌ر ئه‌مه‌ش سه‌ره‌بابه‌تی ئه‌م کۆنفراسه‌یه.

به‌خێر بێن بۆ هایدڵبێرگ.

**پرۆفیسۆر سروش:**

زۆرسوپاس به‌ڕێز جاکۆب، وه سوپاسی هه‌مووتان ده‌که‌م خوشك و برایانی به‌ڕێز. له ڕاستیدا، به‌ڵێ هایدڵبێرگ نه‌ك ته‌نها تاقیگه‌کانی کیمیا بیری من ده‌خاته‌وه، کاتێك کارم له مێژووی زانستدا ده‌کرد، چه‌ندان جار

لەگەڵ ناوی هیگڵ و چەندان فەیلەسوفی دیکە ڕووبەڕوودەبوومەوە کە بۆ ماوەیەك لەم شارەدا وانەیان وتۆتەوە. ئەمە یەکەمین سەردانمە بۆ هایدڵبێرگ لەم کەشە نایاب و بەیانییە نایابەدا کە ئێمە تیایدا کۆبووینەتەوەو هیوادارم دوا نیوەڕۆکەی لە بەیانییەکەی باشتربێت.

بابەتی ئیسلام و مۆدێرنیتە و دیموکراسی بابەتێکی ناسراوو ئاشنایە لەلاتان هەروەکو پرۆفیسۆر ئارکۆن ئەم بەیانییە لێدوانی لەسەردا. لە ڕاستیدا ئێمە چەندان جار کۆبووینەتەوەو هەمان ئەم سیما و ڕوخسارانەمان لە دانیشتنەکاندا بینیوەو گفتوگۆی هەمان بابەتمان کردووە بەلاَم بە دڵنیاییەوە ئەم کارە بە شێوەیەکی چەق بەستوو تاکڕەهەند نەبووە بەڵکو هەندێك پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە.

باشم لە یادە کە بۆ یەکەم جار پێشنیاری بیرۆکەی حکومەتێکی ئاینی دیموکراسیم کرد کاتێك بانگهێشت کرابووم لەلایەن بەڕێز "ستینباخ"ەوە ئەویش ئێستا لێرە ئامادەیەو منی بانگهێشت کردبوو بۆ هامبێرگ بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ هەندێك هاوڕێی دیکەی ئێرانی، ئەگەر هەڵەم نەکردبێت دوانزە ساڵ لەمەوپێش بوو. لە ڕاستیدا، ئەو کۆبونەوەیە کۆبونەوەیەکی مەترسیداربوو، دەستم بە قسەکرد و هەندێك لە گروپە ئۆپۆزسیۆنەکان دەستدرێژیان کردە سەر کۆبونەوەکە، لەبەرئەوە کۆبونەوەکە دیوی شیرین و دیوی تاڵیشی هەبوو، دیوی ئیجابی و دیوی سلبی هەبوو. بەلاَم هەوڵدەدەم دیوە ئیجابییەکانم بیربکەوێتەوە و ئەو کاتەش گفتوگۆی هەمان بابەتمان کرد: ئیسلام و مۆدێرنیتە. ئەوەش بابەتێکی زیندووەو هێشتا لەگەڵماندایە و پێموایە شتێکی دووبارە نییە ئەگەر بەردەوام ئەم بابەتە ڕەچاو بکەین و گفتوگۆی بکەین چونکە هێشتا هەندێك خاڵ و بەشی چارەنەکراو لەناو بابەتەکەدا ماوە کە پێویستە لەلایەن قسەکەری جیاواز و بیریاری جیاوازەوە یەکلایی بکرێنەوە. بە دڵنیاییەوە لە وڵاتەکەم واتە ئێران ئەمە بابەتێکی زۆر زیندووەو ئێمە لە ژێر دەستی دەوڵەتێکدا دەژین زۆر بە ئاشکرا دەوڵەتێکی ئیسلامییە و لە ڕێگەی چەمکی هێز یاخود دەسەلاَتەوە ***authority*** فەرمانڕەوایی دەکرێت و زۆریش دژە دیموکراسییە. لەبەرئەوە ئەمە گفتوگۆ و مشتومڕێکی زۆر زیندوو گەرم گوڕە لە وڵاتەکەماندا: ئاشتبوونەوەی ئیسلام و مۆدێرنیتە، ئیسلام و دیموکراسی و ئیسلام و زانست و..هتد.

زۆرێك نووسەر و ڕۆژنامەنوس و پرۆفیسۆری زانکۆ و قوتابی و.. هتد هەن لەم بوارەدا کاردەکەن و چالاکیان نواندووەو لە پێناو ئەم چالاکیانەشدا باجیان داوە. لەم کاتەدا کە من قسە بۆ ئێوە دەکەم، هەندێك لەو کەسانە لە زینداندان. هەروەها زۆرێك ڕۆژنامە هەن ڕێیان پێنادرێت چونکە زۆر بە ئاشکراو ڕوونی قسە لەسەر بابەتەکە دەکەن و لە بارەی ئایین و مەسەلە نائاینییەکانەوە دەنووسن، من خۆم یەکێکم لەوانە.

پێموایە ئەمە دەیسەلمێنێت کە دانوستانێکی گەرم و گوڕ لەسەر ئەم بابەتە هەیە. ئێستا من لە ئێرانەوەو لە بارەی ئێرانەوە دەدوێم، لەلایەکەوە موسڵمانان زۆرینەی

دانیشتوانن وەکو ئایین و وەکو نیشتمانیش حەز دەکەن بە ئاشتی و بەختەوەری و خۆشگوزەرانییەوە لە ئێراندا بژین و ژیانێکی شەرەفمەندانەیان هەبێت لە نیشتمانە رۆشنبیری و مەعنەویەکەیاندا واتە ئیسلام. لەلایەکی دیکەشەوەو بە دڵنیاییەوە، ئەوان لە پێویستییەکان و زەروورەتییەکانی سەردەمی نوێ و مۆدێرنیتەو سیستەمی جیهانی پاش – رۆشنگەری ***post – enlightenment*** تێدەگەن و هەروەکو ئێمەش لەمرۆدا ئەمە باش دەزانین. بەلأم لەلایەکی دیکەشەوە، دەرکی ئەوەیان کردووە ئەم مۆدێرنیتەیە لە رۆژئاواوە هاتووەو رۆژئاوایش وێنەیەکی نێگەتیڤی لە زەینی ئەواندا هەیە، ئێوە دەزانن، ئەو وێنەیە رۆژئاوای ئیستیعمارە. ئێمە راستەوخۆ لە ژێر فەرمانڕەوایی داگیرکاریدا نەبووین، بەلأم بەهەر جۆرێک بووبێت، هەمیشە کاریگەری فەرمانڕەوایی داگیرکار لەسەرمان بوونی هەبووە بەتایبەتی لە سەدەی رابردوودا. ئەمە پارادۆکسە. لەلایەکەوە حەزتان لە مۆدێرنیتەیەو لەلایەکی دیکەشەوە رقتان لە سەرچاوەکەیەتی واتە رۆژئاوا، رۆژئاوای پاش – رۆشنگەری. وە لەلایەکی دیکەشەوە ئێوە ئایینەکەتان (ئیسلام) خۆش دەوێت، وە مۆدێرنیتەش جیگای گومانە کە ئاخۆ لەگەڵ ئیسلامدا گونجاوو سازگارە یاخود نا. لەبەرئەوە لێرەدا بابەتێکی تیۆری گەورە هەیە کە پێویستە کاری لەسەر بکرێت، وە مەسەلە سیاسی و کۆمەلأیەتییەکانیش پێویستە شان بە شانی هەوڵە تیۆرییەکان کاریان لەسەر بکرێت، پێویستە ئەم کارەش بیریاران و رۆشنبیران بیگرنە ئەستۆ. هەر لەبەرئەوەشە پاش شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران، ئەم دانووستانەی دیموکراسی و ئیسلام لە سەردەمی پێشووی گەرم و گوڕترەو زۆرێك لە بیریاران و نووسەرانی بەخۆیەوە سەرقاڵکردووە، چەندان کتێبیش لە 25 ساڵی رابردوودا دەرکەوتن و هێشتا ئێمە کاری لەسەر دەکەین. بەلأم بەداخەوە سەردەمی جەنگی موسڵمان – عەرەب لە دۆخی ئێستامان باشتر بوو، ئەمە جێگای داخەو لە راستیدا نەخۆشییەکە پێویستە چارەسەر بکرێت. حەزدەکەم وەبیرتان بێنمەوە، بۆ نمونە رابەری ئێستای ولأت ئایەتولأ خامنەیی، یەکێك بوو لە وەرگێڕەکانی کتێبەکانی سەید قوتب و ئێوەش ئەمە دەزانن، ئەو کارەی بە ئەنجام گەیاند – کتێبی (معالم في الطريق)ی وەرگێڕاو کتێبێکی دیکەش براکەی وەریگێڕا. ئێوەش هەموو ئەم بەرهەمە تازانەتان خوێندۆتەوە، بە تایبەتی ئەو بەرهەمە ئایدۆلۆژیانەی لە جیهانی عەرەبەوە هاتن. وەرگێڕانی ئەو کتێبە بۆ ئەوە بوو رەوایەتی بە رێڕەوی شۆڕش ببەخشێت لە ئێراندا، بەلأم دوای شۆڕش، لە راستیدا، ئەوان وا بیریان کردەوە کە زۆر دەوڵەمەندن و پێویستیان بە هیچ کەسێك نییە بۆئەوەی شتیان فێر بکات، لەبەرئەوەی ئەوان هەموو شتێك لەبارەی شۆڕش و ئایین و تەفسیر و وەحییەوە دەزانن و لەبەرئەوە سەیری شوێنێکی دیکە ناکەن و باوەڕیان پێی نییە. حەزناکەم قسە زۆر لەبارەی ولأتە ناعەرەبەکانەوە بکەم چونکە هیچ ئاماژەیەکمان لا نییە کە ئەوان چییان کردووە لە ئەندۆنیسیا،

له توركیا، كۆسپی زمان و خەیاڵكردن و وەهمی سەروەت و سامان لەسەر بەشێكمان وای لێكردووین لە باقیاتی جیهانی موسڵمانان دابڕێین. لە ڕاستیدا ئەمە جێگەی داخە، ئەگەر پرسیار بكەیت لە ڕۆشنبیرەكان، ئەوا ناوی ڕۆشنبیرە خۆرئاواییەكانتان یەك بە دوای یەكدا بۆ ریزدەكەن: فەرەنسی، ئەڵمانی، ئینگلیزی.. بەڵام ئەگەر لەبارەی ڕۆشنبیرە عەرەبەكانەوە پرسیاریان لێبكەیت، یەك ووشە ناڵێن. لە هیچ كەسێكەوە شتێك نابیستیت و نازانن كە كتێبەكانیان خوێندونەتەوەو نازانن كە ناویان هێناون. لە ڕاستیدا ئەمە جێگای بەزەیی پێداهاتنەوەیە، من دڵنیام ئەم حاڵەتە كتومت ئەو حاڵەتەیە كە پەیوەندی بە جیهانی عەرەبی و ئێرانەوە هەیە. مەبەستم ئەوەیە پێم وانییە زۆرینەی ئەو كتێبانەی لە ئێران دەردەچن بۆ عەرەبی وەرگێڕدرابن. لەبەرئەوە نەبوونی پەیوەندییەكی لەو جۆرە، دابڕانێكی لەو جۆرە لە نێوان ئەم جیهانە جیاوازانەی ئیسلام ئێستا بۆتە ڕاستییەكی واقعی لە جیهانی ئیسلامدا، ئەو پارچە پارچەبوونەی كە هەیە ئێمەشی گرتۆتەوە. ئێمە قسە لەبارەی پارچە پارچە بوونەوە ***Fragmentation*** دەكەین و ئەم پارچە پارچە بوونەش تا ئێستا بوونی هەیە بە هۆی بەربەستی زمان و بەهۆی زۆر هۆكاری دیكەو وەهم و هتد..

ئەوەندە بەسە بۆ پێشەكی. تا ئێستا دەمهەوێت چەند خاڵێكتان بۆ بخەمە ڕوو، لەوانەیە هەندێك خاڵی تیۆری بن لەبارەی مەسەلەی مۆدێرنیتەو ئیسلام، دیموكراسی و ئیسلام. نامهەوێت هیچ چارەسەرێك بۆ كێشەكە بدەم بە دەستەوە. نامەوێت هیچ فتوایەك دەربكەم و لە ڕاستیشدا هیچ كەس هانی نەداوم بۆ كردنی كارێكی لەو شێوەیە. تەنها دەمهەوێت ئەوە نیشاندەم كە كێشەكان چین و پێویستە ئێمە چ هەنگاوێك هەڵگرین، كاتێكیش قسە لە پەیوەندی نێوان دیموكراسی و مۆدێرنیتە و ئیسلام دەكەین، لەوانەیە بۆ نەوەكانی داهاتوویێت بریاربدەن دەیانهەوێت چی بكەن. ئەم مەسەلەیەم لە ئەمستردام لەو كۆنفراسەدا باسكرد كە سادق و هاوڕێی بەرێزم ئەبوزەید ئامادەبوون، بەلانی كەم دەتوانم هەمان شت بڵێمەوە لەبارەی ئێرانەوە كە سەردەمی "هەڵهێنجان ***Derivation***" بەسەرچووە. مەبەستم ئەوەیە ئێستا هیچ كەس بیرناكاتەوە لە هەڵهێنجانی دیموكراسی و بیرۆكە نوێكان لە قورئان یاخود لە ترادسیۆنەوە. من بەوە دەڵێم سەردەمی هەڵێنجان. من ئەوە دەزانم بۆ نمونە لە ڕابردوودا نەك تەنها لە ئێران بەڵكو هەروەها لە بەشەكانی دیكەی جیهانی موسڵماناندا هەروەكو ئەبوعەللای مەودودی، هەوڵی ئەوەیان دەدا كە بڵێن زۆرباشە بەیعەت یان شوورا هەمان هەڵبژاردنە و شتگەلێكی لەو شێوەیە. لەبەرئەوە ئەوە سەردەمێك بوو كە زۆرینەی هەوڵەكانی بە ناو ڕۆشنبیرە موسڵمانەكان ئاڕاستەی ئەم مەسەلەی هەڵهێنجانە كرابوو.

ئێستا پێمولیە هەموو كەس دەركی ئەوە دەكات كە ئەمە خەونێكی بەدی نەهاتوو بوو، وە ئەم سەردەمی هەڵهێنجانە تاڕادەیەك بەسەرچووەو ئەم هەولانەش هاوانتەبوون. ئەمەش دەرككردنێكی زۆر گرنگ و زۆر بە بەهایە لەلایەن ڕۆشنبیرە موسڵمانەكانەوە

چونکە ئێستا ئەوان دەرکی ئەوەیان کردووە ئێمە لە جیهانێکی نوێدا دەژین کە خاوەنی چەمکاندنە نوێکانی سەرجەمی شتەکان و هەموو مرۆڤایەتی و مێژوو و هەموو شتێك و کۆمەڵگەیە. کۆمەڵگەی نوێ کۆمەڵگەیەکی سادەو گەورەبووی کۆمەڵگەی عەرەب یاخود کۆمەڵگەی مەککەی سەردەمی پێغەمبەر نییە. لەبەرئەوە تەنها کۆمەڵگەیەکی گەورەترتان نییە لە ڕووی ژمارەوە بەڵکو لە ڕووی جۆریشەوە جیاوازە. لەبەرئەوەش کە لە ڕووی جۆرەوە جیاوازە ناتوانیت بیرۆکە کۆنەکان میکانیکیانە بگوازیتەوە بۆ ناو کۆمەڵگەی نوێ. لە ڕاستیدا ئەمە دەرککردنێکی زۆر سودبەخش و بەنرخە، ئێمە لە زۆر هەوڵی نەزۆك ڕزگار دەکات واتە لەوە ڕزگارمان دەکات کە سەرقاڵی گواستنەوەیەکی یاخود وەرگێڕانێکی میکانیکیانەی بیرۆکە کۆنەکان بین بۆ بیرۆکە نوێکان. هەر لەبەر ئەو مەسەلەیە ئەوەش دەڵێم کە بیرۆکەی شورا یاخود بەیعەت لە جەوهەردا ئیسلامی نین، مەبەستم ئەوەیە لە کۆمەڵگەی عەرەبی پێش ئیسلامیشدا بوونیان هەر هەبووە لەبەرئەوە ئەو کەسانەی وا بیر دەکەنەوە بۆ ئەوەی بتوانن دیموکراسی بە ئیسلام بکەن، پێویستە بیرۆکەی شورا یاخود بەیعەت بووروژێنن، ئەوانە لە ڕاستیدا بە هەڵە هەنگاویان ناوە چونکە لە ئێستادا بیرۆکەی جاهلیەت دەهێننە ناو جیهانی مۆدێرنەوەو دەیانهەوێت ئاشتبوونەوە ***reconciliation*** بکەنە واقع، لەبەرئەوە من دەڵێم سەردەمی هەڵهێنجان بەسەرچووە.

سەردەمی هاتوو، گەر بشێت وا بڵێم، سەردەمی پێکەوە گونجاندنە ***compatibility***، ئەم پێکەوە گونجاندنە مانای ئەوەیە موسڵمانان حەزدەکەن لە کەشێکی دیموکراسیانەدا بژین، ئەوان نایانهەوێت بڵێن ئەم دیموکراسییە یان مۆدێرنیتەیە ئیسلامییە، مەسەلەکە ئەمە نییە، بەڵکو حەزدەکەن لە کەشێکی دیموکراسیانەدا بژین و لە هەمان کاتیشدا ئیمانیان بە باشترین شێوە بپارێزن. موسڵمانان نایانهەوێت لە کەشێکی دیموکراسیانەدا بژین ئەگەر لەسەر حسابی ئیمان و بیروباوەڕەکانیان بێت. حەزدەکەن تەفسیری روحیان هەبێت لەبارەی گەردونەوە ***Universe*** و روحانی بوون یاخود مەعنەویەت ***spirituality*** بۆ ئەوان زۆر گرنگ و بەهادارە، بەڵام تا ئەوپەڕی گونجان حەز دەکەن پێویستییەکانی شێوازی نوێی ژیان و گوزەران دەستەبەر بکەن. کەواتە مەسەلەکە ئەمەیە، ئەم مەسەلەیە و ئەم سەردەمە ئەگەر ئێوە حەز بکەن، من پێیدەڵێم "سەردەمی پێکەوە گونجاندن" تەنها بۆ ئەوەیە نیشانی بدەم ڕێچکەیەك هەیە بۆ ئاشتبوونەوە یاخود ڕێچکەیەك هەیە بۆئەوەی موسڵمان بوون گونجاو بێت و لە هەمان کاتیشدا ژیان و گوزەران لە کەشێکی دیموکراسیانەدا هەرچۆنێك بێت دەستەبەر بێت. من ناڵێم تەواوی مۆدێرنیتە لەگەڵ تەواوی ئیسلامدا گونجاوەو ناڵێم ئیسلام تاکە تەفسیرێکی هەیە، لەبەرئەوە ئەمانە هەمووی بابەتی گفتوگۆن بەڵام هەندێك تەفسیر دەتوانێت لەگەڵ هەندێك جۆری مۆدێرنیتەدا هەڵکات، ئەمەیە ئایدیای یاخود بیرۆکەی کەمترین ***minimalist***. باسی وشەی

"کەمترین"م کرد، با کەمێك زیاتر لەسەر ئەم وشەیە بڕۆم، لە ڕاستیدا ئەمە ناوەڕۆکی یەکێك لە درێژترین بابەتەکانمە بە زمانی فارسی نەك ئینگلیزی واتە تا ئێستا نەکراوە بە ئینگلیزی. ناونیشانی بابەتەکە "ئاینی زۆرترین لە بەرامبەر ئاینی کەمترین"ە، ئاینی زۆرترین یان ئایینداری زۆرترین مانای ئەوەیە جۆرێك لە ئایینداری ***Religiosity*** حەز دەکات هەموو شتێك واتە زۆرترین شت لە ئاینەکەوە وەربگرێت و هەڵهێنجێنرێت. ئێوە دەزانن، کەسانی دینی کەسانێکی عاشقن، ئەمەش ووتە بەنرخەکەی منە: ئاین هێندە گرنگە تەنها دەبێت بۆ عاشقان بەجێبهێڵرێت، چونکە عاشقان عادەتەن هەندێك شت هەیە نایبینن، هەندێك هەڵە هەیە نایبینن و ناتوانن رەخنە لە مەعشوقەکانیان بگرن، هەمیشە لێبووردەن، هەمیشە مل بۆ مەعشوقەکانیان کەچ دەکەن. لەبەرئەوە تۆ هەمیشە پێویستت بە هەندێك چاوی رەخنەیی هەیە، پێویستت بە هەندێك ڕاهێنانی رەخنەیی هەیە بۆئەوەی رووبەروو بیتەوەو بگەیتە ئایینەکەت بە شێوازێکی بیرکردنەوەی رەخنەییانە. بەڵام کەسانی ئاینی حەزناکەن رەخنەی ئایینەکەیان بکەن، ئیمامی یەکەمی شیعە وتەیەکی هەیە دەڵێت: "مرۆڤ ناکرێت سەرزەنشت بکرێت چونکە مرۆڤ دایکی خۆش دەوێت، ئایینیش دایکی ئایینداران"، ئایینداران سەرزەنشت ناکرێن بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە شێوازێکی زانستییانەو لێکۆڵەرەوانە و بە شێوازێکی بیرکردنەوەی رەخنەییانە دەبێت ئاگاداری ئەمە بین. ئاینی زۆرترین بەرهەمی عیشقە. لەبەرئەوەی تۆ ئیمانی خۆتت خۆش دەوێت، ئاینی خۆتت خۆش دەوێت، حەز دەکەیت هەموو جوانییەکان لەناو ئاینەکەی خۆتدا ببینیت. ناتوانیت لەوە تێبگەیت و دان بنێیت بەوەدا کە دەشێت کەموکوڕی لە ئاینەکەتدا هەبێت، بەڵام دەشێت پێویست بێت لە سەرچاوەکانی دیکە بڕوانیت بۆئەوەی پێویستییەکانی دیکە دەستەبەرکەیت..

ئەم ئاینی زۆرترینە لە ڕاستیدا ئەو ئاینەیە کە ئێستا لە وڵاتی ئێمە فەرمانڕەوایی دەکات، زۆرینەی دەسەڵاتەکان مەکسیمالستن واتە ڕەچاوی بیرۆکەی زۆرترین دەکەن لەو دیدەوەی کە ئەوان خەڵکی هاندەدەن و رازیان دەکەن بۆئەوەی بە شێوەیەك بیربکەنەوە هەرچییەك ئەوان پێویستیان پێیەتی دەتوانرێت لە ئیسلامەوە دەربهێنرێت. لەبەرئەوە ئەوان نایانەوێت بە دوای هیچ سەرچاوەیەکی دیکەدا بگەڕێن، جا ئەو سەرچاوەیە لە ڕۆژئاوا بێت، لە ڕۆژهەڵات بێت، یاخود لە ئێرانی ئیسلامی بێت یان هەرچییەك بێت، کەواتە تۆ خاوەنی هەموو شتێکیت و سەرچاوەی دەوڵەمەندت هەیە و دەتوانیت ژیانێکی بەختەوەرانە بەسەر بەریت بەبێ وەرگرتنی هیچ شتێك لە کەسێکی دیکەوە، ئەمە ئاینی زۆرترینە..

بەڵام ئێستا دەڵێم خۆشبەختانە بە واقعی بوونی ئاینی کەمترین (منیمالیست) پێی گرتووەو کەوتۆتە سەرڕێ. لەو دیدەوە کەمترینە کە تەنها ڕێگایەك بە تۆ دەبەخشێت بۆئەوەی ژیانێکی ڕوحییانە بەسەر بەریت، بەڵام زۆر شتی دیکە و پێویستی دیکە هەن کە تۆ پێویستە بە دییان بهێنیت و تێریان بکەیت و

وەریانبگریت و بیانهێنیت لە سەرچاوەکانی دیکەوە. لە ڕوانگەیەکی تیۆرییەوە، خاڵی یەکەم کە حەزدەکەم باسی بکەم و جەغدی لەسەر بکەمەوە ئەمەیە: بۆ ئەوەی بەلانی کەم گونجاندن لەنێوان ئاین و دیموکراسیدا وێنا بکەین دەبێت تێگەیشتنێکی فیمالیستییانەمان بۆ ئایین هەبێت وەك لە تێگەیشتنێکی ماکسیمالیستییانەی ئایین. تێگەیشتنێکی مەکسیمالیستییانەی ئایین دوژمنی دیموکراسییە، دوژمنی مۆدێرنیتەیە، دوژمنی هەموو شتێکی دەرە – ئاینییە. ئەمە خاڵی یەکەم بوو واتە قسەکردنێکی تیۆریانە لەبارەی تەفسیرێکی فیمالیستییانەی ئاین.

خاڵی دووەم کە حەز دەکەم قسەی لەسەر بکەم ئەویش بیرۆکەی دەرە – ئایینە – ***extra religion***، یاخود بیرۆکە و چەمکە دەرە ئاینییەکان (نائاینییەکان) لە بەرامبەر بیرۆکە و چەمکە ناو ئایینییەکان (ئاینییەکان). ئەمە شتێکە هەر زوو لە کارەکەمدا دەرکم کرد واتە ئەو کاتەی دەستم کردە بیرکردنەوە و نوسین لە بارەی ئایینەوە لە کۆمەڵگاکەماندا – بە هەرحاڵ دەمهەوێت پێتان بڵێم قورسترین کارێك بۆئەوەی ئەنجامی بدەیت لە کۆمەڵگەیەکی ئایینیدا قسەکردنە لەبارەی ئایینەوە. دەبێت زۆر وریا و هۆشیار و زیرەك و دانابیت بۆئەوەی بیرۆکەکانت بخەیتە ڕوو بێئەوەی ڕووبەڕوی هیچ ڕێگریەك ببیتەوە، لەوانەیە من ئەوەندە زیرەك نەبووبم چونکە دوچاری هەندێك ڕێگری بووم. لەگەڵ ئەوەشدا هەروەکو ووتم ئەمە ئەو باجەیە کە دەبێت بدرێت. من لە سەرەتاوە دەرکی ئەوەم کرد: لەبەرئەوەی کەسانی ئایینی عاشقن، لەودیوو دەرەوەی ئایینەکەیانەوە شتێکی دیکە نابینن، سەرنج و تێڕامانەکانیان لە چوارچێوەی ئایینەکەیاندا ڕەنگی خواردۆتەوە، بۆیە هەمیشە پێویستە هاوسەنگییەك لە نێوان ناوەوەو دەرەوەی ئایینیدا بکرێت. ئەمە زۆر گرنگە و لە ڕاستیدا ناوەرۆکی تێزەکەمە لە کتێبەکەمدا بە ناوی "کشان و چوونەوەیەکی تیۆریانەی مەعریفەی ئایینی". لەبەرئەوە هەوڵدەدەم هاوسەنگی نێوان ناوەوەو دەرەوەی ئایین و بیرۆکە دەرە ئاینییەکان و بیرۆکە ناو ئاینییەکان بپارێزم. هەمیشە مەسەلەکە هەر ئەمە بووە و هەوڵیشم داوە لە کتێبەکەمدا نیشانی بدەم کە ئەمە بیرۆکەیەکی نوێ نییە بەڵکو لە ڕاستیدا ئەمە تەواوی مێژووی ئاین بووە. هەمیشە کەسانی ئاینی بە تایبەتی زانایان و دینناسان و فەیلەسوفان دەوڵەمەندبوون بە بیرۆکە دەرە – ئاینییەکان. سەیری سەدەی دووەمی پاش دەسەڵاتی پێغەمبەر کەن، سەیری موعتەزیلە، تەنانەت سەیری ئەشعەری کەن، ئەوان فەلسەفەیان بەهیچ دەزانی کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، فەلسەفەی تایبەت بە خۆیان هەبووەو بەشێك لە فەلسەفەکانیان لە دەرەوەی ئیسلام، لە مەسیحییەکانەوە، لە یۆنانەوەو.. هتد وەرگرتووە. هەوڵیانداوە هاوسەنگیەك لە نێوان هەردووکیاندا دروست بکەن، ئەوان بیانهەوێت و نەیانهەوێت، بە زانین بێت یاخود نەزانین، بەشێك لەم بیرۆکە و ئایدیایانەیان خستۆتە ناو ئەو تەفسیرانەوە کە لەبارەی قورئانەوە کردوویانە و..هتد. ئێوە لە بیرتانە چ کاتێك فەرمووده(حدیث)ی پێغەمبەر زاڵ بوو – بەڕێز

ناسـر حەمیـد ئەبوزەیـد پێویـستە ڕاسـتێتی فەرموودەمان پـێ بڵێت: "ئەو تەفسیری قورئان دەکات بە گوێرەی ویست و بیرۆکەکانی خۆی، بـە دڵنیاییـەوە دەچـێتە جەهەننـەم"، لەوانەیـە فەرمووده بەرهـەمی سـەدەی دووەم یـان سـێیەم بووبێت چونکە ئەم جۆرە تەفسیرکردنی قورئان بـە گـوێرەی بیرۆکـە کەسـییەکان زۆر زاڵ و بەرچاوبووە.

هەنـدێك کـەس بیرۆکـەیان لـە یۆنانـەوە وەرگرتـووە، هەنـدێکی دیکـە لـە هیندییەکانـەوە وەریـانگرتووە.. هتـد کەواتـە تەفـسیرکردن *interpretation* پشت بەستوو بووە لەسەر ئەم بیرۆکە نائاینییانە بەڵام من لە کتێبەکەمدا ئەم مەسـەلەیەم بـە مەسـەلەیەکی تـەواو سروشـتی باس کردووە. تۆ ناتوانیت لەسەر ئەم مەسەلەیە سەرزەنشتی کەس بکەیت. ئەو کەسانەی وا بیر دەکەنـەوە کـە دەتـوانن زەینیـان بەتاڵکەنـەوە و هـەر گریمانەیـەکی پێـشوەختییان هـەبووە نەیهێڵن و بە زەینێکی تـەواو خاڵییـەوە دەتـوانن ڕووبەڕووی وەحـی (سـروش *revelation*)ببنـەوە لـە شـێوەیەکی پوختـدا بۆئـەوەی مانـا قوڵەکـەی وەحی کەشف بکەن، پێموایە ئەوانە لە وەهمدا دەژیـن. هێڵکـاری مێـژووی مۆدێرن پێمانـدەڵێت بەداخـەوە کـارێکی لـەم شـێوەیە مەحاڵـە و حـەز بکـەیت یـاخود نـا ئـەوە مێـژووە وا دەڵێـت. تـۆ هەمیـشە لـەژێر هەیمەنـەی هەنـدێك بیرۆکـەدایت کە هیچ ئاگایەکت لێیان نییە، بەڵام ئەم بیرۆکانە بوونیـان هەیـە و کاریگـەری لەسـەر شـێوازی بیرکرنـەوەو شـێوازی تەفسیرکردنت دادەنێن بـۆ ئـەو تێکستەی (دەقـەی) لەبەردەستایە. دەقەکە مـەرج نییـە دەقێکـی موقـەدەس یـاخود دەقێکـی ئاسمـانی بێـت، دەشـێت شـیعرێکی ڕێڵکـی، شیعرێکی حافز یان هـەر کەسێکی دیکە بێت. هەمیـشە مەسـەلەکە هـەر بـەم شـێوەیە بـووە، مێژووش شایەتی ئەوەیە، هەموو ئەو کەسانەی ووتوویانـە "ئێمـە بـە باشـترین شـێوە نیـەتی خوامـان ناسـیوە" ئـەوانیش کەوتوونەتـە هـەمان داوەوەو گیرۆدەی هـەمان هەڵـەبوون و کاتێکیش تەفـسیرەکانیان هەڵدەوەشـێنیت، دەبینیـت بیرۆکـەکانیان لـە گۆشـەگەلێکی جیـاوازەوە هـاتوون و ڕژاونەتـە نـاو کتێبـەکانیان و ئـیش و کارو بەرهەمـەکانیان. ئەمـەش کاریگـەری بیرۆکە ناو ئایین و دەرە ئاینییەکانە نەك تەنها لە بواری تەفـسیر و تەفـسیرکردنی دەقەکانـدا بـەڵکو لـە ناسـینی خـوداو تەفـسیرکردنی مێـژوو هـەموو شتێکدا بەو شێوەیە بووە.

حەز دەکەم پێتـان بڵێم، بۆ نموونـە، زۆربـەی فەیلەسـوفە موسـڵمانەکان بوونەتـە ڕیالیـست *Realist*، ڕیالیـست بـەو مانایـەی لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا هـەیبووە، واتـە چـەمکگەرا (*conceptualist*)، بـە مانایـەکی دیکـە باوەڕیـان بە ڕێسا گشتییەکان *Universals* هـەبووە، ئەم بابەتـە هـەرگیز وانەیـەکی ئیسلامیی نییـە، هـیچ شـتێك لـەبارەی ریـالیزم و ناوگـەرایی *nominalism* لـە هـیچ کـام لـە دەقـە ئیـسلامییەکاندا، چ لـە شـیعەگەری و چ لـە سـوونیگەریدا نابینیـت، بـە دڵنیاییـەوە نـە لـە قورئانیـشدا چـونکە ئـەم بیرۆکەیـە یـاخود بابەتە سەد دەرسەد لە زەینی موسڵمانەکانەوە دوور بووە.

ریـالیزم لـە بەرامبـەر نومینالیزمـدا (ناوگـەرایی)، نومینـالیزم بووبـووە بابـەتی بـاوی

ڕۆژگار لە ئەورووپا و بێگومان ریالیزمیش لە یۆنانی کۆندا بوونی هەبووە و موسڵمانەکان پاشان وەریانگرتووە. بەڵام زۆربەی تەفسیرە فەلسەفییە عەقڵانییەکانی قورئان لە ژێر هەیمەنەی قوتابخانەی ریالیزمدایە، واتە ریالیزمی فەلسەفی، لەبەرئەوە تەفسیری دەقە دینییەکان لە سەرچاوەگەلێکی دەرەدینییەوە سەرچاوەیان گرتووە. ئەوانەی بەم کارە هەستاون گفتوگۆی ئەم بابەتەیان نەکردووە و ئاشکرایان نەکردووە و دەریاننەخستووە کە ئاگاداری بەکارهێنانی بەرهەمەکانی قوتابخانەی ریالیزمن واتە ریالیزمی یۆنانی، بەڵکو هەمیشە بیریان لە چییەتی (ماهیەت *essence*) شتەکان کردۆتەوە. کاتێک سەیری ئاویان کردووە، بیریان کردۆتەوە، بەڵێ ئاو چییەتی خۆی هەیە، لەبەرئەوە خوای گەورە قسە لە بارەی چییەتی ئاوەوە دەکات. کاتێک سەیری درەختەکانیان کردووە، ووتویانە: هەموو درەختێک چییەتییەکی تایبەت بەخۆی هەیە، خوای گەورە قسە لەبارەی درەختەکانەوە دەکات، ئەشجار لە قورئاندا هاتووە، لەبەرئەوە خوای گەورە قسە لەبارەی چییەتی درەختەکانەوە دەکات. کاتێک "اشارە" دێتە پێشەوە، ئەوان ناوگەربوون و بە تەواوی شێوازێکی جیاوازیان پەیڕەو کردووە.

ئەمەی باسم کرد وەکو نمونەیەکی زیندوو، بۆ ئەوە بوو پێتان بڵێم، بیرۆکەکان لە گۆشەگەلێکەوە دێنە زەینی ئێمەوە کە ئێمە ئاشنا نین پێیان، بەردەوامیش بۆ نەوەکانی داهاتوو دەگوێزرێنەوە و بیرۆکەکان دروست دەبن و لێرەوە کاریگەری بیرۆکەی بێگانە دەبینین.

لەبەرئەوە، بۆ کەسێکی ئاینی، بۆ باوەڕدارێک، بۆ لێکۆڵەرێکی دینی بەتایبەتی، پێویستە زانین و ئاگاداربوون لەم مەسەلەیە بە ئەرکی خۆیان بزانن، چەندێک ئاینەکەی خۆی دەناسێت پێویستە ئەوەندەش هۆکار و بیرۆکە نائاینییەکانی دیکە بناسێت، بەڵام بە داخەوە ئەمە شتێکە ئێمە بەرچاومان ناکەوێت. ئەمەش بە تایبەتی ئامۆژگاری من بووە لە کۆڕەکاندا لە ئێران، دەڵێم باشە ئێوە مامۆستای ئاینین، ئێوە عالمن، ئێوە قورئان دەزانن، فەرموودە دەزانن، هەموو شتێک دەزانن، بەڵام تەنها قورئان و فەرموودە دەزانن، پێویستە مەعریفەی خۆتان فراوان کەن و ئەم تێکستە تێپەڕێنن بۆئەوەی شتەکانی دەرەوەی پەرتوکە ئاینییەکانتان بزانن و بناسن. ئەمەش ئاماژەیەک دەدات بە ئێوە کە بۆچی تێگەیشتنی ئاینی ئەوەندە تێگەیشتنێکی مێژوویییە، مێژوویییە چونکە مەعریفەی مرۆڤ لە دەرەوەی ئاین بە هەمان شێوە مێژوویییە، لەبەرئەوە کاریگەری لەسەر تێگەیشتنی ئاینی دروست دەکات و وای لێدەکات پشت لەسەر بیرۆکە نائاینییەکان ببەستێت.

حەزدەکەم خاڵێکی دیکە زیاد بکەم: خاڵی سێهەم ئەویش بەتایبەتی مەسەلەیەکی فەلسەفی دیکەیە، پێویستە لە زەینماندا بێت پێش ئەوەی بێینە سەر بیرۆکە زیاتر واقعی و کردەییەکان، ئەویش بیرۆکەی مافەکانە (*Rights*). زمانی ئایینی بەتایبەتی لە ئیسلام و یەهودیەتدا زمانی ئەرکەکانە (*Duty*)، زمانی

ئیلتیزاماتەکانە (*obligations*)، بەلاّم قسە لە مەسیحیەت ناکەم چونکە کەمێك جیاوازە، هەروەها لە بارەی بودیزمەوە قسە ناکەم. من بەش بە حاڵیٚ خۆم بۆ ئەم مەسەلەیە گەڕانێکم بە قورئاندا کرد. لە هەموو قورئاندا، زیاتر لە شەش هەزار ئایەت، تەنها یەك دوو جار بیرۆکەی مافەکان دەبینێت. ئەو ئایەتەتان بۆ دێنمەوە کە ئێستا خۆم لە بیرمە، لەوانەیە پرۆفیسۆر ئەبوزەید هەندێك نمونەی دیکەمان بیر بخاتەوە، ئایەتەکەش باس لە کەسێکی کوژراو دەکات، لەبەرئەوە خاوەنی کوژراوەکە دەتوانێت یاخود دەسەلاّت ماڤ ئەوەی هەیە تۆڵەی کوشتنەکەی بکاتەوە، کەواتە بیرۆکەی ماف ئەوەیە، ئەم ئایەتە قورئانییە زۆر شازە، لەبیرمە لیڤی شتراوس کە گەورەی نێو کۆنەکانە *neocons*، بمبەخشن نمونە بەو دەهێنمەوە، بەلاّم کتێبێکی زۆر نایابی لەسەر مێژوو هەیە و لەوێدا باس لەوە دەکات کە هیچ باسێك لە بارەی مافەکانەوە لە پەیمانە کۆنەکەدا نابینیت، ئەمە ئەوەیە کە ئەو وتوویەتی و منیش ئاماژەم پێدا: لە قورئانیشدا ئەوەت بەرچاو ناکەوێت. بێگومان ئەو هیچ شتێکی لە بارەی قورئانەوە نەزانیوە بەلاّم ئەو جوولەکەبوو زۆرباشیش شارەزای پەیمانە کۆنەکە *old testament* بووە، ئەو دەڵێت: مافەکان لە چەمکە نوێکەیدا، لە دیدی نوێی مافەکاندا، لە پەیمانە کۆنەکەدا بەرچاو ناکەوێت. منیش پێتان دەڵێم بە هەمان شێوەش لە قورئاندا بەرچاوتان ناکەوێت جگە لە یەك دوو شوێن کە لەوانەیە بەرچاوتان بکەوێت..

زمانی ئەم دوو ئایینە زمانی ئەرکەکانە، زمانە ئلتیزاماتەکانە، باباڵێین زمانی لێپرسراوییەکانە، خودای ئەم دوو ئایینە خودای ئەرکەکان و لێپرسراوییەکانە. خودا هەمیشە ئامادەیی هەیە و بە وورياییەوە سەیری تۆ دەکات بۆ ئەوەی لێپرسراوییەکانت راپەڕێنیت و ئەرکەکان و ئیلتیزاماتەکانت جێبەجیٚ بکەیت و.. هەروەها. زمانی مافەکان لەم دوو ئایینەدا تا ڕادەیەکی زۆر بوونی نییەو لەبەرئەوەشە ئابورییەکانیان ئابوری – ئەرکییە، سیاسەتەکانیان سیاسەتی– ئەرکییە، ئەخلاقەکانیان ئەخلاقی – ئەرکییە و هەروەها.. لەلایەکی دیکەوە، لە رۆژئاوای لیبراڵ، زمانی زاڵی لیبرالیزم زمانی مافەکانە، پێشم وایە دیموکراسی لە رۆژئاوای نوێدا، بەشێکە لە لیبرالیزم، بێگومانیش لەسەر مافەکان پشت دەبەستێت. بێگومان کەسێك دەتوانێت رەخنە بگرێت و منیش رەخنەم گرتووە کە جەغدکردنەوەی زۆر لەسەر مافەکان و پشتگوێخستنی ئەرکەکان کەم و کورتییەکەو لەلایەکی دیکەشەوە جەغدکردنی زۆر لەسەر ئەرکەکان و پشتگوێخستنی مافەکان هەڵەیەکی دیکەیە، پێویستە لە هەردووکیان دوورکەوینەوە. بەلاّم با ئێمە دۆخی ئێستامان شی بکەینەوە و گفتوگۆی بکەین. ئەمە ئەو دۆخەیە و حەزدەکەم بڵێم دیموکراسی نەوەی زمانی یاخود کلتوری مافەکانە. گونجاندنی کلتوری مافەکان و کلتوری ئیلتیزاماتەکان پێکەوە کارێکی گرانە. من ناڵێم کارێکی مەحاڵە بەلاّم ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ کارێکی لەم شێوەیەدا زۆر جدییە و زۆریش تاقەت

پڕۆکینەو پێویستیشە پێشوازی لێبکرێت چونکە دواجار پێویستە هەموومان ڕووبەڕووی کێشە ڕاستەقینەکان ببینەوە. من بەش بە حاڵی خۆم ئەزموون و بیرۆکەم هەیە و لێرەدا تەنها وەکو پێشنیارێك دەیخەمە ڕوو، چارەسەرێکی سادەنییە، لەوانە پێویست بێت هەردوو پارادایمەکە، پارادایمی ئەرك و پارادایمی ماف، تێپەڕێنین و لەوانەشە پێویست بێت پارادایمی سێهەم دروست کەین و تێیدا بتوانین هەردووکیان ئاشت بکەینەوە و تێکەڵیان بکەین. هەندێك ئاماژەم هەیە بەڵام نامهەوێت لێرەدا بۆتان پێشنیار بکەم و کێشە بە کراوەیی بۆتان جێدەهێڵم بەڵام پێتان دەڵێم ئەمە کێشەیەکی گرنگە.

هەروەکو ووتم، ڕۆژئاوای لیبراڵ، جەغدێکی لە ڕادەبەدەر لەسەر مەسەلەی مافەکان دەکاتەوە. دیموکراسیش نەوەی کلتووری مافەکانە، لەبەرئەوە چ لە یەهودیەت *Jadaism* و چ لە ئیسلامدا *Islam* هەندێك جۆری ڕێگری هەیە لەبەردەم دیموکراسیدا چونکە عەقڵیەتی *Mentality* ئەم دوو ئایینە عەقڵیەتێکی ئەرك – خوازە، جەغدکردنی زۆر لەسەر مەسەلەی مافەکان ڕەت دەکاتەوە چونکە ماف مانای شێوەیەك لە سەربەخۆیی مرۆڤەکان دەگەیەنێت لەبەرامبەر خودادا. "من مافم هەیە" ئەمەش شتێکە لەلای کەسی دیندار زۆر خۆش نییە. ئەرك واتە گوێڕایەڵی و ملکەچی، واتە تەسلیم بوون، تۆ تەسلیمی خودای خۆت، گەورەی خۆت دەبیت، ئەو خودایەی دەیهەوێت تۆ ئەرکەکانت جێبەجێ بکەیت. بەڵام بوونی ماف مانای ئەوەیە تۆ سەربەخۆییت – تەنانەت لەبەرامبەر خوداشدا. تۆ ئەم مافەت هەیە و بانگەشەی بۆ دەکەیت، ئەمەش هەندێك جار پەیوەندی بە جۆرێك لە لووت بەرزییەوە هەیە کە هەمیشە لە کایەکانی دینداریدا کارێکی نەخوازراوە.

کەواتە ئێمە چۆن دەتوانین ئەرك و ماف ئاشتکەینەوە و لە لووت بەرزیش بەدووربین و لە هەمان کاتیشدا ملکەچی و تەسلیم بوونمان بۆ خودا قبوڵ بێت، کەواتە ئەمە ڕووبەڕووبونەوەیەکی ڕاستەقینەیە بۆ هەموو ئایینەکان بە مەسیحیەتیشەوە چونکە ملکەچی *submission* جەوهەری هەموو ئاینداریەکە، ئەمە جێگەی گومان نییە. ئەگەر وا هەست بکەیت تۆ کەسێکی سەربەخۆبیت، کەواتە تۆ خوایەکی بۆ خۆت، ئەمەش دەبێتە فرە پەرستی *polytheism* وەك لە یەکتاپەرستی *monotheism* و پەرستشی خودای ڕاستەقینە. کەواتە ئەمە ڕووبەڕووبونەوەیەکی دیکەیە و خۆشحاڵیشم لە وڵاتەکەی خۆماندا سەرنجی کەسانێکی زۆریشم بۆ ئەم مەسەلەیە ڕاکێشاوە. بۆ ئەو کەسانەی لەم کایەدا کاردەکەن واتە کایەی ئاشتکردنەوەی ئیسلام و دیموکراسی، مەسەلەکە تەنها سیاسەت و هەڵبژاردن و جیاکردنەوەی دەسەڵات و..هتد. نییە. لێرەدا زۆر مەسەلەی قووڵتر دێتە پێشەوە. ئەگەر جۆرێك لە عەقڵیەت ئامادە نەکرێت، مەبەستم ئەوەیە بەبێ جۆرێك لە عەقڵیەت هەموو ئەم شتانە لەوانەیە شتگەلێکی ڕواڵەتی بن، ئێوە شتە دروستکراوەکان دەناسن، لەوانەیە پەرلەمانتان هەبێت، دەسەڵاتی قەزائیتان هەبێت بەڵام هیچ کەس بەشێوەیەکی ڕاست و دروست

کاری خۆی جێبەجێ ناکات چونکە پێویستتان بــە هەنــدێك پایــە و بنــەمای فەلــسەفی هەیــە، تەنانـــەت بنـــەما و پایـــەی دیـنناســـی (ئیلاهیاتناســی) بــۆ ئــەوەی سیــستەمێکی دیموکراســی راســتەقینەتان هــەبێت. چــی دی خــودای ئێــوە ناتوانێــت خودایــەکی ســەپێنەر بێـــت، خودایـــەکی ســـەپێنەر لەگـــەڵ فەرمانڕەواییەکی دیموکراسییانەدا کە هـەڵگری بیرۆکــەی مافەکانــە ناگونجێــت. لەبــەر ئــەوە پێویستە تەنانەت بیرۆکە و عەقڵیەتتان لەبارەی خــوداوە و لــە بــارەی مەســەلەی خوداییــەوە بگـۆڕن، دواجـاریش لـە دینناسـییەکەتاندا قـوڵ ببنــەوە. لەبەرئەوەشــە هەمیــشە لــە وڵاتەکــەی خۆمدا وتوومە و پێشنیارم کردووە دەبێت ئێمە گۆڕانکـــاریین و گـــۆڕان بکـــەین، یـــاخود بـــە دەربـــڕینی جیـــاواز دەیڵێمـــەوە دەبێــت ئێمـــە تەنانەت بە دینناسیدا ***Theology*** بچینەوەو چی دی چەق نەبەستێت، ئەوە تەنها تەفسیرکردنی دەق نییـــە تـــەنها چـــوونەوە نییـــە بـــەناو فــەرموودەکانی پێغەمبــەردا و.. تــەنها کــارایی سیاسـی نییـە، بـەڵکو زۆر مەسـەلەی قـوڵ دێنـە پێشەوەو لەبەرئەوەشە ماوەی یەك سەدەیە ئێمە لە پرۆسەی دیموکراتیزە کردنداین. لە بیرتانە یەکەم شۆڕشی دیموکراتی یاخود دەستوری لە وڵاتەکەماندا لە ساڵی 1906دا ڕوویدا، ئێستا لـە سـاڵی (2004)دایـن، نزیکـەی یـەك سـەدەیە ئـەم دیموکراتیزە کردنـە ڕێگـەی خـۆی گرتـووە. ئێوە تـەنها کەسێکتان بەرچاو ناکـەوێت پێتـان بڵێـت کلتـوری دیموکراسـی یـاخود ئـازادی لـە وڵاتـی ئێمـەدا بـە باشـی جێـی خـۆی گرتـووە، نا هێشتا ڕێگایەکی درێژماوە بۆ بڕین چونکە دیوە چـــەمکییەکەی دیمـــوکراتیزەکردن هێـــشتا پێویـستە بێتـە واقـع و بەرجەسـتە ببێـت، پێـشم وایـــە لـــە بـــواری دینناســـیدا، لـــە بـــواری تەفسیرکردنی پەرتوکـە پیرۆزەکانـدا و.. هێـشتا ڕێگەیـەکی درێـژماوە بیـبڕین بـەڵام پـێم وانییـە لێرەدا ماوە هەبێت درێژە بە قسەکانم بدەم.

لـە ڕاسـتیدا ئـەوەی ویـستم بیڵـێم لـە بـواری بنەما فەلسەفییەکاندا پێشتر زۆربـەی وتـرا بـەڵام ڕێگەم بدەن بەسەرهاتێکتان بۆ بگێڕمەوە:

دوو مـــانگ لەمـــەوپێش لـــە ئێـــران بـــووم و سـەردانی ئایـەتوڵڵا مونتـەزەریم کـرد، بێگومـان مونتــەزەری کەســایەتیەکی ناســراوی ئێرانــە ئـەویش بـەهۆی ئـەوەی ڕابـەری "روحـولا"بـوو، بـــەڵام زۆری نەخایانـــد دەســـت بەســـەرکراو دوورخرایـــــەوەو پاشـــــانیش چـــــالاکییە سیاسییەکانی قەدەغـەکراو لـە ماڵەکـەی خۆیـدا بۆ ماوەی پێنج ساڵ دەست بەسەرکرا، ئێستا نیمچە ئازادییەکی هەیە، سەردان کردن بۆ لای مونتەزەری کارێکی زۆر مەترسیدارەو حکومەت پێـــی ناڕەحـــەت دەبێـــت بـــەڵام لەبەرئـــەوەی هاوڕێیەتیــەکی دێــرین لــە نێوانمانــدا هەیــە، بڕیارمــدا ســەردانی بکــەم کــە شــوێنەکەی لــە دەرەوەی شـــاری قـــوم بـــوو. لـــە ڕاســـتیدا، گفتوگۆیــەکی باشمــان ئەنجامــدا، یــەکێك لــەو گفتوگۆیانــە لــە بــارەی دەوڵــەتی ئیــسلامییەوە بوو. ئێوە دەزانن ئایـەتوڵڵا مونتـەزەری یەکێکـە لە فەقیهە پلە یەکەکان، کتێبێکی ئێجگار گرنگی نووسـیوە – چـوار بەرگـە– لـە بـارەی ولایـەتی فـــەقیهو دەســـەڵاتی فـــەقیهو لـــە ڕاستیـــشدا پـشتگیری ئـەو بیرۆکەیـەی کـردووە. هێـشتا ئـەو کتێبــە باشــترین و ووردەکــارترین سەرچــاوەی

بیرۆکـەی ولایـەتی فەقیهـە، بـەڵام بـەم دواییانـە بەشێك لـە بیرۆکـەکانی خـۆی گۆڕیـوە. بـەڵام مـن پرسیارم لێکرد، ئایـەتوڵا، بـا هـەموو مەسـەلەی ولایەتی فەقیه بخەینـە لاوە، ئاخۆ ئەوە خودایـە بڕیار دەدات بۆ ئێمە بـەم شێوەیە فـەرمانڕەوایی وڵات بکـەین و.. ئەگـەر هـاتوو بەڵێننامەیـەکیش لـە نێـوان خـەڵك و حکومەتـدا هـەبێت، لەسـەر بنەمای ئەو بەڵێننامەیە ئێمە فەرمانڕەوایەتی بە میرات بە هەندێك کـەس بـدەین، تەنانـەت ئەگـەر ئەوانە نوێنەریشمان نەبن، ئێمە بە میرات بـەڵێن بە هەنـدێك کـەس بـدەین وەکو پارێزگـار یـاخود فـەرمانڕەوا خزمـەتمان بکـەن، هـەتا ئـەو کاتـەی ئـەوان خزمـەتمان بکـەن ئێمـەش یارمـەتییان دەدەیــن و هــەتا ئــەو شــوێنەی بەڵێننامەکــە دەپارێزن ئێمەش شان بە شانیان دەڕۆیـن، بـەڵام ئەگــەر کــارێکی لــەو شــێوەیەیان نــەکرد، دەریاندەکـەین و لەسـەر کـار لایـان دەبـەین و بەڵێننامەکـە دەشـکێنین و کۆتـایی پێـدەهێنین، ئـەویش ووتـی ئـەوە لـە دیـدێکی ئیـسلامییەوە سەددەرسـەد ڕاسـتەو لـە شـوێنی خۆیدایـەتی، پاشـانیش ووتـی ئەمـە بنەمایـەکی ئیـسلامییە "اوفوا العقود: پەیمان و بەڵێنەکانتان بپارێزن". لەبەرئـەوە، بـە چاوپۆشـی کـردن لـە ولایــەتی فەقیهو فرمانە خوداییەکە، باس باسی پـەیمان و بەڵێنـە، بـەڵێن بـدە، پـێم ووت بـەرێز ئایـەتوڵڵا ئەمە کتومت پرنسیپی بەڵێنامەیە، ئارگیومێنتی بەڵێننامەیـە لـە فەلـسەفەی سیاسـی ڕۆژئـاوادا. ئەمـە بنـەمای دیموکراسـییە، بنـەمای شـێوازی نوێی سیاسەتە. ئەویش ووتی تـەواوە، تەنانـەت لەسەر بنەمایـەکی ئیسلامیش لانیکـەم گونجاوو سازگارە. ئێوە نـاتوانن ئـەوە لـە بیرۆکـەی "اوفوا العقــود"ەوە وەربگــرن و هــەڵیهێنجن، بــەڵام دەتــوانن لەســـەر بنـــەمای "اوفـــوا العقـــود" دابیمــەزرێنن. هــەروەها ئــەم مەســەلەیەم بــۆ خوێنـدکارەکانی زانکـۆی تـارانیش باسـکردووە. ئـەم تێڕوانینــە بــۆ ئــەو کەســانەتان کــە لــە چوارچێوەیەکی ئایینیـدا بیردەکەنـەوە، بـۆ ئـەو کەسانەتان کە هێشتا وا بیردەکەنەوە کە ئەرکی ئایینیتانـــە بـــۆ پـــشتگیری کردنـــی یـــاخود دژوەسـتانەوەی سیـستەمێکی سیاسـی، بـۆ ئـەو کەسـانەتان هێـشتا پـشت لەسـەر دەسـەڵاتێکی ئـایینی دەبەسـتن، ئێـستا گـوێ بـۆ ئایـەتوڵا مونتەزەری بگرن: لە ڕاستیدا ئەو دانی ناوە بە تیۆریــای بەڵێننامــەی فەرمانڕەوایــەتیکردن و قبوڵی کردووەو ئەمە ئەو ڕێچکەیەیە کە دەبێت بە فعلی بگرینە بەر.

حـەز دەکـەم بڵـێم، نـەك تـەنها لەسـەر بناغـەی ئـەو بنـەما فەلـسەفییانە کـە کـاتم نـەبوو لەگـەڵ مونتەزەریـدا لێـی بـدوێم، هەرچـەندە پـێم وایـە زۆرباش ئاگاداری پێشگریمانە فەلسەفییەکانی تیۆریــای بەڵێننامــە ***contract*** نییــە، چــونکە ژمارەیەکی زۆر پێش گریمانە هەیە، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشدا حەزدەکەم بڵێم ئەم دیدە دیدێکی باشە کاتێك کەسێکی پایـەداری ئایینی بە فعلـی بـەو شـێوەیە بیردەکاتــەوە، ئێمــەش پێویــستە دژی نەوەسـتین، پێویـستە پێـی نـەڵێین تـۆ ئیـسلام ناناسـی، پێویـستە پێـی نـەڵێین بـەڵێ دەبێـت بگەڕێیتــەوە بـۆ لای ڕۆشـنبیرە ئایینیـەکان، بـۆ لای پیـاوە نائایینییـەکان بۆئـەوەی فێـرت کـەن تیۆریای بەڵێننامـە چییە، لانـی کـەم مونتـەزەری شوێنکەوتووانێکی زۆری هەیە. ئەمـەی قسەمان لێکــرد بریتییــە لــەوەی چــۆن دیموکراســـی

دەتوانێـت ڕێگـای خـۆی بدۆزێتـەوەو ڕیـچکەی چـوونە نـاو کۆمەڵگـە موسـڵمانەکان بـشکێنێت. ئێـوە بـە زمـانێکی سـادە ئـەم ڕێگایـە پێـشنیار دەکـــەن و هەوڵیـــشدەدەن ســـەرنجی ئـــەم دەسەلاّتانە رابکێشن. بەلاّم سـەرەڕای ئەمانـەش پـەیامی سـەرەکی مـن ئەمەیـە کـە شـان بـە شـانی کارایی سیاسـی و ئـەم جۆرە فتوادانـە ئاینییـە، پێویـستە ئـەو کـارو چـالاکییە فەلـسەفییانەتان هـەبێت بۆئـەوەی کلتـوری دیموکراسـی دروسـت ببێـت و نیـشانی خـەڵکی موسـڵمانی بـدەن و دەریخەن کە ئەوانیش دەتـوانن لـە سیـستەمێکی دیموکراسیدا بژین و ئیمانیشیان پارێزراو بێت. پێموایـە نـەك تـەنها مـاف منـە، بـەڵکو ئـەرکی منیـشە لێرەدا کۆتـایی بـە قـسەکانم بهێـنم. زۆر سوپاستان دەکەم.

**سەرچاوە:**

*www.drsoroush.com*

# ئۆگست کۆنت و فەلسەفەی پۆزەتڤیزم

هاشم ساڵح
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

-1-

پێویسته ئەوه بزانین یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی ئەو گیروگازە ترسناکەی لە ئێستادا لە نێوان جیهانی ئیسلامی و خۆرئاوادا دروست بووە، دەگەڕێتەوە بۆ بێئاگایی ئێمە لە چۆنیەتی دروستبوونی شارستانیەتی خۆرئاوا. ئێمە بۆ ئەوەی بزانین چۆن چۆنی سەودا لەگەڵ خۆرئاواو ئەقڵیەتی خۆرئاوادا بکەین، پێویستە تێبگەین لە ڕووی مێژوویی‌یەوە ئەو ئەقڵیەتە چۆن دروست بووە، چونکە ئەقڵیەتی مۆدێرن جیاوازە لەو ئەقڵیەتە غەیبانی و تیۆلۆژیەی، بەر لە هاتنی لەئارەدابوون.

شایەنی باسە بۆ ئێمەی توێژەرانی جیهانی ئیسلامی وەختێك دێینە خۆرئاواو دەچینە ناو زانکۆکانیەوە، یەکەمین شتێك کە توشی شۆك و ڕاچڵەکانمان دەکات، ئەم ئەقڵیەتە پۆزەتڤستیە – زانستیە سارد وسڕەیە کە بەیەکجاری خۆی لە هەموو ڕەهەندێکی تیۆلۆژی و ترانسندنتالی جیاکردۆتەوە. من بۆ خۆم کاتێك سی ساڵ لەمەوبەر هاتمە فەرەنسا، دوچاری ئەو حاڵەتە بووم و نەمدەتوانی هەروا بە ئاسانی لەگەڵ ئەو ئەقڵیەتە نوێیەدا خۆم ڕابێنم. ماوەیەکی زۆرم ویست تا پێیئاشنابم و تێبیگەم و باش و خراپی لەیەك جیابکەمەوە. مۆدێرنە لەسەرەتادا ئەوقت دەکات و وەکی حەقیقەتێکی ڕەها خۆیت بەسەردا دەسەپێنێت، بەڵام دوای ئەوەو هێدی هێدی خاڵە بەهێز و لاوازەکانت بۆ دەردەکەوێت.

ئەم شارستانیەتە زەبەلاحەی لەمڕۆدا کۆنترۆڵی جیهانی کردووە، تێگەیشتنی هەروا کارێکی ئاسان نییە. دەتوانین بڵێین "ئۆگست کۆنت" (1798–1857)، یەکێکە لە وێستگە سەرەکیەکان لە مێژووی دروستبوونی مۆدێرنەی خۆرئاوادا، چونکە ئەم بۆ خۆی دامەزرێنەری فەلسەفەی پۆزەتڤستیە کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، لە

فەرەنـــسادا بالآدەســـت بـــوو. "کۆنـــت" کـــە ڕاستەوخۆ دوای شۆڕشی فەرەنسی لەدایك بوو، درکی بەوە کردبوو دەبێت لەسەر دار و پـەردوی ئـەو سـستمە فیـودالّی و تیۆلۆژییـە مەسـیحیە کۆنـەی شـۆڕش ڕایمـالّی، سـستمێکی تـازە بهێنرێتـە ئـارا. هـەروەها پێیوابـوو پێویـستە زانـست مەشـروعیەت و یەکانگیریـەکی تۆکمـە، پێشکەش بە کۆمەڵگەی پیشەسازی بکات کە لـە سـەرەتای دروسـتبونیدا بـوو. وەکـی ئاشـکرایە سـستمی فێنـدەمێنتالی مەسـیحی لـە ڕابـردودا یەکانگیریەکی کۆنکرێتی بەخشیبووە کۆمەڵگەو جیهانبینیـەکی پڕاوپـڕی بـۆ دەسـتەبەر کردبـوو، بۆیە جێگرتنەوەی هەروا کارێکی ئاسان نەبوو. بە تایبەت گەر بزانین ئەوە بە درێژایی سەدان ساڵ لە ئەقڵی شوێنکەوتوانیدا چەسپی بوو.

ئەمە ئەو ئەرکە قورسە بوو کە ڕووبەڕووی نـەوەی "ئۆگست کۆنـت"بـوو بـووەوە. "کۆنـت" بـەو پێیـەی خوێنـدکار و سـکرتێری فەیلەسـوفی مـەزن "سـان سـیمۆن" بـوو (1760–1825)، دەیزانی هەر بە تەنها زانست بەس نییە، بەڵکو پێویستە ئاینێکی نوێ بێتە ئارا کە لەگەڵ ئەو کۆمەڵگـە تـازە دروسـت بـووەی ئـەوروپادا بگونجێت. لەبەرئـەوە سـەروەختێك کۆمەڵناسـی دامەزرانـد، لـە کۆتاییـەکانی ژیانیـدا لـە هـەوڵی ئەوەدا بوو ئاینێك بۆ مرۆڤایـەتی فەراهەم بکات کـە بـە بۆچـونی ئـەو ئـەرکی ئـەوە دەبێـت تـا جێگـەی مەسـیحیەتی تەقلیـدی بگرێتـەوە. بۆچونی "کۆنت" وابوو کە زانست و ئایین دژی یەکتر نین و پێك ناکۆك نین، بەڵکو یەکتری تەواو دەکـەن. بـەلآم پێویـستە ئـاینێکی نـوێ بهێنینـە ئارا کە تەواوی مرۆڤایەتی بگرێتەوەو هەر تـەنها تایبـەت نـەبێت بـە مەسـیحیەکانی ئـەوروپا. دەبێـت ئـەم ئاینـەش بـە دوور بێـت لـە هـەموو دەمارگیری و دەستەگەرییەك.

مێژوونوسی هاوچەرخ "میشێل وینۆك" کە لـە نوسـینی بـەم باسـەماندا زۆر پـشتی پێدەبەستین، دەڵێت: (لە سەرەتادا کۆنت هەموو متمانەیـەکی بەیـەك شـت بـوو، ئـەو شـتەش زانـست بـوو. دروستبوونیـشی لـە ڕووی مەعرفییـەوە خۆبـەخۆ بـەرەو ئـەوەی دەبـرد، چونکە خۆی دەرچووی قوتابخانەی زانستەکان بـوو – واتـە پۆلێتیکنیـك – و ئـەو کاتـەی لـەو قوتابخانەیەش دەرچوو تەمەنی لە شانزە ساڵ و شەش مانگ زیاتر نەبوو. مامۆستاکانی هەر لە سەرەتاوە نیشانەی بەهرە و بلیمەتیان تیا بەدیکرد و لەناو هاوپۆلەکانیدا بە زیرەکترین خوێنـدکار دەستنیـشانیان کـرد. تەنانـەت هاوڕێکـانی قوتابخانەشـی سـەرەڕای بـچوکی تەمەنی، بە فەیلەسوف بانگیان دەکرد. بەلآم بـەهۆی ئـەو هـەراو کێـشە سیاسـیانەی لـە قوتابخانەکـەدا ڕویانـدا، دەسـەلآتدارانی ناچـار کـرد کۆتـایی بـە خوێنـدن بهێـنن لەوێـداو خوێندکارەکانیشی دەربکەن، لەبەرئەوە ئۆگست کۆنـت نـەیتوانی خوێندنەکـەی تـەواو بکـات و بڕوانامـەی مامۆسـتایەتی بەدەسـت بێنێـت. ئەمـەش بـە درێـژایی ژیـانی دەبێتـە گرێیـەکی گەورە بۆی و لە ڕووی مادی و بژێوییەوە زیانی زۆری لێـدەدات. بـەلآم ئـەم پەراوێزکەوتنـە ناچارییە، بۆ ئەو سودێکی زۆری هەبوو تا خۆی بۆ فۆرمەلە کردنی فەلسەفەکەی بەشێوەیەکی تـازە و دوور لـە دەسـتێوەردانی زانکـۆ تـەرخان بکـات. دوای دەرکردنـی لـە خوێنـدن، گەڕایـەوە

شــارەکەی خــۆی کــە مۆنپیلێیــەو لەســەر کــەنارەکانی دەریــای ســپی ناوەڕاســتە، بــەڵام نەیتوانی زۆر تیایدا بمێنێتەوە، چونکە پاریس بــە شــانۆکانی و زانــست و هونــەر و کیــژە قەشــەنگەکانیەوە، فریــوی دەدا و پەلکێــشی دەکــرد، لەبەرئــەوە جــارێکی تــر رویکــردەوە پاریس و لەسەر ئەو وانە تایبەتیانە دەژیا کە بە خوێنــدکارەکانی دەوتــەوە. جێــی باســە کۆنــت وانــەی ماتمــاتیکی دەوتــەوە. لــە ســاڵی 1817 ڕوداوێکــی گــرنگ لــە ژیانیــدا روودەدات کــە ئاشــنایەتی پەیــدا کردنیــەتی لەگــەڵ ســان ســیمۆنی فەیلەســوفدا. ســان ســیمۆن لەگــەڵ ناسینیدا دەستبەجێ دەیهێنێتە ناو ستاڤی ئەو گۆڤــارەی بــەناوی پیــشەسازییەوە دەریــدەکرد. کۆنــت لــەو ســەرەتای لاویەتیەیــدا بــە بلیمــەتی سانسیمۆنی مامۆستای کە تەمەنی لە پەنجاو حــەوت ســاڵی تێپەڕانــدبوو، زۆر سەرســام بــوو. هاوکات هەر لەو کاتەشەوە درکی بەوە کرد کە بۆچونی هاوبەشیان لەسەر ئایدیا سەرەکیەکان هەیــە و بــەمجۆرە بەیەکدی سەرسام بوون. لــەو بــیرو بۆچــونانەی ڕای هاوبەشــیان هــەبوو لەســەری، ئەمــە بــوو: مــرۆڤ دوای ئــەوەی لــە هــەژمونی تیۆلۆژیــای کــۆن و پیــاوانی ئــایینی مەسیحی رزگــاری بــوو، خــۆی بــووە ســەنتەری گــەردون و چــارەنووس و بڕیــار کەوتــە دەســت خــۆی. لێــرەوە ئــیتر ئــەو دەســەڵاتە تیۆلۆژیــە کۆنــەی پــێ قبوڵنــەدەکرا کــە لــە دەرەوەڕا یــاخود لە سەرەوە بە سەریدا دەسەپێنرا، وەکو ئەوەی بە درێــژایی چــەندین ســەدە لــە ئــارەدا بــوو. ئەو کات مرۆڤی ئەوروپایی هەستیکرد پێویستی بە مۆراڵێکی نوێ و سیاسەتێکی نوێ هەیە، هەر ئەمەشە کە بە مۆراڵ و سیاسەتی پۆزەتڤستی نــاو دەبرێــت. ســان ســیمۆن دەیــووت: پێویــستە بیریارانی ئەم سەدەیە تەواوی تواناکانی خۆیان بۆ ئەم مەسەلەیە بخەنە کار. بۆ یارمەتیدانیشی لــە گەڵاڵــەکردنی ئــەم پــرۆژە فیکریــە مەزنــەدا، ئۆگــــست کۆنـــت دایـــە پـــاڵی و کەوتـــە هاوکــاریکردنی. بــۆ مــاوەی ســاڵانێکی زۆریــش ســــکرتێر و یاریـــدەدەری بـــوو، بەرلـــەوەی پەیوەندی نێوانیــان بگۆڕێــت و ببێتــە ڕکابــەری، بــە تایبــەت دوای ئــەوەی ئۆگست کۆنت گــەورە بوو لە ڕووی فیکریشەوە بەرەو پێشچوو).

شــایەنی باســە "کۆنــت" لــەو ماوەیــەدا کــە لەگـــەڵ "ســـان ســـیمۆن"دا بەســـەری بـــرد زانیاریــەکی زۆری لــە چــەندین کایــەی جیاجیــای وەك: (فەلسەفە و سیاسـەت و ئـابووری و فیزیـا و بایۆلۆژیــا و گەردونناســی و ماتماتیــك)دا، پەیـــدا کـــرد. تـــاوای لێهـــات بـــوو بـــە ئینسکلۆپیدیایەك و ئەوەنــدە تینــوی زانــین بــوو کە تێربونی نەبوو. ساڵی 1819 لە نامەیەکدا بۆ یــەکێك لــە هاوڕێکانی دەنووسێت: (پێموایــە ئــەو ناوبانگــە زانستیەی بەدەســتم هێنــاوە، بــە هایــەکی گــەورەتر بــە بیروبۆچــونە سیاســیەکانم دەدات). لــە راستیــشدا سیاســەت بــەبێ فیکــر نرخێکی ئەوتۆی نییە. ئیتر لەو کاتەوە "کۆنت" مەســەلەکانی بــەمجۆرە دەبــینی: (فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری لە سەدەی رابردودا دەستیانکرد بە پرۆسەیەکی تێکو پێکدان، واتە تێکو پێکدانی ئەو مەعریفە تیۆلۆژیەی پیاوانی کڵێسا چەندین سەدە بە دامەزراندن و دروستکردنیەوە خەریك بوون، ئیتر کاتی ئەوە هاتووە تا لەم سەدەیەدا ســەرقاڵی بونیادنــان و دروســتکردنی شــتێکی

تازە بین). لە یەکێك لە لێدوانە بەناوبانگەکانیدا دەڵێت: (ئەو شتەی لەمرۆداو بۆ یەکەمجار لە مێژودا رووبەڕومان دەبێتەوە ئەوەیە کە زەوی بێنینە جێی ئاسمان و واقیعیش لە شوێنی غەیبانیەت دابنێین. چ بلیمەتێك هەیە درك بەوە نەکات کە ئەمە ئەرکی سەرەکی ئەم رۆژگار و سەردەمانەمانە؟).

لێرەدا ئێستێك دەکەم و دەڵێم: (ئەم قسانە بریتیە لە ناوەرۆکی مۆدێرنەی خۆرئاواو هەر ئەمەشە وا دەکات کە ئێمەی خۆرهەلأتی توشی شۆك بکات، چونکە لە ناوبردنی ترانسندنتال و غەیبانیەت و شیعر وامان لێدەکات هەستبکەین تەنها و بێکەسین و وادەزانین بەنرخترین شتی بوونمان لەدەست داوە. لە ڕاستیشدا ئێمە لەم بۆچونەشماندا بە هەڵەدا نەچووین، چونکە مۆدێرنەی پۆزەتڤیزم گەرهاتوو بەدوا قۆناغی خۆی گەیشت، ئەوا بەرەو ئەقڵیەتیەکی تەکنۆلۆژی سارد و سڕی وا دەچێت کە نە سۆزی تێدا دەبێت و نە بەزەیی. هەر ئەمەشە توشی شۆك و حەپەسانمان دەکات، کاتێك کە بۆ یەکەمجار دێینە خۆرئاواوە. ئەمەش لە ئێستادا بۆتە یەکێك لە خەسڵەتەکانی شارستانیەتی خۆرئاوا، شارستانیەتێك کە زیاد لە پێویست بابەتگەرا و وشك و برنگە). لەبەرئەوەیە فەیلەسوفانی ئەمڕۆی خۆرئاوا، لە هەولی ئەوەدان ئەم کەم و کوڕی و لادانە لە بونیادی مۆدێرنەی خۆرئاوادا چارەسەر بکەن. دەتوانین بڵێین شارستانیەتی مۆدێرن، دەسکەوتە تەکنۆلۆژیەکانی زۆر لە دەسکەوتە ڕوحیەکانی گەورەترە، یاخود بە جۆرێکی تر ئەو پێشکەوتنەی لەسەر ئاستی پیشەسازی و تەکنۆلۆژی و زانستی و پزیشکی ڕویدا، بەرەو پێشچونێکی هاوشێوەی ئەوە لەسەر ئاستی ڕوحی و ئەخلاقی دروست نەبوو. بێگومان گەورەترین خاڵی لاوازیی مۆدێرنەی خۆرئاواش لێرەدایە.

بالێرەدا زۆر لە بابەتەکەمان دوور نەکەوینەوەو بێینەوە سەر قسە و باسەکانمان لەمەڕ "ئۆگست کۆنت" و چۆنیەتی دروستبوونی مۆدێرنەی تۆزەتڤستی لەسەرەتاکانیدا. "کۆنت" دوای ئەوەی چەند وتارێکی لە گۆڤارەکەی "سان سیمۆن"دا بلأوکردەوە، توانی لەو گۆشەگیرییەی بێتە دەرێ و تۆزێك ناوبانگ پەیدا بکات، لەم کاتەشدا تەمەنی هەر بیست و چوار ساڵێك دەبوو. هەر لەو قۆناغەدا لێکۆڵینەوەیەکی درێژی بەناوی: (بەرنامەی کارە زانستیە پێویستەکان بۆ سەرلەنوێ رێکخستنەوەی کۆمەڵگە) بلأوکردەوە. لەم لێکۆڵینەوەیەدا رەگوریشەی تەواوی ئەو بیروبۆچونانە دەبینین کە دواتر "کۆنت" باسیان لێدەکات. لەو لێکۆڵینەوەیەیدا دەڵێت: (دەبێت بە یەکجارەکی خۆمان لە سستمی مەسیحی – فیودالی کۆن ڕزگار بکەین و سستمێکی نوێ بێنینە ئارا کە لەسەر زانست و پیشەسازی و تەکنۆلۆژیا دامەزرابێت. بەلأم ئەو ئاقارە رەخنەییە روخێنەرەی پاشماوەی سەردەمی رۆشنگەری و شۆڕشی فەرەنسییە، تا ئێستاش رێگرە لەبەردەم ئەوەی کار بەم ئەقڵیەتە بونیادنەرە تازەیە بکرێت، بەلأم خۆ ناکرێت ئێمەش تا ئەبەد هەر لەسەر رەخنەو روخاندن بژین. بۆیە دەبێت ئەو ڕەهەندە روخێنەرەی شۆڕشی

فەرەنسی جێبهێڵین، بۆ ئەوەی دەست بە قۆناغی ئاوەدانکردنەوەو بونیادنان و ڕێکخستنەوەو دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤ بکەین). ئەو کات "کۆنت" بۆیەکەمجار تیۆریا بەناوبانگەکەی خۆی بەناوی فەلسەفەی مێژووەوە ڕاگەیاند و تیایدا باس لەوە دەکات کە مێژووی مرۆڤایەتی بەسێ قۆناغدا تێپەڕیووە:

-قۆناغی تیۆلۆژی.

-قۆناغی میتافیزیک.

-قۆناغی زانستی (یان پۆزەتڤیزم) کە پێشکەوتوترین قۆناغی مرۆڤایەتیە.

ئەمە ئەو کەشفە مەعریفیە گەورەیە بوو کە هەر لە سەرەتای تەمەنیەوە، "کۆنت"ی بەخۆیەوە خەریك کردبوو. وەکو ئاشکراشە ئەم تیۆریایە دەبێتە تەوەری سەرەکی تەواوی نوسین و پرۆژە فیکرییەکەی.

* * * * * *

"کۆنت" ئەگەرچی هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ "سان سیمۆن"ی مامۆستای ناکۆکی کەوتە نێوانیان، بەڵام دەستبەجێ پەیوەندی لەگەڵدا نەبڕی و لێی جیانەبووەوە. ئاشکرایە هەموو قوتابیەکی لێهاتوو ڕۆژێك دێت لە مامۆستاکەی هەڵدەگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی ڕێگای خۆی هەڵبژێرێ و شتێکی تازە بێنێتە ئارا. ئەمەش بۆ خۆی سونەتی ژیان و یاسای گەردونە. شایەنی باسە سەروەختێك "سان سیمۆن" هەوڵی ئەوەی دا خۆی بکوژێت، "کۆنت" دەستبەجێ گەیشتە لای و کەوتە دڵدانەوەی. لێرەدا کەمەکێك ڕادەوەستین تا بپرسین: چۆن دەبێت باوەڕ بە فەیلەسوفێك بکەین کە خۆی بکوژێت یاخود هەوڵی خۆ کوشتن بدات؟ فەیلەسوفێکی وا چۆن دەتوانێت، پرۆژەیەکی شارستانی بۆ خۆرئاوا فۆرمەلە بکات؟ لێرەشدا ڕووم بە شتگەلێکی تردا تەقی لە خۆرئاوا، کە بێئاگابووم لێیان. ئێمە لە جیهانی ئیسلامیدا بە سوك سەیری ئەو کەسانە دەکەین کە پەنا بۆ خۆ کوشتن دەبەن و گەر هەوڵێکی وا بدەن ئەوا هەموو کارەکانی پێشوویان دەسڕینەوە، بەڵام لە خۆرئاوا بۆچونێکی دیکەیان هەیە، چونکە بیریارانیش بێهەڵەو کەموکوڕی نین و خاڵی لاوازی خۆیان هەیە. تەنانەت ئەو دەسکەوتە مەعریفیانەشی بەدەستی دێنن، شێوەیەکە لە شێوەکانی پڕکردنەوەی ئەو کەموکوڕیانە و قەرەبوکردنەوەیەکی خاڵە لاوازەکانیانە. دواجار دەشبینین "ئۆگست کۆنت" خۆیشی دوچاری کێشەی دەروونی قوڵ دەبێت و زیاد لە جارێك لە سنورەکانی شێت بوون نزیك دەبێتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەس گومانی لەوە نییە کە یەکێکە لە گەورە فەیلەسوفان! هەروەها چەندین نمونەی دیکەی لەو جۆرەمان هەیە، وەك: "نیتشە و میشێل فۆکۆ و ئالتۆسێر و... هتد".

هەرچۆنێك بێت کێشە و ناکۆکیەکان لە نێوان قوتابی و مامۆستاکەیدا دەستی پێکرد، لەبەرئەوەی مامۆستا بەردەوام قوتابیەکەی بە منداڵ دەزانێت و وەکو باوکێك نارەحەت دەبێت گەر بزانێ کوڕەکەی گەورە بووەو دەیەوێت سەربەخۆ ڕەفتار بکات. سەرەڕای ئەوە "سان سیمۆن" ئەوەی بیری لێدەکردەوەو بە گرنگی دەزانی گۆڕینی دام و دەزگاکان بوو، لە کاتێکدا "ئۆگست کۆنت" بەر لە هەر شتێك بیری لە

گــۆڕینی بیروبــاوەڕ و ئایــدیاکان دەکــردەوە. لێرەوە "کۆنت" دەستیکرد بە دۆزینەوەی ئەو یاسایانەی ئاڕاستەی گەشە و بەرەو پێشچونی رەگەزی مرۆڤایەتی دەکەن. لەمبارەیەوە ئەو پێیوابوو: (ئەو یاسایانەی ئاڕاستەی مرۆڤ دەکەن، هاوشێوەی ئەو یاسایانەن کە جڵەوی جیهانی فیزیکی یاخود مادی دەکەن).

ئەمە وایلێکرد باس لە فۆرمەلەبوونی زانستێکی نوێ بکات بە ناوی (فیزیای کۆمەڵایەتیەوە)، بەرلەوەی بگاتە دۆزینەوەی چەمکی سۆسیۆلۆژیا واتە کۆمەڵناسی. یەکێك لە تایبەتمەندییە سەرەکیەکانی مۆدێرنەی خۆرئاواش، لێرەدایە. ئەمەش تایبەتمەندییەکە کە لەگەڵ تێگەیشتنی ئێمەی خۆرهەڵاتیدا ناکۆکە. بەڵام بۆچی؟ لەبەرئەوەی مرۆڤ کورتدەکاتەوە بۆ یاساگەلێکی زانستی و چەند هاوکێشەیەکی ماتماتیکی.. بەمجۆرە ئەو وێنە ئایدیالیە قەشەنگە لەبەر مرۆڤ دادەماڵن کە لە ڕابردووەوە بۆمان ماوەتەوە و بەمەش مرۆڤ دەبێتە تەنێکی مادی و ژمارەیەك لە کۆمەڵگەدا. ئەم دیاردەیە لە خۆرئاوادا زۆر توشی شۆکی کردم و بۆمن کێشەیەك بوو کەنە تێیدەگەیشتم و نەبۆم چارەدەکرا، تا ئەوکاتەی دەستم بە خوێندنەوەیەکی قوڵکرد دەربارەی چۆنیەتی دروستبونی مۆدێرنەی خۆرئاوا. بۆ ئەوەی لە هۆکارەکانیش تێبگەم، زیاد لە بیست دانە ساڵم ویست. پوختەی ئەو تێگەیشتنەش، ئەم وتار و لێکۆڵینەوانەیە کە لێرەدا بەرچاویان دەخەم..

بەهەرحاڵ پرۆژە زانستیەکانی "ئۆگست کۆنت"، دوچاری تێکچون و پشێوی هاتن، ئەویش بەهۆی ناجێگیری ژیانی لە ڕوی سۆزدارییەوە. ساڵی 1825 سۆزانییەك دەناسێت و دەیهێنێت. "کۆنت" لەبەرئەوەی پیاوێکی ناشیرین بوو، بۆیە بەزەبری پارە نەبوایە نەیدەتوانی سەرنجی هیچ ئافرەتێك بەلای خۆیدا ڕابکێشێت.. ئەم شتەی بە ئاشکرا لەو وەسیەتنامەیەدا نووسیبوو کە لە دوای مردنی دۆزرایەوە. سەروەختێك ئەو ئافرەتەی هانی، پێیوابوو تاهەتایە پێکەوە دەبن و ئەویش خۆی بە قەرزارباری دەزانێت، لەبەرئەوەی لە پیشەی لەشفرۆشی رزگاریکردووە. بێئاگا لەوەی کە کێشەی گەورە و ڕاستەقینە دوای ئەوە روودەدات. ئەو ئافرەتەی هێنابووی ناوی "کارۆلین ماسان" بوو، خانمێکی قەشەنگ و جوان بوو. دوای ئەوەی بووە هاوسەری "کۆنت"یش، دەستبەرداری دۆستە کۆنەکەی نەبوو. تەنانەت مێردەکەشی ناچار کرد سەردانی ماڵەوەیان بکات و پێشوازیشی لێبکات. "کۆنت" دەیزانی هاوسەرەکەی خیانەتی لێدەکات و لەگەڵ دۆستەکەیدا پێکەوە دەخەون! ئەمە تەواو سەر شێتی کرد و ئەقڵی لەدەستدا. ساڵی 1826 دوچاری قەیرانێکی دەرونی قوڵ هات. ئەم روداوەش بە رۆژی روناك و لەبەرچاوی خەڵك و خوادا ڕویدا، کاتێك وانەی دەربارەی فەلسەفەی پۆزەتڤستی دەوتەوە. لە نێو ئامادەبوانی ئەو شوێنەدا کەسایەتی بەناوبانگی تێدا بوو، لەوانەش ئەندامانی ئەکادیمیای زانست و چەند فەیلەسوفێکی ناسراوو گرنگ.

ئەوەی سەیر بوو لەو روداوەدا ئەوەبوو: "کۆنت" لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدا کەوت و بورایەوە، پاشان بە هۆش خۆیدا هاتەوەو کەوتە

وڕێنەکردن و قسەی بێسەر و بەر!.. لە پای ئەمەدا ڕەوانەی یەکێك لە نەخۆشخانە دەرونیە گەورەکانی فەرەنسا کرا و بەناوبانگترین پزیشکەکانی ئەویّ چاودێری چارەسەرکردنیان دەکرد. ماوەی حەوت مانگ و نیو لەو جێگەیەدا مایەوەو چەندین چارەسەری بۆ دانرا، بەلاّم ئاکامی نەبوو. لەگەڵ درێژەکێشانی نەخۆشیەکەیدا، هاوسەرەکەی زوو زوو هەڵدەکوتایە سەری لە نەخۆشخانەکەدا و بەبیّ هیچ مۆڵەت وەرگرتنێکیش لە پزیشکەکان، پەلی دەگرت و دەیبردەوە بۆماڵەوە. جارێك لەو جارانە سەیردەکات قەشەیان هێناوە بۆئەوەی ڕێورەسمی ژن هێنانەکەی بە شێوەیەکی شەرعی و بەپێی داب و نەریتی ئایینی مەسیحی ئەنجام بدەن. ئەم کارەش دایکی کردبووی، لەبەرئەوەی ژنێکی کاتۆلیکی زۆر ئیماندار و لەخوا ترس بوو. هەروەها دایکی پارەی نەخۆشخانەکەی بۆدا، هەرچەندە چاکیش نەبوو بووەوە. بەلاّم ئاخۆ ڕۆژێك دێت "ئۆگست کۆنت" تەواو چاك بێتەوە؟ لە ڕاستیدا دوای ئەوە زیاد لە جارێکی تر توشی ئەو حاڵەتە دەبێتەوەو تەنانەت لە ساڵی 1827 هەوڵی خۆکوشتن دەدات، کاتێك دەیەوێت خۆی لەسەر یەکێك لە پردەکانی سەر ڕوباری سینەوە فڕیّ بداتە خوارەوە، بەلاّم لەو کاتەدا بە ڕێکەوت پۆلیسێك لەو ناوەدا دەبێت و پەلاماری دەدات و ناهێڵێت ئەو کارە بکات. ئەوەی زۆر سەیرە ئەوەیە دوو ساڵ دوای ئەوە هێز و توانای ئەقڵی بۆ دەگەڕێتەوە و وای لێدێت بتوانێت لە ماڵەکەی خۆیدا دەست بە وتنەوەی وانەکانی بکاتەوە، دەربارەی فەلسەفەی پۆزەتڤیزم. ئەو فەلسەفەیەی بە درێژایی سەردەمی پیشەسازیو تەنانەت تا ساتەوەختی ئێستاشمان، بەسەر ئەقڵیەت و بیرکردنەوەی خۆرئاواو خۆرئاواییەکاندا زاڵە.

دوایین بەشی فەلسەفەی پۆزەتڤیزم (واتە بەشی شەشەم)، لە ساڵی 1842 دا بلاّوکرایەوە. تەواوی ئەو بەشانە هەموو ئەو بوار و زانستانە دەگرێتە خۆی کە لە سەردەمی "ئۆگست کۆنت"دا لە ئارەدا بوون. واتە دەتوانین بڵێین ئەو شەش بەشەی فەلسەفەی پۆزەتڤیزم کە لە نوسینی "کۆنت"ە، پوختەی فیکر و ئەو سەردەمەیە کە تیایدا ژیاوەو تەواوی زانستە سەرەکیەکان لە خۆ دەگرێت، وەك: (ماتماتیك و فیزیا و کیمیا و بایۆلۆژیا و گەردون و..هتد)، بەلاّم نیوەی وانەکان تەرخان بوو بۆ (فیزیای کۆمەلاّیەتی)، واتە بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگە. لە پێشەکی گشتی ئەم کتێبە گەورەیەدا، "کۆنت" بە دوور و درێژی باس لە تیۆریای سیّ قۆناغەکەی پەرەسەندنی مرۆڤایەتی دەکات. ئەو تیۆریایەی کە لە دنیای فیکردا ناوبانگی زۆری بۆ پەیدا کرد. دەربارەی ئەو سیّ قۆناغە دەڵێت: (هەریەکێك لە بۆچونە سەرەکیەکانمانو هەموو لقێك لە لقەکانی مەعریفە دوا بە دوای یەك و پلە بە پلە بە سیّ قۆناغی تیۆری جیاجیادا تێدەپەڕن. قۆناغی یەکەم، قۆناغی تیۆلۆژیە و دووەمیان، بریتییە لە قۆناغی میتافیزیا و سێهەم قۆناغیش، قۆناغی زانستی یان پۆزەتڤستیە. ئەم سیّ قۆناغەش، سیّ جۆر فەلسەفەی لێدەکەوێتەوە. لە قۆناغی تیۆلۆژیدا، مرۆڤ هەوڵدەدات هۆکارەکانی سەرەتاو ئاکام و مەبەستەکانی

ئاخیرەت لێکبداتەوە و تێیان بگات. مرۆڤ لەم قۆناغەدا پێیوایە دیاردە سروشتیەکان بەرەنجامی هێزە لەبن نەهاتووەکانی سروشتە و کاریگەری ئەو هێزانەش راستەوخۆ و بەردەوامە. هەروەها مرۆڤی ئەم قۆناغە لەو بڕوایەدایە کە تەواوی گەردون ملکەچی خواستوویستە هەڕەمەکیەکانی ئەو هێزانەیە. لەم دۆخە سەرەتاییانەشدا، ئامانجی کۆمەڵگە پاوانخوازیو پەلوپۆهاویشتنە لە ڕێی شەڕو پەلاماردانەوە. دەزگاو دامەزراوەی ناوەندی کۆمەڵگەش، لەسەر سستمی کۆیلایەتی دروست دەبێت. پاشان دوای ئەمە مرۆڤایەتی کەمەکێك بەرەو پێش دەچێت و پێدەنێتە قۆناغی میتافیزیکەوە، واتە مرۆڤایەتی قۆناغی تیۆلۆژیا بەجێدێڵێت و داخڵ بە قۆناغی میتافیزیك دەبێت. دواجار و دوای تێپەڕاندنی ئەم دوو قۆناغە، مرۆڤایەتی دەچێتە قۆناغی سێهەم کە قۆناغی پۆزەتڤیزمە. لەم قۆناغەدا بەرەو پێشچونی زانست و پیشەسازی دەبینین و ئیتر پرسیاری مرۆڤ بەوەوە گیر ناخوات کە بڵێت: لە کوێوە دێین و بەرەو کوێ دەچین؟ یان سەرقاڵی ئەوە بێت بەدوای ڕەچەڵەکی گەردون و ئاکام و مەبەستی ژیاندا بگەڕێت، بەڵکو لە هەوڵی ئەوەدا دەبێت کە لە ڕێی ئەرگیومێنتی ئەقڵانی و تێبینیکردنی واقیع و ئەزمونکردنی ژیانەوە، لەو یاسایانە بگات کە جڵەوی دیاردەکانی ناو گەردون دەکەن. شایەنی باسە ژیانی تایبەتی و شەخسی مرۆڤ، ڕەوتی ژیانی مرۆڤایەتی نیشان دەدات. ئەوەتا کۆنت بۆ خۆی دەڵێت: کێ لە ئێمە ئەوەی لە بیر نییە کە لە قۆناغی منداڵیدا تیۆلۆژی بووە و لە لاوێتیدا میتافیزیکی و لە سەردەمی کامڵبونیشیدا پۆزەتڤستی بووە).

-2-

هەموو ئەو پێشکەوتنەی لەسەرجەم کۆمەڵگەکانی خۆرئاوادا بە چاوی خۆمان دەیبینین ، بەرهەمی فەلسەفەی پۆزەتڤیزمە کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا گەشەی سەند. ئەم فەلسەفەیە بڕوای تەواوی بەوە هەبوو کە دەبێت ئەقڵ و زانست، ڕابەرایەتی مرۆڤایەتی بکەن بەرەو شارستانیەت و پێشکەوتن و مەدەنییەت.. لێرەوە پێویستە ئەقڵ و زانست، شوێن بە تیۆلۆژیای مەسیحی تەقلیدی چۆڵ بکەن کە بووە مایەی هێنانە ئارای دادگاکانی پشکنین و دواکەوتویی کۆمەڵگە لە هەموو ڕویەکەوە. گەر بێتو ئەم خاڵە بەهێند نەگرین، ئەوا هەرگیز لە ناوەرۆکی مۆدێرنەی خۆرئاوا تێناگەین و نازانین چۆن چۆنی مامەڵەی لەگەڵدا بکەین یاخود چۆن بکەوینە دیالۆگکردن لەگەڵیدا.

فەلسەفەی پۆزەتڤیزم کە هاوشانی هاتنە پێشی شۆڕشی پیشەسازی بوو لە خۆرئاوا، بڕوای وابوو دەبێت زانست جێگەی ئایین بگرێتەوە. ئەم متمانەکردنەش بە زانست و تەکنۆلۆژیا لەو ڕۆژگارەدا ڕەهاو بێسنور بوو. بەڵام دواتر هەندێ ڕوداوو گۆڕانکاری ڕوودەدەن، ئەوە دەخەنە ڕوو کە زانست هەمووی خێر و چاکە نییە، بەڵکو هەندێ جار ڕووی نێگەتیڤ و زیانبەخش و وێرانکەریشی هەیە. بالێرەدا گەر بۆ چرکەساتێکیش بووە بیر لەو بۆمبە ئەتۆمیە بکەینەوە کە درا بەسەر

هێرۆشیما و ناکازاکیدا یان بیر لە چەکە کۆکوژەکان یاخود لە بەکارهێنانەکانی زانستی بۆماوە بکەینەوە کە دەیەوێت رووەك و ئاژەڵ و تەنانەت مرۆڤیش کۆپی بکات!.. زانستیش وەك ئایین وایە، رەنگە بۆ کاری چاکە بەکاربهێنرێت و ڕەنگە کاری خراپەشی پێبکرێت. بەڵام لەو سەردەمەدا، واتە لە سەردەمی "ئۆگست کۆنت" و "سان سیمۆن"ی مامۆستایدا، ئەم شتانە هەرگیز بە خەیاڵی هیچ کەسدا نەدەهات. زانست ئامانجی ڕەهای هەموان بوو، دەیانویست لەڕێی زانست و ئەقڵەوە، لە کۆمەڵگەی کشتوکاڵی، فیوداڵی، ئسوڵی، دواکەوتوو رزگاریان بێت و بچنە ناو سەردەم و رۆژگاری پیشەسازی و تەکنۆلۆژی پێشکەوتووەوە.

لەو سەردەمانەدا مرۆڤی ئەوروپی تینووی ئەوە بوو، لە هەموو رووییەکەوە پێشبکەوێت و لەسەر هەموو ئاستەکان هەنگاو بنێت. خەونی بەوەوە دەبینی بگاتە سەردەمێکی پڕ خێرو خۆشی وا کە هەژاری و برسیەتی و نەخۆشی تێدا نەبێت. وای دەزانی بەرەو پێشچونی بواری پزیشکی دەتوانێت، هەرچی دەرد و نەخۆشیە بنەبڕی بکات و چارەسەریش بۆ هەموو پەتاکان بدۆزێتەوە. بەڵام "ئۆگست کۆنت"ی دامەزرێنەری فەلسەفەی پۆزەتڤیزم و لە ژێر کاریگەری "سان سیمۆن"ی مامۆستایدا، هەر بە تەنها بڕوای بە پێشکەوتن نەبوو، بەڵکو گرنگی زۆریشی بە بونی ئارامی و بەرقەراربوونی یاسا دەدا. "کۆنت" پێیوابوو پێشکەوتن کە مەبەست لێی گواستنەوەو هەنگاونانە لە دۆخێکی دواکەوتووەوە بۆ دۆخێکی پێشکەوتوو، نابێت مانای پشێوی و نائارامی بگەیەنێت. ئەو شتەی "کۆنت" بە گەرمی سەرقاڵی بوو، ئەو مەسەلەی پشێوی و نائارامیە سیاسی و کۆمەلاّیەتیە بوو کە لەدوای شۆڕشی فەرەنسیەوە دروست بووبوو. دەیویست قۆناغی شۆڕش و وێرانکاری کۆتایی پێبێنێت و دەست بە قۆناغی ئاوەدانکردنەوەو سستماتیزەکردنی کۆمەڵگە بکات، گرنگی و گەورەییشی لێرەدایە.

"کۆنت" وەکی هەموو مەزنە فەیلەسوفێك تەنها هەر بیر لە بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆی ناکاتەوە، بەڵکو بیر لە بەرژەوەندی گشتیش دەکاتەوە. هەر لەبەر ئەمەش بوو بە درێژایی ژیانی هەژار و نەدار بوو، ئەگەر یارمەتی چەند هاوڕێیەکی و ئەو کەسانە نەبوایە کە هەواداری بوون، ئەوا ڕەنگە لە تاو برسیەتی و نەبوونی بمردایە. "کۆنت" ئەوەندە بە بەرژەوەندی گشتیەوە سەرقاڵ بوو، خەریك بوو خۆی و گوزەرانی خۆی بیردەچووەوە. ئەو پێیوابوو سۆسیۆلۆژیای پۆزەتڤستی دەبێت دوو شت پێکەوە کۆ بکاتەوە، بۆئەوەی کاروبارەکانی کۆمەڵگە بە چاکی بەڕێوە بچێت. ئەو دوو شتەش، پێشکەوتن و سستمە. لەمبارەیەوە قسەیەکی هەیە دەڵێت: (هیچ سستمێکی شەرعی دروست نابێت و ناتوانێت بەردەوام بێت، گەر بە تەواوەتی لەگەڵ پێشکەوتندا نەگونجێت و کۆك نەبێت، بەلاّم هیچ پێشکەوتنێکیش ڕونادات گەر نەبێتە مایەی چەسپاندنی یاسا و دامەزراندنی سستمێکی شەرعی و هێنانە ئارای دۆخێکی ئارام و سەقامگیر). "کۆنت" مەسەلەکانی

بەمجۆرە دەبینی: (دوای قۆناغی نێگەتیڤ کە پێویستە بۆ شۆڕش و بۆ ژێرەو ژوورکردنی سستمی پێشوو، پێویستمان بە قۆناغی پۆزەتیڤ هەیە کە قۆناغی ئاوەدانکردنەوەو ڕێکخستنەوەی کۆمەڵگایە.. خۆ ناکرێت فەرەنسا هەموو تەمەنی بە شۆڕش و کۆدێتا بەڕێ بکات، بەڵام بەر لە فۆرمەلەکردنی سیاسەتێکی نوێ، پێویستە لەسەرمان و بەر لە هەر شتێ لە واقیع تێبگەین و پێی ئاشنابین، ئەو کات سیاسەت پشتئەستوور دەبێت بە مەعریفەیەکی زانستی دروست دەربارەی پێکهاتەی کۆمەڵگە).

لە ڕاستیدا "کۆنت" میتۆدی ئەزمونگەری لە کایەی زانستە فیزیاییەکانەوە گواستەوە، بۆ ئەوەی بەسەر خودی کۆمەڵگە و تەواوی دیاردە ئینسانیەکاندا پراکتیزەی بکات. یەکێك لە خەسڵەتە سەرەکیەکانی فەلسەفەی پۆزەتڤستیش لێرەدایە کە فەلسەفەیەکی زانستی وردە و تەنها بڕوای بە یاسا فیزیاییەکان و ژمارە و هاوکێشە ماتماتیکیەکان هەیە. فەلسەفەی پۆزەتڤستی فەلسەفەیەکە عەشقی ئەوەیە پەی بە یاساکان بەرێت، ئیتر ئەو یاسایانە بێت کە ئاراستەی دیاردە سروشتی و فیزیاییەکان دەکات یاخود ئەو یاسا و ڕێسایانە بێت کە جڵەوی هەڵسوکەوت و بیرکردنەوەی مرۆڤەکان دەکات. "کۆنت" لەو باوەڕەدا بوو کە تەواوی مرۆڤایەتی بەرەو قۆناغی پۆزەتڤیزم و زانستی پەتی دەڕۆن، بەڵام هەموویان پێکەوەو لەیەك کاتدا پێی ناگەن، ئەوەی بۆری میللەتانی تر دەداتەوە لەم پرۆسەیەدا گەلانی ئەوروپایی و خۆرئاوایین.

سەرەڕای بلیمەتی و لێهاتووی زۆری، بەڵام وانەکانی "کۆنت" دەربارەی فەلسەفەی پۆزەتڤیزم، سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێناو نەیتوانی لەناو توێژێکی دیاریکراوی بچوکدا نەبێت، شوێنی خۆی بکاتەوە. شەش بەرگی کتێبەکەی لەمەڕ فەلسەفەی پۆزەتڤیزم، لە کاتی دەرچوونیدا زۆر بە سارد و سڕی پێشوازی لێکرا. بە پشت بەستن بەم ڕاستیانە دەتوانین بڵێین: (کۆنت تا لە ژیاندا بوو ئەوەندە بەناوبانگ نەبوو، ناوبانگ پەیداکردنی دوای مردنی دەستی پێکرد). ڕاستە هەندێ زانا و گەورە ڕۆشنبیران دەیانناسی، بەڵام خەڵکی بە گشتی دوای مردنی نەبێت نەیانناسی و پێی ئاشنا نەبوون.

"کۆنت" دەست کورت و گۆشەگیر بوو، "کارۆلین"ی خێزانیشی بەردەوام سەرزەنشتی دەکرد، لەبەرئەوەی نەیتوانی خۆی بۆ پۆستی مامۆستای زانکۆ کاندید بکات. با ئێستا ئەو حاڵەتە سەیرە بێنینە بەرچاوی خۆمان کە بە ئەقڵدا ناچێت: (ئۆگست کۆنت کە گرنگترین فەیلەسوفی سەردەمەکەی خۆیەتی و یەکێکە لە نوێخوازە مەزنەکان، مامۆستای زانکۆ نییە، کەچی دەیان خەڵکی ئاسایتر مامۆستای پایە بڵندن لە زانکۆکانی فەرەنسا!!..). بەڵامساڵی 1841 لە ناکاو هەواڵێکی دڵخۆشکەری پێدەگات کە تینووتاوی دەداتێ، ئەویش ئەوەیە نامەیەکی لە فەیلەسوفی گەورەی بەریتانی "جۆن ستیوارت میل"ەوە پێدەگات و تیایدا باس لە سەرسامی خۆی دەکات بەرامبەر تێزەو تیۆرەکانی لەمەڕ فەلسەفەی پۆزەتڤیزم. لەو نامەیەدا "میل" دەڵێت: (خۆم بە بەختەوەر

دەزانم کە بەرهەمەکانی ئێوەم موتالاکرد و پێموایە یەکێکە لە بەرهەمە بەرز و نایابەکانی فەلسەفەی مۆدێرن). تۆ بڵێی ئەمە سەرەتای دانپیانان بێت بە بەهرەو لێهاتووی ئەودا؟ ئایا بەرهەمی بلیمەتی و ئەو رەنجە زۆرەی دەچنێتەوە، دوای ئەو هەموو چاوەڕوانییە؟

ئەوەی ڕاستی بێت کامەرانی و بەختەوەریەکەی زۆری نەخایاند. ئەوەندەی نەبرد "کارۆلین"ی خێزانی وازی لێهانی و بە یەکجاری ماڵی بۆ بەجێهێشت! شایەنی باسە پێشتریش هاوسەرەکەی چەندین جار ڕۆیشتبوو، دەرۆیشت و پاش ماوەیەك دەگەڕایەوە، بەڵام ئەمجارەیان ناگەڕێتەوە. دوای جیابونەوەشیان "کارۆلین" چەند ساڵێك نامەی بۆ دەنارد و ناوبەناویش ئامادەی وانەکانی دەبوو لە پاریس. وەك گوێگرێکی ئاسایی لەگەڵ ئامادەبواندا دادەنیشت. لەلایەکی ترەوە زانکۆکانی فەرەنسا هەموو داواکارییەکانی "کۆنت"یان ڕەتدەکردەوە، بۆ ئەوەی ببێتە پرۆفیسۆر و لە زانکۆدا وەربگیرێت، هەموو جارێك دووچاری نائومێدی دەهات و هەستی دەکرد نە ڕێزی دەگیرێت و نە نرخی دەزانرێت. ساڵی 1843 لە فەرمانبەریش دەردەکرێت و بێ موچە دەمێنێتەوە. ئەمە ناچاری دەکات پەنا بۆ فەیلەسوفی بەریتانی "جۆن ستیوارت میل" بەرێت، ئەویش زۆر جوامێرانە بە دەنگ داواکەیەوە دەچێت، پارەیەکی زۆری بۆ کۆدەکاتەوەو بۆی ڕەوانە دەکات و تا مردن لەسەر ئەو پارەیە دەژی.

ساڵی 1844 ژیانی "کۆنت" لە سەر ئاستی فیکری گۆڕانێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی. دوای ئەوەی لە ڕێی کتێبە قەوارە گەورەکەیەوە (چەند وانەیەك دەربارەی فەلسەفەی پۆزەتڤیزم)، زانستە ئینسانیەکانی دامەزراند، خۆی بۆ ئەرکێکی تر تەرخانکرد کە ئەویش نوسینی کتێبێك بوو بە ناونیشانی: (سستمی سیاسەتی پۆزەتڤیزم). مەبەستی لە نوسینی ئەم بەرهەمەش هەر بە تەنها دامەزراندنی سیاسەتێکی نوێ نەبوو، بەڵکو دەیویست ئایینێکی تازەش بۆ مرۆڤایەتی بێنێتە ئارا، ئاینێك کە جێگای تیۆلۆژیای مەسیحی کۆن بگرێتەوە. بەڵام لەو ماوەیەدا ڕوداوێکی تایبەت ڕویدا کە ئاڕاستەی ژیانی گۆڕی و گەورەترین کاریگەریشی لەسەر فەلسەفەکەی بەجێهێشت. ئەم ڕووداوە کاریگەریی بە ڕادەیەك بوو کە هەندێ دوای ئەوە باسیان لە "ئۆگست کۆنت"ی یەکەم و "ئۆگست کۆنت"ی دووەم دەکرد. تەنانەت هەندێ لە خوێندکارەکانیشی لە شوێنکەوتنی کشانەوە، لەبەرئەوەی (بە بۆچونی ئەوان) ناپاکی دەرهەق بە فەلسەفەی سەرەتای خۆی کردووە یاخود لێی پەشیمان بۆتەوە.

با بزانین ئەو ڕوداوە گرنگە چییە کەوا "ئۆگست کۆنت"ی شڵەژاندووە؟ ئەو ڕووداوە چیرۆکێکی خۆشەویستیە لەگەڵ کچێکدا کە حەڤدەساڵ لە خۆی منداڵترە. ئەم کچە ناوی "کلۆتیڵد دوڤۆ"یەو لە بنەماڵەیەکی ئۆرستۆکراتی خانەدان دەبێت. ئەم پەیوەندییە ئاڕاستەی بیرکردنەوەو فەلسەفەی "کۆنت"ی گۆڕی. ئەوێك کە پێشتر پێیوابوو زانستی پۆزەتڤستی بەرزترین و گرنگترین شتێکە بۆ مرۆڤایەتی، ئەمێستا و دوای ناسینی "کلوتێڵد

دوڤــۆ"، ســۆزداری و خۆشەویــستی لەســەر و زانــست و ئــەقڵ و هــەموو شــتێکەوە دادەنێــت. ئەمــە ئــەو گۆڕانکارییــە مەزنــە بــوو کــە بەســەر "ئۆگست کۆنت"دا هات. لـە شوێنێکدا "کۆنت" بـە "کلوتێلـد دوڤـۆ" دەڵێـت: (کتـێبی داهـاتووم بریتی دەبێت لە ئۆپێرایەکی زۆر گەورەو تیایدا باس لە باڵادەستی و ئەولەویەتی خۆشەویستی گەردونی دەکەم، نەك تەنها بەسەر هێزدا، بەڵکو بەســەر ئەقڵیــشدا). لێــرەدا ئێــستێك دەکــەم و دەڵــێم: (شارســـتانیەتی خۆرئـــاوا گـــەر ئـــەم بۆچونەی کۆنتی پـەیڕەو بکردایـە، ئەوا نـە دڵـی لـە دەست دەدا و نـە ڕۆحـی بـزر دەکـرد). کـەس گومــانی لــە گرنگــی زانــست و پیــشەسازی و دیــسپلین و پێــشکەوتن نییــە، تێکــڕای ئــەم شـــتانەش بێگومـــان بـــۆ دروســـتکردن و دامەزرانــدنی شارســـتانیەت پێویــستن و بــە فیعلیش بوونـە مایـەی دامەزرانـدنی گـەورەترین شارسـتانیەتی تـەکنۆلۆژی لەسـەر زەوی، بـەڵام خۆزگـە ئـەم شارستانیەتە دڵ و ڕۆح و ویـژدانی فــەرامۆش نەکردایـــە، خۆزگـــە خـــۆی لـــەو خۆشەویستیە گەردونییە بەتاڵنەکردایەتەوە کە "ئۆگــست کۆنــت" لــە دووەم قۆنــاغی ژیــانی فیکریـدا بانگەشـەی بـۆ دەکـرد. گـەر ئەمـە بوایـە ئـەوا دەگەیـشتینە شارسـتانیەتێکی کامـڵ و بـێ کەموکوڕی لە ڕوی تەکنۆلۆژی و ئینسانیەوە.

گــەر شارســتانیەتی خۆرئــاوا بەشــێوەیەکی مرۆڤدۆســـتانە مامەڵـــەی میللـــەتانی دیکـــەی بکردایـە، ئـەوا سـەردەمی کۆلۆنیـالیزم و هـەموو ئەو مەرگەساتانەمان نەدەبینی کە لێی کەوتەوە. میللــەتانی دیکــەش بــە چــاوی گومانــەوە لــە خۆرئـــــاواو دەســـــکەوتەکانی مۆدێرنـــــەیان نـــــەدەڕوانی و نەدەکەوتنـــــە دژایـــــەتیکردن و ئافەرۆزکردنی کە ئەمەش بۆ خۆی هەڵوێستێکی پەرگیرانەیە و زیان بە هەموو لایـەك دەگەیـەنێت، چونکە هەماهـەنگیکردن لەگـەڵ شارسـتانیەت و لەگــەڵ شــتە پۆزەتیڤــەکانی ناویــدا، ڕێگــەی ڕاســتو دروســتە لــە پێنــاو بــەرەو پێشــچونی میللەت و کۆمەڵگەکانماندا.

بـە هـەر حـاڵ "ئۆگـست کۆنـت" لـە دووەم قۆناغیـدا، دەسـتبەرداری هێـز و هێـزداری بـوو بۆئـەوەی ڕێـچکەی خۆشەویـستی بگرێتـە بـەر، ئـــەو خۆشەویـــستیە گەردونیـــەی تـــەواوی مرۆڤایـــەتی دەگرێتـــەوە. هۆکـــاری ئـــەم گۆڕانکاریــەش دەگەڕێتــەوە بــۆ ئــەو چــیرۆکی خۆشەویـستیەی توشــی بــوو. لێــرە بــەدواوە "کۆنت" هەر بە تەنها سەرگەرمی شارستانیەتی زانستی تەکنۆلۆژی نەبوو، بەڵکو رویکردە بەها ئایـدیالی و ڕوحیـەکانیش. واتــە "کۆنـت" لــە خـەونی غەفڵـەت زەدەیـی بـەئاگا هـات و درکـی بـەوە کـرد کـە لـە ژیانـدا و لـە دەرەوەی بـەهای زانــستی و تــەکنۆلۆژی و پێــشکەوتنی مــادی، بەهاگــەلێکی دیکــەش هەیــە، بــەڵام ئەفــسوس شارسـتانیەتی خۆرئـاوا شـوێن پێـی "ئۆگـست کۆنـت"ی دووەمـی هەڵنـەگرت و هـەر پابەنـدی یەکـەمیان بـوو. نــەك هــەر ئەوەنــدەش، بگــرە پێیوایـــە "کۆنـــت" ی دووەم ناپـــاکی لەگـــەڵ "ئۆگست کۆنت"ی یەکەمدا کردووە.

بــەڵام داخــۆ خیانــەتکردن ئــەوە نییــە کــە قۆنـاغی یەکـەم لـە فەلـسەفەی "ئۆگست کۆنـت" پــەیڕەو بکــەین و قۆنــاغی دووەمــی فــەرامۆش بکەین؟ ئایا سەرکەوتنی مادی هەموو شتێکە لـە بوونـدا، وەکـی ئـەوەی لـە ئێـستا زۆربـەی زۆری

خۆرئاواییەکان پێیان وایە، یاخود شوێنێکیش بۆ رێز و خۆشەویستی و خزمەتکردن بە کەسانی دی ماوە؟ شایەنی باسە خۆشەویستی "کۆنت" لەگەڵ "کلۆتێلد دوفۆ"دا خۆشەویستیەکی کورت خایەن بوو کە ساڵێك زیاتری نەخایاند، بەڵام توانی فێری خۆشویستنی تەواوی مرۆڤایەتی بکات و ئەمەشی بەشتێکی دانەبڕاو لە فەلسەفەی پۆزەتڤستی دادەنا، بەڵام لەو کاتەوەی ئەم گۆڕانکارییەی لە خۆیدا دروست کرد، ئیتر بەرەبەرە خوێندکارەکانی لێی دەتەکینەوە. ئەوەی جێی داخە یەکێك لەوانە فەیلەسوفی بەریتانی "جۆن ستیوارت میل" بوو. "میل" کەسێکی تەواو مادی بوو، جگە لە بەهای پێشکەوتنی مادی و تەکنۆلۆژی، بڕوای بە هیچ بەهایەکی دیکە نەبوو. هەروەها یەکێکی تر لەوانەی کە وازیان لێهێنا "لیتری" بوو، کە خاوەنی فەرهەنگی بەناوبانگی فەرهەنگی فەرەنسی "لیتری"بوو.

دواجار بەم پەرەگرافە کۆتایی بەم نوسینەمان دێنین: (کۆنت نەیدەویست راستەوخۆ بەشداری پرۆسەی سیاسی بکات و تەنها کۆمەڵەی پۆزەتڤیزمی دامەزراند کە دروشمەکەی بریتی بوو لە: سستم و پێشکەوتن. پێویستە تەنها بیر لە سستم و پێشکەوتن بکەینەوە. دواتر کتێبێکی بەناونیشانی وتارێك دەربارەی تێکڕای فەلسەفەی پۆزەتڤستی بلاوکردەوە. ئەم کتێبەی بە زمانێکی شیعری نوسیبوو کە پوختەی هەموو فەلسەفەکەی بوو. ئەم کتێبە سیاسەتمەداری بەناوبانگی فەرەنسی جۆڵ ڤێری زۆر پێی سەرسام بوو، هەر ئەمیش رۆڵێکی گەورە دەبینێت لە پراکتیزەکردنی فەلسەفەی پۆزەتڤیزم لە فەرەنسای کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا.. وەکی دەشزانرێت جوڵ ڤێری ئەو کەسەیە کە دامەزرێنەری قوتابخانەی عەلمانییە لە فەرەنسادا و هەر ئەویشە کە نەخوێندەواری لەو ولاتەدا ناهێڵێت. لەم کتێبە شیعریەیدا کۆنت بۆ یەکەمجار چەمکی ئایینی مرۆڤایەتی دەستنیشان دەکات و باس لە گرنگی دەسەلاتێکی روحی دەکات کە لە بەرامبەر دەسەلاتی مادیدا ڕابوەستێت. پاشان لەگەڵ هەڵکشانی تەمەنی ئۆگست کۆنتدا، ئاراستەی ئایینی فەلسەفەی پۆزەتڤیزمیش زیادیدەکرد و قەناعەتی بەوە دەکرد کە پێویستە ئیدارەیەکی روحی بێتە ئاراو سەرپەرشتی کۆمەڵگە بکات، بەتایبەت لە دوای دارمانی دەسەلاتی کڵێسا و کەمبوونەوەی کاریگەری مەسیحیەت لەسەر هاولاتیانی خۆرئاوا، ئەویش بەهۆی رۆشنگەری و شۆڕشی فەرەنسیەوە. لەمبارەیەوە کۆنت دەڵێت: پێویستە لەسەر دارو پەردوی سەردەمی تیۆلۆژیا دەسەلاتێکی روحانی نوێ بێتە ئارا، بۆ ئەوەی ئاراستەی کۆمەڵگە و ڕای گشتی بکات. دەبێت ئەم دەسەلاتە روحانیە لە خۆرئاوادا، جێگەی دەسەلاتی پاپا بگرێتەوە و ئامانجی ئەوەش بێت تەواوی میللەتانی ئەوروپا لە ژێر رکێفی خۆیدا کۆبکاتەوەو هەوڵی ئەوەش بدات نەتەوەکانی دیکەش بێنێتە ژێر سایەی خۆی، ئەویش لە ڕێگەی پەیوەندی بەستنێکی ئەخلاقی ئاست بەرزەوە).

**سەرچاوە:**

www.alawan.com

# پێویستی پاراستنی مافەکانی مرۆڤ لە هەمبەر دیکتاتۆری زۆرینە

## روانینێك بۆ بیرۆکەی جۆن ستیوارت میل لە مەڕ ئازادی هزر

**جۆن سالوین شاپیرۆ**

**لە فارسییەوە: ئاریا ئەحمەدی**

کتێبی میل "دەربارەی ئازادی" هێشتا بە شرۆڤەکردنێکی دانسقەی بیروباوەڕ دەژمێردرێت. بەڕای میل، دەبێت لە ئازادی نەك تەنیا لە بەرامبەر جیاکاری و سانسۆری حکومەتی بەڵکو تەنانەت لە هەمبەر دیکتاتۆری (ئیحساسات و بیروباوەڕی باوی) کۆمەڵگەش پشتیوانی بکرێت.

ئەوەی لە خوارەوە دەکەوێتە بەرچاوتان، هەڵبژاردەی نمونەگەلێکی بەپێزی بەرگریکردنی "جۆن ستیوارت میل"ە لە ئازادی هزر.

.. بابەتی ئەم وتارە، هەرە ساکار دەربڕینی بنەمای مامەڵەکردنی کۆمەڵگەیە لەگەڵ تاك لە بواری گرتنەبەری ئاراستەی زۆرەملێ و کۆنترۆڵکردن بەشێوەی ڕەها. ئەو ئامڕازانەش کە کۆمەڵگە بۆ کۆنترۆڵ و زۆرداری پەیڕەوی دەکات، لەوانەیە هێزی جەستەیی و مادی بەشێوەی سزاگەلی یاسایی یاخود زۆرەملێی ئەخلاقی بەهۆی ڕای گشتییەوە بێت. ئەو بنەمایەش کە باسمان کرد، پشتگیریکردنی تاکە لە خود وەك تەنها ئامانجی کۆتایی مرۆڤ بەشێوەی تاك و کۆمەڵ، کە دەتوانێت لەبارەی دەستێوەردانی ئازادی کردەیی هەر ئەندامێك لە کۆمەڵگە خوازیاری پاساوهێنانەوە بێت. تەنها مەبەستێك لەو بوارەدا دەتوانرێت بە ڕێکوپێکی بۆ هەر ئەندامێکی کۆمەڵگەی مەدەنی بە پێچەوانەی ئیرادەی تاك بگیرێتە بەر، ریگرتنە لە زیانگەیاندن بە ئەوانی دیکە. بۆیە چاکەی خودی ئەو تاکە! چی بەشێوەی جەستەیی یاخود ئاکاری بێت، پاساوێکی بەس و قایلکەر نییە.. ئەمانە هۆکارگەلێکی چاکن بۆ سەرزەنشتکردن و بەڵگەهێنانەوەو هاندان و پاڕانەوەی تاك. بەڵام لە هەندێك بوارەوە کە تاك دەتوانێت بە چەشنێکی دیکە کار بکات، ئەوا بۆ ناچار کردن و ڕووبەڕووکردنەوەی نیە لەگەڵ

هەر چەشنە شەڕ و خراپەیەك. پاساوی ئەو ڕەفتارەی کە چاوەڕوانی کۆنترۆڵکردنی تاکی لێدەکەین، دەبێت لە کاتێکداو بە جۆرێك بێت، کە تاك شەڕ و خراپەش بۆ کەسێکی دیکە دروست بکات. بۆیە تاك تەنها لە بواری ئەو هەڵسوکەوتانەی کە بە تەواوی پەیوەندی بە خۆیەوە هەیە، سەربەخۆیی کردەوە ماف ڕەواو ڕەهایەتی. تاکێك کە زاڵە بەسەر سەربەستی و زەین و جەستەیدا.

.. مەبەست لەم ستونە بەستێن خۆشکردنە بۆ دەرك و تێگەیشتنی بنەمای لیبرالیزم (ئازادیخوازی) و، هەروەها ناسینی بیرمەندانی لیبراڵ یاخود بیرمەندانێکە، کە دەتواندرێت لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی لیبرالأنە لە بیرۆکەکانیان بەدەست بهێندرێت.

.. کۆمەڵگا دەتوانێت و دەبێت حوکمی خۆی بکات و ئەگەر لە کاتێکدا لە بڕی حوکمی ڕاستو دروست، حوکمی نادروست و ناڕاست بدات و هەر جۆرە حوکمێك دەربکات، کە پەیوەندی بە کار و شتگەلێکەوە هەبێت کە بۆی نیە و نابێت دەستێوەردانی تیادا بکات، ئەوا لەو حاڵەتەدا دیکتاتۆری کۆمەلأیەتی گرتۆتەبەر کە زۆر مەترسیدارترە لە شێوازەکانی سەرکوتکردنی سیاسی. چونکە هەرچەندە تاك لەو حاڵەتەدا ڕووبەڕووی سزاگەلێکی قورس نەبۆتەوە، بەلأم ڕێگاکانی دەربازبوونی لێ سنوردار بۆتەوە، کە بە چەشنێکی قوڵتر دزە دەکاتە ناو وردەکاریەکانی ژیانی و، دەروونی تاك کۆیلە دەکات. بەم پێیە، پشتگیریکردن لە تاك بەرامبەر دیکتاتۆری حکومی بە تەنهایی بەس نیە و، دەبێت لە بەرامبەری بیروبۆچوون و ئیحساساتی زاڵی کۆمەڵگەدا، لە ڕێی ئامرازگەلێکی دوور لە سزا مەدەنیەکان پشتیوانی و پشتگیری لە تاك بکەین. ئەو بیروبۆچوونە زاڵەی کۆمەڵگە، کە نیازی سەپاندنی بیرو باوەڕو داب و نەریتی هەیە لە چوارچێوەی یاسا و ڕێساکانی ڕەفتارکردن بەسەر کەسانی ناڕازیدا..

بەلأم لە لایەکی دیکەوە جۆرێك پەیوەندی کردەیی لە ناو کۆمەڵگەدا هەیە، کە ئەو پەیوەندیەش بە شێوەیەکی سەربەخۆ و جودا لە تاك ڕێکدەخرێت. ئەگەری لەو پەیوەندیەدا سود و هۆگریەك بۆ دەستێوەردان هەبێت، ئەوا بە شێوەی ناڕاستەوخۆ دەبێت. هەروەها ئەگەر سود و هۆگریەکە لە تەواوی پەیوەندیەکەدا هەبێت، ئەوا ئەو سود و هۆگریەش تەنها بە شێوەی ناڕاستەوخۆیە و، هەموو ئەو بەشانەی ژیان و ڕەفتاری مرۆڤ لە خۆی دەگرێت، کە تەنیا کاریگەری لەسەر خودی تاك هەیە یان ئەگەر کاریگەریشی لەسەر ئەوانی دیکە هەبێت، ئەوا تەنیا لە ڕێگای ڕەزامەندی و بەشداریکردنێکی ئازادانەو بێ فرت و فێڵی تاکەوەیە.. کەوابوو ئەو پەیوەندییە تایبەت بە ئازادی و مرۆڤە و، سەرەتا پەیوەندی دەروون ئاگایی لە خۆدەگرێت و دواتریش داوای ئازادی ڕەهای بیروباوەڕ و ئیحساسات دەکات لە کۆی بابەتەکانی بواری پراکتیکی و تیۆری و زانستی و ئاکاری و خوداناسی..

بەم پێیە، گریمان حکومەت بە تەواوی لەگەڵ خەڵکدا ڕەزامەندی و هاودەنگی هەیە و، هەرگیز

بە نیازی گرتنە بەری هەر جۆرە کردەوەیەکی توندوتیژانە نییەو، قایلە بەو شتەی کە پێی وایە بیروبۆچوونی خەڵکە.

من لەو حاڵەتەشدا ماف خەڵك بۆ کارێکی زۆرە ملێی وەها رەتدەکەمەوە، جا ئەگەر لەلایەن خۆیانەوە بێت یاخود لەلایەن حکومەتەکەیانەوە. چونکە ئەو دەسەڵاتە لە زاتی خۆیدا نارەوایە. باشترین حکومەت هیچ شیایی و مافێکی زێدەتری نییە لە حکومەتێکی خراپ بۆ وەرگرتنی ئەو دەسەڵاتە. چونکە هەر کاتێك ئەو دەسەڵاتە بەپێی رای گشتی و پێچەوانەکەی پەیرەو بکرێت، ئەوا زیانبار دەبێت، تەنانەت زیانبارتر لەو کاتەی کە پەیرەوی دژایەتیکردن بکرێت لەگەڵ رای گشتی و پێچەوانەکەی. هەروەها ئەگەر جیا لە کەسێك، هەموو مرۆڤەکان بیرو بۆچوونێکیان هەبێت و تەنیا ئەو کەسە بیروبۆچوونی جیاوازی هەبێت، ئەوا مرۆڤ ماف بێدەنگکردنی ئەو کەسەی نییە ئەگەر بێتو دەسەڵاتی بێدەنگکردنیشیان هەبێت. لەلایەکی دیکەوە ئەگەر بیروبۆچوونێك جیا بۆ خاوەنەکەی بایەخدار نییە و لە هەمان کاتیشدا بەهۆی ئەو بیرو بۆچوونەوە کۆسپی بۆ دروست ببێت، ئەوا بە تەواوی زیانی شەخسی لەو تاکە دراوەو، تۆزێکیش بۆمان جیادەکاتەوە کە زیانەکە تەنیا لە هەندێك کەس گەیشتووەو، یان فریوی نەوەی ئێستاو ئایندەش دەدات. بۆیە ئەو کەسانەی نارازین لە بیرو بۆچوونی باو، زیانێکی زۆرتریان پێدەگات لە بەرامبەر کەسانێك کە بروایان بەو بیرو بۆچوونە باوە هەیە. هەر بۆیە ئەگەر بیروبۆچوونێك راست بێت، ئەوا ئەوان بێبەش دەبن لە دەرفەتی گۆڕینی بیروباوەڕی ناراست بۆ بیروباوەڕێکی راست و دروستتر. ئەگەریش بیروبۆچوونێك هەڵە بێت ئەوا ئەوان تا رادەیەکی نزیك سودێکی مەزن لە دەست دەدەن. سود و قازانجی تێگەیشتنی روونتر لە هەقیقەت، کە لە ئەنجامی پێکدادانی نێوان بیروباوەری راست لەگەڵ بیروباوەری ناراستدا دروست دەبێت.

**سەرچاوە:**

نشریه انترنتی لیبرال دیموکرات

# ڕۆڵی ماسمیدیای ئازاد

جۆن. دەبلیو. جۆنسۆن
لە فارسییەوە: کارزان محەمەد

"کاتێك خەڵك ئەوەیان دەستنیشان کرد کە "کات" زۆربەی بیروباوەڕو ئایینە شەڕکەرەکانی لەناوبردووە، لەوانەیە بەم باوەڕە بگەن... کە دواخێری جێمەبەست لە ڕێگەی ئاڵوگۆڕکردنی ئازادی هزرەکانەوە باشتر شیاوی دەستەبەرکردنە، باشترین سەنگی هەقیقەت، هێزی بیرکردنەوەیە بۆ خۆسەلماندن لە ململانێی بازاڕدا... ئەمە بەهەموو شێوەیەك تیۆری سەرەکیی دەستوری ئێمەیە. ئەمە ئەزموونێکەو تەواوی ژیانیش ئەزموونە"

**(دادوەری دادگای باڵای وڵاتە یەکگرتووەکان)**

**ئۆلیڤەر وێندڵ هۆڵمز-1919**

بۆ ئەوەی کۆمەڵگایەك بەڕاستی بە ئازاد هەژمار بکرێت، دەبێ ئاستێکی باڵای پرەنسیپەکان لەهەمبەر دەربڕینی بیروباوەڕ بەشێوازی بڵاوکردنەوە پیادە بکرێت، چ ئەو ئامرازی ماس میدیایە ڕۆژنامە بێت یان گۆڤار، پەرتوك، یادداشت، فیلم، تەلەفزیۆن بێت و نوێترین جۆریشی ئینتەرنێتە. ئەزموونی ئەمریکا لە قۆناغێکی پتر لە دووسەد ساڵەدا نمونەیەکی درەخشانی ئیرادەی میللەتێك بۆ بنیاتنانی یاسا سەرەکی و بنچینەییەکان بۆ دەربڕینی بیروباوەڕ دەخاتەڕوو. هەڵبەتە ئەم ئەزموونانە تایبەت بە کلتورو مێژووی وڵاتە یەکگرتووەکانە، بەڵام ئەو پرەنسیپە گشتییانەی کە شی دەکەنەوەو ڕۆشنی دەکەنەوە پراکتیزەکردنێکی بەرفراوانی لە کۆمەڵگە ئازادەکانیتردا هەیە.

دەستوری وڵاتە یەکگرتووەکان واتا بەردی بناغەی سەرەکی سیستەمی دەوڵەتی ئەمریکا، لە ساڵی (1791) لەلایەن (13) ئەیالەتی سەرەکییەوە دانەدەنرا بەڵکە بە زیادکردنی (10) ڕیفۆرم بوو کە بە جاڕنامەی مافە

مەدەنییەکان (*Bill of Rights*) ناودەبرێت و مەبەست لەی پارێزگاریی لە مافەکان و ئازادییە تاکەکەسییەکانە. شتێکی ڕێکەوت نەبوو کە مافی ئازادی دەربڕین لەلایەن ڕۆژنامەکانەوە هەمان سێ ڕیفۆرمەکەی یەکەمی گرانبەها کردووە. بەشێك لە ڕیفۆرمی یەکەم دەڵێت: " کۆنگریس هیچ یاسایەك دەربارەی دوورخستنەوەی ئازادی دەربڕین یا ئازادی چاپەمەنی دانانێت". بەلای بنیاتنەرانی ئەمریکاوە واتا ئەو پیاوانەی کە ڕەشنوسی دەستورو جاڕنامەی مافە مەدەنییەکانیان ئامادە کردووە کاغەزە چاپکراوەکان (بەگشتی لەشێوەی ڕۆژنامەو بڵاوکراوەدا بوو) ئامرازەکانی ماس میدیای بڵاوکردنەوە بوو، هەرئەمەش بووەمایەی پەیدابوونی وشەی (چاپەمەنی) لە ڕیفۆرمی یەکەمدا. بەدرێژایی مێژووی ئەمریکا ئازادی دەربڕین و چاپەمەنی بەهەمانشێوەی کە لە ڕیفۆرمی یەکەمدا بەیەکترەوە گرێدراون —هەمیشە لەگەڵ یەکتردا ئاوێتە بوون چ لە زەینی گشتی و چ لە هزری ئەو دادوەرانەی کە داوایان لێدەکرا بڕیار لەبارەی شکاتەکانی پەیوەندیدار بە دەربڕینی بیروباوەڕ لە ڕێگەی بڵاوکراوەکانەوە بدەن.

ڕەنگە باشترین ڕێگا بۆ ناسین و ڕێزگرتن لە ڕۆڵی ئاڵۆزو فۆرمەڵەبوونی چاپەمەنی ئازاد لە ولاتە یەکگرتووەکاندا، شرۆڤەکردنی وەرچەرخانی مێژووییانەی ئەم دیاردەیەیە لە ڕێگەی ئەو بڕیارانەی کە دادگاکانی ئەمریکا دەریانکردووە. لەگەڵ ئەمەشدا کە لە ڕیفۆرمی یەکەمدا لە ئاستێکی زۆر زۆردا گرەنتی ئازادی چاپەمەنی دەکات، سیستەمی دادوەریی ولاتە یەکگرتووەکان بەوردیی پێناسی ئەم چەمکەی کردووە کە لە پراکتیکدا بە چ شێوەیەك بێت. بەگشتی ئەوە دادگاکانن کە ئەم بیرۆکەیەیان لە ڕەگ و ڕیشەکانی خۆی لە سەدەی هەژدەیەمی یاسای عورفی ئینگلیزیدا بەرفراوانتر کردووە و لە بەرامبەر ئەو دەسەڵاتانەی کە لە کۆمەڵگای ئەمریکادا لە ئازادی زیادلەسنوری چاپەمەنی بێزارن، بەرگریی لەم مافە دەکەن.

***دادگایی (*Zenger*) و تۆمەتی فیتنەگەریی**

دادگایی کردنی بڵاوکەرەوەیەکی ڕۆژنامەی نیویۆرك بەناوی (جۆن پیتەر زینگەر) لە ساڵی (1734) نمونەیەك لەم تیۆرە گشتییە بەدەستەوە دەدات کە ئازادی چاپەمەنی لە کۆلۆنیالەکانی بەریتانیا لە باکوری قارەی ئەمریکا بەوجۆرە لێکنادرێتەوە کە ئەمڕۆ لێکدانەوەی بۆ دەکرێت. دەوڵەتی کۆلۆنیالیزمی نیویۆرك، زینگەری لەبەر چاپکردنی وتارێك کە تیایدا بەشێوەیەکی بێ ڕەحمانە ڕەخنە لە فەرمانڕەوای دەسەڵاتداری کۆلۆنیال دەگرێت، بە فیتنەچی تۆمەتبار کرد.

فەرهەنگی زاراوە یاساییەکان (*Black*) فیتنە وەك پەیوەندییەکی نوسراو پێناس دەکات کە "دەیەوێ کەسێك بخاتەبەردەم نەفرەت، شەرم...شکاندن، گاڵتەپێکردنەوە." ڕۆژنامەی زینگەر پڕوپاگەندەی ئەوەی کردبوو کە فەرمانڕەوا دادگاکانی بەبێ ڕەزامەندی یاسادانەران هێناوەتەئاراو بەشێوەیەکی تۆتالیتارانە کەسانی کۆلۆنیالکراوی لە مافی بوونی لیژنەی دادوەریی بێبەش کردووە. زینگەر لەڕێگەی پارێزەرەکەی خۆیەوە نکوڵی

له چاپکردنی ئەو چەشنە تۆمەتانە کرد. ئەو تەنها ئەوەی دەربڕی کە مافی ئەوەی هەیە لە ڕۆژنامەکەی خۆیدا ڕەخنە لە بەرپرسێك بگرێت، تەنانەت ئەگەر ئەو ڕەخنەیە تا ئەوئاستەی ڕاستی تێدا هەبێت گاڵتە بەو بەرپرسە بکات. لە بڕیاردانێکی چارەنوسسازدا، لیژنەی دادوەریی زینگەری ئازاد کردو یاریدەی بنیاتنانی پرەنسیپێکی دا کە لەڕێگەیەوە لەبەرامبەر تۆمەتی فیتنەگەریدا بەرگریی لە ڕاستی بکرێت. بەڵام بڕیاری لیژنەی دادوەریی لەم دۆسیەیەدا بنەمای یاسای ئینگلیزی نەگۆڕی، ئەو بنەمایەی کە لەلایەن یاسانوسی بەرجەستەی ئینگلیز (ویلیام بلاك ستۆن)ەوە لەدوادوای سەدەی هەژدەهەم بە هێزو ڕاشکاوییەوە ڕاگەیاندرابوو کە بەپێی ئەو بڵاوکراوەیە (ئەو شتەی... شەیتانئامێزە) بە تاوان دەژمێردرێت کە دەکرێ سزا بدرێت.

لە ساڵی (1798) زۆرینەی ئەندامانی کۆنگریسی ئەمریکا لەترسی ئەوەی کە توندڕەوەکانی شۆڕشی فەرەنسا ڕێگەی خۆی تا ئەولای ئەتلانتیك بکاتەوە، (یاسای فیتنە)یان دانا کە تیایدا (نوسین، چاپ، دەربڕین یا بڵاوکردنەوەی هەرجۆرە نوسینێکی درۆ، ڕیسواکارو مەبەست خراپ) دژ بە دەوڵەت بە تاوان ڕاگەیەندرا. ژمارەیەك لەو کەس و ڕۆژنامانە بەپێی ئەم یاسایە دادگایی و سزا دران. یەکێك لەوانە بڵاوکەرەوەیەك بەناوی (*James Thomson Callender*) بوو کە لە ساڵی (1800) بە تۆمەتی تاوانی ئاماژەکردن بۆ پریزدێنت جۆن ئەدامز وەك (پیرەمێردێکی ئاگرین... کە خوێن لە دەستەکانی دەچۆڕێت) بۆ مێزی دادگا ڕاکێش کرا. کلندەر کە ڕووخسارێکی ناخۆشەویست بوو و تەنانەت لەو ڕۆژگارەدا قسە نەشیاوە توندە سیاسییەکان، بە قسەی خراپ دەژمێردراو بەچەندین ساڵ زیندانی سزا درا. لە ساڵی (1801) ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی کە (تۆماس جیفرسۆن) لە (ڤێرجینیا) گەیشتە سەرۆك کۆماری، ئەوی بەخشی.

***تۆمەت لە سەدەی نۆزدەهەمدا**

دوای دەستپێکی سەدەی نۆزدەهەم، تۆمەتبارکردن وردە وردە ببوە مەسەلەیەکی مەدەنی تا مەسەلەیەك بۆ دادگاکانی تاوان. واتا لەبری ئەوەی دەوڵەت ئەو ڕۆژنامەنوسانە بخاتەبەردەم لێکۆڵینەوەوە کە ڕەخنەیان لە پلەدارە بەرپرسەکان گرتبوو، ئەو کەسایەتییە گرنگانەی کەوتبوونە بەردەم ئەم تۆمەتانەوە بۆ پارێزگاریی لە چاکی ناوبانگیان خۆیان لە دادگا شکاتیان دەکرد. دوای ئەوە، تا سەدەی بیستەم ژمارەیەکی کەم بەگژداچوونەوەی دادوەریی هەبوو کە مەسەلەکەی مافی تاکەکان بوو لەهەمبەر دەوڵەتی میللیدا. گرنگترین شکاتەکانی پەیوەندیدار بە دەستوری سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم، دەربارەی ئازادی دەربڕین نەبوو، بەڵکو کۆمەڵە زۆرانبازییەکی نێوان ئەیالەتەکان و دەوڵەتی فیدراڵ و بەرزکردنەوە دادوەرییەکان بوو لەلایەن دەوڵەتەوە کە بڕیارە بازرگانییەکانی ڕێکدەخست.

لەو ڕۆژگارەدا نەریتی دێرینەی ئەمریکییەکان پابەندبوون بوو بە بابەتە

لۆکاڵییەکانــەوە، دەیانویــست کــە پێکدادانــە ڕاســـتەوخۆکانی نێـــوان دەوڵـــەتی میللـــی و کەسەکان بگەیەنێتە کەمترین ئاست.

لــە ســاڵی (1833) دادگــای بــاڵای وڵاتــە یــەکگرتووەکان –واتــا بــاڵاترین دادگــای وڵات– بڕیاری دا کە جارنامەی مافە مەدەنییەکان تەنها ڕێگــە لــە دەســتدرێژیی دەوڵــەتی میللــی بۆســەر مافـــەکانی تاکـــەکان بگرێـــت، ویلایەتـــەکان دووچاری ئەم سنورداریتییە نەبوونەوە. ئەم بنەمایە ڕێگەی بە ویلایەتەکان دەدا کە هەر درێژە بە سانسۆری ڕۆژنامەکان و ماسمیدیا چاپکراوەکانیتر تا چەندین ساڵ دوای سەدەی بیستەم بدەن. بەمپێیە لەگەڵ بوونی سەدایەکی زۆر ڕوونی گوتەی ئازادی چاپەمەنی کە لە ڕیفۆرمە بەراییەکاندا پیرۆز کرابوو، بە درێژایی مێـــژووی ئـــەمریکا، دادگاکـــانی ئـــەم وڵاتـــە لەهەمبەر ئەو پیاو و ژنانەی کە جەسارەتی ڕەخنەیان لە دەوڵەت نیشان داوە، پرەنسیپێکی دژیـــەك پراکتیـــزە دەکـــەن. دوای بڕیـــاردانی (1833) تا سەرەتاکانی جەنگی جیهانی یەکەم، شــکاتگەلێکی جۆراوجــۆر دەربــارەی ئــازادی دەبڕین لە دادگای باڵادا خرایەڕوو. ئەگەرچی نەریتی کلتوری ئازادیی سیاسی و زیادبوونی ڕۆژانــەی ڕۆژنامــەو گۆڤــارە پڕتیراژەکــان هــەم نوســـەران و هـــەم کاریکاتێریـــستەکان و هـــەم وتارەنوســە بنەڕەتییــەکانی هــان دەدا کــە لــەم قۆناغەدا پەرە بە سنورەکانی ئازادی دەبڕین بدەن. تەنانەت ئەبراهام لینکۆڵنیش بیرۆکەی کاریکاتێرە بێبەزەییەکان بوو. (ویلیام جنینگز بایرۆن)یش یەکێکتر بوو لە سیاسەتمەدارە ناسراوەکانی سەرەتای سەدەکە. بەتایبەتی لە ســـاڵانی ســـەرەتای ســـەدەی بیـــستەمدا، ڕۆژنامەنوسەکان و نوسەرانی (ڕیسوادەرخەر)، بــە ســودوەرگرتن لــە تیراژی میللــی گۆڤارەکــان وەك زەمینــەی کــار، بەگــژ نەهێــشتنی گەنــدەڵی کــۆڕە سیاســی و ئابورییەکانــدا دەچــوون کــە ڕووبــەڕووی پێــشوازییەکی زۆر دەبــۆوە. ئــەم ئاشکراکردنانە بووەمایەی پەیدابوونی کۆمەڵە گۆڕانکارییـــەکی سیاســـی و یاســـادارێژەریی و کۆمـــەکی دامەزرانـــدنی ئـــەم بزووتنـــەوە پێشکەوتووەی وەك هێزێکی گرنگی سیاسی لە سەدەی بیستەمدا کردو ژینگەیەکی هێنایەئارا کە دەیان ساڵ دوای ئەوە بووەمایەی گەشەی یاسایی ئازادیی چاپەمەنی.

***چاپەمەنی ئازاد لەماوەی سەردەمی جەنگدا**

لە ساڵی (1917)، تاڕادەیەك هاوكات لەگەڵ چــوونی وڵاتــە یــەکگرتووەکان بۆنــاو جــەنگی یەکەمی جیهانی، کۆنگریس (یاسای سیخوڕی) دانا کە ئەو کەسانەی بە سزا دەگەیانــد کــە بەشــێوەیەکی نایاســایی، زانیــاری بــەرگریان ئامـــادە دەکـــرد یـــاخود وەریانـــدەگرت یـــا دەیاگواستەوە. ساڵی دواتر، زنجیرە ڕیفۆرمێك بۆ ئەم یاسایە زیاد کرا کە بەگشتی بەناوی یاســای گێرەشــێوێنی 1918 ناســراوەو ئــەم سزادانانە بەپێی ئەو بڕیارانە گشتێنرا کە بەسودی دووژمنانی ئەمریکا تەواو دەبوو. دادخوازییـــەکانی ژێرســـایەی ئـــەم یاســـایە سەرەنجام بەهۆی بڕیارگەلێك لەلایەن دادگای باڵای وڵاتەیەکگرتووەکانەوە بووەمایەی ئەوەی کە ماددەکانی پەیوەندیدار بە ئازادی دەربڕین و ئازادی چاپەمەنی ببەستریتەوە بە ڕیفۆرمی

یەکەمی دەستورەوە. گرنگترین ئەم ماددانە کە لە ساڵی (1919) بڕیارەکەی دەرکرا، بریتی بو لە بەدواداچوونی پیاوێك بەناوی (جیکۆپ ئەبرامز). ئەبرامز بە لادان لە یاسای گێرەشێوێنی تۆمەتبار کرابوو، چونکە دوو بەرگ نوسینی بڵاوکردبۆوە کە تیایدا رەخنەی لە پریزدێنت (ودرۆ ویلسۆن)و دەوڵەتی ئەمریکا گرتبوو لەبەر پشتگیریی سەربازیی ئەمریکا لە مەبەستەکانی سزاری ڕووس بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشی بەلشەفیکی. ئەم دوو بەرگە (یەکێکیان بە ئینگلیزیو ئەویتریان بە زمانی ئایدیش بوو) تەنها لە بەشێکی بچوکی شاری نیویۆرکدا بڵاوکرابۆوە. سەرەڕای ئەم رەخنەیە کە ئەبرامز دەستپێکەری بوو، پەیوەندییەکی کەمی لەگەڵ جەنگی ئەمریکا بۆسەر ئەڵمانیا هەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا جەخت لەسەر تاوانباربوونی ئەبرامز لەلایەن دادگای باڵای ولاتەیەکگرتووەکانەوە کرایەوە. زۆرینەی ئەندامانی دادگای باڵا لەو بڕوایەدابوون کە رەفتاری ئەبرامز (مەترسییەکی تەواو و بەپەلە)ی ئاراستەی ئارامی ناوخۆیی کردووەو بەمپێیە دەتوانرێ لەلایەن دەوڵەتەوە سزا بدرێت.

کێشەی (مەترسی بێ سێ و دووی خێرا) جارێکیتریش لەلایەن دادوەری باڵا (ئۆلیڤەر وندڵ هۆڵمز) ساڵێك بەرلەوە لە بڕیاردانێکدا کە پەیوەندیدار بوو بە ئازادی دەربڕین لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا خرابووەڕوو. هەرچەندە لەبارەی دۆسییەی ئەبرامزەوە، هۆڵمز خاوەنی بیروڕای جیاواز بوو و ئاماژەی بۆ ئەم مەسەلەیە دەکرد کە زۆرینەی ئەندامانی دادگا پێوەرەکانی ئەویان بەشێوەیەکی نادروست بۆ بەراوردکردنی یاسایبونی ئەم چەشنەی ئازادی دەربڕین بەکارهێناوەو لێبڕاوانە ڕایگەیاند کە نابێ کۆمەڵگا لە (بڵاوبوونەوەی نهێنیانەی نامیلکەیەکی خراپ لەلایەن کەسێکی نەناسراوەوە) بترسێنرێت.

گوزارشتی (مەترسی بێ سێ و دووی خێرا) زۆر لەلایەن ئەو دادگایانەوە کە لە ماوەی (80) ساڵی ئەم دواییەدا بۆ توێژینەوە لە یاسایبوونی دەربڕینە زارەکی، نوسراو و سیمبولییە رەخنەییەکان لە دەوڵەت بەکارهێنراوە. هەندێ لە زانایانی یاساناس لەوبڕوایەدان ئەم هەڵسەنگاندنە هێندە شیاوی گۆڕان بووە کە دەکرێ بوترێ زمانەکەی تاڕادەیەك بۆ هەر جۆرە بارودۆخێکی سیاسەتی گشتی گونجاوە لە سانسۆرێکی تەواوەوە بگرە تادەگاتە رێگەپێدانی تەواوەتیانە بە دەربڕین.

دۆسییەکانی ئازادی دەربڕین بە درێژایی جەنگی یەکەمی جیهانی، نیشاندەری خاڵێکی گرنگە دەربارەی پەیوەندی مادده یاساییەکانی پەیوەندیدار بە ئازادی دەربڕینو ئازادی چاپەمەنی لە ریفۆرمی یەکەمی دەستوردا. دادگای باڵای ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا هەرگیز بەشێوەیەکی ڕوون وشەکانی (دەربڕین)و (چاپەمەنی) پێناس نەکردووە چونکە ئەوانە زۆرینەیان لە مافەکانی پەیوەندیدار بەیەك دۆسیەدا پێکەوەبەستراونەتەوە. بۆنمونە، ئەبرامز داوای مافی خۆی بۆ دەربرینی ئازادانەی بیروباوەڕەکانی لەڕێگەی یاریدەدەرەوە واتا لەڕێگەی لاپەڕەی چاپکراوەوە دەکرد.

بەمپێیە وای دەردەخست کە دەربڕینەکانی هەم لەڕێگەی ماددەی پەیوەندیدار بە ئازادی دەربڕینی ڕیفۆرمی یەکەمەوە پارێزراوەو هەم لەلایەن ماددەی ئازادی چاپەمەنییەکەیەوە. وەك ڕێسایەکی گشتی، دادگاکان لەهەمبەر ئەو کەسانەی بیروباوەڕەکانی خۆیان لە ڕۆژنامەکاندا یا لە ماس میدیاکانی تردا بڵاودەکەنەوە، پرەنسیپێکی زۆرتریان بەسەردا پیادە ناکات بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی کە لە کۆمەڵگادا بیروباوەڕەکانی خۆیان بەشێوەیەکی زارەکی دەخەنەڕوو.

*** دوو بڕیاری دادگای باڵا لەپێناو پێشەچوونی ئازادی چاپەمەنی**

سوودوەرگرتن لە ڕیفۆرمی یەکەم وەك بنەچەیەکی گرنگی دەستور لەپێناو پاراستنی ئازادی دەربڕینی تاك لە ساڵی (1925) لە پرۆسەی دۆسییەیەکی تاکەکەسی کۆمۆنیستێکدا بەناوی (***Benjamin Gitlow***) بەجۆرێکی کاریگەرانە بەرەو پێشەوە چوو. ئەم کەسە چەند لاپەڕەیەکی چاپ و پەخش کردبوو کە بانگەشەی بۆ بەکارهێنانی مانگرتن و هەنگاونانی گشتیانە بە قازانجی سۆشیالیزم دەکرد. ئەیالەتی نیویۆرك (گیتلۆ)ی تاوانبار کرد بە پێشێلکردنی یاسای ئەیالەت کە بانگەشەی بۆ لەناوبردنی دەوڵەت بە تاوان ناوزەد دەکرد. ئەگەرچی دادگای باڵای وڵاتە یەکگرتووەکان جەختی لەسەر تۆمەتبارکردنی گیتلۆ کردەوە، لەگەڵ ئەمەشدا بڕیاری دا کە پرەنسیپەکانی ڕیفۆرمی یەکەم لەهەمبەر ئازادی دەربڕین و ئازادی چاپەمەنی وەك ئازادییە بنەڕەتییە تاکەکەسییەکان هەژمار دەکرێت کە نە لەلایەن ئەیالەتەوە دەتوانرێ سنوردار بکرێت و نە لەلایەن دەوڵەتی میللییەوە. هەروەها دادگا شێوازی ڕیفۆرمی چواردەهەمی گرتەبەر کە لەساڵی (1868) دانرابوو و جەختی دەکردەوە کە "هیچ ئەیالەتێك.. ئیمتیازات و ئارامییەکانی هاوڵاتیانی وڵاتەیەکگرتووەکان سنوردار ناکات و هەروەها هیچ ئەیالەتێك دەستبەسەر گیان، ئازادی یا ماڵی هیچ کەسێ بەبێ بڕینی قۆناغە یاساییەکان ناگرێت و هیچ کەسێك لە یاسا دانراوەکانی ناوچەکەی خۆیدا لە پاراستنی مافەکانیدا لەهەمبەر یاساکان بێبەش ناکرێت" دادگا جەختی کردەوە کە مەبەستی نوسەرانی ئەو ڕیفۆرمە ئەوە بوو کە لەمە بۆ دواوە، ئەیالەتەکان وەك دەوڵەتێکی میللی ئەرکی سەرشانیانە ڕێز لە ئازادییە گرنگە تاکەکەسییەکان بگرن و ئازادی دەربڕین و چاپەمەنیش هەردووکیان لەو ئازادییە بنەڕەتیانەن.

بەم جۆرە پرۆسەی سودوەرگرتن لە شێوازی ڕیفۆرمی چواردەهەم وەك جۆرە هەرەمێك بۆ بەدیهێنانی پرەنسیپەکانی جاڕنامەی مافە مەدەنییەکان لەهەمبەر ئەو کەسانەی کە لەگەڵ دەسەڵاتی ئەیالەتدا ڕووبەڕوودەبنەوە، دەستی پێکرد. حوکمی گیتلۆ کە بڕیاری 1833ی دادگای باڵای لەبارەی ئەوەی کە ئەیالەتەکان جێبەجێ کردنی ماددەکانی جاڕنامەی مافە مەدەنییەکانیان لەئەستۆدا نییە، خستەلاوەو پرۆسەیەکی دەستپێکرد کە پتر لە (40) ساڵ درێژەی کێشا. بەهەمانشێوە پرەنسیپەکانی تری (10) ڕیفۆرمەکەی یەکەمی دەستوری

ولاتەیەکگرتووەکان بەشێوەیەکی هەڵبژاردە ئاوێتە کرابوون تا لەپێناو پاراستنی تاکەکان لەبەرامبەر دەستوەردانە ئەیالەتی و فیدراڵییەکاندا بەکاربهێنرێن. ئەم پرۆسەیە لەسەر ئاستی ناوچەیی بووە مایەی بەهێزکردنی ئازادی دەربڕین.

ڕەنگە گرنگترین بڕیار دەربارەی ئازادی چاپەمەنی لەنێوان هەردوو جەنگی جیهانی لە ساڵی (1931) لە پرۆسەی دۆسییەیەکدا بووبێت کە پەیوەندیدار بوو بە مافی ئەیالەتێك لە پیادەکردنی سنوردارکردنی لە بڵاوکردنەوەی کاغەزێکی بەدناو و ئابڕووبەر بەناوی *Saturday Press* کە لەلایەن *J.M. Near* بڵاودەکرایەوە، ئەو پیاوەی کە بەدناوترین وتەبێژی دەمارگیرییە خاکپەرستی و نەژادپەرستییەکانی ساڵانی دەیەی (1920)دا بوو. لیژنەی یاسادانەرانی مینەسوتا لە ساڵی (1925) یاسای ڕێگەگرتن لە ئازاردانی گشتیان دارشت کە ڕێگەی بە دادوەر دەدا هەر بڵاوکراوەیەك کە (تۆمەت خستنەپاڵ، هەرزە، وروژێنەر) یا (بەدبین، ڕیسوائامێزو بوختانئامێز)بێت، ڕایبوەستێنن. ماوەیەکی کورت دوای دانانی ئەم یاسایە، دادوەری ئەیالەتێك بڵاوکردنەوەی (ساتردی پێرس)ی ڕاگرت. لە پێداچوونەوەی بڕیارەکەدا، دادگای باڵای ولاتە یەکگرتووەکان بە سودوەرگرتن لە دەستور، بە بەرگریی کردن لە بارودۆخێکی پێشینەدار کە لە یاسای عورفی بەریتانیاوە سەرچاوەی گرتبوو و لەلایەن بنیاتنەرانی ئەمریکاوە قبوڵ کرابوو، بە دەنگدانی (5 بەسەر 4)دا قبوڵی کرد کە نابێ (قەدەغەکردنی پێش بڵاوکردنەوە) بەسەر چاپەمەنیدا پیادە بکرێت. دادگای باڵا بڕیاری دەرکرد کە لەگەڵ ئەمەدا لەوانەیە بتوانرێ ئەوە قبوڵ بکرێت هەندێکجار کەسێك دەبێ لەبەر بڵاوکردنەوەی شتێ کە بەهۆی زۆر نزمی ئاستەکەی، بەدبینی یا بوختانئامێزەکەیەوە سزا بدەین، دەبێ هەلومەرجێکی زۆر خراپی هەبووبێت (وەك بابەتێك کە پەیوەندیدار بێت بە ئاسایشی نەتەوەییەوە) تا ڕۆژنامەیەك پێشتر بەهۆی بڵاوبوونەوەی وتارێکی وروژێنەرەوە ڕابگرین. (*Robert R. Mc Cormick*)ی بڵاوکەرەوەی خەڵکی شیکاگۆ کە کۆمەکی دارایی (ساتردی پێرس)ی کردبوو، دەبوایە بچێتە دادگای پێداچوونەوە، دادوەری باڵا (چارلز ئایوانز هیۆز)یش بە بەدەستهێنانی ڕای زۆرینە ئەم دۆسییەیەی داخست، ئەمەش وەك یەکێك لە سەرکەوتنە مەزنەکانی ئازادی هزر لە مێژوودا تۆمار دەکرێت.

***ڕووخسارە گشتییەکان و یاسای بوختان**

یەکێك لە ڕووخسارە گرنگەکانی زیادبوونی ڕۆژبەڕۆژی ئازادی چاپەمەنی لە ولاتە یەکگرتووەکان لە سەدەی بیستەمدا (تێزی ڕووخساری گشتی)یە کە لەلایەن دادگای باڵاوە لە چەند دۆسییەیەکی سەرنجڕاکێشدا لە ساڵانی دەیەی (1960و1970و1980) فۆرمەڵە بووە. بنەمای بنچینەیی ئەم تێزە ئەوەیە کە کەسێکی مامناوەند (واتا کەسێك کە بەناوبانگ نییە یا هەمووان ناوی نازانن) پاراستنێکی زیاتری لەهەمبەر ڕەخنەی چاپەمەنیدا هەیە تا ڕووخسارێکی گشتی.

لەلایەکی ترەوە کەسایەتییەکی بەناوبانگ و

ناسراو، دەبێ باشتر بەرگەی بابەتگەلە شەرمهێنەرو ڕەخنەییەکانی ئامرازەکانی ماس میدیا بگرێت، تەنانەت ئەگەر درۆش بێت مەگەر ئەوەی کە ئەو بتوانێ بیسەلمێنێت بڵاوکەرەوەی ئەو قسانە بە مەبەستێکی خراپ بەکاریهێناوە.

بۆ ئەم مەبەستە (مەبەستی خراپ) پێناسە بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەیەك یا گۆڤارێك کە نوسەر، ئامادەکار یا بێژەر (لە ڕادیۆو تەلەفزیۆندا) لەکاتی بڵاوکردنەوە یا پەخشکردنیدا ئاگاداریی ئەو درۆیە بووبێت. هەروەها (مەبەستی خراپ) بەم چەشنەش دەوترێ ئەگەر نوسەر، ئامادەکار یا بێژەر بەبێ لەبەرچاوگرتنی ڕاستی یا درۆی تێڕوانینەکە کاری پێ بکات. زۆرینەی ئەو دۆسیانەی کە لەژێر ناوی (تێزی ڕووخساری گشتی) دەخرێتەڕوو لەم ڕووەوە بایەخی پێدەدرێت کە ئایا ئەو کەسەی بانگەشە دەکات تۆمەتیان بۆ هەڵبەستووە یا ئابڕوویان بردووە، لە ڕاستیدا لەلایەن دادگاوە بە ڕووخسارێکی گشتی ناودەبرێت یان نا. کاتێك کەسەکە وەك ڕووخسارێکی گشتی بناسرێت، کێشەیەکی زۆر گەورەیە کە بتوانرێ بسەلمێندرێت تۆمەتی دراوەتەپاڵ.

ڕەنگە ئەو مەسەلەیەی کە پتر لەهەمووان ناسێنەری کێشەی (تێزی ڕووخساری گشتی) بێت، ڕیکلامێك بێت کە لە سەرەتاکانی دەیەی (1960) بودجەکەی لەلایەن گروپێکەوە درا کە دەیانویست یارمەتی سەرکردەی بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکان (مارتین لۆتەر کینگ) بدەن. ئەم ڕیکلامە ئاماژەی بۆ ئەم حەقیقەتە کردبوو کە بەرپرسە سەربازییە ناوچەییەکان لە سەرتاسەری ناوچەکانی باشوردا لەڕیزیاندا مۆنتگۆمری لە ئەلاباما، کینگیان ئازار داوە. (ئەل بی سۆلیڤان) بەرپرسی گشتی سەربازیی لە مۆنتگۆمری بەهۆی ئەو تۆمەتەوە شکاتی لە ڕۆژنامەی (نیویۆرك تایمز) کردو واخستیەڕوو کە ئەو ڕیکلامە دەربڕینی زیادەڕۆیی و تۆمەتگەلێکی لەخۆگرتووە کە لەوانەیە ببێتەمایەی ئەوەی کە خەڵك تێڕوانینێکی ڕەخنەئامێز لەهەمبەر ئەودا دروست بکەن. دادگا بڕیاری دا کە (نیویۆرك تایمز) لەو ڕیکلامەدا دووچاری کۆمەڵە هەڵەیەك بووە کە لەڕووی مەبەستێکی باشەوە بووە نەك خراپ و (سولیڤان) وەك ڕووخسارێکی گشتی ڕێگەی پێنادرێ سزا لە ڕۆژنامەکە وەربگرێت. پتر لە (20)ساڵ دوای ئەوە، سەرلەنوێ داوا لە دادگای باڵا کرا کە ئەگەری تۆمەت دژ لە ڕووخسارێکی گشتی شرۆڤە بکاتەوە.

*Jerry Falwell*ی کەشیشی موحافیزکاری بەناوبانگ لە گۆڤارێکی سێکسیدا کرابووە بیرۆکەی (ریکلامێکی گاڵتەئامێز)، لەم ڕیکلامەدا ڕاستییەکان دەربارەی *Jerry Falwell* بەشێوەیەکی سەیر درۆ بوو. بەرلەوە فالول بانگەشەی ئەوەی کردبوو کە زیانێکی زۆر بەر ناوبانگی ئەو کەوتووە. ئەگەرچی دادگا بە قازانجی گۆڤارەکە دەنگی داو بەڵگەی ئەوەی هێنایەوە کە ئازادی چاپەمەنی مەیدانێکی کارکردنی بەرفراوانی خستۆتە بەردەم کارکاتێریست و ئەوانەی کە کاریکاتێری کەسایەتییە گشتییەکان دەکێشن.

***هیرارکییەتی پرەنسیپەکان**

دادگاکانی ئەمریکا لە دەرکردنی بڕیارە فراوانەکانی خۆیاندا لەهەمبەر ئازادی دەربڕین و چاپەمەنی، بە درێژایی ساڵان بەشێوەیەکی گشتی پرەنسیپێکی زیاتری بۆ پەیامە سیاسییەکان داناوە تا جۆرەکانی تری دەربڕین. ئەم مەسەلە سەرسوڕهێنەر نییە چونکە دیموکراسی ئەمریکا لە دوادوای سەدەی هەژدەهەمدا تائەندازەیەک کوڕی ڕەخنەگرتنی سیاسیانەی فەرمانڕەوایەتی بەریتانیا بەسەر ئەمریکای باکوردا بوو. ڕێکەوت نییە کە تاهەنوکە زۆرینەی ئەو دۆسییانەی جێگەی مشتومڕ بوون، تێڕوانینە سیاسییەکان بوون بەڵام ئەگەر وادابنێین دەربڕینێکی سیاسی بەسەر ئەویتردا زاڵ بێت، لەم هیرارکییەتەدا کام فۆرمی دەربڕین لەهەمووان نزمتر دادەندرێت؟

فۆرمێکی دەربڕین کە لەلایەن دادگاکانەوە لە ئاستێکی نزمتردا دادەندرێت، گوتاری بازرگانییە. دادگای باڵا هەمیشە بڕیاری داوە کە ڕیکلامە پڕوپاگەندەییەکان لەکاتێکدا لەلایەن یاسای ڕیفۆرمکراوی یەکەمەوە پشتیوانی لێ دەکرێت کە ڕاست بێت. بەمپێیە زیادەڕۆیی وتن و هەڵە ڕاستەقینە بچوکەکان کە لەوانەیە لە دەربڕینە سیاسییەکاندا بسەپێندرێن، کاتێک لە بواری ڕیکلامێکی پڕوپاگەندەیی تەلەفزیۆنی وەک ددانشۆرێک یا ئۆتۆمبێلە زۆر گەورەکان بێت پارێزگاری یاسایی لێ ناکرێت. ئەم کارە تائەندازەیەک لەبەر ئەو هۆیەیە کە سەلماندنی بانگەشە پڕوپاگەندەییەکان ئاسانترە لە سەلماندنی تێڕوانینە سیاسییەکان. سەرەڕای ئەوە بەگشتی دادگا ئەمریکییەکان لەوە تێگەیشتوون کە پاڵنەری بەهێز بۆ سودوەرگرتن لە دۆزینەوەی بازاڕ بۆ کاڵاکان و خزمەتگوزارییەکان سەرکەوتوو دەبێت بەسەر هەر دەرەنجامێکی دڵساردکەرەوە کە لە بڕیارە دەوڵەتییەکانەوە سەرچاوە دەگرێت.

جۆرێکی تری دەربڕین کە لە پێوەری پرەنسیپی دادوەریدا تەنانەت لە ئەمەش نزمترە بێشەرمییە. لە دۆسییەی (***Roth***) دژ بە ولاتەیەکگرتووەکان لە ساڵی (1975)دا دادگای باڵا بابەتەکانی دژ بە داوێنپاکی و پۆرنۆگرافی واتا بلاوکردنەوەی وێنەی ئابڕووبەرانە (تەواو بێ بەهای کۆمەڵایەتی) دۆزییەوەو بەمپێیە ئەوانەی خستە ڕیزی دەربڕینە پارێزگارییی لێنەکراوەکانەوە. مەسەلەی ئابڕوو بردن بەگشتی بابەتێک بووە کە باسوخواسێکی بەرفراوان لەسەر پێناسەکەی کراوە. ئابڕووبردن لە ڕوانگەی کەسێکەوە مەحاڵ بێت و لە ڕوانگەی کەسێکی ترەوە شاکارێکی هونەریی بێت. لە ڕوانگەی هەندێ کەسەوە کتێبی وەک (***Ulysses***)ی بەرهەمی (جیمز جویس) بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ هەستورووژێنەرو ناپەسەندە، بەڵام لەم دوادواییەدا لە ئامارێکی ئەدەبیدا ڕووناکبیران ئەو بەرهەمەیان بە مەزنترین بەرهەمی ئەدەبی زمانی ئینگلیزی لە سەدەی بیستەمدا هەژمار کرد. کاتێک (پاتری ستیڤارت)ی دادوەری باڵا لە ساڵانی ناوەراستی (1960) لە پرۆسەی دۆسیەیەکدا ئاشکرای کرد کە ئەگەری ئەوە هەیە نەتوانێ (ئابڕووبردن) پێناسە بکات، ئەمە زمانحاڵی زۆرینەی

ئەمریكییەكان بوو، بەڵام خودی ئەو وتی:"كاتێ دەیبینم دەستنیشانی دەكەم".

بەداخەوە تێڕوانینی كورت و سادەی دادوەر (ستیڤارد) پێوەرێكی یاسایی كاریگەر بۆ هەڵسەنگاندنی بەرهەمی هونەریی نادات بەدەستەوە، دادگای باڵا بەتوندی و بەهێزەوە هەوڵی داوە كە بەم پێوەرە بگات. لە ساڵی (1973) دادگای باڵا پێوەرێكی سێ بەشی لەپێناو ناسینی ئابڕووبردندا پوختە كردوو هەندێ لە دەربڕینە دیاریكراوەكانی بە دەرەوەی سنورەكانی پرەنسیپی دەستور هەژمار كرد كە بریتین لە:

1-كەسێكی ئاسایی بە سودوەرگرتن لە ستاندارەكانی كۆمەڵگەیەكی لۆكاڵی، بەرهەمەكەی بەشێوەیەكی گشتی و بەشێوەی یەكپارچە لە ڕوانگەی شەهوانییەوە كۆششی زۆری تیادابكات.

2-بەرهەمەكە ڕەفتارێكی سێكسی (بەشێوەیەكی ئاشكرای تۆمەتباركەرانە) نیشان بدات یا بیخاتەڕوو.

3-بەرهەمەكە بەهایەكی جددی ئەدەبی، هونەریی، سیاسی یا زانستی تیادا نەبێت. بەلەبەرچاوگرتنی ئەم ستاندارە گرنگانە سەیر نییە كە فەرمانی دادگا لەبارەی ئابڕووبردنەوە لە ماس میدیادا لە ماوەی ئەم سێ ساڵەی دواییدا ڕوویەكی ڕۆشنی نەبووبێت. لە زۆرینەی بوارەكاندا، نەبوونی لێبڕاویی و بێبڕیاریی دادگا، بەشێوەیەكی گشتی ڕەنگدانەوەی كۆمەڵگەی ئەمریكییە كە لە نێوان لایەنگریی بۆ ئازادییەكی تەواو و بێ قەیدومەرج لەلایەك و پارێزگارییە كۆمەڵایەتییەكان لەلایەكی ترەوە دابەش بووە.

***كۆكردنەوەی هەواڵەكان و ڕیفۆرمی یەكەم**

پرۆسەی كۆكردنەوەی هەواڵەكان كە بەرلە بڵاوبوونەوە یا پەخشكردنیشیانەوە ئەنجام دەدرێت، بەزۆریی بۆتە جێگەی شرۆڤەی دادگا ئەمریكییەكان. دادگای باڵا لە ساڵی (1972) بڕیاری دا كە دەكرێ ڕیپۆرتەرەكان پابەندی ئەوە بكرێن كە سەرچاوە تایبەتییەكانی خۆیان بۆ لیژنەكانی دادوەریی ئاشكرا بكەن. ئەگەرچی لە ساڵی (1991) دادگای باڵا ڕایگەیاند كە ئازادی چاپەمەنی ڕێگە لە ئەیالەتەكان ناگرێت سكاڵا تۆمار بكەن دژ بەو ڕیپۆرتەرانەی بەڵێنی بەنهێنی هێشتنەوەی سەرچاوەكانی خۆیان پێشێل دەكەن[1]. دادگاكانی ئەمریكا بەگشتی وابڕیار دەدەن كە پرۆسەی بەدواداچوونیان بەڕووی گشت خەڵك و چاپەمەنیدا واڵا بێت، مەگەر جێ‌پێی بەرژەوەندییەكی كامڵ لەئارادا بێت، وەك مافی تۆمەتبار بۆ دەستەبەركردنی دادگایەكی دادپەروەرانە كە شیاوی گرەنتی نەبێت و دادگا ناچار بێت لە پشت دەرگا داخراوەكانەوە دانیشتن بكات. ڕەنگە یادەوەرییە مێژووییەكەی ئەو دادگا تایبەتانەی سەدەكانی شانزدەهەم و هەڤدەهەم (دادگای مەدەنی و تاوان)ی بەریتانیا بێت كە وا لە دادوەرانی ئەمریكایی دەكات تا بەم بنەمایە لە پشتڕاستكردنەوەی دادگا داخراوەكاندا ڕابمێنن. دادگای باڵا تەنانەت ئەو مافەی دادوەریی ئەیالەتیش دەزانێت كە ئەگەر بەگونجاوی بزانن ڕێگە بە كامێرای

تەلەفزیۆنیش بۆ دادگاكانی خۆیان بدەن تا پرۆسەی بەدواداچوونەكەیان تۆمار بكەن. ئەگەرچی هەندیَ هەلومەرجیش هەیە كە مافی ماس میدیا بۆ خستنەرِووی پرۆسەی دادوەریی بە كەمتر لە مافی تۆمەتبار دێتەبەرچاو. بۆنمونە دەربارەی ژیانی تایبەتی كەسەكان، ناسنامەی لاوانی تۆمەتبار بە تاوانە قورسەكان بەگشتی لە بەدواداچوونەكانی ماس میدیا دەشاردرێنەوە.

بەدرێژایی سالان، ولاتە یەككگرەتووەكان وەك دیموكراسییەكانی تر شایەتحالی ئەوە بوو كە گۆرِانكارییە تەكنەلۆژییەكان، پرەنسیپە یاساییەكەی خستۆتە ئاستەنگەوە. دادگا ئەمریكییەكان بەگشتی پرەنسیپێكی زیاتریان بۆ میدیا چاپكراوەكان وەك رۆژنامە داناوە تا میدیا وتراوەكان وەك تەلەفزیۆن. بەمپێیە بۆنمونە دادگای بالا لەم سالانەی دوایی دەیەی (1960) برِیاری دا كە كەس خاوەنی مافێكی رەهای یاسای كۆمیونیكەیشن لە رێگەی پەخشی قسەوە نیە، چونكە (شەپۆلی ئەلیكترۆمگنتیك) هەموو وەرگرەكان ناگرێتەخۆ. ئەم لۆژیكە بووە بنەمایەك بۆ برِیاری دادوەریی كە دەستی پالێوراوەكانی كارە رەسمییەكانی بۆ دەستەبەركردنی (كاتێكی یەكسان) لەپێناو وەلامدانەوەی بەیاننامە تەلەفزیۆنییەكانی پالێوراوەكانی تردا والا دەكرد. ئەگەرچی بەلەبەرچاوگرتنی پەرەسەندنی تەلەفزیۆنە كێبلێیەكانو بوونی ئینتەرنێت لەهەموو شوێنێكدا، پێدەچێ دادگاكان بەرەو بەیەك زانینی ئامرازی پەخشی قسە لە هەمان ئاستی یاسای میدیای چاپكراودا لە جولاندان.

***نامەكانی پنتاگۆن (وەزارەتی بەرگری ئەمریكا)**

رەنگە گرنگترین دۆسییەی ئەمریكایی پەیوەندیدار بە ماس میدیا لەم پەنجا سالەی دواییەدا، دۆسییەی ناوبراو بە نامەكانی پنتاگۆن بێت. ئەم مشتومرِەی نێوان دەولەتی ولاتەیەككگرتووەكان و رۆژنامەی (نیویۆرك تایمز)ی بەناوبانگترین رۆژنامەی ولاتەكە، نمونەیەك لەو مشتومرِە زۆرە سەنگینانەمان بەدەستەوە دەدات كە پەیوەندیدارن بە چاكسازی یەكەمەوە هەیە كە پێشتر قسە لەبارەیەوە كراوەو رەنگە مشتومرِئامێزترین باسوخواسی سیاسی ئەم سالانەی دواییش بێت واتا رِێبازی ئەمریكا لە جەنگی ڤێتنامدا.

رەگورِیشەی ئەم باسە دەگەرِێتەوە بۆ (1967)، كاتێك كە (رۆبەرت مەك نامارا)ی وەزیری بەرگریی لیژنەیەكی تایبەتی راسپارد كە كورتە مێژوویەكی سیاسەتەكانی ئەمریكا لە ڤێتنام لە قۆناغی سالانی (1945 تا 1967) كۆبكاتەوە. ئەم لیژنە تایبەتییە پێكهاتبوو لە خودی وەزیری بەرگریو كەسانی دامەزراوە دەولەتییەكانی ترو ژمارەیەك لە بەلێندەرە سەربەخۆكان. هیچ هەڤپەیڤینێك لەمبارەیەوە رِووی نەدا، هەموو توێژینەوەكان لە دیكۆمێنتە بەردەستەكان دەرهێنرابوون. ئەنجامە بەدەستهاتووەكەی رِاپۆرتێكی سەنگین بوو كە لە پتر لە (7,000) لاپەرە بوو و لە سالی (1969)دا تەواوبوو.

ئەم رِاپۆرتە بە نامەكانی پنتاگۆن ناسرا، تەنها (15) دانەی لێ چاپ كرا چونكە مەبەست

لـێی تـەنها سـودوەرگرتنی نـاوخۆیی وەزارەتـی بەرگریی و دامەزراوە دەوڵەتییەکانی تر بوو.

یـەکێك لـە بەڵێنـدەرەکان کـە رۆڵێکـی بـچوکی لـە بەرهـەمهێنانی ئـەم راپـۆرتـە تێروتەسـەلەدا هەبوو، (دانێك ئەلزبێرگ)ی دامـەزراوەی (***Rand***) بـوو کـە دامەزراوەیـەکی لێکۆڵینـەوەیی بـوو، کارەکـەی شـرۆڤەکردنی مەسـەلەکانی بـەرگریی میللی بوو.

بەشـێك لـە گومـانی ئـەلزبێرگ دەربـارەی سیاسەتی ئەمریکا لە ڤێتنام لەوەوە سەرچاوەی دەگرت کە لە نامەکانی پنتاگۆندا باس کرابوو. دوای ئەوەی سەرکەوتوو نەبوو لە رازیی کردنی ئەنـدامانی کـۆنگریس بـۆ ئاشـکراکردنی ئـەم لێکۆڵینەوەیە، ئەلزبێرگ رۆنوسێکی نهێنیانەی تـری لـەم راپـۆرتـە ئامـادە کـردو خـستییە بەردەسـت رۆژنامەنوسـانی (نیویـۆرك تـایمز)و (واشـنتۆن پۆسـت). نامـەکانی پنتـاگۆن ناوەرۆکەکەی زانیارییـەکی کـەم نهێنی تێدابوو بـەڵام هەنـدێ لـە بەشـەکانی گومـانی لـەبارەی ئاقڵانـەبوونی سیاسـەتەکانی ئـەمریکا سـەبارەت بە ڤێتنام دروست دەکرد هـەم پێش و هـەم دوای شـەڕی چـەکدارانەی ولاتەیـەکگرتووەکان لـە باشوری خۆرهەڵاتی ئاسیا.

لە حوزەیرانی (1971) رۆژنامـەی (نیویۆرك تـایمز) دوو بەشـی لـە نامـەکانی پنتـاگۆن بلاوکـردەوە بەرلـەوەی دەزگـای لێپرسـینەوەی پریزدێنت ریچارد نیکسۆن داوا لە دادگا بکات. بڕیـاری بلاونەبوونـەوەی پاشماوەکـەی بـدات. دادوەرێکی فیدراڵی نیویۆرك بڕیاری داخستنی دەرکـرد تـا بەدواداچـوونێکی تەواوەتیانـە بـۆ مەسـەلەکە دەکرێت. ئەمـە یەکـەمینجار بـوو لـە مێـژووی ئـەمریکادا کـە دادگایـەکی ولاتەیەکگرتووەکان پێشتر رێگە لە رۆژنامەیەك بگرێـت وتـارێکی تایبـەت بلاوبکاتـەوە[2]. ئەمـە نمونەیـەکی کلاسـیانەی قەدەغـەکردنی بەرلەبلاوبوونـەوە بـوو. بـەزوویی دۆسـییەکە رێگـەی خـۆی بـۆ دادگـای بـاڵای ولاتـە یەکگرتووەکان واڵا کرد. دوای ئەوەی داواکاری وەزارەتی دادوەریی بۆ بەدواداچوونی نهێنیانە رەت کرایەوە، دادگا رێگەی دا کە دادگاییەکە لە (26ی حوزەیرانی 1976)دا بەشێوەی ئاشکرا بێـت. دادگـا تـەنها چـوار رۆژ دوای ئـەوە بڕیارەکـەی خۆی راگەیاند. زۆرینەیـەکی شـەش کەسی (بەبێ ئەوەی ناوی ئەندامانی ببردرێت) بەیاننامەیـەکی کورتیـان دەرکـرد کـە لەبنەڕەتـدا دەیـوت هـەرجۆرە تێهەڵـچوونەوەیەك لـەپێناو دەسـتگیرکردن بەرلـەوادەی خـۆی، سـزایەکی گرانـی لـە بڕیارەکـانی دەسـتوردا بەدواوەیـە. لەمبارەیەوە دامەزراوەی لێپرسینەوەی نیکسۆن ئـەوجۆرە هەلومەرجـە فەراهـەم ناکـات. لەبەرئەوەی هـەرکام لـە شـەش کەسە زۆرینەکە بـەرەی بیروباوەڕەکـانی خۆیـان بەشـێوەیەکی جیـاواز نوسـی، کێـشەیە کـە بتـوانرێ (هێڵـی درەخشان ***the bright line***) دەستنیشان بکرێت کـە دڵـی بڕیـاری دادوەریـی روون دەکاتـەوەو دادوەرو لیژنـەی دادوەریـی هەنـدێکجار ئاماژەی بۆ دەکەن. تەنها شتێ کە بەشێوەیەکی لێبڕاوانە دەتـوانرێ بخرێتـەڕوو ئەمەیـە کـە زۆرینـە نەگەیـشتبوونە ئـەم دەرەنجامـەی ئاشـکراکردنی ئەم زانیاریانەی نامەکانی پنتاگۆن دەبێتەمایـەی "زیـانی راسـتەوخۆو بەپەلـەو قـەرەبوو نـەکراوە" بـۆ ئاسایـشی نەتـەوەیی. زۆرینـەی

دەستەبژێرەکانی دەستور، بڕیاری دادگایان لەبارەی دۆسییەی نامەکانی پنتاگۆنەوە وەك (سەرکەوتن دوای شکستی ماڵە تێکدەرەکان) بەتایبەتی لەپێناو ئازادی چاپەمەنیدا ناوزەدیان دەکرد. دادگای باڵا بایەخی تەواوی بەوەنەدابوو کە بڵاوبوونەوەی ئەم دیکۆمێنتانە ڕابوەستێنێت، بەڵام بەڵگەهێنانەوەی دەوڵەتی قبوڵ کرد کە دەتوانرێ بڕیارێك بۆ پاراستنیان دەربکات.

بەمشێوەیە رەنگە دواتر بەڵگەنامەیەك لەسەر زیانمەندبوونی بڵاوبوونەوەی ئەم بەڵگەنامانە بخرێتەڕوو، کۆتایی نمایشەکەش بەمجۆرە بوو کە سەرەنجام نامەکان لەلایەن نیویۆرك تایمز، واشنتۆن پۆستو رۆژنامەکانی تری سەرانسەری وڵاتەوە بڵاوبۆوە. ئەم کارە هیچ مەسەلەیەکی ئاسایشیانەی نەهێنایەپێش.

***ڕەنگدانەوەی دەوڵەت**

بەشێوەیەکی کورت، ماس میدیا خاوەنی کورتە مێژوویەکە لەپێناو تاقیکردنەوەی توانستی گۆڕانی بابەتەکانی پەیوەندیدار بە ئازادی دەربڕینو ئازادی چاپەمەنی لە ڕیفۆرمی یەکەم، بەمشێوەیە هەر جۆرە مەبەستێکی پەیوەست بە سنورداركردنی دەسەڵاتیان لە گرتنەخۆوو سیاسەتو کۆمەڵگایان دەخستە ئاستەنگەوەو بە یەکگرتوویەوە جەختیان دەکردەوە کە (خەڵك مافی خۆیانە بزانن). ئەمە شتێکە کە دەبێ هەبێت، لەبەرئەوەی کۆمەڵگای ئازاد -تەنانەت ئەو چاپەمەنیانەی کە هەندێکجار باشێتی سەلیقە دەخەنەلاوە- بۆ پاراستنی کۆمەڵگایەکی ئازاد ژیاریانەن.

تۆماس جیفرسۆن ئەو چەشنە چاپەمەنیانە بە باشترین گرەنتیدەرەکانی ئازادیی دەزانێو حەزی دەکرد لەپێناو بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکانی رەخنەگرێکی هەمیشەیی کە دەتوانێ رەوتی چالاکییەکانی دەوڵەت ڕوون بکاتەوە، لەگەڵ زیادەڕۆییەکانیشیدا بگونجێت. هەموو دیموکراسییەکان خاوەنی ئەو دەمارگیرییەی وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ چاپەمەنییەکی بێکۆتو بەند نییە، و لە ڕاستیدا تەنانەت دادگاکانی ئەمریکاش لە کاتێکدا حەز دەکەن بەشێوەیەکی یارمەتیدەرانە ئازادییەکی باشتر بە ماس میدیا بدەن، بەشێوەیەکی جێگیرو یەکڕیتمیش پشتیوانیان لە ئازادییەکی بێکۆتو مەرج نەکرد. ڕێگە بدەن بۆ پرەنسیپێك بگەڕێینەوە کە لە سەرەتای ئەم وتارەدا شرۆڤەمان کرد: بۆئەوەی میللەتێ بەڕاستی بە ئازاد هەژمار بکرێت، دەبێ ئامادە بێت ئازادییەکی زۆر بە ماس میدیا بدات کە بیروباوەڕو تێڕوانینە جۆراوجۆرەکان بخاتەڕوو. لەکاتێکدا پێشینەی ئەمریکا لەم کارەدا کاملٌو بێ کەموکوڕی نییە، ئینتیما توندەکەی بۆ ئەو شتەیە کە دادوەری باڵا (ئۆلیڤەر وێندڵ هۆڵمز) لە ساڵی (1919) وەك (ئەزموون)ی ئەمریکایی لە تیۆری دەستوردا خستوویەتەڕوو و دەیەوێ بەشێوەیەکی گەشەکردووانە چانسو ئازادی بە بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕەکان بدات.

**پەراوێزەکان:**

1-گەورەنگترین ئەخلاقی رۆژنامەنووسی لە پرۆژەی ئەخلاقی رۆژنامەنووسی سەرجەم سەندیکاو

گروپەکانی تایبەت بە رۆژنامەنووسان، پاراستنی سەرچاوەیە (و-ك).

2-واتا هەرگیز سانسۆری پێش بڵاوبوونەوە لە ئەمریکادا نەبووە، بەڵکو سانسۆری دوای بڵاوکردنەوە هەبووە بە مانای سانسۆرێکی دیموکراسیانە دێت(و.ك).

## بۆ خوێندنەوەی زیاتر:

*Zechariah Chafee, Free Speech in the United States (Harvard University Press, 1967)*

*Fred W. Friendly, Minnesota Rag: the Dramatic Story of the Landmark Supreme Court Case that Gave New Meaning to Freedom of the Press (Random House, 1981)*

*Leonard Levy, The Emergence of a Free Press (Oxford University Press, 1985)*

*Paul L. Murphy, The Meaning of Freedom of Speech (Greenwood Publishing, 1972)*

*Paul L. Murphy, World War I and the Origin of Civil Liberties in the U.S. (W.W. Norton, 1979)*

*Richard Polenberg, Fighting Faiths: The Abrams Case, the Supreme Court, and Free Speech (Viking Press, 1987)*

*S.J. Ungar, The Papers & The Papers: An Account of the Legal and Political Battle Over the Pentagon Papers (E.P Dutton, 1972)*

***About the Author:***

***John W. Johnson has served as head of the Department of History at the University of Northern Iowa since 1988. He is the author of. He is currently working on a book on privacy in American life .***

## دەربارەی نوسەر

جۆن. دەبلیو. جۆنسۆن (***John W. Johnson*** ) لە ساڵی 1988 وەك سەرۆکی بەشی مێژوو لە زانکۆی ئەیوای باکور خزمەتی کردووە، ناوبراو نوسەری ئەم بەرهەمانەیە

***Historic U.S. Court Cases: An Encyclopedia (2nd edition 2001), The Struggle for Student Rights: Tinker v. Des Moines and the 1960s (1997), Insuring Against Disaster: The Nuclear Industry on Trial (1986***), و ***American Legal Culture, 1908-1940 (1981)***

ناوبراو لەم دوادواییەدا لەسەر پەرتوکێك لەبارەی ژیانی تایبەتی لە ولاتەیەکگرتوەکانی ئەمریکادا کار دەکات.

# فایلی ژماره

# -لیبرالیزم-

# وشەیەك بۆ لیبرالیزم

لیبرالیـزم، بەدرێـژایی سـەدەی رابـردوو، خـاوەنی دەنگێکـی نـزمو شـەرمن بـووە لـە واقعـی رۆشـنبیریو سیاسـی کوردیـدا. لـە بەرامبـەردا سێ دەنگـی بـەرز هەمیـشە بـە متمانەیـەکی زۆرەوە کاریـان لەسـەر سێ ژێـی هەسـتیارکردووە: نەتـەوە، چـین، ئـاین..، یـان وردتـر: هـەر سێ دەنگـی پێکاهەڵپژاوی ناسیۆنالیستو مارکسیو ئاینییەکان، کە ئەگەر لەسەر هیچ شتێك کۆك نەبووبن لە دژایـەتیکردنی لیبراڵیـزمو بـەنزم تەماشـاکردنی هـاوڕا بـوون. تەنانـەت کەسـانێکی زۆر لـە زمـانی کوردیـدا گەمـەیان بـە پیتـەکانی وشـەی (لیبراڵـی) کـردووە بەمەبەسـتی نزیککردنـەوەی لـە وشـەی (بەرەڵایی).

ئـەم فایلـەی گۆڤـاری سـەردەم پـاش زنجیرەیـەك فایـلو تـەوەری تـر دێ دەربـارەی مارکـسیزمو فەلسەفەی دەوڵـەتو کۆمـەڵگاو ململانێی نێوان سکیۆلاریزمو فەندەمێنتاڵیزم..، واتـە هەوڵێکـە بـۆ بەردەوامیـدان بـە بیرکردنـەوەی سیاسـی، لەسـەر هـەموو ئاسـتو رەهەنـدەکان، وەك شـەڕێکی شارستانی دژی ئـەو لۆجیکـە سـەرەتاییەی کـە سیاسـەت لـە هونـەری رامکـردنو دەسـتەمۆکردنو پێڕەوکردنـی دەسـەڵاتی پەتیـدا کورتدەکاتـەوە، نـەك هونـەری بیرکردنـەوەو رێکخـستنی ئـەقڵانیو پێکەوەگونجانی دەسەڵاتو بەرژەوەندیەکان.

بایەخی لیبراڵیزم، چ وەك رێچکەیەکی سیاسیو چ وەك دنیابینیـەکی فەلسەفی، لەوێوە دەست پێدەکا کە تاکەکەسو بەرژەوەندیو ئازادیە فەردیەکان دەکاتە بەردی بناغەی هەر گردبوونەوەیـەکی کۆمەڵایـەتیو سیاسـیو سـەرەتای هـەر بەرژەوەندیـەکی بـاڵاو پیرۆز. لای لیبراڵیـەکان هـیچ بەهایـەك سروشـتی نیـەو پێـوەری هـیچ کـارێکی بـاشو خـراپ پێشوەخت نیـە، تاکـە شـتێك کـە سروشـتیو پێشوەختە ئازادیی مرۆڤە، ئیتر هەموو بەهاکانی تر هـەوڵێکن بۆ تەرجەمـەکردنی ئەو بەهایـە، بەڵام لەژێر ناوو پەردەی جیاوازدا. کەواتە هیچ دەسەڵاتێك، ئیتر دەسەڵاتی دەوڵەت بێ یـان کۆمەڵگـە یـان دەسـەڵاتی نـەریتو رای گـشتی، بـۆی نیـە رەوایـەتی ببەخـشێتە کردەوەیـەك یـان هەڵوێـستێك کـە بازنەی ئازادیەکان بەرتەسك بکاتەوە.

ڕەواترین دەسەڵات، بەم مانایە، ئەو دەسەڵاتەیە کە کار بۆ پاراستنی ئازادیەکان لەلایەکو فراوانکردنی لەلایەکی ترەوە دەکا. کەواتە شەرعیەتو شارستانیەتی هەر دەوڵەتێك بە ژمارەی کەسە ئازادەکان دەپێورێ. لەو پێناوەدا دەبێ سیستمی سیاسیو کۆمەڵایەتی بەجۆرێك ڕێکبخرێ ئازادیەکان تێکەڵی یەکتر نەبنو ئازادی هیچ کەسو هیچ گروپێك لەسەر حسابی ئازادیی کەسو گروپەکانی تر نەبێ. چونکە تەنها یەك جۆر لە ئازادی ساختەو ترسناکە، ئەویش (ئازادیی پێشێلکردنی ئازادییە)، تەنها یەك جۆر ڕێگریش ڕەواو پێویستە، ئەویش ڕێگرتنە لەو ئازادییەی کە دەبێتەهۆی پێشێلکردنی ئازادی. لێرەوە گرنگترین ئەڵقەی گواستنەوە دەست پێدەکا لە ئازادیی تاکەکانەوە بۆ ئازادیی کۆمەڵایەتیو لە بەرژەوەندییە تایبەتەکانەوە بۆ بەرژەوەندی گشتی. بەڵام ئەوەی ئەم ئیلتزامە گشتییە دروست دەکا خودی ئیلتزام نیە، بەڵکو ئەوە ئازادییە ماناو ڕەوایەتی دەبەخشێ بە ئیلتزام نەك شتێکی تر.

-گۆڤاری سەردەم-

# ليبراليزم

له فەرەنسیەوە: د. ئەلبێرت عیسا

له سیاسەت و مێژووی مرۆڤایەتی ئەم چوار سـەدەیەی دواییـدا، لیبرالیـزم بـوە بـە ئیلهامبەخشی زۆر لـە جووڵانـەوەو بزووتنـەوە سیاسـیەکانی ئـەوروپا و ئـەو وڵاتانـەی کـە کاریگەری کولتوری ئەوروپایان بەسەرەوە بوە. بـەم واتایـە، دەتـوانین بڵـێین بـە هـۆی رۆڵـی سەرەکی له ناو سیاسەتی ئەوروپیدا، ناتوانین پێناسـەیەکی تـەواوی لیبرالیـزم بکـەین بـە بێ ئـەوەی بیبەسـتینەوە بـە شارسـتانیەتی ئەوروپییـەوە، هـەر لـە فەلەسـوفەکانی پـێش سۆکراتەوە هەتا دەگاتە سەردەمی هاوچەرخ. له راستیدا کێشەی پێناسەکردنی لیبرالیزم لەوەوە سەرچـاوە دەگـرێ کـە دوژمنـە هـەرە سـەرەکیەکانی، کـە بـریتین لـە رادیکالـەکان و موحافیزەکان، هەر یەکە گەیشتۆتە هەڵوێستی نـالیبرالی یـان دژ بـە لیبرالیـزم لەسـەر بنـچینەی دەروازە سـەرەکیەکانی لیبرالیـزم خـۆی. بـەم شـێوەیە، پارێزەرەکـان چوارچـێوەیەکی پـارێزەرتر دەبەخـشن بـە لیبرالیـزم و رادیکاڵـەکانیش زێـدەڕەوی تێـدا دەکـەن. ئـەم هەڵوێستە، له ئەنجامدا گێرەشێوێنیەك دروست دەکـات کـە هـەوڵی جیاکـاری سـەخت ئـەدات و رێگـە دەگرێـت لـەوەی کـە بزانـرێ ئایـا هەنـدێ بیرمەندی سیاسی، لیـبراڵ بـوون یـاخود نـالیبراڵ یـان دژ بـە لیبرالیـزم. بـۆ نمونـە، ئایـا تۆمـاس هۆبس یـان ئیمانوێل کانت یـان ئیدمۆند بێرك، لیبراڵ بوون؟ جگە لەمەش، له میانەی مێژوییدا، لیبرالیزم چەندین جلی گۆڕیوە و چەندین جلـی دیکـەی لەبـەر کردۆتـەوە. بـەپێی شـوێن و بـارو دۆخ و سـەردەمی جیاواز، لیبرالیزم بە چـەندین شێوە هاتۆتە پێشەوە. بەم شێوەیە، لیبرالیزمی سـەردەمە سـێکۆلارەکان روخـساری خـۆی بـە شـێوەیەکی جیـاواز لـە لیبرالیزمـی سـەردەمە ئاینیـەکان دەرخـستوە. هـەروەها، لیبرالیزمـی وڵاتـە کاتۆلیکـەکان لـە ئەوروپا ئەوەنـدە هاوشێوە نـەبوە لەگـەڵ ئـەوەی وڵاتـە پرۆتـستانتەکان. لیبرالیـزم وەك قوتابخانـەکانی دیکـەی بـیری سیاسـی، بـەش

بەش بوەو لەبەر ئەوە ناتوانرێ پێناسەیەکی لەیەکچووی بۆ بکرێ.

لەسەر بناغەی ئەم بۆچوونە، دەتوانین چەند جیاکاری و پێناسەیەك پێشکەش بکەین. یەکەم، لیبرالیزمی ئەورووپی سەردەمی کلاسیك جیاوازە لەوەی ئەمڕۆ. لیبرالیزمی دێمۆکریت یان ئەوەی لوکرێس، "لیبراڵ" نیە بەو واتایەی کە ئەمڕۆ دەیبەخشین پێی. "لیبراڵەکانی" سەردەمی یۆنانی کۆن جیاواز بوون لەوانەی فەیلەسوفە سۆکراتیەکان چونکە ئەوانەی یەکەم بە جیاوازی لە فەیلەسوفە سۆکراتیەکان، ژیانی سیاسیان بە چالاکیەکی سروشتی لە قەڵەم نەداوە و بەلایانەوە ژیانی شەخسی بالاتر بوو لە پێداویستیەکانی کۆمەڵگەو دەوڵەت. لەگەڵ ئەوەشدا، لیبراڵە کلاسیکیەکان بە جیاوازی لەگەڵ لیبراڵەکانی سەردەمی نوێ بەڵام لەگەڵ فەیلەسوفەکانی یۆنانی کۆن، کۆك بوون سەبارەت بەوەی کە عەقڵ دەتوانێ سنوور دابنێ بۆ باشترین شێوازی ژیان. فەیلەسوفە کۆنەکان بیریان دەکردەوە کە تەنها تاکە باشەکان، واتا دەستەبژێری تاکەکان توانای ئەوەیان هەبێت بەرەنگاری دەسەڵاتی سیاسی بنەوە. جگە لەمەش، بە جیاوازی لەگەڵ ئەوانەی سەردەمی نوێ، "لیبراڵەکانی" سەردەمی کلاسیك کردەی ساسیان بە شتێکی سروشتی لە قەڵەم نەدەدا. بە زۆری لیبراڵە نوێکان چالاك بوون لە سەر ئاستی سیاسی و بە شێوەیەکی گشتی دەسەڵاتی سیاسیان دەخستە بەردەم لێپرسینەوە بە واتای ئەوەی کە هەوڵیان ئەدا چاکسازی بکەن زیاتر لەوەی کە بیروخێنن.

دەشێ بوترێ هەڵوێستی رەخنەیی لیبراڵە نوێکان بەرامبەر بە دەسەڵاتی سیاسی، شتێکی مەرکەزی بوو چونکە ئەوان بە شێوەیەکی بنەڕەتی سیاسەتیان وەك شتێکی دەستکرد تەماشا دەکرد. بە لای ئەوانەوە حکومەت شتێکی پێویستە، بەڵام شتێکی سروشتی نیە و ئازادی مەرجێکی مرۆیی سروشتیە و دەسەڵاتی سیاسیش لە ئەنجامی رێککەوتنەوە دێتە کایەوە. عەقڵ دەتوانێ ببێ بە پێشەوای سیاسەت، بەڵام سروشت تەنها ئامانجە نێگەتیڤەکان پێشکەش دەکات بە رێککەوتنی سیاسی و لەبەرئەوە دەشێ بە شێوەیەکی سەرەکی بەربەستێك دابنرێ بۆ مردن و نەخۆشی و هەژاری. هیچ مرۆڤێك ناتوانێ بە ناوی مافی سروشتی یان بە ناوی مافی "سەروسروشتیەوە" حوکم بکات. ئامانجە رەواکانی حکومەت لەو سنوورە دەوەستنەوە کە زەمینە خۆش بکەن بۆ مەرجەکانی جیاوازی شێوەی ژیان و بە شێوەیەکی بنچینەیی بریتین لە زامنکردنی ئاشتی و گەشەسەندن و خۆشی بۆ هەموو.

یەکەم خەباتی گرنگی لیبرالیزمی نوێ بریتی بوو لە خەبات دژی شێواندنی چەمکی سیاسەت لەلایەن ئەو شیکاریانەی کە بەسراونەتەوە بە هەندێ رەهەند و ئیعتباراتی ئاینییەوە. هەندێ لە بیرمەند و پیاوانی سیاسی پێشنیازی ئەوەیان دەکرد کە تەنها یەك ئاین هەیە لە ناو وڵاتێکدا. بۆچی ئەم پێشنیازە؟ لە پێناو کەمکردنەوەی پێکدادان لە نێوان ئەوانەی کە بە ناوی مافی ئاینی، واتا مافی چارەسەرکردنی کێشەی رۆحی، داوای

حوکمکردن دەکەن. ستراتیجیەتی لیبراڵەکان بریتی بوو لە تەجاوزکردنی ئەم جیهانبینیە لە رێگەی تەسککردنەوەی کایەی سیاسی بە شێوەیەك کە بوونی چەندین ئاین لە تەنها وولاتێکدا، شەڕی ئەهلی دروست ناکات. بە شێوەیەکی تەریبی لەگەڵ ئەم سیاسەتە لێبوردەییە، لیبراڵەکان بازرگانی و چالاکیە بازرگانیەکانیان دانا بە شتێکی پۆزەتیڤ چونکە، بەلای ئەوانەوە، لە کەش و هەوایەکی لەم شێوەیەدا، خەڵکی دەتوانن ووزەو هێزی خۆیان بەم ئاراستەیە بەکار بێنن. ئەمانەن بنچینەکانی بیری لیبراڵ کە بەسەریانەوە هێڵە جیاجیاکانی پارێزەرەکان و رادیکاڵەکان دروست بوون: واتا، سروشت هیچ ئاراستەیەکی ئەخلاقی پۆزەتیڤ پێشکەش ناکات و ئازادی پێشینەیی هەیە بەسەر دەسەڵاتدا. لەبەرئەوە، پێویستە سیاسەتی دەسەڵاتی سیاسی سێکۆلاریزە بکرێ و ئەو پرینسیپە دەستوری و چوارچێوە دادوەریانە بنیاد بنرێن کە سنوور دائەنێن بۆ هەڵسوکەوتی حکومەت و مافی هاوولاتیان زامن دەکەن بەرامبەر بە زێدڕەوی سیاسەتی حکومەت.

پرینسیپی "لیبراڵ" بۆ یەکەم جار لە ساڵی 1810 لەلایەن حیزبێکی سیاسی ئەسپانی راپەڕێنرا کە پرۆگرامەکەی لە چوارچێوەی دەستوری ئینگلیزی، واتا لە سیستمی حوکمی دەستوری ئینگلیزی ئیلهامی وەرگرتبوو. دەتوانین بڵێین کە هەرچەندە کۆمارە بازرگانیەکانی ڤێنیسیاو هۆڵەندا بۆ یەکەم جار جاری لیبرالیزمیان لێدا لەناو چوارچێوەی هەڵوێستی لێبوردەیی کاری بازرگانی، بەڵام ئینگلتەرای شۆڕشی 1688 یەکەم پرینسیپی لیبرالیزمی نوێی دانا. سیستمی دەستوری و لێبوردەیی ئاینی و چالاکی بازرگانی کە لە لایەن شۆڕشی ئینگلیزیەوە بنیادنرا، بوون بە مۆدێلێك بۆ لیبراڵە ئەمریکی و ئەوروپیەکانی سەدەی هەژدەهەم. بۆ مۆنتێسکیۆ، بۆ نمونە، کە بە شێوەیەکی سەرەکی نمونەی ئینگلتەرای ئایدیالیزە کرد، رژێمی ئینگلیزی باشترین مۆدێل بوو. شۆڕشگێڕەکانی کۆتایی سەدەی هەژدەهەم، بە ناوی پرینسیپە کۆماریەکان، خەباتیان دەکرد دژی بەریتانیای مەزن کە ئیلهامیان لە لۆك *Locke* وەرگرتبوو کە پاساوی بۆ شۆڕشی 1688 هێنابووەوە. هۆکار و ئەنجامەکانی شۆڕشی فەرەنسی ساڵی 1789 نەختێ ئاڵۆز بوون و پرینسیپە لیبراڵەکانی ئەوەندە روون نەبوون. لەناو ئەم شۆڕشە تەنگومژاویە، دیموکراسی و ناسیۆنالیزم و سۆسیالیزم بوون بە کێبڕکێکەری لیبرالیزم. لەگەڵ ئەوەشدا، لە میانەی سەدەی نۆزدەهەمدا، لە ئەوروپا زۆر شۆڕش بەرپا بوون و زۆر چاکسازی لیبراڵی ئەنجامدران لەناو چوارچێوەی هاوپەیمانێتی لەگەڵ بزوتنەوە ناسیۆنالیست و دیموکراتیەکاندا. زۆر لە بیرمەندانی لیبراڵیزم وەك ئەلێکسی دی تۆکڤیل *Alexis de Tocqueville* و جۆن ستیوارت میل *J. S. Mill* و لۆرد ئەکشن *Lord Action* دەستیانکرد بە پرسیارکردن لە سەر چۆنیەتی گونجاندنی دیموکراسی و ئازادی و میرنشینی ئێتنیك و ناسیۆنال لەگەڵ مافە گەردونیەکانی مرۆڤ.

زۆرجـار جـەخت خرایـە سـەر ئـەوەی کـە لیبراڵەکانی زۆر لە وولاّتە ئەوروپییەکانی سەدەی نۆزدەهــەم (ئــەڵمانیا و ئیتالیــاو هــەروەها ئـەوروپای ناوەڕاسـت) خـەبات دەکـەن، پـێش هـەموو شـتێك، لـە پێنـاو یەکیـەتی ناسیۆنال و ناکۆکی پیشان نادەن بەرامبەر رۆڵی مەرکەزی دەوڵـەت. ئـەم هەڵوێـستە بـە پێـچەوانەی لیبراڵـە بـەریتانی و ئەمریکیەکانـە کـە بـە نـاوی بـازاڕی ئـازاد و تاکگـەرایی، هـانی دەسـتێوەرنەدانی دەوڵـەت ئـەدەن. لەگـەڵ ئەوەشـدا، پێویـستە تێبینـی بکـرێ کـە، بـە پێـچەوانەی ئـەوەی کـە بـاوە، لــە ســەرەتادا لیبراڵــە ئــەمریکی و ئینگلیزیـەکان ئەوەنـدە دژی دەوڵـەت نـەبوون. بـەو شـێوەیە، لـۆك *Locke* و جـێمس مـادیزن *James Madison* لەگـەڵ ئـەو حکومەتـە بـوون کەئامانجــەکانی دیــار بــوون، بــەڵام بــواری چالاکیەکانی ئەوەنـدە سنووردار نـەبوون. ئـەو باســانەی کــە لەلایــەن هێربێــرت سپێنــسەر *Herbert Spencer* و ویلیـەم گراهـام سـەمنەرەوە *William Graham Sumner* پێشکەشکران دژی دەستێوەردانی ئابووری و کۆمەڵایـەتی دەوڵەت، نوێنەرایەتی تەنها یەك لایەنی لیبرالیزم دەکەن.

ئەمـە، لـەناو ئـەو باسـانە تێبینـی دەکـرێ کـە لەلایەکــەوە لــە کۆتــایی ســەدەی نۆزدەهــەم و سـەرەتای سـەدەی بیستەم و، لەلایـەکی دیکـەوە لەلایـــەن بەشـــێکی لیبراڵـــە کۆمەڵایەتیـــە ئینگلیزەکــان پێــشکەشکران. ئــەم بەشــەش لەلایـەن کەسـانێکەوە نوێنەرایـەتی دەکـرا وەك گــرین *Green* و هۆبــسهاوس *Hobshouse* و تێڕوانینـە ئابووریـە نوێکـانی کێینـز *Keynes* و هەنــدێکی دیکــە لــە وولاّتــە یــەکگرتوەکانی ئەمریکا کە بیرو باوەڕیان بۆ چاکسازی وورده وورده‌یـی (تـدریجی) بـوو، لـە نووسـینەکانی نووسەری وەك هێربێرت کرۆلی *Herbert Croly* و جۆن دیۆی *John Dewey* گوزارشتیان لێدەکرا. ئـەم نووسـەرانە لەگـەڵ تاکگـەرایی پـەرگیری هەندێ لیبراڵی سـەدەی بیستەم نـەبوون. بـەڵام هـەوڵیان ئـەدا ئـازادی تـاك بگـونجێنن لەگـەڵ داننــان بــە بەرپرســێتی و رۆڵــی دەوڵــەت لــە مەسـەلەی بـەدیهێنانی خۆشـی و کامـەرانی بـۆ هاوولاّتیــان، بــە تایبــەتی لــەو بوارانــەی کــە پەیوەسـت بـوون بـە بـارودۆخی ژیـانی مـادی و ئاسـتی پـەروەردەی خـەڵکی زۆر هـەژار. هـەمان شــێوازی شــیکردنەوە دەدۆزینــەوە لــەناو نووســینەکانی ئەوانــەی کــە هــەمان بــیر و باوەڕیــان هەیــە لــەناو زۆر لــە وولاّتــانی ئـەوروپاو هـەر لـە سـاڵانی 1840ەوە، هـەمان ئاســەواری بــیری لیبرالیزمــی کۆمەڵایــەتی دەدۆزینـەوە لـەناو کارەکـانی فریـدریك هـارکۆرت *Frederick Harkort*.

زۆر لە لیبراڵەکان، گەشەکردنی لیبرالیزمیـان بـەم ئاڕاسـتەیە رەتکـردەوە چـونکە متمانیـان نەبوو بەو ستراتیجیەتە ئابووریانەی کە لەلایـەن دەوڵەتــەوە دائـەنران و بـەو ئامانجـە نوێیانـەی پەیوەسـت بـە بـەختیاری میللـەت کـە لەلایـەن لیبرالیزمی کۆمەڵایەتیەوە پێشکەش دەکران کە بەلای ئەوانەوە نزیکتر بوون لە سۆسیالیزم وەك لــە لیبرالیــزم. لەگــەڵ ئەوەشــدا، لیبرالیزمــی کۆمەڵایەتی بەشێکە لەو تێڕوانینەی کە چەقی داکوتیوە لەناو نەریتی سیاسیدا. زۆر لە لیبراڵـە پارێزەرەکــان ئــەوەیان پەســەند کــردوە کــە دەوڵــەتێکی ئــاینی شــتێکی خــراپ نــەبوو

هەرچەندە دەترسان لە مەترسی پشتبەستنێکی تەواو بە دەوڵەت. لە بەریتانیای مەزن و لە زۆربەی وولاتانی ئەوروپا، لیبرالیزمی نوێ لەلایەن حیزبە لیبراڵە رەسمیەکانەوە قبوڵ نەکرا (بە لایەنی کەمەوە لە سەرەتادا)، بەڵام حیزبە سۆسیال دیموکراتەکان زەمینەیان خۆش کرد بۆ پەرەسەندنی. لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، پەسەنکردنی سیاسی میتۆد و ئامانجی نوێ، سیمبۆلیزەکراوە لە رێگەی ئەوەی کە پاش قەیرانە گەورەکەی سالانی 1930، تەوژمی (التیار) "پێشکەوتنخواز" چوارچێوەیەکی لیبراڵی وەرگرتوە لە کاتێکدا لیبراڵەکانی جاران پێیان دەوترێ، "پارێزەرەکان".

لیبرالیزمی نوێ، لە لایەکەوە، وەلامێك بوو بۆ گەشەسەندنی حیزبە سۆسیالیستەکان. بەم بۆنەیەوە پرسیارێك خۆی سەپاند سەبارەت بەوەی کە ئایا جیاوازی نێوان لیبراڵەکانی جاران و ئەوانەی ئەمرۆ هیچ راستیەك پیشان ئەدات، واتا هیچ جیاوازیەك هەیە لە نێوانیاندا. پارێزەرەکان پاساوی ئەوەیان هێنایەوە کە لیبراڵە نوێکان پەتیان شل کردوە بۆ سۆسیالیزمو لیبراڵە نوێکان سکاڵای خۆیان دەربڕیوە سەبارەت بەوەی کە پارێزەرەکان خۆیان بە هەندێ سیاسەتی لیبراڵەوە بەستۆتەوە کە باوی نەماوەو چیتر خزمەتی ئامانجەکانی لیبرالیزم ناکات. ئەم دیالۆگە، گەورەترین بابەتی سەدەی نۆزدەهەم بوو کە سیاسەتی خۆرئاوای بە جارێ هەژاند. لە کاتی جەنگی جیهانی دووەم و تەنانەت لە پاشیدا، لیبرالیزمی پارێزەر میللیەتی (شەعبیەتی) خۆی دۆزیەوە بەتایبەتی کاتێك ستەمی چەپ، زیاتر لەوەی راست، بە مەترسیەك بۆ سەر رژێمە لیبراڵەکان دانرا. لە سالانی 1950، بۆ ماوەیەکی کەم، هەندێ لە رۆشنبیرە لیبراڵەکان تێڕوانینی بێ کەڵکی بیر و باوەڕیان خستە ئاراوە، بەو واتایەی کە بیر و باوەڕ لەو بوارەدا ئەوەندە گرنگ نیە: کە لیبرالیزم بالاترە لە کێبڕکێکەرە تۆتالیتارەکانیان، چونکە لیبرالیزم چوارچێوەی ئایدیۆلۆجی نیەو سیاسەتێکی لیبراڵی بەتوانا بریتیە لەوەی کە واز بهێنرێ کە گروپە بەرژەوەندیدارەکان بەریەك بکەون و چیتر خەریکی دارشتنی مشتومڕی ئایدیۆلۆجی نەبن. بەڵام لەبەردەم جەمسەراندنی (بەجەمسەربوونی) ئایدیۆلۆجی سالانی 1960 و 1970، ئەم بیرۆکەیە ئەوەندەی نەخایاند. شکستهێنانی سیاسەتی ئابووری کە گەشەسەندنی ئابووری پاش جەنگی درێژە پێدا لە کۆتایی سەدەی بیستەم، بەشداریکرد لە پێشخستنی لیبرالیزمی پارێزەر و بەم شێوەیە لیبرالیزمی کۆمەلایەتی کەوتە سەنگەری بەرگریکردن لە خۆ. لەگەڵ ئەوەشدا، هەتا ئەمرۆ ئەم مشتومڕە بەردەوامە.

گەورەترین رەخنە کە ئاراستەی لیبرالیزم کراوە بریتیە لە جەخت خستنە سەر ئەوەی کە لیبرالیزم رێز ناگرێ لە بنچینە ئەخلاقیەکان. چەپەکان و راستەکانیش، لیبرالیزمیان تاوانبار کردوە بەبێ باکی و بەرەلڵایی ئەخلاقی کە زەمینە خۆش دەکەن بۆ دیدی بەرتەنگ و خۆپەرستی و رۆحی بۆرجوازی دژ بەو فەزیلە خانەوادانەیەی کە مرۆڤ بەرەو باشی گشتی ئاراستە دەکەن. بەلای ئەوانەوە، لیبرالیزم

چوارچـێوەی ئـەخلاقی دائـەنێ بـە شـتێکی شەخـسی کـە نـابێ پەیوەنـدی هـەبێت بـە سیاسـەتەوە. بەلاوەخـستنی چوارچـێوەی ئـەخلاقی و بەرتـەنگ بـینی، کۆمەڵگـە پـەرش و بـڵاو دەکـەن و پەیوەندییـە ئـابووری و کۆمەلایەتیەکانی جاران دادەتاشن و تاکگەرایی روخێنـەر و پـەرش و بڵاوکـەر دێننـە کایـەوە. زۆرجار ئەزموونی کۆماری ڤایمەر لە ئەڵمانیا بە نمونە هێنراوەتـەوە بۆئەوەی لاوازی سیاسـەتی لیـبرالی پیـشان بـدرێ لـە بـواری نـەبوونی چوارچـێوە ئەخلاقیـەکانی جـاران (بـۆ نمونـە ئەوانـەی مەسـیحیەت) کـە پێویـستن بـۆ تۆکمەکردنی رژێمە لیبراڵیەکان.

لیبراڵەکان بە شێوەیەك بەرگریان لە خۆیان دەکـرد کـە جـەختیان دەخـستە سـەر ئـەوەی باشـترین بیرمەنـد، یـان بـۆ نمونـە تۆکڤیـل و فرانـسوا گیـزۆ *François Guizot*، پێویـستی فەزیلەی کۆمەلایەتیان لەناو کۆمەڵی لیبراڵدا بە شـتێکی لاوەکـی دانـەناوە و هـەروەها رۆڵـی رێکخراو و نەریتی جوانیان بە پێویست زانیوە. کەسانێکی دیکە، بۆ نمونە لۆك *Locke*، هەندێ فەزیلـەی کۆمەلایـەتی و دەزگـای کۆمەلایـەتییان داناوە بە بەرهەمی ئەو تاکگەراییەی کە کۆمەڵ پـەرش و بڵاوناکاتـەوە. لیبراڵـەکان متمانـەیان هەیە بە تێکەڵکردنی دەسەلاتی حکومەت و ئەو دەسـەلاتەی کـە پـەروەردەی دەزگـا کۆمەلایەتیـەکان دەکـات. بـەلام تەسـلیمکردنی چوارچێوە کۆمەلایـەتی و ئەخلاقیەکان بە بوارە ناحکومیـەکان، واتـای ئـەتۆمیزمی *atomism* کۆمەلایـەتی و بـێ بـاکی ئەخلاقی ناگـەیێنێ.گـەر بـوترێ کـە تاکـەکان، زیـاتر لـە خێـزان یـان گرووپـەکان، بـریتین لـە ئێلێمێنتـی کۆمـەڵی سیاسـی، واتـای ئـەوە ناگـەیێنێ کـە سیاسـەت دەبێ واز لەم گرووپانە بهێنێ. هەروەها، نەبوونی باوەڕ بە باشییەکی سروشتی بالاّ بۆ مرۆڤ، ئەوە ناگەیێنێ کە بە شێوەیەکی هەڕەمەکی دەتوانرێ هەموو شێوازێکی ژیان هەڵبژێردرێت.

ئەم ئێلێمێنتانە وەلامـی هەندێ رەخنـەی دژ بـە لیبرالیـزم ئەدەنـەوە، بـەلام نـەك وەلامـی سـەرجەم رەخنـەکان. دەمێنێتـەوە بـوترێ کـە هەرچەندە لیبرالیزم بە شێوەیەکی تەواو بێ باك نیـە بەرامبـەر ئـەخلاق، بـەلام لـەم بـوارەدا زۆر بـەرزخوازی نیـە. ئەو خەسـڵەتانەی کـە داوایـان دەکـات ( بـۆ نمونـە داوێـن پـاکی و پەروۆشـی و هەڵـسوکەوتی جـوان) نابنـە هـۆی هەڵبـژاردنی شـتە باشـەکانی سروشـتی مرۆیـی، چـونکە بەرزخوازیە هـەرە بالاّکانی مـرۆڤ خراونەتە لاوە. زۆر لـە لیبراڵـەکان وەلامـی ئـەم رەخنەیـەیان داوەتـەوە بـە شـێوەیەك کـە جـەخت دەکەنـەوە لەسەر لایەنێکی گرنگتر لە لیبرالیزم. لە راستیدا هـەر لـە دروسـت بوونیـەوە شـێوە نادیاریـەك تیبینی دەکرێ لە بیری لیبراڵدا.

هۆبس و لۆك و ئادەم سمیس لەو باوەڕەدان کە عەقڵ پێویستە ئەو دەزگایانە بنیاد بنێ کـە خزمـەتی ئاشـتی و گەشەسـەندن بکـەن و لـەم چوارچێوەیەدا دەبێ گوزارشت بکەن لـە لایەنـە سۆزداریەکانی مـرۆڤ. تـەیارێکی بەپەرۆشـتر لـە لیبرالیـزم دەیـەوێ عـەقڵ بـەکاربێنێ لـە پێنـاو دروسـتکردنی جیهـانێکی ئـازاد کـە بتـوانێ بـە شێوەیەکی تەواو خۆی دوور رابگرێ لـە جۆشـی سروشتی. بەلای ئەم جۆرە لیبرالیزمەوە، ئازادی مرۆڤ بریتـی نیـە لـە تـەنها نـەبونی ناسەقامگیری

مـادی و هـەژاری، بـەڵكو بریتییـە لـە ئـازادی گەشەپێدانی كەسایەتی بە شێوەیەكی چالاك. ئەم تەیارە، نزیكە لە بیری بێنێدیكت سپینۆزاوە *Bénédict Spinisa* كە تێبینی دەكات ژیانی مرۆڤ تـەنها بریتـی نیـە لـە تەحـەمولكردنی لایەنـە سـۆزداریە سروشـتیەكان، تەنانـەت هـەتا بـە خۆشیـشەوە بێـت، بـەڵكو چـالاكی ئـازاد و عەقڵانیش دەگرێتەوە.

دوور كەوتنـەوە لـە سروشـت كـە زەمینـە بـۆ لیبراڵـەكان خـۆش دەكـات بـۆ ئـەوەی خۆیـان دوورەپەرێز رابگرن لە تاكگەرایی زیانبەخشو ئەخلاقیـەتی سـاكار و ئاسـایی، دەتـوانێ لـە هەمان كاتدا ببێتە هۆی هەڵوێستێكی ئەخلاقی كـە هـیچ رێزێك لـە بـوونی دەزگـا یـان دەسـەڵات نـاگرێ. لیبرالیزمـی ئاسـایی هـۆبس و لـۆك، هەنـدێ ئامـانجی سروشـتی پێشنیاز دەكـرد بـە ئاراسـتەیەكی نێگـەتیڤ. بـەڵام لیبرالیزمـی بـە پەرۆش بۆ بەهاكانی خۆی كە وازی هێناوە لەم تێروانینانە، هەروەك ئەوەی تێبینی دەكرێت لە فەلسەفەكانی كانت و هێگل، خۆی بەستەوە بە بنیادنـــانی عـــەقڵانی ئـــازادی لـــە میانـــەی جوڵانەوەی مێژوو، ئەمەش لە پێناو زامنكردنی بـەدیهێنانی ئامانجـە ئـەخلاقی و سیاسـیەكان. كاتێك لە كۆتایی سەدەی نۆزدەهـەم و سـەرەتای سـەدەی بیـستەم، ئەوەنـدە متمانـە نـەدەكرا بـە عەقڵانیـەت و گەشـەكردنی مێـژوو، گـەڕان بـە شـوێن خـۆ وەك بـوونێكی ئـازاد و راسـتەقینە، بـەلای ئـەوەدا شـكایەوە كـە چـیتر واز بێنـێ لـە بواری سیاسـەت و كایە چۆڵ بكات بۆ شیعر و رۆمـانس و پزیـشكی دەروونناسـی. لیبرالیزمـی لۆك كە سەرقاڵی گـەڕانێكی زۆرە بە شوێن كایـە ناسیاسیەكانەوە بوو، هەوڵ ئەدات ئەمانـە پـەرە بـسێنن بـەبێ وازهێنـان لـە سیاسـەت و، وەك ئـەنجام، بـە بـێ دروسـت كردنـی نائومێـدیی سیاسی لە كاتی شكستهێنانیان.

ئـەمڕۆ بازنـە زانكۆییـە ئـەنگلۆ ساكسۆنەكان كـەمتر بـە شـوێن بەرەنگاربوونـەوەی رادیكـالیزم دژ بە لیبرالیزم دەگەڕێن و زیاتر دەیانەوێ بزانن ئایا سوودگەرایی و ئەو باسانە كە دەوەستنەوە سەر مافەكان، دەتوانن باشترین پاساو بدۆزنەوە بۆ جۆری دەزگا سیاسیەكان و ئـەو سیاسـەتانەی كە خزمەتی ئەوان دەكەن.

ئـەم دابەشـبوونەی نێـوان سـوودگەراكان و ئەوانـەی خۆیـان دەبەسـتنەوە بە پاساو رێـسای ئەرك و مافەكان، وا دەكات كـە تیۆری هاوچەرخ بە ئەندازەی تـەیارە لیبراڵەكـەی جاران، ئەوەنـدە كــارا نــەبێت لــە بەرەنگاربوونــەوەی تــەیاری رادیكـال. بـە لایـەنی كەمـەوە، لیبرالیزمـی لـۆك شـێوازێكی كورتكـەرەوەی هـەبوو لـە نێـوان چوارچـێوە ســـوودگەرایی و ئەوانـــەی كـــە دەوەستانەوە سەر مەسەلەی ماف. لـەوە دەكات گومان هەبێت لـەوەی كە لیبرالیزم بتوانێ خۆی رزگـار بكـات لـە كێشە تیۆریـەكان بـەبێ كەوتنـە نـاو پارێزگـەرایی بێـرك كـە دەوەسـتێتەوە سـەر توانای مێژوو لـە راگرتنی نەریتـە لیبراڵـەكان بـە بـێ داننـان بـە دیـدی لیبراڵـی سـەبارەت بـە مافـە گەردونیەكان.

**سەرچاوە:**


"فەرهەنگی بیری سیاسی، مرۆڤ و بیروباوەڕ"

***Bernard J.*، *Dictionnaire de la pensée politique*، *Hommes et Idées*، *Hatier*، *Paris*، *1999*، *pp.449-457.***

# لیبراڵیزم له سیاسەتەوە بۆ ئاکار

## دەربارەی فەلسەفەی سیاسی و کۆمەڵایەتی جۆن ستیوارت میل

د. شاهۆ سەعید

**بایۆگرافی:**

جــۆن ســـتیورات میــل (1806-1873) یەکێکە لە فەیلەسوفە بەناوبانگ و دیارەکانی سەدەی نۆزدەیەمی ئینگلتەرا، بە پێشەنگی لیبراڵیزمی نوێ لەقەڵەم دەدرێ. لەخێزانێکی خوێندەوارو ناسراو هاتۆتە دنیاوە. لە سەرەتای ژیانی فیکرییدا لەژێر کاریگەریی (جێمیس میل)ی باوکیدا بووە، کە مێژوونوس و بیریاری سەردەمی خۆی بووە. هەر بەهۆی باوکییەوە چۆتە ژێر کاریگەریی (جێرمی بێنتام 1748-1832) دامەزرێنەری فەلسەفەی سوودگەری. لەپاش مردنی باوکی و بێنتام بووە بە نوێنەری فەیلەسوفە رادیکاڵەکان و پێڕەوانی رێچکەی سوودگەری. لە ژیانیدا، جگە لە کاری تیۆریی، کاری رۆژنامەوانی و سیاسیشی کردووە، ساڵی 1865 وەك ئەنـدامی ئەنجومەنی نوێنـەران هەڵبژێردراوە. گرنگترین بەرهەمە فیکرییەکانی بریتین لە: سیستمی لۆجیك (1843)، زنجیرەیەك وتار دەربارەی پرسەکانی ئابوریی سیاسی (1844)، پرنسیپەکانی ئابوریی سیاسی (1848)، دەربارەی ئازادی (1859)، چەند بیرۆکەیەك دەربارەی ریفۆرمی پارلەمانی (1859)، چەند سەرنجێك دەربارەی حکومەتی نوێنەرایەتی (1861)، سوودگەری (1861)، ئۆگەست کۆنت و پۆزەتیڤیزم (1865)، کلۆڵی ژنان (1869)[1].

**لە سیاسەتی پەتییەوە بۆ ئاکار:**

تا باوکی لە ژیاندا مابوو، (جۆن ستیوارت میل) خاوەن هێڵێکی فیکریی تایبەت نەبوو. چونکە (میل)ی باوك بڕوای بە لیبرڵیزمی نەریتپارێز هەبوو، لە پەروەردەی فیکریی کوڕەکەیشیدا تا ئەندازەیەکی زۆر دۆگما بوو، هیچ رەوتێکی فیکریی قەبوڵ نەبوو جگە لە رێچکەی سوودگەریی پێنتام و رادیکاڵیزمی فەلسەفی کە لەسەر بنەمای "ئازادی لە پێناو

چێژ"دا دامەزرابوو. ساڵی 1836 کاتێ باوکی مرد، جۆن ستیورات مێل تەمەنی 30 ساڵان بوو، ئیتر ئازادانەترو بەدیدێکی رەخنەیی فراوانترەوە کەوتە لێکۆڵینەوەو گومان لەو پرسیارانەی لای دروست بوبوون سەبارەت بە لایەنە لاواز و گرفتئامێزەکانی رادیکالیزمی فەلسەفیی لای پێنتام و مێل-ی باوکی..، تا وردە.. وردە بووە خاوەن فەلسەفەی تایبەت بەخۆی سەبارەت بە لیبرالیزم، کە دواتر بە لیبراڵیزمی نوێ ناسرا. بەڵام رەخنەی وی لە رێچکەی باوکی و بێنتام رەخنەیەکی ریشەیی نەبوو، بەڵکو شێوەیەك بوو لە چاکسازی و هەموارکردن لە لیبراڵیزمی نەریتیدا.

بەگوێرەی فەلسەفەی سوودگەری دوالیزمی (خێر/ شەڕ) تەرجەمەی ئەخلاقیی دوالیزمی (چێژ/ئازار)ە، چونکە ئەو شتە (خێر)ە کە چێژبەخشەو دەبێتەهۆی بەختەوەری، ئەو شتەش (شەڕ)ە کە دەبێتە هۆی ئازارو ژیانی مرۆڤ دەخاتە بەر مەترسی. ئەم فەلسەفەیە دژی هەموو ئەو تیۆریا فەلسەفیانە بوو کە پێکهاتەی حکومەت و کۆمەڵگایان دەگەڕاندەوە بۆ بیرۆکەی پەیمانی کۆمەڵایەتی یان مافی سروشتی، چونکە پێیوایە تەنها "چێژو بەرژەوەندی" بنەمای پاساوە فیکریی و سیاسی و ئەخلاقییەکانی مرۆڤن، نەك گریمانەو بیرۆکە پەتییەکان. بەڵام (جۆن ستیوارت مێل) هەستی کرد پەرگیری لە شیکردنەوەی ئەم فەلسەفەیەدا رەهەندە ئەخلاقییەکان لە سیاسەت و کردەوەکانی مرۆڤ دادەماڵێ و جۆرێك لە خۆپەرستی لە مرۆڤدا دەچێنێ و خەمی بەکۆمەڵ کاڵدەکاتەوە. ئەم پرسیارە (مێل)ی کوڕی ماندوکردو تووشی دۆخێکی نێرڤسیی کرد، تا ئەو کاتەی دەستی دایە خوێندنەوەی ئەدەبی رۆمانتیکی، ئەو ئەدەبە ئاسۆی بیرکردنەوەی بەرەو دنیایەکی تر کشاند، دنیایەکی دۆزییەوە کە هەر لە منداڵییەوە بەهۆی پەروەردەی ئەقڵانی و سوودگەریی باوکییەوە ونی کردبوو[2].

لەنێوان ساڵانی 1838 بۆ 1840 جۆن ستیوارت مێل زنجیرە وتارێکی بەراوردکاریی بڵاوکردەوە سەبارەت بە فەلسەفەو دنیا بینی بێنتام لەلایەك و کۆلێردج لەلایەکی ترەوە. لەو وتارانەدا ئاماژە بەوە دەدا کە فەلسەفەی بێنتام و فەلسەفەی هەستەکی- ئەزمونگەریی ئینگلیزی بەگشتی تاك رەهەندانە دەڕواننە کێشەکان و دنیابینی ئەدیبێکی رۆمانتیکی وەك کۆلێردج دەوڵەمەندترە سەبارەت بەناسینی سروشتی مرۆڤ و کۆمەڵگاکان و گەشەی مێژوویی جیهان. هەروەها لە رێگەی فەلسەفەی رەخنەیی (ئیمانوێل کانت)ەوە ئایدیالیزمی ئەڵمانی ناسی، ئەڵبەتە ئەو فەلسەفەیە ئەقڵی مرۆڤ بە هەردوو دیوە پەتی و هەستەکیەکەیدا رەخنە دەکا، چونکە ئەقڵ ئەو دەزگا رەهاو بابەتی و بێگوناهە نیە کە توانای یەکلاییکردنەوەی هەموو کێشەو پرسیارەکانی هەبێ، بەڵکو هەندێ لایەنی شاراوە، بەتایبەتی ئەنگێزەی ئەخلاقی، لە ناخی مرۆڤدا هەن کە بە پێودانگی بەرژەوەندی و چێژو ئازادییە پەتییەکان ناپێورێن.

جیاوازییەکی تری نێوان لیبراڵیزمی باوك و کوڕ لەوەدا دەرکەوت کە یەکەمیان زیاتر خاوەن مۆرکێکی ئینگلیزی بوو.. بەڵام دووەمیان

ئینگلتـەرای بەزانـدو جگـە لـە ئایـدیالیزمی ئـەڵمانی ئاشـنایەتی لەگـەڵ لیبرالیـزمو پۆزەتیڤیزمی فەرەنسیشدا پەیداکرد، بەتایبەتی لەرێگـەی تۆکڤێـل و ئۆگەسـت کۆنتـەوە کـە وەك دامەزرێنەری پـۆزەتیڤیزمی فەرەنسیو زانستی سۆسـیۆلۆجیای مـۆدێرن لەقەڵـەم دەدرێ. واتـە جـۆن سـتیوارت مێـل بـە پێـچەوانەی جێرمـی بێنتام و جێمس مێل-ی باوکییەوە خەونی بە پایـەداربوونی لیبرالیزمێکـی گەردوونییـەوە دەبینـی، کـە سـنوری دورگـەی ئینگلیـزی تێبپەرێنێ[3].

**هەمواركردنی فەلسەفەی سودگەری:**

جۆن ستیوارت مێل هەستیکرد لە فەلسەفەی سوودگەریی بێنتامدا پرسی ئەخلاق کراوە بە پاشکۆی بـایۆلۆجی یـان سـایکۆلۆجی چـێژو ئازار، لـە باشـترین حاڵەتدا کراوە بـە پرسـێکی میتافیزیکی کە مەحاڵە بەو شێوەیە بێتەدی کە لە خولیای مرۆڤدا جێگیرە. بەڵام لای وی ئاکار (ئەخلاق) هێند بە ئاسانی تێکەڵ بە دوالیزمی چێژو ئازار ناکرێو بەو لۆجیکە ناپێورێ، بگرە بەپێچەوانەوە هەندێ جار ئاکار دەبێتە پێوەر بۆ حوکمدان لەسەر ئـەوەی داخـۆ چ جـۆرە چـێژێك شـەرەفمەندانەیەو چ جـۆرە چـێژێکیش شـایەنی رێـز نیـە. ئەڵبەتـە جـۆن سـتیوارت مێـل لـەم مەسەلەیەدا لەژێر کاریگەریی فەلسەفەی مۆراڵی ئێمانوێل کانتدا بوو.

دووەم، لای جـۆن سـتیوارت مێـل ئـازادی ئامرازێك نیە بۆ گەیشتن بە چەند ئامانجێکی دیاریکراو کە لای بێنتام سەرەکیترینیان بریتی بوو لە "دابینکردنی زۆرترین چێژ بۆ زۆرترین خەڵك"، بەڵکو ئازادی خۆی ئامانجێکە دەبـێ هـەموو ئـامرازە سیاسـی و یاسـاییەکانی بـۆ بخرێتەگـەڕ. سـێیەم، لەکاتێکـدا بێنتـام زۆر بایەخی بە دەستەواژەی "زۆرترین کەس" دەدا، سـتیوارت مێـل پێیوابـوو ئەڵقـەی وون لـە هاوکێشەکەدا کەمینـەی خەڵکە، چونکە مـرۆڤ، هەرچەندە سەر بە کەمینەش بێ، ناکرێ بەناوی چێژو بەرژەوەندیی زۆرینـەوە بچەوسێنرێتەوە، بەتایبەتی لەو شوێنەدا کە پرسەکە پەیوەندیی بـە دیـدو بۆچـوونو رادەربڕینـەوە هەیـە. ئینجا کۆمەڵگا کاتێ ئازاد و سەربەخۆیە، کە ئازادی و سەربەخۆیی بۆ هەموو ئەندامەکانی دابین دەکا. بەڵام کاتێك ئازادی لە یەکێك لـە تاکـەکان زەوت دەکـرێ مانـای وایـە لـە تـەواوی کۆمـەڵگا زەوتکراوە.

لە هەمواركردنێکی تری لیبرالیزمی نەریتیدا جـۆن سـتیوارت مێـل پێیوایـە ئـەرکی حکومـەت لەئاسـت کۆمـەڵگادا ئـەرکێکی نـەرێخواز (نێگەتیڤ) نیە. واتە دەزگایەکی خەمسارد نییە کـە لێگـەڕێ کاروبـارە گـشتییەکان خۆبـەخۆ بڕۆنو دەست لـە هیچ کایەیـەك وەرنـەدا. بەڵکو حکومـەت ئـەرکێکی ئـەرێخواز (پـۆزەتیڤ)یـشی هەیـە، پێویـستە لـە رێگـای یاسـاو بڕیـارو رێنماییەکانەوە تەنها ئەو ئازادیانە نەپارێزێ کە هەن، بەڵکو دەرفەت برەخسێنێ بۆ فراوانکردنی روبەری ئازادیەکانو دابینکردنی ئازادی بۆ ئەو کەسانەی کە خەونی پێوەدەبینن[4]. واتـە لەتـەك ئەو یاسا ئابورییـە بەناوبانگـەدا کـە سوودگەرە نەریتپارێزەکان پشتیان پێبەستبوو، "لێگـەڕێ با ئیش بکا، لێگـەڕێ با بڕوا"، ستیوارت مێل پێیوابـوو دەبـێ حکومـەت زەمینـسازی بـۆ ئـەو

کەسانەش بکا کە دەرفەتی ئیش و توانای گەڕانیان نیە.

## سەرەتایەك دەربارەی چەمکی (سوودی گشتی):

کاتێ جۆن ستیوارت مێل لە مێژوی دوو هەزار ساڵ لە ململانێ و مشتومڕی دوورو درێژو نەبڕاوەی فەیلەسوفان و رێچکە فیکریەکان ورددەبێتەوە سەبارەت بە گەوهەری ئاکارو ماهیەتی خێر، دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە هیچ کۆدەنگییەك لەو بارەیەوە لەئارادا نیە، بگرە زۆرجار لەژێر پاساوی ئەو گەڕانە بێوچانەدا ترسناکترین رەفتار دەرهەق بە مانای خێرو ئاکار پێڕەوکراوە.

کێشەکە لەوێوە سەرچاوەی گرتووە کە فەیلەسوفان و زانایان هەوڵیان داوە بەهەمان میتۆدی زانستە سروشتی و پەتیەکان ماهیەتی ئاکار دیاری بکەن و پێودانگ بۆ خێرو باشە دابتاشن. لەو نێوەندەدا دوو قوتابخانەی فیکری کەوتوونەتە ململانێوە، یەکەمیان: قوتابخانەی (حەدسی)یە *Intuitive*، بڕوای وایە ئاکار خاوەن پێودانگێکی پێشوەختە، واتە بەر لە بیرکردنەوەی مرۆڤ پێوەرە ئاکاریەکان بوونیان هەبووە، کە ئەڵبەتە زۆربەی ئایینناس و فەیلەسوفە ئەقڵانی و خاوەن دیدە میتافیزیکیەکان سەر بەم قوتابخانەیەن. قوتابخانەی دووەم خاوەن میتۆدێکی سۆراخکارییە (استقرائی *Inductive*)، کە پێیوایە هەموو پێودانگەکان پاشوەختن و مرۆڤ تەنها پاش سەرنجی هەستەکی و ئەزمونی راستەوخۆ هەقیقەتی بەهاکان دیاریدەکاو پێوەرە ئاکاریەکان دادەتاشێ.

بۆ خۆدەربازکردن لە حوکمی تاکڕەهەندی هەریەك لەم دوو قوتابخانە باڵادەستە جۆن ستیوارت مێل پەنادەبا بۆ کتێبی (میتافیزیکای ئاکار)ی ئەمانوێل کانت، کە ئەقڵ وەك دەزگایەکی گرنگ، بەڵام سنوردار، لەقەڵەم دەدا. واتە دەشێ ئەقڵ بتوانێ سەبارەت بە دەرەنجامەکانی ئاکارو رەفتاری مرۆڤ، بەباش یان بەخراپ، حوکم بدا، بەڵام توانای نیە ماهیەتی ئاکار وەك یاسایەکی پەتی، پێشوەخت یان پاشوەخت، پێناسە بکا. ستیوارت مێل راڤەیەکی سوودگەریی بۆ ئەو دیدەی (کانت) دەکاو دەڵێ ئاکاری بەرز خۆی لەخۆیدا هیچ مانایەکی نیەو پێویستی بەهیچ جۆرە بەڵگاندنێکی ئەقڵی یان هەستەکی نیە، چونکە ئێمە بەها باشەکان وەك غایەتێك دەناسین و هیچی تر، بۆ نمونە دەڵێین: "هونەری مۆزیك شتێکی باشە، چونکە چێژدەبەخشێ...، بەڵام ناتوانین ئەوە بسەلمێنین کە چێژ خۆی لەخۆیدا بۆ باشە"(5). کەواتە ئەو شتەی کە ئێمە ناومان ناوە (خێرو باشە)، خۆی لە خۆیدا غایەت نیەو هەڵگری ماهیەتێکی دیاریکراو نیە، بەڵکو ئامرازێکە بۆ غایەتێکی تر کە پەیوەندیدارە بە دابینکردنی چێژەوە. لێرەوە خێر ماهیەتێکی پێشوەختی نیە وەك پێڕەوانی قوتابخانەی حەدسی دەڵێن، بەڵام ماهیەتێکی پاشوەختیشی نیە وەك ئەزمونگەرەکان دەڵێن، چونکە ماهیەت بەخشین بە خێر ئەوە دەخوازێ کە یاسایەك بۆ پێڕەوکردنی دابڕێژین و مرۆڤەکانی تری پێوە پابەند بکەین. سەرەنجام

ئــەو پابەندییــە چــێژو ئــازادیی ئینــسان بەرتەسکدەکاتەوە تا ڕادەی ئازاردانی، ئەڵبەتە ئازارەکانیش دەرەنجامی هەموو ئەو کردەوەو ڕەفتارانەن کە ئێمە ناومان ناون شەڕو خراپە.

## سوودگەریی گشتی وەك ڕێچکەیەكی فەلسەفی مانای چییە؟

ڕەگوڕیــــشەی فەلــــسەفەی ســــوودگەری دەگەڕێتەوە بۆ یۆنانیەکان، بەدیاریکراویش بۆ ئــــەپیکۆر، بــــەڵام لــــە دەوروبــــەری ســــەدەی نۆزدەیەمــــداو لەســــەر دەســــتی بێنتــــام وەك ڕێـچکەیەکی سیاسی و قوتابخانەیەکی فیکریی گەشەی گەورەی بەخۆوە بینیوە. ئەم فەلسەفەیە لەســـەر پرنـــسیپێك دادەمـــەزرێ کـــە پێیوایـــە "دابینکردنـــی زۆرتـــرین بەختـــەوەری بـــەردی بناغـەی ئاکارەکـانی مرۆڤـە"[6]، واتـە راسـتیو دروستی کردەوەی مرۆڤ بەوە دەپێورێ کە ئایا ئەو کردەوەیــە تــا چ ئەندازەیــەك بەختــەوەریو چێژ بـۆ مـرۆڤ دابین دەکـا. بـەڵام لـە سـەردەمی ئــەپیکۆرەوە تــا ســەردەمی لیبراڵیزمــی نــوێ بـەدحاڵیبونێکی گـەورە سـەبارەت بـە چـەمکی چێژ لەئارادایـەو زۆرجـار چێژ تـەنها لـە چێژی ورگو سێکسدا کورتکراوەتەوە، تەنانەت کاتی خــۆی نــەیارانی ئــەم چــەمکە ســیفەتی مرۆڤبوونیان لـە پێڕەوانی ئـەپیکۆر دادەماڵیو بـە بـەراز دەیانچواندن. بـەڵام پێڕەوانی ئـەپیکۆر لـە وەڵامـی ئەوانـەدا دەیـانووت: ئێمـە بـاس لـە چێژی مرۆڤ دەکـەین نـەك چێژی ئـاژەڵ، ئـەوە خـەتای نەیارەکانمانـە کـە سروشـتی مـرۆڤ بـە سروشــتی ئــاژەڵ دەچــوێنن "ئەگــەر ئــەو تۆمەتــەش راســت بــێو سەرچــاوەی چــێژ لای مرۆڤ و بەراز یەك شت بێ، مانای وایە ئەوەی بۆ یــەکێکیان خێــرە بــۆ ئــەوی تریــشیان هــەر خێرە"[7].

بــەڵام جــۆن ســتیوارت مێــل زۆر بەتونــدی وەڵامــی نــەیارانی ئــەپیکۆر دەداتــەوەو جــەخت لەسـەر ئـەوە دەکاتـەوە کـە چێژی مرۆیـی تـەنها چێژێکی جەسـتەیی پـەتی نیـە بـەڵکو چێژێکی ڕەمزیشە، مرۆڤ خاوەنی ئەو هونەرو بەهرانەیە کــە چــێژ لــە چــەندین فــۆرمی جیــاوازدا بەرجەســتەدەکا، وەك ئــەو چـێژانەی کـە زادەی تێڕامــانو بیرکردنــەوەو فــەنتازیاو وەرزشــی ڕۆحیو فیکرین، یان ئەو چێژانەی کە مرۆڤ لـە ڕێگــەی پابەنــدبوونی ئاکــارییو راســتگۆییو قارەمانێتییـەوە بەدەسـتی دێنـێ. تەنانـەت مێـل لــەوە زیــاتر دەڕواو پێیوایــە کــە بیریــارە ســودگەرەکانیش وەك ئایدیالیـستەکان "چـێژە ئەقڵیــەکان لــە چــێژە جەســتەییەکان بــاڵاتر دەیانبینن، چونکە بەردەوامترو زامنترن.."[8].

بــــەڵام ئەڵبەتــــە کاریگــــەریی ســــیاقی نـەریتپارێزی ئـەو دەمـەی ئینگلتـەرا بەسـەر ئـەم بۆچوونەی مێلو سوودگەرەکانەوە دیارە، دەنا چەمکی چێژ لە فەلسەفەی لیبراڵیزمدا بەگشتی چــەمکێکی کراوەیــەو نــاکرێ پێناســەیەکی پێشوەخت بۆ چێژ دابنرێو بڕیار لەسەر ئەوە بـدرێ کـە چ جـۆرە چـێژێك مرۆیـیو باڵایـەو چ جۆرێکیـان ئـاژەڵیو نزمـە، چـونکە دەشـێ لـە هەندێ سیاقدا چێژی فیکریو ڕۆحی باڵا بێو لــە هەنــدێ سیاقیــشدا بەپێــچەوانەوە ببێتــە بەهانـەی سـەرکوتکردنو چـەپاندنی دەرونـیو جەســتەیی، هــەروەك چــۆن دەشــێ چــێژی جەســـتەیی بـــە هـــەردوو دیـــوە جـــوانو

ناشـــرینەکەیدا بـــەکار بـــێ. بـــەڵام بـــۆ پوچەڵکردنەوەی ئەو دیدەی نەیارانی ئەپیکۆر دەکـرێ بـووترێ جیـاوازیی بنـەڕەتی لـە نێـوان چێژی جەستەیی لای مرۆڤ و ئاژەڵ لەوەدایە کە چێژی ئاژەڵ پـەتی و راسـتەوخۆو بایۆلۆجییـە، بۆ نمونە چێژی سێکسی لای مرۆڤ دەخرێتە ناو تۆڕێکی بەرفراوانی هێمای سیمانتیکی و کۆدی زمانـــەوانی و هونـــەری و پۆشـــاکی لـــەپێناو درێژکردنـــەوەو موتوربـــەکردنی بـــە چـــێژی دەرونـــی و فیکـــری. بـــە هـــەمان شـــێوە چـــێژی خواردن لای مرۆڤ وەك هی ئاژەڵ راسـتەوخۆ، لـە سروشـتەوە بـۆ گـەدە، نیـە.. بـەڵکو ئـەویش دەخرێتـــــە نێوکۆیـــــەکی کۆمەڵایـــــەتی و ئیـستاتیکی و تێکـەڵدەکرێ بـە هونـەرەکانی چێـشتلێنان و رازاندنـەوەی خـوان و ئێتیکـی پێشکەشکردن.

مێل بڕوای وایە مرۆڤ بوونەوەرێکە هەمیشە کۆششدەکا بـۆ گـۆڕینی ماناکـانی چـێژ بـەرەو ئەفراندنی فۆرمی نوێی چێژو دوورخستنەوەی لـە چـێژی سـەرپێیی و ئـاژەڵی. بـۆ نمونـە گـەر مرۆڤـەکان، بێجیـاوازی، سەرپـشکیان بکـەی لەوەی کـە ئایا حەزدەکـەن کەسـانێکی گەمـژەو ئاسـودە بن، واتـە لای خۆیـان خۆشـبەخت و لای خـــەڵك بەدبـــەخت بـــن، یـــان بەپێـــچەوانەوە کەسانێکی ماندوو خاوەن ئەندێشەو نیگەرانی بن بەڵام کیبریا و ڕێزی دەوروبەریان بردبێتەوە.. ئـەوا بێگومـان بڕیـار لەسـەر هەڵبـژاردنی دووەم دەدەن، تـەنها ئـەو کەسـە نـەبێ کـە خـۆی لـە بنەڕەتدا گەمژەیەکی ئاسودە بێت و لە مـەغزای پرسـیارەکە تێنـەگا، بۆیـە مێـل راشـکاوانەتر دەڵێ: "باشتر وایە مرۆڤ بوونەوەرێکی نیگەران بـێ تـا بـەرازێکی ئاسـودە بـێ. باشـتر وایـە (سـوکرات)ێکـی نیگـەران بـێ تـا گەمژەیـەکی ئاسودە بێ"[9].

گەیـشتن بـە دواچـێژ هەمیـشە وەك ئەگـەرو پرسـێکی دواخـراو دەمێنێتـەوە، چونکە چێژی واقعـی هەمیـشە کاتییـەو چـێژی نـەمریش چێژێکی ئایدیاڵـە کـە تـەنها وەك خولیایـەك لـە زەینـی مرۆڤدا ئامادەیی هەیـە. مرۆڤ بۆ ئـەوەی چێژ درێژبکاتـەوە هەمیـشە بـە ئایـدیاو ئـازارو تەقەشـوف موتوربـەی دەکا. یـەکێك لـە دوژمنـە ترسـناکەکانی چـێژ بریتیـە لـە خۆپەرسـتی، چونکە کەسی خۆپەرست مانایەکی چەندایەتی دەبەخشێ بـە چێژو بەختـەوەری بەشێوەیەکی مادیی پەتی پێوانەدەکا. رەنگە ئەم جۆرە مرۆڤە وەك خـود پێداویـستییەکانی خـۆی دابـین بکـا، بـەڵام لەسـەر ئاسـتی کۆمەڵایـەتی هەسـت بـە نـامۆبوونێکی کوشـندە دەکـات و لـە بازنـەی بەختەوەرییـــەکی دەســـتەجەمعیدا جێگـــای نابێتـەوە، هەسـتدەکا هـەموو بەختەوەرییـەکی ئـەوی دی بەختـەوەری ئـەم لەبەینـدەبا. رەنگـە یەکێك پرسیار بکا دەربارەی مەسەلەی (بەخت) یـان (شـانس) کـە مـرۆڤ هەمیـشە خـەونی پێوەدەبینێ، کە بۆ هەندێ دێتەدی بۆ هەندێکی تر، هەرچەندە هەوڵیش بدەن، دەستیان ناکەوێ یان بەکەمی پێیدەگەن.. لە وەڵامی ئەم پرسەدا مێـل پێیوایـە هۆکـاری چـاوەڕوانی بـەخت دەگەڕێتـەوە بـۆ پـەرت و بڵاویـی و تێرنـەبوونی ئارەزوەکانی مرۆڤ و کەموکورتی ئەو دامودەزگا کۆمەڵایەتیانـەی کـە دەرفـەت بـۆ مرۆڤـە جیاوازەکان رێکدەخەن. لێرەوە لیبراڵیزمی نوێ مانایـەکی کۆمەڵایـەتی سیاسـی دەبەخـشێ

بەچێژو بەختەوەری‌و پێیوایە بەختەوەری راستەقینە لە کۆی بەختەوەرییە فەردیەکان دروستدەبێ.

بەلاّم لە فەلسەفەی لیبراڵیزمدا بەرگریکردن لە بەرژەوەندی بەو مەرجەی لەسەر حسابی بەرژەوەندی کەسانی تر نەبێ ناچێتە خانەی خۆپەرستییەوە، چونکە هەندێ جار بەهۆی ئیرەییەوە کەسانێکی کۆڵنەدەر بەخۆپەرست لەقەڵەم دەدرێن. لەبەرامبەر خۆپەرستیدا سیفەتێکی پێچەوانەی مرۆیی هەیە کە دەکرێ بەبالاّترین‌و بێوێنەترین ئاکار لەقەڵەم بدرێ، ئەویش خۆبەخشینە. بۆیە جۆن ستیوارت مێل زۆر بەتوندی وەلاّمی ئەو نەیارانەی لیبراڵیزم دەداتەوە کە لیبراڵەکان بەکەسانێك لەقەڵەم دەدەن بێنرخانە تەماشای خۆبەخشینی قارەمانەکان دەکەن، بەڵکو مێل پێیوایە لە شەهیدبووندا بالاّترین ماناکانی بەختەوەری بەرجەستەدەبێ، چونکە خۆبەخش یان شەهید کەسێکە قوربانی بە بەختەوەری خۆی دەدا لەپێناو بەختەوەرییەکی تردا کە پێیوایە گرنگترو فراوانترو دوورخایەنترە. قارەمانی راستەقینە ئەو کەسەیە ئازاردەچێژێ نەك لەپێناو خودی ئازاردا بەڵکو لەپێناو چێژی کەسانێکی ترو بەخشینیان لە ئازارچەشتن. بۆیە "پێویستە هەموو نازناوێکی شەرەف ببەخشرێ بەو کەسانەی کە خۆیان لە چێژی ژیان بێبەشدەکەن، کاتێ ئەو خۆبەخشینە بەهەق رێژەی خۆشبەختی لە جیهاندا فراوانتر دەکا"[10]. بەلاّم خۆبەخشینێك لەپێناو بەختەوەریی کەسانی تردا نەبێ، یان تەنها بۆ ئازارچەشتنێکی پەتی بێ، ئەوا لەباشترین حاڵەتدا دەکرێ کەسی خۆبەخش وەك گۆشەگیرە سکهەڵگوشەکان تەماشابکرێ کە لە خەڵوەتگاکەیدا ئازاردەچێژێ. واتە دەکرێ هەڵوێستی ئەم جۆرە کەسانە ببێتە ئیلهام بەخش بۆ کەسانێکی تر سەبارەت بەتواناکانی خۆبەخشین لە مرۆڤدا، بەلاّم هەرگیز نابێ ببنە نمونەی بالاّو بۆ هەمان مەبەست لاسایی بکرێنەوە.

لێرەوە تیۆرەی سوودی گشتی، یان بەرژەوەندی گشتی، جێگەی تیۆرەی سوودی پەتی دەگرێتەوە، کە لەسەر دوو کۆڵەکەی سەرەکی دادەمەزرێ[11]:

**یەکەم:** پێویستە یاساو ئۆرگانە کۆمەلاّیەتییەکان بەشێوەیەك دابمەزرێن کە هارمۆنی لەنێوان بەرژەوەندی گشتی‌و بەرژەوەندی تاکدا بسازێنن، واتە بەرژەوەندی گشتی یەکسان بێ بە بەرژەوەندی کۆی تاکەکان.

**دووەم:** پێویستە کولتوورو رای گشتی، کە فراوانترین دەسەلاّتیان هەیە بەسەر کەسایەتی مرۆڤەوە تۆڕێکی فیکریی لەنێوان ئەقڵی مرۆڤەکاندا بچێنن، بەو مانایەی: هەرگیز بەرژەوەندی من دابین نابێ ئەگەر بەرژەوەندی بەرامبەرەکەشم دابین نەکرێ، بەمجۆرە مرۆڤ، ئارەزومەند بێ یان ناچار، بەرگری لە بەرژەوەندی گشتی دەکا لەپێناو بەرژەوەندی خۆیدا.

لێرەدا پرسیارێك دێتەئاراوە کە زۆرجار ئایندارەکان بۆ لەکەدارکردنی لیبراڵیەکان کردوویانە: ئایا ئەگەر ئەنگێزەی هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان هیچ نەبێ جگە لە بەرژەوەندی،

کەواتــە چ مانایــەك دەبەخــشرێ بــە ئــەنگێزە غەیبانیەکان، بەتایبەتی کە دەبێ مرۆڤی خاوەن ئیمان هەموو ڕێنماییە ئاینیەکان جێبەجێ بکا بــێ ئــەوەی پرســیار بکــا ســەبارەت بــەو بەرژەوەندییــەی چــنگی دەکــەوێ لــەم دنیــادا؟. بــەلاّم میّــل لــە وەلاّمــدا دەلّــێ: "گــەر ئیمــانی راستگۆیانە لـەئارادا بـێ سـەبارەت بـەوەی کـە غایەتی خوا، بەر لە هەموو شتێك، خۆشبەختی بوونەوەرەکانــــەو مەبەســــتی بوونیــــان لــــەوەدا بەرجەســــتەدەبێ..، ئــــەوا تیــــۆرەی سوودگەری نەك هەر تیۆرەیەکی ئیلحادی نیە، بـەڵکو لـەو بارەیـەوە لـە هـەر تیۆرەیـەکی دینـی قــوولّترە"[12]. پاشــان لــە رەواندنــەوەی ئــەو گومانــەی کــە پێیوایــە ســوودگەرەکان ئــیرادەی یــــــەزدان وەك سەرچــــــاوەیەکی ئــــــەخلاقی ناسـەلمێنن، میّـل دووپـاتی دەکاتـەوە کـە ئەگـەر بەختــــەوەری مــــرۆڤ کــــارێکی خێــــر بــــێ و خواوەنـدیش کۆکـەرەوەی هـەموو خێرێـك بـێ، ئــەوا بەختــەوەری زادەی ئیرادەیــەکی غــەیبی بالاّیـە، ئـەوەش گەوهـەری ناسـینی خودایـە لای هەر فەیلەسوفێکی سوودگەر.

خـەڵکانێکی تـر لـەژێر کاریگـەری کولتـوری باودا بەچاوی نزمەوە دەڕواننە وشـەی سوودو بەرژەوەندی، چونکە کەسی سوودگەر لای ئەوان هـەمان وێنـەی کەسـی هەلپەرسـتی هەیـە. ئـەو جۆرە کەسانە مانا گشتییەکەی سوود تێکەڵ بە مانا زاراوەیی و فەلسەفیەکەی دەکەن و بڕوایـان وایـە سـوودگەری پاسـاو بـۆ رەفتـاری خـراپیش دێنێتــەوە بەمــەرجێ ســوودی لێبکەوێتــەوە بــۆ کەسـێك یـان بـۆ چـەند کەسـێك، بـۆ نمونـە زۆر کـەس پـەنا دەبـەن بـۆ درۆکـردن، کـە رەفتـارێکی نـزمو ناشــرینە، نــەك تــەنها بــۆ بەرژەوەنــدی تەســکی خۆیــان بــەڵکو هەنــدێ جــار بــۆ بەرژەوەندی کەسە نزیکەکانیشیان. بەڵام بەڕای میّــل کــاری خــراپ، گــەر بــۆ مەبەســتی بەدەســتهێنانی ســوودیش بــێ، تــەنها لــە مەودایـەکی نزیکـدا سوودبەخـشەو لەمـەودای دووردا زیـانی لێدەکەوێتـەوە، ئینجـا درۆکـردن داهێنراوی سوودگەری و لیبرالّیزم نیە، بەڵکو لـە هـەموو ئـەو کۆمـەڵگا ساویلکەو دواکەوتوانـەدا هەیە کە درۆ بەسەر ئەندامەکانیاندا تێدەپەڕێ و توانــــای جیاکردنــــەوەی راســــتگۆیی و ساختەکارییان لەیەکدی نیە. مرۆڤ لە کۆمەڵگە پێــشکەوتوەکانداو لــە پێنــاو بەدەســتهێنانی سوودی خۆیدا رۆژ بەرۆژ بەرچاوڕوون تر دەبێ سەبارەت بە فێڵ و تەڵەکەکانی مرۆڤەکانی ترو خێری زیاتر بۆ ئاشکرا دەبێ. بەم مانایە خێر شـتێك نیـە یـەزدان بەیـەك جـار فێـری مرۆڤـی کردبـێ، بـەڵکو ئـەو شـتەیە کـە رۆژ بـەڕۆژ زیـاتر دەناسرێ و چاکسازی زیاتری تێدادەکرێ. جۆن ستیوارت میّـل لـە کۆتـایی ئـەم پرسـەدا ئامـاژە بـەوە دەدا کـە سـوودگەریش، وەك بـەزمی هـەر رێــچکەیەکی فیکــری تــر، ســەرەتا چــەندین تەفسیری هەڵەی بۆ دەکرێ و چەندین بوختـانی بەدەمەوە دەکرێ[13].

## ســــوودگەری لـــــە پەیوەندیـــــدا بـــــە پاداشت و سزاوە:

هەرچــەندە راوبۆچــوونی جیــاواز هەیــە سەبارەت بە سەلماندنی بەختەوەری گشتی وەك چوارچێوەیەك بۆ دەستەبەرکردنی بەختـەوەریی

تاکەکان، بەڵام یاسایەکی ئەخلاقی هەیە مرۆڤ هاندەدا بۆ بەشداریکردن لە بنیاتنانی بەختەوەریی گشتیدا، بەتایبەتی کاتێ هەستدەکا بەختەوەریی تاك تەنها ئەو کاتە دەگاتە پلەی کەماڵ کە بەشێك بێ لە بەختەوەرییەکی فراوانتر. هەندێ جار ئەو هاندەرە کۆمەڵایەتییە، هەندێ جاریش هاندەرێکی زاتیو ناوەکییە، هەندێ جار مرۆڤ لەپێناو پاداشتدا، یان لە ترسی سزا، کار بۆ بنیاتنانی بەختەوەریی گشتی دەکاو هەندێ جاریش ئەنگێزەیەکی ئەخلاقیو ویژدانی ئەو کارەی پێدەکا. تەنانەت کەسی ئیمانداریش هەمیشە لەبەر خاتری خوا کاری خێر ناکا، بەڵکو لەبەر خاتری خۆی، لەپێناو بەهەشتدا یان لەترسی دۆزەخ ئەو کارە دەکا. بەڵام دواجار ئەنگێزەو هاندەرێك هەیە، ئیتر ناوەکی بێ یان دەرەکی، کار بۆ بەستنەوەی بەختەوەری تاکەکان دەکا بە بەختەوەری گشتییەوە.

خەڵکانێك پێیانوایە ئەنگێزەی ترانسندنتاڵ گرنگترە لە ئەنگێزەی ئەقڵیی پەتی، چونکە مولزیم ترو کاریگەرترە، بۆ نمونە ئەگەر مرۆڤ لە پێڕەوکردنی فەرمانی یەزداندا کاری چاکە بکا کاریگەرترە تا وەك بڕوایەکی شەخسی ئەو کارە بکا..، بەڵام جۆن ستیوارت میڵ پێیوایە کاری چاکە، لە ژێر هەر ناوێکدا بێ، دواجار هەڵوێستێکی خودییە، چونکە ئەوە بڕوای ناوەکی مرۆڤە بەرامبەر یەزدان کە دەبێتە ئەنگێزەو هاندەر نەك بوونی یەزدان وەك زاتێکی باڵای غەیبی لە دەرەوەی گەردوون.

مرۆڤەکان باسیان لە چەندین جۆر هاندەر کردووە سەبارەت بە بەجێهێنانی ئەرکی کۆمەڵایەتی کە هەندێکیان خۆڕسکنو لەناو ناخی مرۆڤدا لەدایکدەبن، هەندێکیشیان وەرگیراونو مرۆڤ لەڕێگەی ئەزموونەوە فێریان دەبێ. بەڵام زامنترین ڕێگە بۆ جێبەجێکردنی ئەرك بریتیە لە بەستنەوەی ئەرك بەسوودەوە، واتە لکاندنی سوودی گشتی بە سوودی تاکەکانەوە لەڕێگەی چاکسازی لە بوارە کۆمەڵایەتیو سیاسیەکاندا بەشێوازێکی ئەقلانی کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا تەبا بێ نەك بەزۆر بسەپێنرێ بەسەریاندا، چونکە "تا ئەقڵی مرۆڤ زیاتر پێشبکەوێ ئەو هاندەرانە زیاتر دەبن کە هەستی یەکگرتن لەنێو تەواوی تاکەکانی کۆمەڵگادا دەچێنن"[14]. کەواتە گەر ستراتیجی پاداشتو سزا بەو شێوەیە دابڕێژرێ کە لەگەڵ خۆشبەختی مرۆڤدا یەکبێتەوە، ئیتر لەژێر کاریگەری ئایندا بێ یان لەژێر کاریگەری یاسای دانراودا بێ یان هەڵقوڵاوی یاسای ویژدانی ناوەکی ئینسان بێ، دواجار دەستەبەری ئەرکی کۆمەڵایەتی دەکا بەبێ ئەوەی لەسەر حسابی ئازادی تاکەکان بێ. لێرەوە هەموو خەڵکی دەبنە خاوەن پابەندبوونێکی ئەخلاقیی ئارەزوومەندانە لەئاست ئەركو یاسا گشتیەکاندا، جگە لەو کەسە خۆپەرستانەی کە هیچ شتێك دادیان نادا جگە لە سزای دەرەکی، ئەوانەش دەبێ ناچار بکرێن کە بەرژەوەندیو سوودی خۆیان بەو شێوەیە پراکتیزە بکەن کە لەسەر حسابی بەرژەوەندی کەسانی ترو سودی کۆمەڵایەتی نەبێ[15].

**بەڵگەو ڕەوایەتی بەختەوەری:**

مرۆڤ حەزدەكا هەموو ئەو ئیشانە بكا كە ئارەزوویان دەكا. تیۆرەی سوودگەریش بڕوای وایە گەڕان بەدوای بەختەوەرییدا خولیاو ئارەزوویەكی هەمیشەیی ناخی هەر مرۆڤێكە. بەلام باشترین بەڵگە بۆ سەلماندنی ئەم هەقیقەتەو بۆ تەرجەمەكردنی لەسەر زەمینی واقع لەو شوێنەوە دەستپێدەكا كە مرۆڤ دەگاتە ئەو قەناعەتەی مەحاڵە بەختەوەریی خۆی بەدی بێ گەر بەختەوەری وی بەشێك نەبێ لە بەختەوەرییەكی گشتی. بەختەوەری وەك هەر غایەتێكی بالاو دوورخایەن، مرۆڤ كۆششی بۆ دەكا بێ ئەوەی پێویست بكا ئەو كۆششەی خۆی بسەلمێنی یان قەناعەت بە مرۆڤەكانی تر بێنێ كە كارێكی خێر دەكا، چونكە بەختەوەریش دەچێتە خانەی غایەتە دوورخایەنەكانەوە كە هەموو كەس لەسەری كۆكە بەلام لە وردكردنەوەیدا تووشی كێشە دێن. بەم مانایە ڕێكخستنی كۆمەلایەتیانەی بەختەوەریی لەنێو مرۆڤەكاندا نەك هەر زەرورەتێكە بۆ ڕێكخستنی مافی مرۆڤەكان، بەڵكو ئەرك و پێوەرێكی ئەخلاقییشە.

كۆششی مرۆڤ بۆ چنگكەوتنی پارەو موڵك ومال لە بنەڕەتدا بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەریی بووە، واتە پارە ئامرازێك بووە بۆ غایەتێكی تر كە پارە نەبووە، دواتر لای كەسانێكی زۆر پارە خۆی لەخۆیدا بۆتە غایەت و پەیداكردنی پارە بۆتە خودی بەختەوەریی. بەلام لە هەردوو حاڵەتەكەدا، واتە چ پارە ئامراز بێت یان غایەت، بێپاساوی بەختەوەری هیچ مانایەكی نیە. هەمان هاوكێشە بەسەر كاری خێریشدا جێبەجێدەبێ، كەسانێك كاری خێر لەگەڵ خەڵكانی تردا دەكەن و بەختەوەرییان پێدەبەخشن لەپێناو مەبەستێك یان بەرژەوەندییەكی شەخسیدا، واتە كاری خێر وەك ئامرازێك تەماشادەكەن نەك وەك غایەتێك.. لە بەرامبەردا كەسانێك هەن پێیان وایە خێر، خۆی لەخۆیدا، غایەتەو دەبێ هەموو كارەكانی تر بچنە خزمەتی ئەو غایەتە. بەلام گەر خێر غایەت بێت یان ئامراز دواجار هەر بەدیهێنەری بەختەوەریی كۆمەلایەتییە. كەواتە "ئێمە جگە لە بەختەوەری ئارەزوی هیچ شتێكی تر ناكەین... چونكە پێكهاتەی سروشتی مرۆڤ بەشێوەیەكە كە حەز لە هیچ شتێك نەكا گەر بەشێك نەبێ لە بەختەوەری یان ئامرازێك نەبێ بۆ بەدەستهێنانی"[16].

**پەیوەندیی نێوان دادپەروەری و بەرژەوەندی:**

ئایا هیچ كێشەیەك هەیە لەنێوان دادپەروەری و بەرژەوەندیدا؟ ئایا چەمكی دادپەروەری لە بنەڕەتدا بۆ دەستەبەركردنی بەرژەوەندی و سوودی گشتی مرۆڤەكان نەهاتۆتە ئاراوە؟ ئایا دەتوانین وێنای دادپەروەری بكەین دژ بە بەرژەوەندی و سوودی مرۆڤ؟!

وەلامی بەشێكی زۆری بیریاران لەمبارەیەوە تەمومژاوییە، چونكە ئەوان مەبەستیانە پایەیەكی بڵندو ڕەها ببەخشن بە دادپەروەری كە هیچ شتێك هاوتای نەبێ. بەلام گەر دادپەروەری نەهێنرێتە سەرزەمینی مرۆڤ و گەر وەك چەمكەكانی تر شەن وكەوی نەكرێ تەنها

وەك چەمكێكی ئایدیاڵو حیكمەتێكی پەتی دەمێنێتەوە، كە ناتوانین لێی تێبگەینو مانای كۆمەڵایەتیو یاسایی پێببەخشین. دادپەروەری وەك هەر بەهایەكی ئەخلاقی لەڕێگەی سیفەتە دژەكانەوە دەناسرێتەوە، واتە بۆ ناسینی دادپەروەری پێویستمان بە ناسینی هاودژەكەیەتی، كە ئەویش (ستەم)ە. تا بازنەی ستەمیش فراوانتر ببێ بازنەی بەختەوەریو چێژی مرۆڤ بەرتەسكتر دەبێتەوە، ئەڵبەتە پێچەوانەكەیشی راستەو بەرقەراربوونی دادەپەروەری دەبێتە مایەی بەختەوەریو چێژی زیاتر. بۆ روونكردنەوەی زیاتری پەیوەندی نێوان دادپەروەریو بەرژەوەندی جۆن ستیوارت مێل چەند نمونەیەك لە پێنج خاڵدا باس دەكا[17]:

**یەكەم:** پێشێلكردنی ئازادییە تایبەتەكانی مرۆڤ، یان زەوتكردنی موڵكیەتی تایبەتی تاكەكان، وێنەی پێڕەوكردنی ستەمی یاساییە. لە دۆخێكی ئاوهادا دادپەروەری تەنها كاتێك مانای هەیە كە كۆتایی بەو پێشێلكردنە بێنێو ستەم لەسەر ستەملێكراوەكان هەڵگرێو شادییان بۆ بگەڕێنێتەوە.

**دووەم:** هەندێك جار خودی یاسا ستەمكارە، واتە بەرگی ستەم دەكرێ بەبەری دادپەروەریداو بەناوی پێڕەوكردنی یاساوە بەختەوەری زەوتدەكرێ. رەنگە كەسانێك هەبن بەرگری لە یاساكان بكەن گەر یاسای خراپو زاڵمیش بن. لە دۆخێكی ئاوهادا پێڕەوكردنی یاسا مانای پێڕەوكردنی دادپەروەری ناگەیەنێ، چونكە دادپەروەریو ستەم پێكەوە كۆنابنەوە.

**سێیەم:** دادپەروەری لە باوەڕی گشتی خەڵكدا واتە پێڕەوكردنی سزاو پاداشت بەسەر كەسانێكدا كە شایەنی خەڵاتن یان سزا.. هەردوو حاڵەتەكەش چەشنێك لە بەختەوەری دابین دەكا كە بەرەنجامی پێڕەوكردنی دادپەروەرییە. بەڵام لە بەرامبەردا ستەم واتە لەبەینبردنی ئەو هاوكێشەیە، واتە سزادانی كەسێك كە شایەنی پاداشتە یان پاداشتكردنی كەسێك كە شایەنی سزایە، ئەوەش گەورەترین ئازاری ویژدانی دەخاتەوەو دادپەروەریو بەختەوەری دەخاتە دوو سەنگەری دژبەیەكەوە.

**چوارەم:** پەیمان شكاندن جۆرێكە لە زوڵم، جا ئیتر پەیمانێكە نوسراو بێ یان لەسەر بنەمای متمانەی هاورێیەتی هاتبێتە ئاراوە. هەرچەندە مەرج نیە كەسی پەیمانشكێن سزای راستەوخۆ بدرێ، بەڵام رەفتارەكەی دژی دادپەروەرییە، نەك لەبەرئەوەی یاسایەكی نوسراو یان عورفی پێشێلكردووە، بەڵكو لەبەر ئەوەی ئازاری ناخی مرۆڤێك یان چەند مرۆڤێكی داوەو بەرژەوەندییەكی لەبەین بردووە كە خەڵكانێك ئومێدیان لەسەر بنیات ناوە.

**پێنجەم:** كەسی دادپەروەر كەسێكی بێلایەنە، بەتایبەتی لەو شوێنانەدا كە نابێ جیاوازی لەنێوان كەسە نزیكو دوورەكاندا بكا. بەڵام ئەم یاسایەی دادپەروەری رەها نیە، چونكە هەندێ جار ستەمە گەر بێتو مرۆڤ هاوسۆز نەبێ لەگەڵ كەسە نزیكەكانی خۆیداو فەزڵیان نەدا بەسەر ئەو كەسانەدا كە نایانناسێ یان دوورن لێی. حومكێكی لەمجۆرە، بەباش یان خراپ، پەیوەندی بەسیاقی بەختەوەریی

هەیە کە هەندێ جار ئەوە دەخوازێ مرۆڤ بێ لایەن بێ و هەندێ جاریش لایەنگر بێ.

بەمجۆرە جۆن ستیورات مێل پێیوایە ئەوەی مانای خێر دەبەخشێ بە دادپەروەری و دەیکاتە ئەرکێکی پیرۆز خودی دادپەروەری نیە، بەڵکو ئەو بەرژەوەندییە کە دەیخاتەوە: "گەر یەکێکیش پرسی بۆ دادپەروەری ئەرکە؟!.. تەنها بەیەك وشە وەڵامی دەدەمەوە: لەبەرئەوەی بەسوودە"[18]. بەڵام هەرکاتێك دادپەروەری دژی سوودی مرۆیی بوو ئەوە دەبێ زۆر بەجدی پێداچوونەوەی بۆ بکرێ، بۆ نمونە مەرج نیە سزای تاوانبار هەمیش هەق بێ، چونکە لە سەردەمی ئێستادا (سەدەی نۆزدەیەم) نەریتی تۆڵەی سەرەتایی باوی نەماوە، بەتایبەتی ئەو نەریتەی کە لە شەریعەتی جولەکەو ئیسلامدا هەیەو دەڵێ: دەبێ چاوی ئەو کەسە کوێربکرێ کە چاوێکی کەسێکی کوێرکردووەو ددانی ئەو کەسە بشکێندرێ کە ددانی کەسێکی شکاندووە. بەڵام زۆرجار کۆپیکردنەوەی سزا لەشێوەی تاوانێکە، لەبری ئەوەی ئاسوودەیی و بەختەوەری دروست بکا بەپێچەوانەوە ئازاری دەروونی دەخاتەوە. بۆیە غایەت لە سزا رێگرتنە لە دووبارەکردنەوەی تاوان نەك تۆڵەسەندنەوەی پەتی. لە کۆتایی ئەم بابەتەدا مێل دەپرسێ: "کەواتە ئایا داتاشینی جیاوازی لەنێوان دادپەروەری و سوودبەخشیندا جۆرێك نیە لە وەهم؟"[19]، لە وەڵامدا ئەوە دووپاتدەکاتەوە کە دادپەروەری تەنها لەناو سیاقی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا مانا پەیدادەکا، وەهمێکی گەورەشە گەر وابزانین دەبێ نەخشەی سیاسی و ماناکانی بەختەوەری و بەرژەوەندی دوابخەین و رایانبگرین تا ئەو کاتەی بەتەواوەتی مانای دادپەروەری یەکلایی دەکەینەوە.

### دەربارەی ئازادی[20]

مێژوییەکی درێژە هاوڵاتیانی یۆنان و رۆمان و ئینگلتەرا بەگومانەوە دەڕواننە رەوایەتی دەسەڵات، بەتایبەتی کاتێ ناکۆکی لەنێوان بەرژەوەندی خەڵك و بەرژەوەندی دەسەڵاتداراندا دروست دەبێ. بۆیە پرسیارێك دێتە ئاراوە کە ئایا کامیان: خەڵك یان دەسەڵات مافی ئەوەی هەیە بەرگری لە بەرژەوەندی خۆی بکا لەسەر حسابی بەرژەوەندی ئەوی تر. ئەڵبەتە فەرمانڕەوا ستەمگەرەکان، هەرچەندە کەمینەش بوون، کە هەندێ جار نوێنەرایەتی خێڵێك یان بنەماڵەیەکی بچووکیان کردووە، بێدوودڵی بەرژەوەندی خۆیان سەپاندووە بەسەر زۆرینەی خەڵکدا، زۆر دڵڕەقانە مافیان بەخشیوەتە خۆیان بۆ چەوساندنەوەو سەرکوتکردنیان. سەرەنجام پرنسیپی مافی زۆرینە وەك مافێکی دەستەجەمعی هاتۆتە ئاراوە، بۆ کەمکردنەوەو رێگرتن لە دیکتاتۆریەت و ستەمی کەمینەی فەرمانڕەوا. وەك بەرهەمی ئەو هوشیارییەش سیستمی دیموکراتی هاتۆتە ئاراوە کە زنجیرەیەك رێوشوێنی دەستوری گرتۆتەبەر بۆ دەستەبەرکردنی بڕێك لە ماف و ئازادیەکانی زۆرینەی خەڵك.

بەڵام تەنها سەلماندنی مافی زۆرینە بەس نیە بۆ دەستەبەرکردنی ئازادی وەك بەهایەکی گشتی، چونکە زۆرجار پەیوەندیی نێوان

حاکم و مەحکوم پەیوەندییەکی ساختەو ناچارییەو زادەی ئیرادەی هاوبەش نیە، بۆیە جۆن ستیوارت میل پێشنیازدەکا: "دەسەڵاتداران و کۆمەڵانی خەڵکی ببنە خاوەنی شوناسێکی یەکگرتو، بەو مانایەی بەرژەوەندی و ئیرادەی دەسەڵاتداران هەمان بەرژەوەندی و ئیرادەی خەڵکی بێ"[21]. لە دۆخێکی ئاوهادا هاوئاهەنگی و متمانەی هاوبەش لەنێوان هەردوو لایەنی هاوکێشەدا دروست دەبێ، ئیتر وەك بیریارە لیبراڵیستە نەریتپارێزەکانی ئەوروپا پێیانوایە دەسەڵاتی فەرمانڕەواکان دەبێتە دەسەڵاتی زۆرینەی خەڵك و دەسەڵاتی زۆرینەی خەڵکیش یەکسان دەکرێتەوە بە دەسەڵاتی هەموو خەڵك کە هەڵقوڵاوی ئیرادەی یەك بەیەکی تاکەکانە.

جۆن ستیوارت میل کێشەیەکی گەورەی لەگەڵ ئەم بۆچوونە باوەدا هەیە سەبارەت بە دەسەڵاتی زۆرینە، چونکە لای وی مەرج نیە ستەم تەنها ستەمی کەمینە بێ دژی زۆرینە، بەڵکو زۆرجار ستەمی زۆرینە دژی کەمینە ترسناکترە، چونکە ئەو ئازارەی کە کەسێك دەیچێژی لەسەر دەستی ژمارەیەکی زۆری خەڵك چەندین قات، لەڕووی جەستەیی و دەرونییەوە، زیاترو زاڵمانەترە لەو ئازارەی کە ژمارەیەکی زۆری خەڵك بەدەست تاقە کەسێکەوە دەیچێژن. مەرجیش نیە ستەمی زۆرینە تەنها ستەمێکی سیاسی بێ، بەڵکو هەندێ جار بەرگی کۆمەڵایەتی یان رۆشنبیری یان ئاینی دەپۆشێ، هەندێ جار بەناوی رای گشتییەوە ئازادیەکان بەرتەسك دەکرێنەوەو سەرکوتکردنی یاسایی یان رەمزی دژی خەڵکانێك پێڕەودەکرێ کە رایان وەك رای گشتی نیە، یان هەندێ جار مرۆڤ ناچار دەبێ، لەژێر فشاری کۆمەڵگادا، پشتیوانی نابەدڵ بۆ رایەکی گشتی دەربڕێ. بۆیە "هەر هێندە بەس نیە تاك بپارێزین لە ستەمی فەرمانڕەوای سیاسی، بەڵکو پێویستە بەهەمان شێوە تاك بپارێزین لە ستەمی رای گشتی و هەستوسۆزی باو، هەروەها پێویستە رێگەنەدرێ ئیرادەو بیرۆکەکانی کۆمەڵگە بسەپێندرێ بەسەر ئەو تاکانەدا کە قەبوڵیان نیە"[22].

یەکێك لە خەتەرترین ستەمەکان، کە بەناوی مافی زۆرینەوە ئەنجام دەدرێ، بریتیە لە ستەمی ئاینی یان عەقائیدی یان مەزهەبی. بەڵام پێڕەوانی ئەو ئاینانەی کە رۆژێ لە رۆژان ستەمیان دژی بێدینەکان، یان دژی پێڕەوانی ئاین و ئاینزاکانی تر، ئەنجامداوە.. خۆیان لە سیاقی ترو لە وڵاتانی تردا توشی ستەمی هاوشێوە بوونەتەوە لەسەر دەستی کەسانێك کە هاوئاین و هاوعەقیدەیان نەبوون. بۆیە لە وڵاتانێکدا کە رەوایەتییان بەخشی بە توندوتیژی بەناوی مافی زۆرینەوە، پاش ئەزموونێکی دوورو درێژی کوشتوکوشتارو پاکتاوکردنی مەزهەبی و عەقائیدی، خاوەن عەقیدە ناکۆکەکان خۆیان گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە نابێ هیچ دین و مەزهەب و عەقیدەیەکی دینی و دنیایی، بەناوی مافی زۆرینەوە، ئازادیی کەمینەکان زەوت بکا. تەنانەت لەو وڵاتانەی خۆرئاوا کە ئاینداریی تەقلیدی رووەو کزبوون دەڕوا ئایندارەکان داوای سەلماندنی ئازادی ئاینی دەکەن و داوای پاراستنی پەرستگاو پێڕەوانیان دەکەن

بەرامبەر ئەو زۆرینەیەی خەڵك كە ئایندار نین، واتە هاوكێشەكە پێچەوانە بۆتەوە. هەربۆیە بەبڕوای جۆن ستیوارت مێل ئازادی ئایینداری، بەمانا راستەقینەكەی، لەو وڵاتانەدا بەرقەرارە كە وڵاتی ئاینی نین[23].

ئەی ئەگەر حوكمی زۆرینە لە بەرژەوەندی كەمینە بوو، پرسەكە چی بەسەردێ؟ ئایا زۆرینە بۆی هەیە توندوتیژی دژی تاكێك یان چەند تاكێكی كۆمەڵگا پێرەوبكا بەبیانوی پاراستنی بەرژەوەندییان، واتە بەبیانوی ئەوەی كە زۆرینە بەرژەوەندیی تاكەكانی، زیاتر لە خۆیان، مەبەستە؟! لە وەڵامدا مێل پێیوایە هیچ بیانویەك رەوایەتی نابەخشێتە دەسەڵات، ئیتر دەسەڵاتی سیاسی بێ یان كۆمەڵایەتی، خۆی بكاتە نوێنەری بەرژەوەندی یەك بەیەكی تاكەكانی كۆمەڵگە، چونكە بەرژەوەندیو خواستو ئارەزوەكانی خەڵك هێندە ئاڵۆزو تێكڕژاوو فرەجۆرن كە مەحاڵە هیچ دەزگایەكی نوێنەرایەتیكردن ببێتە خاوەنو پارێزەریان. لێرەوە لیبراڵیزم دەرگا دەكاتەوە بۆ ئازادییە شەخسیەكان، كە دەبێ بەیاسا پارێزراو بن، بەو مانایەی هیچ دەسەڵاتێك، بەناوی پیرۆزییەوە یان بەناوی زۆرینەوە، بۆی نیە سنوری ئەو ئازادیانە ببەزێنێ. دەسەڵات تەنها ئەو كاتە بۆی هەیە رێگە لە رەفتاری كەسێك بگرێ، یان رووبەڕووی سزای یاسایی بكاتەوە، كە رەفتارەكەی ببێتەهۆی پێشێلكردنی ئازادیی كەسانێكی تر، واتە هەموو ئازادییەك رەوایە جگە لە (ئازادیی پێشێلكردنی ئازادی)، چونكە لە حاڵەتێكی وادا هاوكێشەكە یەكسان دەبێتەوە بەسفر. كەواتە بەهای ئازادی لە بەهای بەرژەوەندییش گەورەترە، چونكە هەندێ جار مرۆڤ بە ئارەزوی خۆی، واتە بەبڕیارێكی ئازادانە، لە بەرژەوەندی خۆی خۆش دەبێ، یان بڕوای بەجۆرێك لە چێژ هەیە كە لەگەڵ چێژی گشتیدا یەك نایەتەوە. مرۆڤەكان ئازادن لەوەی بڕیار لەسەر جۆرو شوێنو كاتی پێرەوكردنی بەرژەوەندیی خۆیان بدەن، هیچ كەسێك لەجیاتی هیچ كەسێكی تر ئەو بڕیارە نادا.

بەڵام ئەم یاسایە مرۆڤی كامڵ دەگرێتەوە بەمانا یاساییو كۆمەڵایەتیەكەی، واتە منداڵانو مێردمنداڵان ناگرێتەوە كە لە تەمەنێكدان پێویستیان بە چاودێریو دەستگیرۆییو فێركردن هەیەو دەشێ ئازادیی لە دژی خۆیان بەكاربێنن. لێرەدا جۆن ستیوارت مێل پرسیارێك دەوروژێنێ سەبارەت بەو میللەتە دواكەوتوانەی كە لە مانای ئازادی نەگەیشتوونو دەشێ ئازادی دژی خۆیان، یان دژی ئازادی خۆی، بەكاربێنن. لە حاڵەتێكی ئاوهادا مێل رەوایەتی دەبەخشێ بە فەرمانڕەوا چاكسازەكان كە هەموو رێوشوێنێك، بە ئستبدادیشەوە، بەرامبەر ئەو میللەتە هەمەجییانە بەكاربێنن كە لە تەمەنێكی بچووكی پێگەیشتنی هوشیاریدان. لای وی "ئازادی، وەك پرنسیپێك، نابێ لە دەوڵەتدا بسەلمێنرێ تا ئەو كاتەی خەڵكی ئەو دەوڵەتە دەتوانن باری ژیانی خۆیان، بەشێوەیەكی یەكسان، لەڕێگەی گفتوگۆی ئازادانەوە پێشدەخەن"[24]. تا ئەو كاتەش كە میللەت فێری هونەری وتووێژو بەكارهێنانی ئازادی دەبێ باشتر وایە ملكەچی دیكتاتۆرە دادپەروەرەكان بێ، بەڵام ئەوەش

مەسەلەیەکی دوو بەختەیە و دەشێ دیکتاتۆرەکان دادپەروەر نەبن.

هەرێمێك هەیە کە خاوەنی پیرۆزیی خۆیەتی و چ دامودەزگاکانی دەوڵەت و چ دامودەزگاکانی کۆمەڵگا بۆیان نیە پێی تێبنێن، ئەو هەرێمە شوێنی پێڕەوکردنی بەرژەوەندی و چێژی تاکەکانە، یان بە مانایەکی تر هەرێمی ئازادییەکانە، کە خۆی لە سێ جۆری سەرەکیی ئازادیدا دەبینێتەوە[25]:

یەکەم: ئازادیی فیکرو رادەربڕین و ویژدان دەربارەی هەموو ئەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە سۆز یان زانست یان ئەخلاق یان ئاینەوە هەیە.

دووەم: ئازادیی گەڕان بەدوای بەختەوەری و چێژوەرگرتن لە ژیان، ئازادی لەوەی تاکەکان خۆیان پلان بۆ ژیانی خۆیان دابنێن بەوجۆرەی کە لەگەڵ کەسایەتی و سروشتیاندا دەگونجێ.

سێیەم: ئازادیی کۆبونەوە و ئینتمای تاکەکان بۆ گروپ و فیدراسیۆنە جیاوازەکان بەو شێوەیەی نەبێتە هۆی ئازاردانی کەسانی ترو بەو مەرجەی کەس بەزۆر، یان بەفێڵ، ناچار نەکرێ بۆ کۆبوونەوە و ئینتماکردن.

### دەربارەی ئازادی بیرکردنەوەو گفتوگۆ:

ئازادیی بیرکردنەوە و گوزارشتکردن لە دید و رەخنە و نەیاریی فیکری ئەو زەمانەتانەن کە رێدەگرن لە هاتنەسەرکاری حکومەتی گەندەڵ و ستەمکار. لە سیستمی دیموکراتیدا دەسەڵاتەکانی یاسادانان و جێبەجێکردن تەنها ئەو کاتە شەرعیین کە گوزارشت لە دیدوبۆچوون و خواستی هاوڵاتیان دەکەن. بەڵام ئەو گوزارشتکردنە وەهمێکی گەورەیە گەر پێشوەخت ئازادی بیرو گفتوگۆ و رەخنە وەك کەرەستەگەلی پێوانەکردنی رای گشتی و نزیکبوونەوە لە ترپەی دڵی خەڵکی دابین نەکرابێ.

ئازادی فیکرو رادەربڕین ئازادییەکی شێوە رەهایە کە نابێ لەژێر هیچ پاساوێکدا پێشێل بکرێ و بگرە ئەرکی حکومەتە دیموکراتەکانە کە بیپارێزن، تەنانەت ئەگەر لە سایەی ئەو ئازادییەدا گوزارشت لە رای چەوت یان رای دژ بە رای گشتیش بکرێ. بگرە درێژوترین و ترسناکترین پرۆسەی بێدەنگکردن و سەرکوتکردن ئەو پرۆسەیەیە کە بە رەزامەندی رای گشتی ئەنجام دەدرێ، چونکە بۆ نمونە "گەر هەموو مرۆڤایەتی رێکەوتن لەسەر ئەوەی یەك رایان هەبێ، پاشان تاکە کەسێك رایەکی پێچەوانەی هەبوو، ئەوە مافی مرۆڤایەتی لە بێدەنگکردنی ئەو تاکە مرۆڤە لەپێشتر نیە لە مافی ئەو تاقە مرۆڤە لە بێدەنگکردنی هەموو مرۆڤەکان کاتێ بۆی دەلوێ کارێکی وا بکا"[26].
رەنگە بووترێ هەندێ راوبۆچوون زیانبەخشن و دەشێ نەدرکاندنیان باشتر بێ لە درکاندنیان، بەڵام ئەو زیانەی لەو بێدەنگکردنە دەکەوێتەوە زۆر قورسترە لە دەربڕینی راوبۆچوونەکە، چونکە خراپترین بۆچوون تەنها ئەو کاتە دەزانین خراپە کە دەوترێ، ئەگەر نا دەشێ راست بووبێ و ئێمە دەرفەتمان نەدابێ ببیسترێ. کاتێك ئێمە رێگەنادەین قسەیەك ببیسترێ تەنها ستەم دژی قسەکەرە دەمکوتراوەکە ناکەین، بەڵکو ستەم دژی هەموو نەوەکانی مرۆڤایەتی دەکەین کە بێبەشی

دەکەین لە وەرگرتنی زانیارییەك، زانیارییەك دەشێ هەڵە بێ و دەشێ ڕاست بێ، بەڵام لە هەردوو حاڵەتەکەدا ئێمە زوڵم دەکەین، "چونکە گەر ڕاست بێ ئەوا ئێمە نەوەکان بێبەش دەکەین لە وەرگرتنی ڕاستییەك لەبری چەوتییەك کە پێشتر بڕوایان پێی بووە، گەر هەڵەش بێ ئەوا ئێمە لە سوودێکی گەورە بێبەشیان دەکەین، کە بریتییە لە دڵنیابوون لەوەی لەسەر هەقن"[27].

جیاوازی نێوان کەسی نەریتپارێز، کە یەخسیری شوناسێکی ئاینی یان کۆمەڵایەتی یان حزبی بەرتەسکە، لەگەڵ کەسی لیبراڵ، کە خاوەن ئاسۆی بیرکردنەوەی فراوانە، لەوەدایە کە کەسی یەکەم تەنها لە یەك دەلاقەوە جیهان دەبینێ بەڵام کەسی دووەم توانای بینین و تێپەڕاندنی سیاقە داخراوەکانی هەیەو هەندێ جاریش توانای تێپەڕاندنی نەوەی خۆی هەیە. کەسی یەکەم بڕوای بە بۆچوونی کۆمیونیتییە داخراوەکانەو وەك هەقیقەتی ڕەها لێیان دەڕوانێ، بەڵام کەسی دووەم دڵنیایە کە ڕۆژگارێ دێ هەموو ئەو بۆچوونانەی ئەمڕۆ کە وەك هەقیقەتی نەگۆڕ تەماشادەکرێن هەموار دەکرێن و گۆڕانی ڕیشەییان بەسەر دێ، هەروەك چۆن نەریت و بۆچوونە کۆنەکان سەردەمیان بەسەرچووە. ڕەنگە ئەو کەسەی بۆچوونێکی باو ڕەتدەکاتەوە کەسێکی هەڵە بێ، بەڵام هەڵە بێ لەوە باشترە هەموو بۆچوونەکانی پێش خۆی لاڕاست بێ، مرۆڤ لە بیرکردنەوەدا توشی هەڵەو کۆدژی فیکری ببێ لەوە باشترە بیرنەکاتەوە. "ئایا خراپ بەکارهێنانی ئەقڵ لەلایەن خەڵکییەوە ئەو مافەمان دەداتێ پێیان بڵێین: چیتر ئەقڵ بەکارمەهێنن"[28]، ئەڵبەتە نەخێر چونکە تەنها لەو ڕێگەیەوە ئازادی بیرکردنەوە وەك بەهایەکی یەکسان لەلایەن مرۆڤەکانەوە بەکاردێ. مرۆڤەکان هەموویان خاوەن ئەقڵ و بەهرەی بیرکردنەوەی یەکسانن، بەڵام هەندێکیان خراپ بەکاری دێنن نەك لەبەرئەوەی گوناهێکیان کردووە بەڵکو ڕاستتر لەبەرئەوەی گوناهێکیان دەرهەق کراوە کاتێ ڕێگەیان پێنەدراوە بەکاریبێنن و گەشەی پێبدەن.

تەنها ڕێگەدان بەوانی دی کە قسەبکەن یان ڕەخنەبگرن بەس نییە، چونکە دەکرێ خەمساردانە ئەو کارە ئەنجام بدرێ. پێویستە ئازادی بیرکردنەوە و ڕادەربڕین دۆخێکی کۆمەڵایەتی بخولقێنێ، ئەو دۆخە کۆمەڵایەتییە زادەی گفتوگۆیە، گفتوگۆش دەشێ نەیاری و ڕای پێچەوانەیە بخاتەوە بەهەمان ئەو ئەندازەیەی کە دەشێ هاوڕایی دروست بکا. بەڵام لە هەردوو حاڵەتەکەدا گفتوگۆ نزیکبوونەوەی زیاترو متمانەی پتەوتر دەخولقێنێ. لێرەدا جۆن ستیوارت مێل پێیوایە تەنها ئەو کەسە شایەنی متمانە پێبەخشینە کە متمانەی بەخۆی هەیە، تەنها ئەو کەسەش متمانەی بەخۆی هەیە کە توانای گوێگرتنی لەوانی تر هەیەو بە سنگێکی فراوانەوە گوێ بۆ ڕەخنەو ڕاوبۆچوونیان شلدەکا، دواجار توانای ئەوەی هەیە لە چەندین گۆشەنیگای جیاوازەوە بۆچوونەکان بەراوردبکاو هەڵیانبسەنگێنێ و ئیعترافیش بە هەڵەکانی خۆی بکا. واتە نابێ بە پاساوی ئەوەی ئێمە متمانەمان بەخۆمان هەیەو دڵنیاین لە بۆچوونەکانمان ئیتر گوێ بۆ ئەوانی

تـر نـەگرین، چـونکە ئـەوە دڵنیـایی نیـە بـەڵکو دۆگمابوونـــە. دڵنیـــایی بەرهـــەمی گومـــان و وروژانـدنی قـسەو گفتوگۆیـە نـەك بێـدەنگی و سـەرکوتکردن، دڵنیـایی بەرهـەمی ئازادییـە نـەك ستەم و ترساندن. تەنانـەت سـەبارەت بـە بابەتـە زۆر هەســـتیارەکانی وەك بڕوابـــوون بـــە خـــوا و پرسە غەیبییەکان، ئیمانی راستەقینە ئیمانێکە زادەی ئـــازادی بیرکردنـــەوەو پرســـیارکردن و گومانە، نەك ترساندن و سەپاندن و دەرسدادان.

دیـدێکی خۆشـبینانە هەیـە دەڵـێ: راسـتی هەمیـشە بەسـەر چـەوتیدا سـەردەکەوێ، واتـە ئـەوەی راسـتی و ناڕاسـتی لێـك جیادەکاتـەوە و مێـژوی مرۆڤایـەتی پێـشدەخا زەبـری زەمانەیـە نـەك کۆشـش و ململانێـی نێـوان راوبۆچـوون و گۆشـەنیگا جیاوازەکـان. بـەڵام جـۆن سـتیوارت مێـل پێیوایـە ئەمـە یەکێکـە لـەو درۆیانـەی کـە مـرۆڤ دڵـی خـۆی پێخۆشـدەکا، چونکە زۆرجـار چەوتی بەسەر راستیدا سەرکەوتووەو زۆرجار پێـــشێلکردنی ئازادیـــەکانی مـــرۆڤ چـــەرخی مێژووی راگرتـووە یـان بـۆ پاشـەوەی بردۆتـەوە، "مێژوو پڕە لەو نمونانەی کە پێماندەڵێن ستەم هەقیقەت پێشێلدەکا، گەر بەتەواویش لەبەینی نەبا بۆ چەندین سەدە دەیباتەوە بۆ دواوە. بۆ نمونـە گـەر تـەنها دەربـارەی بیروبـاوەڕی ئـاینی قـسان بکـەین دەکـرێ بڵـێین ریفـۆرمی ئـاینی، پێش (مارتن لۆسەر)، بەلانی کەمەوە بیست جار تەقیبـەوە، بـەڵام هـەموو جارەکـان سـەرکوتکران. (...) تەنانەت پاش لۆسەر-یش بەهۆی ستەم و زۆردارییەوە ریفۆرمی ئاینی لە چەندین ناوچە ســـەرکوتکران. لـــە ئیـــسپانیا و فلانـــدێرس و ئیمپراتۆریـــای نەمـــسا ئـــاینزای پرۆتـــستانتی سـەرکوتکرا و لەبێخـەوە هەڵکێـشرا"(29). واتـە رێگەدان بە دیدو بۆچوونە جیاوازو نەیارەکان رەوڕەوەی مێـژوی لـە هەنـدێ وڵاتـدا خێراتـر کردووە، سەرنجی خەڵکی بەلای جیاوازی نێوان راستی و چەوتیدا چڕتر کردووە، چونکە ئەوە مێـــژوو نیـــە کـــە قـــسەو ململانـــێ و گـــۆڕان دروسـتدەکا، بـەڵکو ئـەوە قـسەو ململانێکـانن سروشتی مێژو دیاریدەکەن و گوڕوتینی زیاتری پێدەبەخشن.

کەسانێك بەچاوی سووك تەماشای مشتومڕ لـە بـوارە مرۆیـی و سیاسـیەکاندا دەکـەن و وەك قسەی پەتی و بێهوودە لەقەڵـەمی دەدەن. ئەوانە کەســـانێکن دەیانـــەوێ هێڵێکـــی جیاکـــەرەوە لـەنێوان راسـتی و چـەوتیدا بکێـشن، واتـە لـە ئەنجامگیریـــدا هـــەمان میتـــۆدی ماتمـــاتیکی بەکاردێنن و دەڵێن شتێك راست بوو یەك جار راستەو راوبۆچوونی جیاواز قەبوڵ ناکا. بەڵام پرۆســـەی ســـەلماندن و بەڵگەهێنانـــەوە لـــە ماتماتیکـدا شـتێکەو لـە بـوارە سیاسـی و رۆشـنبیریەکاندا شـتێکی تـرە. لـە ماتماتیکـدا بـەهێزترین بەڵگـە ئەوەیـە کـە بـە کـورتترین هاوکێشەو ساناترین لۆجیك دەخرێتەڕوو، بەڵام لە بوارەکانی تردا تا بەڵگەو بەڵگەی پێچەوانە زیاتر بێ ئەگەری هەڵێنجانی دەرەنجامی راستتر زیـاترە، چـونکە دەرفـەتی زیـاتر دەبەخـشێ بـە بـــەراوردی نێـــوان تێزەکـــان و هەڵبـــژاردنی شیاوترینیان.

لـە فەلـسەفەدا جۆن سـتیوارت مێـل نمونـەی پـەیڤینی ئەفلاتۆنی دێنێتەوە کەلەسەر بنـەمای جیـاوازی و وروژانـدنی رای جیـاواز دامـەزراوە بەمەبەسـتی چنگکەوتنی شیاوترین بیرۆکـە کـە

توانــای دروســتکردنی قەناعــەتی هەیــە، لــە تیۆلۆجیــا و ئایینناسیــشدا نمونــەی میتــۆدی قوتابخانــە ئاینیــەکانی چــاخی ناوەڕاســت دێنێتەوە کە ئازادی دەبەخشرا بە قوتابی لەگەڵ مامۆســتا و قوتابیــەکانی تــردا بکەوێتــە گفتوگــۆ و خــستنەڕووی بەڵگــەی جیــاواز بەمەبەســتی گیرســانەوە لەســەر بــەهێزترین بەڵگــە. بــەڵام مێــل ئــەوە لــەیادناکا زۆر جــار ئــەو پــەیڤین و مــشتومڕانەی ســەدەکانی ناوەڕاســت بــەئاقارێکی خراپــدا بــراون و لــەبری ئــەوەی ئــازادی بیرکردنــەوە دەســتەبەر بکــەن کوشــتوویانە، چــونکە وتوێــژکاران ناچــارکراون ســەرەتا بــڕوای رەهــا بەهەنــدێ پێــشەکی و پرنــسیپ بێــنن و لەبــەر رۆشنایی ئــەو پێــشەکیانە وتووێــژ بکــەن. واتــە هەرچــەندە بەشــێوازێکی ئــەقڵانی دوور لــە دەســتێوەردانی دەســەڵاتی سیاســی و ئــاینی وتووێــژ کــراوە بــەڵام بەفــەرمانی دەســەڵات پێــشەکیەکان و بیرۆکــەکانی وتووێــژ بڕیاریــان لەسەر دراوە[30].

ســەرەنجام جــۆن ســتیوارت مێــل ئــەوە دەسەلمێنێ کە ئازادی قسەکردن و رادەربڕین و رەخنــەگرتن بــە ســێ ئەگــەر (ئیحتمــال) کۆتــایی دێ، هــەر یــەکێکیش لــەو ســێ ئەگــەرە خێــرو بەرژەوەنــدی لێدەکەوێتــەوە، نــەک تــەنها بــۆ ئــەو کەســەی ئازادییەکــە پێڕەودەکــا، بــەڵکو بــۆ ئــەو سیاقەش کە تیایدا پێڕەودەکرێ[31]:

ئەگــەری یەکــەم: دەشــێ راوبۆچــوونی بــاو لــەناو خەڵکیــدا ســاختەو هەڵــە بــێ، کەواتــە بۆچوونێك هەیــە کــە هێــشتا نــەوتراوە نزیکترە لە راستییەوە.

ئەگــەری دووەم: دەشــێ راوبۆچــوونی بــاو لەناو خەڵکیدا راست بێ، کەواتــە خستنەڕووی راوبۆچــوونی هەڵــە پێویــستە بــۆ دڵنیــابوون و سەلماندنی راستی و دروستی بۆچوونە باوەکە.

ئەگەری سێیەم: دەشێ هــەردوو بۆچوونەکە بڕێك لــە راستی و بڕێك لــە چەوتییان تێدا بێ. لــەم حاڵەتەشــدا خــستنەڕووی هــەردوکیان پێویــستە تــا رایــەکی ســێیەم بێتــەئاراوە کــە هەڵگری لایەنە پۆزەتیڤەکانی هەردوکیانە.

### ئــازادی تاکەکــەس وەك کۆڵەکــەی بەختەوەری[32]:

بەختــەوەری ئــەو کاتــە مانــای هەیــە کــە کــردەوە و هەڵوێــستی مــرۆڤ زادەی هەڵبــژاردنی ئازادانــەی خــۆی بــێ. لــەو پێنــاوەدا پێویــستە هــەموو ئــەو کۆسپ و رێگرانــە هــەڵبگیردرێن کــە ســنوری ئازادیــەکانی تاکەکــەس بەرتەســك دەکەنەوە، تەنها ئەو کاتە نەبێ کە پێڕەوکردنی ئازادی کەسێك دەبێتەهۆی پێشێلکردنی ئازادی کەســێکی تــر. بــەم مانایــە پابەنــدبوون و دروســتکردنی رێگرەکــانیش تــەنها ئــەو کاتــە رەوایەتییان هەیە کە لەسەر بنەمای سەلماندنی پێشوەختی ئازادی دابمەزرێن.

بناغــەی ســەلماندنی ئــازادیی تاکەکــەس بەهــەمان شــێوەی ئازادی رادەربــڕین بریتیــە لــە بەختــەوەری و بەرژەوەنــدی مرۆڤــەکان. بــەڵام کاتێك ناکۆکی لــەنێوان ئازادی و بەختەوەرییدا دروســتدەبێ، گونــاه ناگەڕێتــەوە بــۆ ئــازادی، بــەڵکو گونــاه گونــاهی خــراپ رێکخــستنی ئازادییــە. بــۆ نمونــە مــرۆڤ ئــازادە لــەوەی کردەوەیــەك ئــەنجام بــدا کــە بەختــەوەری

پێدەبەخشێ، بەڵام ئازاد نیە لەوەی کردەوەیەک ئەنجام بدا کە دەبێتەهۆی لەناوبردنی ئازادیو بەختەوەریی کەسانی تر. یان مرۆڤ ئازادە لەوەی رەخنە لە کەسێك بگرێ کە بەهۆی هەڵوێستێکیەوە ئازادیو بەختەوەری کەسانی تری پێشێلکردووە، بەڵام ئازاد نیە لەوەی قسەیەکی چەوت یان تۆمەتێکی بێبناغە دابتاشێ و لە سیاقێکدا بیدرکێنێ کە کێشەو تاوانی لێبکەوێتەوەو بەختەوەری کەسانی تر لەونابەرێ.

هەندێ جار ئازادییە تاکیەکانی مرۆڤ دەچێتە ناکۆکییەوە لەگەڵ نەریتە کۆمەڵایەتیەکاندا، بەڵام مەرج نیە هەمیشە نەریتەکان نەریتی شیاو بنو بۆ هەموو کاتو شوێنێك گونجاو بن. هەمیشە ئەو نەریتانە بەختەوەری دەستەبەردەکەن کە هەڵبژاردەی ئازادی تاکەکان بێ لە شوێنو کاتی دیاریکراودا، بەڵام ئەو نەریتانەی کە بەختەوەری لەبەیندەبەن نەریتی سەردەمێکی ترنو بەهەڵە پارێزگارییان لێدەکرێ. جیاوازی مرۆڤ لە گەڵ مەیموندا، وەك مێل دەڵێ، لەوەدایە کە مرۆڤەکان جیاوازن بەڵام مەیمونەکان هەمیشە لاسایی یەکتر دەکەنەوە. مرۆڤ لە قۆناغێکدا پەنادەبا بۆ لاساییکردنەوە کە هێشتا کامڵ نەبووە یان هێشتا ئازادیی وەرنەگرتووە، بەڵام هەر ئەوەندەی بووە خاوەنی کەسایەتیو ئازادیی خۆی ئیتر بیر لە ستایڵی جیاوازی بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتو کەسایەتی خۆی دەکاتەوە. سەرباری خاڵی هاوبەشی نێوان مرۆڤەکان، بەڵام هیچ مرۆڤێك کتومت لەوی تر ناچێ، مرۆڤی هیچ سەردەمێك لە هی سەردەمێکی تر ناچێ، مرۆڤی هیچ شوێنێك لە هی شوێنێکی تر ناچێ. مرۆڤەکان بەپێچەوانەی رووەك و درەختەکانەوە پێویستیان بە ئاووهەواو ژینگەی جیاوازە، تاوەکو زیاتر گەشە بکەنو زیاتر پەروەردە بن.

زۆرجار کۆمەڵگە نەریتپارێزەکان لە رەهاکردنی ئازادیەکان دەترسن، چونکە رەنگە کەسە ئازادەکان بەهۆی رسکی گەورەوە پشێوی کۆمەڵایەتیو سیاسی بخەنەوە. بۆیە سەرباری پیرۆزکردنی توانا ئەقڵیەکانی مرۆڤ، کۆمەڵگەکان پێیان باشە دەسەڵاتو چارەنوسیان بسپێرن بەو کەسانەی کە خاوەن توانای ئەقڵی مامناوەندیین. بەڵام لە راستیدا بۆ ئەوەی کۆمەڵگا هەنگاوی خێراتر بنێ و پێشکەوتنی گەورە بەخۆوە ببینێ پێویستە کەسە ئازادو خاوەن پێشنیازە جیاوازەکان حوکمی بکەن. فەرمانڕەوای ئازاد کەسێك نیە پێگەیەکی بالاتری لە خەڵکی ئاسایی هەبێو پیرۆزبکرێ، چونکە کەسێکی جیاوازە لە فەرمانڕەوای قارەمانی چاخە کۆنەکان. قارەمانی کۆن کەسێکی ئازاد بوو کە ئیرادەی خۆی بوێرانە دەسەپاند، بەڵام دەبوو لەو پێناوەدا ئەوانی تر ئازاد نەبنو دەسبەرداری ئیرادەی خۆیان بن.

هەرچەندە ئیمپراتۆریا سەربازییە گەورەکانی مێژوو، ئەوانەی یەك قارەمان یان یەك جۆر سیستمی فەرمانڕەواییان پیرۆزدەکرد، سەروەریی شارستانی گەورەیان تۆمارکردووە، بەڵام وردە.. وردە بەرەو سڕبوونو پوکانەوەو تەنانەت لەناوچوونیش چوون، چونکە هیچ کۆمەڵگەیەك بە تاقە قارەمانێك یان تاقە

کەسێکی ئازاد گەشە ناکا، بەڵکو تا ژمارەی کەســە قارەمانــەکان، یــان کەســە ئــازادو جیاوازەکــان بــەمانا لیبراڵەکــەی، زیــاتر بــێ ئەگەری پێشکەوتنیش زیاترە. جۆن ستیوارت مێــل نمونــەی شارســتانیەتەکانی خۆرهــەڵات دێنێتــەوە کــە رۆژگارێــك گــەورەترین ســەروەری مــــــەعریفی و مـــــــەدەنی و تەلارســــــازییان تۆمارکردووە، بەڵام تاکڕەوی سیاسی و ئاینی بۆتەهۆی لەبەینبردنی ئازادیەکان و سڕینەوەی جیاوازییە ئەفرێنەرەکان و دواجاریش بۆتە هۆی لەناوچــوونی خــودی شارســتانیەتەکان. لــە بەرامبــەردا ئــەوەی شارســتانیەتی ئــەوروپی بەزینــدوویی هێــشتۆتەوە بــاڵابوونی رەگــەزی ئــــەوروپی نیـــــە، بـــــەڵکو ئـــــەو جیاوازییـــــە کولتــوری و فیکرییەیــە کــە بڕێکــی زۆر لــە ئـــازادی و دەسپێـــشخەری تاکـــەکانی بـــە زینـــدوێتی هێـــشتۆتەوە. ئەڵبەتـــە تـــەنها زەمینــەی بابــەتی و مــادیی بــەس نیــە بــۆ چاکسازی و پێشکەوتنی شارستانی، بەڵکو دەسپێشخەری و بەشداریکردنی راستەقینەی تاکەکان مەرجی پێشوەختە، چونکە هەرگیز پێشکەوتن و چاکسازی ناسەپێنرێ بەڵکو دەبێ ببێتە بەشێك لە بەرژەوەندی و دەسپێشخەریی ئازادانەی تاکەکان.

## سنورەکانی دەسەڵاتی کۆمەڵگا بەسەر تاکەکەسدا[33]:

گەر بەرکەوتی تاکەکەس لە ئازادیدا هێندە فراوان بێ.. ئەی بەرکەوتی کۆمەڵگە چەندە؟ ئــەو شــوێنە کوێیــە کــە پابەندکاریــەکانی کۆمەڵگەو دەسەڵاتی حکومەت ئامادەیە نەك ئازادیەکانی تاك؟

هەرچــەندە لیبراڵیــزم بــڕوای بــە بیرۆکــەی پــەیمانی کۆمەڵایــەتی نیــە، بــەڵام بــڕوای وایــە لەبەرامبــەر ئــەو ئازادییــەدا کــە کۆمــەڵگا بــۆ تاکەکەســی دابــین دەکــا، دەبــێ تاکەســیش ئاسایــشی کۆمەڵگــە بپــارێزێ و هەســت بکــا لەئاست کۆمەڵگادا قەرزارەو لە سیاقێکی تردا دەبێ ئەو قەرزە بداتەوە، ئەو هەستکردنە لە دوو هەڵوێستی سەرەکیدا بەرجەستەدەبێ:

**یەکــەم:** دەبــێ هــەموو تاکێــك رێــز لــە بەرژەوەندی تاکەکانی تر بگرێ و پێشێلی نەکا، بەلانی کەمەوە دەبێ ئەو بەرژەوەندیانە بپارێزێ کە لە شێوەی مافدان و لە یاسا و نەریتەکاندا بڕیاریان لەسەر دراوە.

**دووەم:** دەبــێ هــەموو تاکێــك بڕێــك لــە بەرپرســیارێتیە گرانــەکان لەئەســتۆبگرێ، وەك خۆبەخـــشین و بـــەرگریکردن لـــە کۆمەڵگـــە کاتـــێ ئەنـــدامانی کۆمەڵگـــە دووچـــاری مەترسی دەبنەوە.

ئەڵبەتە کۆمەڵگا مافی خۆیەتی ئەم دوو مەرجە بسەپێنێ بەسەر ئەندامانی کۆمەڵگادا لەبەرامبەر ئەو ئازادیانەدا کە بۆیان دابین دەکا. بەڵام ئەم دوو مەرجە تەنها بە بڕیارگەرێکی پەتی جێبەجێ ناکرێن، چونکە هەستکردن بە بەرپرســـیارێتی پێویـــستی بـــەوە هەیـــە کەســـــی بەرپرســــیار ئازادانـــە لـــەخۆی ببـــورێ و دەســـبەرداری خۆپەرســـتی ببـــێ، ئــەوەش پرۆســەیەکی دوولایەنەیــەو بەهــەمان ئەو ئەندازەیــەی پێویــستی بــە بەرپرســیارێتی تاکــەکان هەیــە پێویــستی بــە بەرپرســیارێتی

پلان بۆداڕێژراوی دامودەزگا حکومی و مەدەنیەکانیش هەیە، بەتایبەتی دەزگای پەروەردە. واتە ئەرکی کۆمەڵگا و حکومەت لەم بوارەدا پێڕەوکردنی دەسەڵات نیە بەڵکو بەجێهێنانی بەرپرسیارێتیەکی گشتییە لەئاست بەرپرسیارێتییە فەرعیەکاندا.

ترس لە دەسەڵاتی حکومەت پەیوەندی بە خودی ئەو دەسەڵاتەوە نیە کە پێڕەوی دەکا، بەڵکو لە پەیوەندی بە چۆنیەتی پێڕەوکردنیەوە هەیە. بەڵام مەرج نیە دەسەڵات هەر لای حکومەت خراپ بەکاربێ، دەشێ تاکەکانیش دەسەڵاتی خۆیان، بەتایبەتی لەکاتی سەرزەنشتکردن یان نەیاریکردنی ئەوانی تردا، خراپ بەکاربێنن. بۆ نمونە کاتێ کەسێك هەستدەکا لەگەڵ کەسێکی تردا ناگونجێ، بۆی هەیە هاوڕێیەتی ئەو کەسە نەکا، بەڵام بۆی نیە توندوتیژی دەرونی یان جەستەیی بەرامبەر بەکاربێنێ، تەنانەت بۆیشی نیە بەخراپ لای خەڵکانی تر باسی بکا تەنها لە کاتێکدا نەبێ کە مەترسیەکانی بگاتە ئاستێك پێویست بکا خەڵکانی تری لێئاگادار بکاتەوە. واتە دەشێ کەسێك رۆحیەتی یارمەتیدانی تێدا نەبێ، یان خۆپەرست بێ و حەز بەسەرکەوتنی ئەوانی تر نەکا. بەڵام مادام ئەم سیفەتە خراپانە تەنها زەرەری بۆ ئەو کەسە خۆی هەیە، بۆ دەسەڵاتی سیاسی یان کۆمەڵایەتی نیە سزای بدا، چونکە تاقە سزا کە پێشوەخت وەریگرتووە دۆڕاندنی هاوکاری و خۆشەویستی ئەوانی ترە کە خۆی بەئارەزوی خۆی پردی پەیوەندیی لەگەڵیاندا پساندووە.

بەرتەسککردنەوەی سنورەکانی دەسەڵاتی حکومەت تەنها لەبەر خاتری تاکەکەس نیە، بەڵکو بۆ خاتری حکومەت و کۆمەڵگاشە. زۆرجار بۆچوونێك هەیە لەڕووی تیۆرییەوە راستە، بەڵام لەسەر زەمینی واقع کاتێ بەزۆر دەسەپێندرێ دەبێتە جۆرێك لە ستەم. بۆ نمونە کاتی خۆی دەسەڵاتداران لە ئەمریکا ویستیان مەی و خواردنەوە سەرخۆشکەرەکان بەزۆر قەدەغە بکەن. سەرەنجام توانیان لە یەك گۆشەوە قازانج بەخەڵکی بگەیەنن، بەڵام لەچەندین شوێنی ترەوە زیانی گەورەیان خستەوە، جگە لەوەی ئازادیی کەسانێکی زۆریان پێشێلکرد، زەرەری کۆمەڵایەتی و ئابوری زۆریشیان بەو توێژانە گەیاند کە کاسبیان بریتی بوو لە دروستکردن یان فرۆشتنی مەی.

دەرگا کردنەوە بۆ فراوانکردنی دەسەڵاتی حکومەت و کۆمەڵگە تەنها کێشە لەنێوان بۆچوونە تیۆریەکانی نوخبەی دەسەڵاتدارو ژیانی پراکتیکی خەڵکیدا دروست ناکا، بەڵکو دەرگا دەکاتەوە بۆ پێڕەوکردنی جۆرێك لە توندوتیژی کولتوری یان ئیتنی یان ئاینی لەناو یەك کۆمەڵگادا، چونکە ئەوەی گروپێك بۆ خۆی بەقازانجی دەبینێ گروپێکی تر بە زیان بگرە هەندێ جار بەکوفری دەبینێ. بۆ نمونە "هیچ شتێك وەك خواردنی گۆشتی بەراز بوغزی موسڵمانان بەرامبەر مەسیحیەکان نابزوێنێ"[34]. یان ئایندارە مەسیحییەکانی ئیسپانیا پێیانوایە خواپەرستن لەسەر هەر ئاین و مەزهەبێك، جگە لە کاسۆلیکی، نەك هەر دروست نیە بگرە کوفرێکی گەورەیە. لە

بەریتانیاش"چەندین گروپی مرۆیی گەورە هەن، کە بەپێی بیروباوەڕی ئاینییان، رابواردنو خۆشیو سەفا شەرمەزارو رەتدەکەنەوە"[35]. واتە ناکۆکی نێوان عەقیدەو ئاینەکان هەندێجار دەگاتە ئاستی ئیهانەکردنی یەکترو پێڕەوکردنی توندوتیژی، بەتایبەتی کاتێ یەکێك لە ئاینەکان یان عەقیدەکان نوێنەرایەتی زۆرینە دەکاو ئەوانی تر کەمینەن.

لەم سەروبەندەدا ئەرکی حکومەتو کۆمەڵگەی لیبراڵ ئەوەیە ئایندارای وەك جۆرێك لە ئازادی ئینسان، بەدیاریکراوی ئازادی تاك، تەماشا بکا. لە دۆخێکی ئاوهاشدا دەبێ ئازادیەکان بپارێزێو رێگەنەدا پێکدادان لەنێوان ئازادیەکاندا دروست ببێ، رێگە نەدا شێوازێکی تایبەتی ئایندارای بەسەر شێوازێکی تردا بسەپێنرێ یان بەجێهێنانی عەقیدەو رێورەسمی ئاینی بکرێتە ئامرازێك بۆ پێڕەوکردنی توندوتیژی. واتە ئەوەی دەبێ رێزی لێبگیردرێ راستیو دروستی عەقیدەکە نیە، چونکە ئەوە مەسەلەیەکی رێژەییەو لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر گۆڕانی بەسەر دێ، بەڵکو ئەوەی شایەنی رێزە خودی بەهای ئازادییە. جۆن ستیوارت مێل پێیوایە تەنانەت نابێ بە پاساوی زانستی یان مەدەنی عەقیدەی ئاینی پێشێل بکرێ، لێرەدا نمونەی قسەی نوسەرێك دێنێتەوە کە داوای کردووە جەنگێکی مەدەنی، نەك خاچداریی، دژی ئیسلامو ئەو ئاینانە بەرپابکرێ کە فرەژنی حەڵاڵ دەکەن چونکە ئەوانە دژی شارستانیەتن، مێل لە وەڵامدا دەڵێ: "من پێموایە هیچ کەس بۆی نیە خەڵکی تر ناچاربکا مەدەنیو شارستانی بێ، (...) چونکە شارستانیەت هەمەجیەتی لەکاتێکدا بەزاند کە باڵی بەسەر هەموو دنیادا کێشابوو. زۆر بێ مانایە ئێمە لەوە بترسین هەمەجیەت کەلەسەر دەستی مەدەنیەت شکستی خوارد سەرلەنوێ بێداربێتەوەو شارستانیەت لەناوبەرێ.."(228–229).

بەڕای جۆن ستیوارت مێل بەخشینی هەر ئەرکێکی زیادە بە حکومەت، کە ببێتە هۆی فراوانکردنی دەسەڵاتەکانی، زیانی گەورەی لێدەکەوێتەوە. چونکە نابێ ئەو قەناعەتە لای حکومەتو لای خەڵکیش دروست ببێ کە رۆڵی حکومەت رۆڵێکی زۆر گرنگەو بەبێ حکومەت خەڵکی ناتوانن کاروباری خۆیان بەڕێوەبەرن. بەپێچەوانەوە هەندێ شوێن هەیە گەر حکومەت دەستی تێوەردا لەبری ئەوەی چاکی بکا دەیشێوێنێ. بۆ ئەم مەبەستە زۆر گرنگە بەرپرساریێتی دابەشبکرێو هەموو هاوڵاتیان هەست بکەن بەشێك لە بەرپرسیاریێتییان بەردەکەوێ، ئەگەر نا ئەوا کەس پشت بەخۆی نابەستێو حکومەت دەبێتە زلهێزێکی زەبەلاحو هاوڵاتیانیش دەبنە کەسانێکی گرگن. دواجار ئەو دەوڵەتەی پیاوەکانی خۆی دەکاتە کەسانی گرگن توانای هیچ کارێکی گەورەی نیە.

## پەراوێزەکان:

(1) ئەی. دی. لێندسای، دەروازەی کتێبی "بنەماکانی لیبراڵیزمی سیاسی" لە نوسینی (جۆن ستیوارت میل)، چاپی عەرەبی، (ت: إمام عبد الفتاح

إمـامو د. ميـشيل متيـاس. القـاهرة: مكتبـة مـدبولي، 1996). هەروەها:

*John Stuart Mill: Autobiography. New York, Columbia University Press,1944, p.vii.*

(2) جورج سباين، تطور الفكر السياسي، الكتاب الرابع. ت: علی إبراهيم التبول. القاهرة: دار المعارف، 1971، ص932.

(3) بڕوانـــە: سەرچـــاوەی پێـــشوو، ل932–934. هـەروەها: جان توشار، تاريخ الفكر السياسي. بيروت: الدار العالمية، 1981، ص415–417.

(4) سباين، كتێبی چوارەم، س. پ، ل942–943.

(5) جـــون ســـتيوارت ميـــل، أســـس الليبراليـــة السياسية..، ص41.

(6) هەمان سەرچاوە، ل44.

(7) هەمان سەرچاوە، ل45.

(8) هـەمان سەرچـاوە، ل45. دەربـارەی سروشـتی كاتیو راگوزەری چێژە جەستەييەكان لە ئايـدياليزمی كۆندا بڕوانە:

*Constantan Ritter, The Essence of Plato. T: Adam Alles. New York: The Dial Press, p.258.*

(9) جۆن ستيوارت مێل، س. پ، ل47.

(10) س، پ، ل54.

(11) بڕوانە: س، پ، ل56.

(12) س، پ، ل60.

(13) بڕوانـــە: كۆتـــايی بەشـــی دووەمـــی كتێبـــی "ڕێچكەی سوودی گشتی"، س. پ، ل61–64.

(14) س، پ، ل74.

(15) دەربارەی تێڕوانينی فەلسەفەی سوودگەری بۆ پاداشتو سزا بڕوانە بەشی سێيەمی سەرچاوەی پێشو، ل67–75.

(16) نەسكی چوارەمی هەمان سەرچاوە، ل81.

(17) دەربـارەی ئـەو پێـنج خاڵـە بڕوانـە: بەشـی پێنجەم، ل87–85.

(18) هـ. س. پ، ل99.

(19) هـ. س. پ، ل105.

(20) ناونيشانی كتێبێكی سەرەكی "جۆن ستيوارت مێـل"ــە كـە وەك لـە بايۆگرافيەكـەدا ئامـاژەی پێـدراوە لەڕووی مێژوويیەوە پێش كتێبی "ڕێچكەی سوودگەری گشتی" نوسيويەتی. بەڵام لە چاپی عەرەبيدا لـەڕووی ڕێكخـستنەوە كتێبـی دووەم پێـشخراوەو هـەردوكيان لـەژێر ناونيـشانی "بنـەماكانی ليبراڵيزمـی سياسـی"دا بڵاوكراونەتەوە.

(21) دەروازەی كتێبی "دەربارەی ئازادی"، س.پ، ل119.

(22) جۆن ستيوارت مێل يەكێكە لەو فەيلەسوفانەی كە زۆر ژيرانە پـەی بە مەترسی ديكتاتۆريـەتی زۆرينـە بـردووە، بـەڵام بـەر لـەويش ئەليكـسی دی تۆكڤێـل لـە كتێبـی "ديموكراسـی لـە ئـەمريكا" ئامـاژەی بەهـەمان خەتەر داوە. لە سەردەمی ئەمڕۆشماندا هـەمان مەترسی ئامادەيی هەی كە دەشێ خوليای ديموكراسی لـە ڕژێمـە پۆســت كۆلۆنيالەكانــدا بەلاڕێــدا بــەرێ، بەتايبــەتی بــەهۆی باڵادەســتی ئــەو تێگەيــشتنە بــاوەی كــە پێناســـەی ديموكراســـی لـــە حـــوكمی زۆرينـــەدا كورتدەكاتــەوە. يــەكێك لــەو نوســەرانەی ئامــاژەی بــەو مەترسييە كردووە لـە سـەردەمی ئێستادا سيۆسيۆلۆگی فەرەنـــسی (ئـــالان تـــۆرين)ـــە بـــە تايبـــەتی لـــە كتێبـی: "ديموكراسـی چـيە؟ حـوكمی زۆرينـە يـان دەستەبەركردنی مافەكانی كەمينە"، دمشق: منشورات وزارة الثقافة، 2000.

(23) دەروازەی كتێبی "دەربارەی ئازادی"، س.پ، ل125–126.

(24)س. پ، ل129. ئەڵبەتــە جــۆن ســتیوارت ئــەم قــسەیە لــە ســیاقی ســەدەی نۆزدەیەمــدا دەكــا كــە ســنورێكی دیــار لــە نێــوان جیهــانی شارســتانیو جیهــانی دواكــەوتوودا لــەئارادا بــووە. تێبینــی دەكــرێ جۆرێــك لــە كاریگــەریی گوتــاری كۆلۆنیــالی بەســەر ئــەم قــسەیەوە زاڵــە، بەتایبــەتی لــەو خاڵەدا كە پێیوایە هێشتا زووە بۆ هەندێ میللەت كە ئازادییـان پێبـدرێو باشـترە دیكتـاتۆرە دادپـەروەرەكان حوكمیان بكا.

(25) بڕوانە: س. پ، ل131–132.

(26) بەشـی سـێیەمی كتێبـی "دەربـارەی ئـازادی" بەناونیشانی: دەربارەی ئازادی فیكرو گفتوگۆ، س. پ، ل136–137. دەربارەی هەمان پرس لای بڕوانە:

*John Stuart Mill and freedom of Expression, K. O'Rourke. London: Routledge, 2001.*

(27) هـ. س. پ، ل137.

(28) هـ. س. پ، ل139.

(29) هـ. س. پ، ل151.

(30) بڕوانە: س. پ، ل160–172.

(31) هـ. س. پ، ل173.

(32) بەشی سێیەمی س. پ، ل185–206.

(33) بەشی چوارەمی س. پ، ل207–299.

(34) س. پ، ل219.

(35) س. پ، ل221.

(36) س. پ، ل228–229.

# بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی لەبیری لیبرالیدا

هیوا عەزیز سەعید

**پێشەکی:**

دەشێت کەمو زۆر یاخود دورو نزیک زانیاری لەبارەی لیبرالیزمو ئەو پرەنسیپە گشتیانەی ئەم ئایدیایە بانگەشەی بۆ دەکات هەبێت، کە مافو ئازادیو خاوەندارێتی تاک لەدیارترین ئەو لایانانەن کە لیبرالیزم لەهەوڵی ئافراندنیاندا مێژوویەکی بۆخۆی نەخشاندووە.

بۆیە هەرکاتێك نەغمەی ئەم ووشەیە دەبیستین راستەوخۆ ئازادی رەهای مرۆڤەکانو هەوڵدان بۆ سنورداركردنی دەسەڵاتی سیاسیو لاوازکردنو کەمکردنەوەی هەژمونەکانی کۆمەڵگەمان بێتە پێشچاو، بەردەوام ئەو شەڕو ململانێیە دەبینین کەبیرمەندانی ئەم ئایدیایە لەپێناو مسۆگەرکردنو گرەنتیکردنی مافەکانی تاکەکەس لەبەرامبەر دەوڵەتو کۆمەڵ ئەنجامی دەدەن.

لەکاتێکدا ئەمە بەم شێوەیە نییەو هەروەك (پولادی) نوسیویەتی: "لیبرالیزم وەك قوتابخانەیەکی هزریو ئایدۆلۆجی دروستکەری هەلومەرجێکی مێژوویییە کە پەیوەستە بە لەناوچوونی پەیوەندییە فیوداڵییەکانو سەرهەڵدانی پەیوەندییە بۆرجوازییەکانو گەشەکردنی کۆمەڵگەی سەرمایەداری. هەموو ئامانجو بەها سەرەکییە لیبراڵیەکان وەك (ئازادیو یەکسانیو سەربەخۆیی تاکەکەس) هەر هەمووی لەسەر بنەمای ئاراستەگیری دژ بە پەیوەندییە فیوداڵیەکان بووە، وەك ئیمتیازاتی ئەرستۆکراتی، ریزبەندی پلەو پایەکانو دابەشبوونی کۆمەڵگە بۆ کاروباری کۆمەڵایەتی.

بۆیە زۆرێك لەتوێژەران پێیانوایە لیبرالیزم تەنها وەك ئایدۆلۆجیای چینی بۆرجوازی دەناسرێت، لەکاتێکدا لایەنگرانی لیبرالیزم دەیانەوێت بەرزتر لەئامرازی ئایدۆلۆجیای چینێکی کۆمەڵایەتی تایبەتی نیشانبدەنو بەشێکی پەیوەست بەبنەما گشتییە مرۆییەکان رابگەیەنن"[(1)].

هەروەها (حسین بەشیریە) ئاماژە بۆ ئەم لایەنە دەکات کاتێك نوسیویەتی: "هەندێك لەنوسەران، لیبرالیسم بەتیۆریەکی حکومەتی

سنوردارکراوی بەستراوە بەئازادییەکانی تاکەوە دەزانن و دەشیبەستنەوە بەسیستەمی بازاڕی ئازاد و ئابووری سەرمایەداری بازاڕەوە.

ئەم بەستراوەیەش هەرچەند لەڕووی مێژووییشەوە واقیعیەتی هەبێت، بەڵام لەڕووی زمانزانییەوە بە پێویست نازانرێت.

لیبرالیسم، خوازیاری دابینکردن و رەچاوکردنی مافی یەکسان بوونی هەموو هاووڵاتیانە؛ ئەوەش بەبێ ئەوەی رەچاوی مەزهەب، نەتەوە، نەژاد، رەچەڵەک، چین، رەگەزو...هتد بکات"[2].

بۆیە ناکرێت لیبرالیزم وەک ئایدیای چین و گروپێکی تایبەت پێناسە بکرێت، یاخود بەرگریکاری پێکهاتێکی کۆمەڵایەتی و تایبەتمەند نەبووە، بەڵکو ئەکرێت بەهۆی فراوانی و زۆری ئەو بیرمەندو کەسانەی پشک و رۆڵیان لەفۆرمەڵەکردن و گەڵاڵەکردنی پرەنسیپ و چەمکەکانی ئەم ئایدیایەدا هەبووە، وادەکات شانبەشانی ئەوبیرمەندانەی باسیان لە ئازادی فراوان و بێ لەمپەری مرۆڤ و ماف و خاوەندارێتیەتی، هاوکات بەشێك لەو بیرمەندانە لەمیانەی هەوڵ و تێڕوانینەکانی خۆیاندا، نایانەوێت مرۆڤ لەدیمانەی لیبراڵدا مرۆڤێکی دابڕاو و دورەپەرێز بێت، یاخود وێنای لیبراڵ لای ئەم نوسەرو بیرمەندانە بۆ مرۆڤ وێنای خۆپەرستی و خۆویستیەك نییە کەمرۆڤەکان لەئاکارو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان بپچڕێنێت، بەڵکو لیبرالیزم؛ لەکۆی تێڕوانینی بیرمەندانیدا و بەلەبەرچاوگرتنی قۆناغە مێژووییەکانی و ئەو گۆڕان و پەرەسەندنانەی لە چەمك و پرەنسیپەکانیدا هاتۆتە بوون، هەوڵێکی بەردەوام و درێژخایەنە بۆ ڕەنگڕێژکردن و دیاریکردنی ئەو پەیوەندییانەی لەنێوان (تاك- دەسەڵات، تاك-کۆمەڵگە، تاك-تاك)دا هەیە، تاوەکو لەوێوە ئەرك و مافی هەرپێکهاتێك لەکایەو سنوری خۆیدا وێنا بکات، کەدواجار لەکۆی هەموو ئەم پرۆسەیەدا، بتوانێت ماف و ئازادییەکانی تاك بەشێوازێك گرەنتی و مسۆگەر بکات کە لەگەڵ هیچ کام لەپێکهاتەکانی تر دژو ناتەبانەبێت، بەڵکو لیبرالیزم خەمی گەورەی بریتیە لە تەریبکردنی ئاراستەی هەرسێ پێکهاتەکەی (دەسەڵات-کۆمەڵگە-تاك) لەگەڵ یەکتریدا، بۆئەوەی ئەو دۆخ و ژینگەیە بخوڵقێنێت تاك تیایدا هەست بەبەختەوەری و ئازادی بکات و چێژ لەو ئازادییانە وەربگرێت.

لێرەوە لیبرالیزم هەریەك لەو پێکهاتانە روبەڕوی بەرپرسیارێتی دەکاتەوە، لەناو ئەو بەرپرسیارێتیانەدا، بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی تاك و دەوڵەت لەدیارترین و گرنگترین ئەو لایەنانەن کە ئێمە هەوڵدەدەین لە میانەی ئەم کورتە باسەدا بیخەینەڕوو، بەمەبەستی ئەوەی کە بیرمەندانی لیبرالی کاتێك باس لەئازادی و مافەکانی تاکەکەس دەکات، مانای وانییە کە هیچ جۆرە خوێندنەوەو بایەخێکی بۆ دەسەڵات و کۆمەڵگە لای تاك نەهێشتبێتەوەو پێگەیەکیان نەبێت لە جوگرافیای لیبرالیدا.

لەبەر ئەوە هەوڵدەدەین لەچەند تەوەرێکدا قسە لە بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی تاك و دەوڵەت و پاشان داد و یەکسانی کۆمەڵایەتی بکەین، تاوەکو لەوێوە بتوانین سەرەداوی لایەنی کۆمەڵایەتیبوونی لیبرالیزم بەخوێنەران ئاشنابکەین.

## یەکەم – بەرپرسیاریێتی کۆمەڵایەتی تاك لە لیبرالیزمدا:

قسەکردن لە ماف و ئازادییەکانی تاك و هەوڵدان بۆ تەریبکردنی ئەم ماف و ئازادییانەی تاك لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگەدا، لایەنێکی گرنگە لە لیبرالیزمدا، بۆیە بیرمەندانی بیری لیبرالی زۆرجارو لە قۆناغە جۆراوجۆرەکانی پەرەسەندنی بیری لیبرالی، هەوڵیانداوە کە بۆچوون و تێڕوانینەکانیان بەجۆرێك دابڕێژن نەکەونە دژایەتی و ناکۆکی نێوان تاك و کۆمەڵ.

لەبەرئەوە ئەگەر سەرنجی هەردوو قۆناغە سەرەکیەکەی بیری لیبرالی بدەین، واتە لیبرالیزمی کلاسیکی و لیبرالیزمی نوێ، دەکرێت هەندێك لەو بیرمەندانەی هەوڵی هاوتاکردن و نزیککردنەوەی بەرژەوەندییەکانی تاك و کۆمەڵیان لەبەرچاوگرتووە (راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ) وەك نمونەی ئەم لایەنە بخەینە بەرچاو.

دیارە ئەم لایەنەش خۆی پەیوەندییەکی بەهێزی بەبارودۆخی کۆمەڵگەو مرۆڤەکانەوە هەیە، بەتایبەتی ئەگەر سەیری سەدەی نۆزدە بکەین ئەم لایەنە بەڕوونی خۆی دەنوێنێت، کە ئەمەش فاکتەرەکانی وەك دروستبوونی ململانێی نێوان ئایدیاکان لەدیاریکردنی پەیوەندییەکانی نێوان (تاك – کۆمەڵ) و هەریەك لەو بەرپرسیاریێتیانەی لەسەر هەریەکێکیان هەیە بەرامبەر ئەوی دی رۆڵی تێدابینیووە.

لێرەوە ئێمە ئەگەر مێژووی گەشەکردن و پەرەسەندنی ئەو قۆناغە بخوێنینەوە کە بەلیبرالیزمی کلاسیکی ناوزەدکراوە، هاوشان لەگەڵ جەختکردنەوە لەسەر مافەکانی تاکەکەس و هەوڵدان بۆ مسۆگەرکردن و گرەنتیکردنی ماف و خاوەنداریێتی و ئازادییەکانی تاك، لەگەڵ ئەو هەوڵە بەردەوامانەی بیرمەندانی لیبرالیزم بۆتەسککردنەوە و کەمکردنەوەی فشارو لەمپەرەکانی سەر ئەم مافانە، هێشتا ئاماژەی جۆراوجۆرو ئاشکرا یاخود ناڕاستەوخۆ هەیە کە جۆرێك لەبەرپرسیاریێتی دەخاتەوە ئەستۆی تاك، تاك هاندەدات کە دوورەپەرێزو خۆپەرست نەبێت و تەنها وێڵی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی نەبێت، بەڵکو ژیانی کۆمەڵایەتی تاك و تێکەڵبوون لەگەڵ هاوشێوەکانی بەشێك لەبەرپرسیاریێتی ئەو ژینگەو کۆمەڵە دەخاتە سەرشانی تاك.

(دەیڤد هیوم 1711–1776) لەو سود و قازانجەی کۆمەڵ قسەدەکات کە لەچالاکی تاکەکانی دەستیدەکەوێت، بۆیە کاتێك باس لە چالاکیە ئابووریەکانی تاك دەکات، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەگەرچی مرۆڤ لەڕووی ئابوورییەوە بازرگان یان بۆرژوایەك و لەهەوڵی دەستخستنی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی و فراوانکردنی تێدەکۆشێت، بەڵام لەم کارەیدا بێئەوەی مەبەستی بێت بەرژەوەندی گشتی و کۆمەڵەکەی دێنێتەدی[3].

هەروەها (ئادەم سمس 1723– 1790)یش لە بەرهەمە بەناوبانگەکیدا دەربارەی (سامانی نەتەوەکان)، تیۆرێکی نوێی ئابوری تەواو فراوانی داڕشت، هەوڵیدا جۆرێك لە هاوتایی

لـــــەنێوان بەرژەوەندییـــــەکانی تــــاک‌و گشتیدا بکات[4].

هەر ئەم ئاراستەیەیە کە دواترو لە شۆڕشی فەرەنـــسیدا ڕەنگیداوەتــــەوە لــــە میانــــەی ڕاگەیاندنــەکانی مافــەکانی مــرۆڤ‌و هاوڵاتیــان لە(26)ی ئابی (1789)داو لە ماددەی پێنجەمی ئــەم گەڵاڵــە نامەیــەدا هاتووەکــە: "هــەموو کردەوەیـەکی زیانبـەخش بەرانبـەر بـە کۆمەڵگـە قەدەغەیە"[5].

ســەدەی نــۆزدە لــە هەمانکاتــدا ســەدەی ســەرهەڵدانی بیرۆکــەی سیاســی جۆراوجــۆرو ناهـاو ئاڕاسـتەبوون لەگـەڵ لیبرالیزمـداو لـەبری پاڵپــشتی‌و بــەرگریکردن لــە مافــەکانی تــاک، باسیان لە کۆمەڵگەو مامەڵەیان لەگەڵ چالاکی گـشتی بـوو، کـە دیارترییینیـان بـیری سیاسـی کلیانی‌و سۆسیالیزم بوون.

لەبەرئەوە بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی تاک لە دیدگای بیرمەندانی سەدەی نۆزدەوە، بەتایبەت ئەوانەیان کە جۆرێك لە قسەو هەڵوێستیان لە ئــازادی‌و مافــەکانی تاکەکــەس هەیــە، زۆرو ئاشـکراتر خـۆی نوانـد، تـا ئـەو ئاسـتەی کـە (جێرمـی بنتـام 1748– 1823) لـە پێناسـەی ئازادی‌و جیاوازی کردن لە نێوان دوو جۆر لە ئـازادی (ئـازادی سروشـتی‌و ئـازادی مـەدەنی)، پێیوابێت ئازادی مەدەنی ئەو پانتاییەی ئـازادی مرۆڤە کـە کاروکردەوەیـەك ئەنجامبدات‌و لەگەڵ بەرژەوەنـدی گـشتی ئـەو کۆمەڵـەی تێیـدا دەژی دژو ناتەبا ناوەستێت[6].

ئەم تێڕوانینـە کـە هـەروەك پێشتر ئاماژەمان پێـداوەو لـە گەڵاڵـە نامـەی شۆڕشـی فەڕەنسیدا جۆرێـك لـەم گوزارشـتە ڕاگەیـەنراوە، بەهەنـد وەرگــرتن‌و ڕەچــاوکردنی بەرژەوەنــدی گــشتی کۆمــەڵ وەك ئــەرکێکی کۆمەڵایــەتی تــاك لــە کۆمەڵــدا، لەگــەڵ هەوڵــدانی تــاك بــۆ خــۆ دوورگرتنــی لــە دژایــەتی‌و زیانگەیانــدن بــە بەرژەوەندی گشتی، ئەو مەرجانەن کە لەمەودای ئـازادی مەدەنیـداو لـە هـەر کۆمەڵگەیەکـدا بـۆ تاکەکان پێویستە لەبەرچاو بگیرێت.

ئەم بەرپرسیارێتیەی تاك دواترو لای (جۆن ســتیوارت مــل 1806– 1863)لــە ئاســت‌و سنورێکی باڵاو فراوانتردا وێنادەکرێت، چونکە (مل) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کـە چـۆن‌و چـەند پێویـستە تـاك لەسـەر ئـەو ئاکـارو مامەڵەیـە لێپێچانەوەی لەگەڵ بکرێت‌و سزابدرێت کاتێك ئاکارو جوڵەیەك دەکات کەمایەی دروستکردنی زیان‌و مەترسی بێت بۆسەر تاکەکانی تری ناو کۆمـەڵ، لـەوە زیـاتر پێویـستە لێپرسـینەوەی لەگەڵـدا بکرێـت لەبەرانبـەر بێـدەنگبون لەهـەر بزاوت‌و کارو دیاردەیەك، سزا یاخود گرفت‌و کێــشە بــۆ تاکــەکانی تــری نــاو کۆمــەڵ دروستدەکات[7].

ئەمـە وادەکـات (مـل) بـاس لـە دووجـۆر لـە ئاکاری مرۆڤ بکات، جۆرێکیان تایبەتە بە مرۆڤ خۆی‌و هیچ پەیوەندی‌و کاریگەری بۆ کەسانی تر نییە، بەڵام جۆرەکەی تر کە بەرپرسیارێتی دەخاتە ئەستۆی تاکەکانی کۆمەڵ‌و مرۆڤەکانی نێـو کۆمەڵگـەی پـێ کاریگـەر دەبـن، لای (مـل) بــەدەنگهاتن‌و بێــدەنگی، یــاخود(جوڵــەو وەستان)یش دەگرێتەوە[8].

ئــەم هــەنگاوەی (مــل) لــەوەدا گرنگــە کــە دەشــێت جۆرێــك لەهەســتی هــاودەردیی‌و ئاڕاسـتەی دەسـتەکۆیی بکاتـە ئـەو پەیوەنـدی‌و

ڕایەڵانـــەی تاکـــەکانی کۆمـــەڵ لـــە یەکـــدی نزیکبکاتەوە، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو تاك بەس چاوی لەوەنییە کە فاکتەری خراپ و نێگەتیڤ نەبێت بۆ کۆمەڵ، لەوە زیاتر تاك میکانیزمی چاکسازی و گۆڕینی کۆمەڵە، یاخود هەوڵی جۆرێك لە گۆڕین دەدات کە بە خێرو خۆشی تاکـــەکانی تـــری کۆمـــەڵ کۆتـــایی دێـــت و بـــەرگریکارێکی تاکـــەکانی تـــری کۆمەڵگەی خۆیەتی.

ئـەم هەسـتەیە وایکـردووە (مـل) لـە سـێ ئاسـتدا (ئـازادی) وەك چـەمك بناسـێنێت و لەئاستی سێیەمدا باس لە ئازادی کۆبوونەوەی تاکـــەکان لەگـــەڵ یـــەکتری و پێکهێنـــانی یـــەکێتی و هاوکـــاری لـــەپێناو هێنانـــەدی مەبەستەکان دەکات[9].

لێرەوە دەتوانین ئـەو جیاوازییـە گـەورەو فراوانـەی نێـوان (جـۆن لـۆك 1632–1704)و (مـل) هەستپێبکەین، کاتێك (لۆك) باسی لەوە کردبوو کە "هەرجۆرە تەقەلایەك بەرپرسیارێتی خەڵکانی دی لەئەستۆ بگرێت، بەکردەوەیەکی بێهـودەو دەستخـستنە کاروبـاری خەڵکییـەوە دادەنرێت..."[10].

(مـــل) هەوڵـــدەدات زیـــاتر مەبەســـتەکانی لـەم ڕووەوە بگەیـەنێت و لەهـەوڵی هاوتـاکردن و تـــەریبکردنی بەرژەوەندیـــەکانی ناوکۆمەڵـــە، کـــە پەیوەنـــدی نێـــوان تـــاك و کۆمـــەڵ بـــەجۆرێك دەبەســـتێتەوە بەیەکـــەوە، کـــە هەریـــەکێکیان ئـــەوی تـــر لەبەرچـــاو بگرێـــت بۆیـــە دەنوسـێت: "ئەگـــەر هـــەموو مرۆڤایـــەتی لەسەر بۆچونێك کۆکبن جگە لەکەسێك، بۆیان نییـە ئەوکەسـە بێـدەنگ بکـەن، هـەروەك چـۆن ئەو کەسەش بۆی نییە ئەگەر توانی بۆچوونی خۆی بسەپێنێت"[11].

بەگـشتی مـل ڕۆڵێکـی دیـاری هـەبوو لـە پەرەسەندن و گۆڕانکاری لە ئایدیای لیبرالیداو چەمکی خێرو خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی کردە دینگەیەك لە دینگەکانی لیبرالیزم[12].

بۆیـە( ڕەیـدار لاشـۆن) لـەبارەی (مـل)ەوە نوسـیویەتی: "مـل بەپلـەی یەکـەم بـیری لای خۆفەرمانی کومیونانە بوو، کە هەر زۆر زوو لە ئینگلاند فراژووت. کاتێك مرۆڤ کارێکی ڕەسمی ئـــەنجام دەدات دەبـــێ بەرژەوەنـــدی دیکـــە ڕەچـاو بگـرێ نـەك بەرژەوەنـدی خـۆی، دەبـێ بەرژەوەنـدی هەمـەجۆر بەیـەك بگـرێ و هـەوڵی چاکەی گشتی بدات.

ئەو کەسە دەبێت خۆی بەبەشێکی کۆمەڵگە بزانێ و هەرچی بۆ چاکەی کۆمەڵگەیە بەچاکەی خۆی دابنێ، ئەگەر ئەم فێرگەیەی گیانی گشتی نـەبێ، هەسـتێکی وەهـا پەیـدا نابێـت کـە تاکـە کەسان بەرانبـەر بـە کۆمەڵگـە خۆیـان بـە خـاوەن ئەرك بزانن..."[13].

ئـەم گۆڕانکاریانـەی لـە دیـدی بیرمەنـدانی لیبرالی هەبوو، لە قۆناغی دووەم و لە لیبرالیزمی نوێـدا زیـاتر تـۆخ بـووەوە، چـونکە سـەرەتای گۆڕانکـاری لـە بیری لیـبرالی نوێـدا، هەوڵێکـە بـۆ داکۆکیکردن لـە مـافی تاکەکـەس، بۆئـەوەی لـەم ڕێگەیـــەوە ئـــەو جیـــاوازی چـــینایەتی و پلـــە کۆمەڵایەتیە ببڕێت کە لە کۆمەڵدا بوونی هـەبوو، تـاوەکو بتوانێـت هـەموو چـینەکان لـە ئـامێزی خۆیدا کۆبکاتەوە.

ئـــەم گۆڕانکارییانـــە کـــە ڕەهەنـــدێکی کۆمەڵایـەتی بەخشییە لیبرالیزمی نوێ، وایکرد

لای چــینە کۆمەڵایەتیــەکانی تــر جگــە لــە چــینی بورجــوازی، مایـــەی پێـــشوازیو ڕەزامەندی بێت[14].

لەم گرنگی پێدانە کۆمەڵایەتیەی لیبرالیزمی نوێوە (گرین) بڕوای وابوو کە "بەبێ بوونی کۆمەڵگە تاکەکان بونیان نابێت"[15].

ئـەم گوزارشـتەی (گـرین) دانپێـدانانێکی فـەرمیو ئاشـکرایە بـە واقیعـی پەیوەنـدی بەرامبەریی تاکو کۆمەڵگەدا ... بۆیە لیبرالەکان پەیوەسـت بـەم تێگەیـشتنە وەهـا بەڵگـەیان هێنایـەوە کـە ئـازادی تاکەکەسـی تـەنها دیـوی ژیانی کۆمەڵایەتیەو دیوەکەی تری واتە کاری گروپـی، بــەلای کەمــەوە هێنــدەی ئــازادی تاکەکەسی مایەی گرنگی پێدانە[16].

هــەروەها (گــرین) بــڕوای وابــوو لیــبرالی ڕاســتەقینە چاکــسازیکارێکی کۆمەڵایەتیــەو بــــەرگریکارێکی چــــینی ژێــــر دەســـتو چەوسـاوەیەو دوژمنـی ئـەو خاوەنکارانەیـە لـە ڕێگـەی قۆرخکـاریو دادۆشـینەوە سـەرمایەو بەرژەوەندییەکانی مسۆگەر کردووە[17].

لێرەوە دەکرێت باس لەوە بکەین کە کاتێك (بیلنسکی) ڕەخنەگری ڕوسی دەنوسێت: "گەر کەسانی تر لە ئازادی بێبەشکران، ئەگەر براکانم بــە کــۆتو بەنــدیو لــە دۆخــی هــەژاریو گەندەڵیــدابوون. ئــازادیم بــۆ خــۆم ناوێــت، بەتــەواوی ڕەتیدەکەمــەوە، چــونکە باشــترە قەدەری براکانم تا دواسات بەشبکەم"[18].

ئـەم هەسـتی هاوچارەنوسـییەی لای تـاك بانگەشـەی بـۆ دەکرێـت، هەوڵێکـە بـۆ قسەکردن لەو مەترسیو گرفتانەی کە دەشێت لەسەرەتاوە بەشێکی کەم لەتاکەکان ئازارو زیانیان پێبگات، بـەڵام دواجار ببێتـە نەخۆشـیو پـەتای کۆمـەڵ، یــاخود بەئاڕاســتەیەکی تــردا، ئــەو کاتــەی دیــاردەو گۆڕانکارییــەکانو باشــییەکانی نــاو کۆمـەڵ ناچـنە ئاسـتی گـشتێنراوەوە، هێـشتا ناکاملو قرچۆکن، چونکە لەم دیدگایەوە کۆمەڵ جەســـتەیەکی زینـــدووەو هـــەر ئەنـــدامێکی لەخۆشـیو ناخۆشـیدا هـاودەردی جەسـتەکەیە لەهەمان کاتدا.

بۆیــە لیبرالیــەکان ڕایانگەیانــد کــە تــاك لــە کۆمەڵگــــەدا بەرپرســــیارێتی کۆمەڵایــــەتیان لەبەرامبــەر یەکتریــدا هەیــە، بەتایبــەت ئــەو تاکانــەی توانــای خۆبــەڕێوەبردنیان نییــەو شایــــستەییان لەدەســــتداوە وەك پــــیرو پەککەوتەکانو هەژارانو نەخۆشو ...هتد[19].

بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی تاك تەنها لەوەدا نییـە هاوکـاربنو یارمـەتی هـەژارو نـەخۆشو بێنـەوایانو کـەم ئەنـدامان بـدەن، بـەڵکو دەبێـت مافەکانیشیان بسەلمێنرێتو پارێزراوبێت[20].

کەواتــە بەرپرســیارێتی کۆمەڵایــەتی ئــەو هەوڵەیـە کـە لیبرالـستەکان لـە میانـەی هانـدانو هەوڵـدانی خودییانـەی تاکەکەسەوە کـار لەسـەر پەرەسـەندنی کۆمەڵایەتیو ڕەخساندنی ئازادی کۆمەڵایــەتی دەکەنــەوە، چــونکە لیبرالیــزم لــە ڕوانگەی بەهرەو جدیبوونی کاری هەرتاکێکەوە بۆ بارودۆخە کۆمەڵایەتیەکان دەڕوانێت.

بــــەمجۆرە تاکــــەکان لــــە چــــالاکییەکی بـەردەوامو هەمەلایەنـداو لـەپێناو خۆشـنودیو چــاکترکردنی ژیــانی کۆمەڵایــەتی خۆیــان هەوڵـدەدەن، چـونکە بایەخـدانی تـاك بـەخودی خـۆی بەشـێك لـەو ئەرکـە کۆمەڵایەتیەیــە لــە لیبرالیزمدا کاری لەسەر دەکرێت.

**دووەم – بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی دەوڵـەت لە بیری لیبرالیدا :**

ئەشێت هەرکات ئێمە سەرنج لە سەرەتاکانی مێـژووی گەشـەکردنی ئایـدیای لیـبرالی بـدەین، دەوڵـەت لـە تێـڕوانین‌و بینینـی بیرمەنـدانی ئـەم بـوارە، وەك دێوەزمـەو مەترسـیەکی بـەردەوامی سەر ئازادییەکانی تاك ئاماژەی بۆ بکرێت، نـەك هەرئەمـە بـەڵکو هەوڵـدان بـۆ سـنوردارکردن‌و تەسـکردنەوەی مـەودای جوڵـەی دەسـەڵاتی سیاسـی‌و دەوڵـەت، خـۆی لـە دیـارترین ئـەو تەوەرانـەدا بنەخـشێنێ کـە لیبرالیـستەکانی سەرقاڵ کردووە.

بـەڵام ئـەم ئاڕاسـتەو دیدگایـە لەسـەر هـەمان ڕەوت‌و ئاڕاستەو لە قۆناغە مێژووییەکانی بیری لیـبرالی‌و تەنانـەت لـە قۆناغێکـداو لای هـەموو بیرمەنـدان هاوتـەریب نـەبووە، بـەڵکو زۆرجـار دەوڵـەت ئـەو ئـەرك‌و بەرپرسـیارێتیەی بـۆی جێهێڵـراوە، یـاخود ئـەو ئەرکـەی خراوەتـە ئەستۆی خۆی لـە بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتیـدا دۆزیوەتەوە.

بۆیـە هەوڵـدان بـۆ پێـدانی ڕۆڵ‌و چـالاکی بەدەوڵـەت لەکۆمەڵگـەداو نرخانـدنی دەسـتێوەردانی لـەو بارودۆخـە لای بیرمەنـدانی لیبرالیزم لەقۆناغی نوێدا، پێچەوانەی ئەو دیدو تێڕوانینـەبوو کـە لای بیرمەنـدانی لیبرالیزمـی کلاسیکی جەختی لەسەر دەکرایەوە، بەتایبـەتی لەوەدا کە باسیان لەوە دەکرد کردنەوەی کەرتی گشتی لە نەخۆشخانەو چاودێری تەندروستی‌و فێرکـردن‌و هاوکـاری بێنـەواو هـەژارو پەککـەوتوان‌و نـەداران‌و کەمئەنـدامان‌و کردنـەوەی گەنجینـەی گـشتی، زەمینەسـازی دەکـات بـۆ سـەرهەڵدان‌و گەشـەکردنی مـشەخۆری‌و تەمـەڵی لەکۆمەڵگـەدا، بـەڵام لـەقۆناغی نـوێی لیبرالیزمـدا نـەك ئـەوە قەدەغـە نـەبوو، بـەڵکو هاتنـە نـاوەوەی دەوڵـەت لـەبارودۆخێکی ئـاوادا بەپێویـست‌و پـۆزەتیڤ ڕاگەیەنرا.

لەسـەرەتاوە دەکرێـت بـاس لـە (مۆنتـسکیۆ 1689 –1755) بکـەین، کاتێـك ئەرکـەکانی دەوڵـەت بـەجۆرێك ڕووندەکاتـەوە کـە دەوڵـەت پابەندە بە دابینکردنی ژیانی هاونیشتمانیان‌و خـواردن‌و پۆشـاکی گونجـاو‌و تەندروسـتییان، هـەروەها پێویـستە چـاودێری نـەخۆش‌و پـیرو هـەتیوان بکـات‌و دژی هـەژاری بێـت‌و گەنجینـەی گشتی بکاتەوە[21].

تەنانـەت ئـەم بەرپرسـیارێتیەی دەوڵـەت لای ڤـۆلتێریش ڕەنگیداوەتـەوە؛ کاتێـك بـاس لـەوەدەکات کـە ڕاهێنـانی ئاکـاری‌و ڕەوشـتی تاکـەکان‌و جۆرێـك لـە چـاکەکاری، ئـەو بەرپرسـیارێتیەیە کـە لـە چوارچـێوەی پرۆسـەی فێرکاریـدا بـۆ خـەڵك دەبێـت لەلایـەن سیـستمی سیاسـیەوە جێبـەجێ بکرێـت، لـەم بۆچونەشـدا تاڕادەیـەك لەگـەڵ ئـەفلاتون‌و ئەرسـتۆدا یەکدەگرێتـەوە کـە ئـەوانیش دەوڵـەتیان بـە فێرگـەی تاکـەکانی کۆمەڵ دانابوو[22].

(جـان جـاك ڕۆسـۆ)ش لـە ڕونکردنـەوەی شێوازو فۆرمی دەسەڵاتی سیاسیدا باس لەوە دەکات کە پێویستە دەوڵەت خاوەنسازمانێکی نائاڵۆزو ساکاربێت‌و تاکەکانی دەبێت هۆگری سەرلەبەری کۆمەڵگەبن[23].

لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوەو لەگەڵ پەرەسەندنی پیشەسازیو گەشەکردنی ئابوری، لیبرالیستەکان دەستیانکردە چاوخشاندنەوەو پێداچونەوەی بیرۆکەو چەمکەکانی لیبرالیزمی کلاسیکیو دەرئەنجام لیبرالیزمی نوێ سەریهەڵدا، دیارترین جیاوازی لیبرالیزمی نوێ لەوەدا دەرکەوت کە لیبرالیزمی کلاسیکی بڕوایان بەسنورداری حکومەت هەبوو لە ژیانی هاولاّتیاندا، بەڵام لیبرالزمی نوێ حکومەتی بە بەرپرسیاری خزمەتی کۆمەڵایەتی دانا لە بواری تەندروستیو نیشتەجێکردنو گوزەرانو فێرکردندا(24).

گۆڕانکاری لە چەمكو ناوەرۆکی لیبرالیزمی کلاسیکی بێهودەو خۆڕانەبوو، بەڵکو ئەنجامی ئەو ململانێو بەرابەریە بوو کە لەگەڵ بیری سیاسی کلیانیو سۆسیالستیو ئانارشیستیدا هەیبوو، لەلایەکی ترەوە پەرلەمانی ئینگلیزیو ئەڵمانیو چەند پەرلەمانێکی تری ئەوروپی، چەندین یاساو بڕیاری کۆمەڵایەتیان دەرکردو هەوڵیاندا چاکسازی لە بارودۆخی کارو کارگەکاندا بکەنو سنورێك بۆ خاوەن کارەکان دابنێن، تاتوانن کرێکارەکان بچەوسێننەوە(25).

هەر بۆیە (برتراندرسل) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە "پێدەچێت بیری لیبرالی لە ساڵانی کۆتاییدا لەژێر کاریگەری سۆسیالیزمدا ئارەزووی ئەوە بکات دەسەڵاتێکی زیاتر بداتە دەوڵەت"(26).

هەروەها لیبرالەکانیش لەوە تێگەیشتبوون کە لەئەنجامی گەشەکردنی ئابوریو دروستبوونی کۆمپانیا گەورەکانو پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەکانیان لە ئەوروپادا، پێویستی چاوخشاندنەوەو دەستکاریکردنی پرەنسیپو تێڕوانینە لیبرالیەکانی هێناوەتە بوون، هەموو ئەم لایەنەش بۆ ئەوەبوو کە چۆن بتوانرێت زۆرترین ڕێژە لە ئازادی بۆ تاك مسۆگەر بکرێت.

ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بوو لە سەرەتاوە (مل)ی هاندا کە بڵێت ئازادی فرەلایەنەو ئەوەی ئازادی بە ڕزگاربوون لە فشارەکانی دەسەلاّت لە قەڵەمدەدات تەواو نییە، چونکە بە بڕوای (مل) چەند جۆرێك لە فشار هەیە لە کۆمەڵگەدا، زیانیان لە دەسەڵات زیاترە لەسەر ئازادی ئەو فشارانەی لە پێناو پەیداکردنی پاروی ژیاندا سەرهەڵدەداتو ڕووبەڕووی هەر تاکێك دەبێتەوە، لەم بارەدا پێویستە کۆمەڵگە کە خۆی لە سستمی سیاسیدا وێنا کردووە بێتە ناوەوەو لەپێناو کەمکردنەوەی فشارەکان کاربکات، واتە دەستێوەردانی دەوڵەت لە دۆخێکی ئاوادا دەبێتە کارێکی پێویست لەپێناو بەدیهێنانی بڕێکی زۆر لە ئازادی، بۆیە (مل) ئەوە ڕادەگەیەنێت کە ئازادی تەنیا خێرو خۆشی تاکەکەسی نییە، بەڵکو گوزەرانو خێری تاكو کۆمەڵ پشتی پێدەبەستێت(27).

ئەم بیرکردنەوە لەوەوە هاتووە کە ئەو سستمانەی لەسەر بنەمای لیبرالی بونیاتنراون ئازادی سیاسی لەگەڵ ئازادکردنی ئابوری لە دژایەتیدا دەبن، بەو واتایەی کە سیاسەتی ئازادکردن کە تەوەری لیبرالیزمی کلاسیکە دەبێتە هۆی جەمسەربەندی هەژارییو دەوڵەمەندیی بەو ڕادەیەی کە هەژارەکان ناچار دەبن کە ئازادییەکانی خۆیان لە بەرامبەر

ئیمتیازه ئابوورییەکاندا بفرۆشن. ئازادی بەربڵاو بۆ دژەکەی خۆی دەگۆڕێت، کاتێك کە ئازادی کۆت و بەندی نەبێت دەستی زۆر بەهێزەکان ئاوەڵا دەکات بۆئەوەی لاوازەکان دیل بکەن، لە کۆمەڵگە سەرمایەدارییەکاندا کۆمپانیا گەورە مۆنۆپۆلەکان لە ڕێکخراوێکی پەتی ئابوری دەردەچن و دەبنە ڕێکخراوگەلی نیوە سیاسی، ئینجا ئازادی دەبێتە ئامێزێك بۆ سنووردارکردنی ئازادی ئەوانی تر.

کەوابو دەبێ ئازادی بپارێزرێت. هەروەك چۆن نابێت دەسەڵاتی دەوڵەت بۆ دەستتێوەردانی ئابوری بەڕادەیەك زۆر بەکراوەیی بهێڵدرێتەوە، بەهەمان شێوەش دەبێ بەرگری لە ئازادی توێژە زیان لێکەوتووەکان بکرێت[28].

(رۆسۆ)ش باس لە ئەرکی دەوڵەت دەکات و پێیوابوو ئەرکی دەوڵەت نەهێشتنی پێشێلکردنی مافەکانە لەنێوان تاکەکاندا، بەمانایەکی تر پاراستنی یەکسانی ئابووری نێوکۆمەڵگەیە، چەمکی یەکسانی ڕووندەکاتەوەو ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە نابێت ئەوەندە هەبێت کە بەهێزی دەوڵەمەندیی (تاکێك یان کۆمپانیایەك یان هەر پێکهاتەیەکی ناو کۆمەڵ) بتوانێت ئازاری کەسێکی تر بدات یان بیکڕێت، کەسێکیش نابێت ئەوەندە هەژار بێت ناچاربێت خۆی و کاری خۆی بفرۆشێت[29].

هەر لە گوزارشتێکی هاوماناادا (کارل پۆپەر) باس لەوە دەکات کە "دەوڵەت لەسەرییەتی کە پاسەوانی لە ئازادییەکانی تاك بکات و ئەمەش پێویستی بەوە هەیە کە پشتیوانی لەو توێژە هەژارانە بکرێت کە ئازادییان لەبەردەم هەڕەشەی جۆراو جۆردایە"[30].

لێرەوە بیرمەندانی لیبرالی لە قۆناغی لیبرالیزمی نوێدا، ڕۆڵی دەوڵەت لە چاودێری و یەکسانی کۆمەڵایەتی و دادی کۆمەڵایەتیدا، هاوکات جۆرێك لە پلانڕێژی و بوژاندنەوەی ئابوری و چاودێری بازاڕ دەسەلمێنێ، ئەم گۆڕانکارییانە کە بەپلەبەندی سەبارەت بەبایەخ و پێویستی دەوڵەت لە کاروباری کۆمەڵایەتی جەختیانکردەوە، لە سەرەتای سەدەی بیستەم چەمکی (دەوڵەتی خۆشگوزەران - دەوڵەتی ڕەفاهی)یان کردە پرەنسیپی سەرەکی.

بەو مانایە لیبرالیزم لەسەدەی بیستەمدا لە پێویستی بەشداری سیاسی گروپ و چینە کۆمەڵایەتییەکان و دژایەتیکردنی هەژاری و بێکاری و بەهێزکردنی دەزگای ئەنجومەنی و بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی دەوڵەت فۆرمەڵە بوو[31].

ئەم دەسەڵات و دەوڵەتەش هەروەك (لیدمان) ئاماژەی پێدەکات: "ئەو دەسەڵاتە فیودال و تاکفەرمانەی جاران نەبوو، بەڵکو دەسەڵاتێکی بورجوایانە بوو کە لیبراڵەکان باشتر دەتوانن بە دەسەڵاتی خۆیانی بزانن"[32].

بەکورتی دەکرێت بڵێین لیبرالیزم بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی دەوڵەتی لە چەند خاڵێکدا دیاریکرد، کە مەودایەکی فراوانتربوو لەوەی لە لیبرالزمی کلاسیکیدا دیاریکرابوو بەتایبەتی لە بواری ئابوریدا، دەوڵەت هەموو هەوڵێکی لە لیبرالزمی نوێدا دژی هەڵئاوسان و چونەوەیەکی ئابوورییەو دەسەڵاتی قۆرخکاریی

ســنوردار دەكــات و هــەموو خزمەتگوزاریــەكی گشتی لە ئەستۆیە، بەرهەم و داهات بەیەكسانی دەداتــە تاكــەكان و پلانرێــژی و كەمكردنــەوەی مەترســیەكان و چــاودێری بــازاڕو نەهێــشتنی دروســتبوونی گرفتــی میكــانیكی لــە بــازاڕدا جێبەجێدەكات[33].

## سێیەم- دادو یەكسانی كۆمەڵایــەتی لــەبیری لیبرالیدا:

بیرمەنــــدانی لیــــبرالی زیــــاتر لەهــــەوڵی ئــەوەدابوون بتــوانن لەســایەی ئــەو گەشــەكردنە خێرایــەی ســەدەی بیستەمدا بــوارو مەودایــەكی بــەرینتر بــۆ لیبرالیــزم بكەنــەوە، لــەم هەوڵەشــدا بەداتاشــــــینی چــــــەمكەكانی (یەكــــــسانی كۆمەڵایــەتی و دادی كۆمەڵایــەتی) باســیان لــە لیبرالیزمی نوێ كردووە[34].

باســــكردن لەچــــەمكەكانی یەكــــسانی و ئــــازادیی و دادوەری و بانگەشــــەكردن بۆیــــان كــارێكی بــێ لەمپــەرو گرفــت نــەبووە، چــونكە دەشــێت مــەودای هــەڵكردن و ئاوێتــەبوونیان جۆرێــك لەدژایــەتی نێوانیــانی زەق كردۆتــەوە، ئەمەش لەلایەن (ئیزایا بیرلین1909–1998)ەوە ڕوندەكرێتــەوەو ئامــاژە بۆئــەوە دەكــات چــەند هەوڵــدراوە بۆئــەوەی چــەمكەكانی ئــازادی و یەكسانی و دادوەری پێكەوە كۆبكرێنەوە[35].

(بیرلین) پێیوایە پێویستە ئازادی بڕیاردانی ژیان ئەو پێوەرە بێت تاك ئارەزوویەتی بەڕێژەی پێویــستبوونی بــەئازادی لــەپێناو هێنانــەدی نــەریت و ئاكارەكــانی تــر وەك یەكــسانی و دادوەری و بەختــەوەری و ئاســایش و ســستەم، ڕێزگــرتن لــەئازادی هــەرتاكێك، لۆجیكیانــە ڕێزگرتنی ئازادی كەسانی تر بەرهەمدەهێنێت، بــەجۆرێك ڕێزگرتنــی پرەنسیپەكانی دادوەری و شــەرمەزاری لەنایەكــسانی مامەڵــەكردن لەگــەڵ خەڵكدا، گرنگ و بنەڕەتییە بۆ تاك هەروەك چۆن ئارەزوومەندی ئازادییە[36].

(بێـرلین) بـەم گوزارشـتە ئـەو تێگەیـشتنەمان دەداتــێ كەئەگەرچــی ئــەو چــەمكانە لەئایــدیای لیــبرالی نوێــدا پێویــستی یــەكترین و تەواوكــەری یـــــەكترن، بـــــەڵام لەهەمانكاتـــــدا جۆرێـــــك لەدژایەتیكردن هەیە لەنێوانیاندا كەهەندێكجار لەبەرژەوەنــــدی تــــاك و هەنــــدێكجاری تــــر لەبەرژەوەنــدی دەوڵــەت كاردەكــەن و ئەمــەش كاریگــەری لەســەر ئــازادی تــاك دەبێــت، بۆیــە چارەسەری ئەم گرفتە لەدیدێكی كۆمەڵایەتیەوە دەبینێت و ڕێزگرتنی دادوەری و مامەڵەنەكردنی نایەكــسانی لەگــەڵ تاكــەكانی تــردا دەبێتــە نــەریتێكی كۆمەڵایــەتی كەهاوبەشــی و بەشــداری گشت تاكەكانی كۆمەڵ بگرێتەوە.

(ڕۆناڵــد دۆركــین)یــش كاتێــك بــاس لــە یەكسانی دەكات دەڵێ یەكسانی دەكاتەوە ماف هــەر تاكەكەســێك كــە هــەمان ڕێــزی ئەوانــەی دیكەی هەبێ[37].

لێــرەوە قــسەكردن لــە یەكــسانی و دادوەری لــەبوارە جیاجیاكــانی لیبرالیزمــدا ئاســتێكی فراوان و دیار وەردەگرێت لە لیبرالیزمی نوێدا، بۆ نمونە (هابهاوس 1864–1924) ئاماژە بۆ ئــەم لایەنــە دەكــات كاتێــك دەنوســێت خــاڵی ســــەرەكی لیبرالیزمــــی ئــــابووری یەكــــسانی پاداشــت و خزمــەتی كۆمەڵایەتییــە، بــەپێی ئــەم خاڵــە هــەر بەرهــەمێكی كۆمەڵایــەتی پێویــستی

بەپاداشت هەیە، چونکە دەبێتە مایەی هاندانو پاراستنی ئەو بەرهەمەو لێرەوە هەرکەس کارێك ئەنجام دەدات مافی خۆیەتی بەرێژەی کارەکەی پاداشتی بدرێتەوە[38].

ئەم بیرکردنەوەیە هەوڵدانە بۆ خستنەڕووی ئەوەی کە یەکسانی لەپاداشت لەبەرامبەر خزمەتی کۆمەڵایەتی لە لیبرالیزمدا رۆڵی خۆی هەیە، بەتایبەتی لەهاندانو پەرەپێدانی تواناکانی تاك، ئەمە جگە لەوەی کە لەلیبرالیزمی کلاسیکیدا جەخت لەسەر ئەوە دەکرایەوە کە بازاڕ دەبێت خۆی خۆی بەرێت بەڕێوە، بەلام لەم قۆناغەی لیبرالیزم قسە لەوەیە کە دەبێت بازاڕ یاساکانی خۆی لەکۆمەڵگەوە هەڵگۆزێت[39].

یاخود ئەم هەوڵدانەی بیرمەندانی لیبرالی هەروەك (حسین بەشیریە) نوسیویەتی: "لیبرالیزم لەروانگەی پاراستنو دابینکردنی ئازادییەکانی تاکەوەبوو کە مەسەلەی یەکسانی کۆمەڵایەتیو دەستتێوەردانی دەوڵەتی لەئابووریدا خستە ناو مەسەلەکانیانەوەو گرنگیان پێدا، ئەوەی کە هەموو هاوولاتیان مافو ئازادی یەکسانی سەرچاوەکانو دابینکردنی هەلی بەرامبەری هەبێت"[40].

(ئەلیکسی تۆکڤیل)یش کاتێك قسە لە خۆشنودیو خۆشگوزەرانی خەڵکی دەکات لەسایەی سستمی سیاسیدا، ئەوە رووندەکاتەوە کەمەبەست پێی تەنها خۆشگوزەرانی دەستەو گروپێکی کەمو تایبەت نییە لەمرۆڤ، بەڵکو بۆ هەموو مرۆڤەکانە، مرۆڤەکانیش هاندەدات بۆ ئەوەی بەشێك لەتواناو وزەکانی خۆیان لە پێناو کەسانی تر بێت، لە پێناو پێویستییەکانی خەڵك بێت بەگشتی[41]، چونکە پێیوایە لێرەوەیە مرۆڤ تەنها سەرقاڵی خۆی نابێتو هەولی هاوکاری کەسانی تر دەدات، وادەکات دۆخێکی کۆمەڵایەتی یەکسان بخوڵقێت[42].

ئەم تێڕوانینەی تۆکڤیل لە پێویستی هاندانی تاك بۆ یارمەتیو بەدەمەوەچوونی هاوتاکەکانی لەکۆمەڵگەدا، بۆ دروستکردنی جۆرێك لەیەکسانییە، کە بەبڕوای تۆکڤیل ئەم بیرکردنەوەیە لەیەکسانی دەتوانێت گرەنتیو مسۆگەری دادی کۆمەڵایەتی بێت[43].

دواتر (ڕاوڵز1921-2003) دەیەوێت زیاتر لەسەر سروشتو ناوەڕۆکی ئەم چەمکانە قسەبکات، بۆ ئەمە جەخت لەسەر دوو ڕەگەز دەکاتەوە یەکەمیان ئازادی تاکەکەسەو خۆی لەمافی ڕادەربڕینو هەڵبژاردنو بەشداری پلەوپایەی گشتیو ئازادی کۆبوونەوەو گوزارشتکردنو موڵکایەتی تایبەتیو ئازادی ویژدانو ئازادی لەهەرشتێك ئارەزووی دەکات، دووەمیان بریتییە لە مسۆگەرکردنی دادوەریو یەکسانی، ڕاوڵز پێیوایە ڕەگەزی یەکەم لەسایەی بەرجەستەبوونی ڕەگەزی دووەمدا پراکتیزە دەبێت[44]، چونکە ئازادیو یەکسانی دوو چەمکی فەرمانڕەوای ڕژێمی سیاسی لیبراڵییە.

تیۆری دادوەری راولز لەسەر دوو پرەنسیپ دەوەستێت، یەکەمیان: پابەندە بە یەکسانیو ئەوە دەسەلمێنێت کە مرۆڤەکان لە مافە بنەڕەتییەکانیانو ئازادییە تاکێتیەکانیاندا یەکسانن. دووەمیان: پابەندە بە جیاوازی، تیایدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لەگەڵ

ڕەچاوکردنی پرەنسیپی یەکسانی لەبەردەم یاساکاندا، پێویستە کە جیاوازییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان بەشێوەیەك ڕێکبخرێن بەسود و قازانجی هەموو تاکەکان بکەوێتەوە[45].

واتە کاتێك راولز باس لە (دادوەری) دەکات دوو تێگەیشتنی خۆی بۆ ئەم چەمکە پێشکەشدەکات، تێگەیشتنێك بەمانای بەدەستهێنان و بەرجەستەبوونی سوودمەندیی هاوبەرامبەر لەسەر بنەمای ڕێکەوتن و ڕەزامەندی کەببێتە هۆی ئەوەی کرداری دادوەرانە مسۆگەرکەری بەرژەوەندییەکانی تاك بێت، تێگەیشتنی دووەمی بەمانای بێلایەنییە کەپابەندی هیچ کەسێکی تر نەبێت لەڕەفتارو ئاکارە خودییەکاندا[46].

بەمانایەکی تر راولز پێیوایە لە دۆخی وەهادا، مرۆڤەکان هەرهەموو، بێئەوەی هیچ دەستەیەك کەم بەش بێت، هەمان ئازادی و مافی بنەڕەتییان هەبێت، لەلایەکی ترەوە جیاوازی تەنها ئەگەر لە بەرژەوەندیی کەسانی هەرە لاوازدا بوو ئینجا دەسەلمێنرێت[47].

راولز لێرەدا پرەنسیپێك بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵگا هەڵدەهێنجێ: بەخشە بنەڕەتییە کۆمەڵایەتییەکان دەبێت بەشێوەیەکی یەکسان دابەشبکرێن، مەگەر ئەوەی کە دابەشکردنی بەقازانجی هەمووان بێت. واتە نایەکسانی تەنها و تەنها ئەو کاتە دادپەروەرییە کە بوونی قازانجی هەمووان بێت و تەنانەت بێبەشترین توێژەکانی کۆمەڵیش سوودی لێوەربگرن[48].

لەبەر گرنگی و بایەخی ئەم تیۆرە، (ببلاوی) لەگرنگترین ئەو بەرهەمانەی دادەنێت لە بنەڕەتی دەسەڵات و یاسا دەکۆڵێتەوە و لەسەر بنەمای ئازادی و یەکسانی بونیادنرابێت و جەختی لەسەر پرەنسیپەکانی لیبراڵیزم کردبێتەوە[49].

کەواتە تەوەری سەرەکی تێگەیشتن لە تیۆری دادوەری راولز لەچەند خاڵێکدا خۆی گەڵاڵە دەکات کە بریتین لە:

1. دەبێت پێویستییە سەرەتایی یان بنەڕەتییە ماددییەکانی هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا دابینبکرێن.
2. هەر تاکێك مافێکی یەکسانی هەیە بەرامبەر بەپرۆژەیەکی گونجاو لە ئازادییە بنەڕەتییەکان کە لەگەڵ پرۆژەیەکی هاوشێوە دەربارەی ئازادییەکان بۆ هەمووان سازگاربێت.
3. هەڵی دەستڕاگەیشتن بە بەهرەی سامانی کۆمەڵایەتی دەبێت بەجۆرێك دابەشبکرێت، کەهەڵی بێبەشترین توێژەکانی کۆمەڵگا بگەیەنێتە بەرزترین ئاستی خۆی.
4. نایەکسانییە ئابوورییەکان دەبێت بە شێوازێك ڕێکبخرێن کە سامانی هەژارترین توێژەکانی کۆمەڵگا بگاتە بەرزترین ئاستی خۆی[50].

لەبەر رۆشنایی و ڕەچاوکردنی پرەنسیپی دووەمی راوڵزدا، (سیلڤی میزورو ئالان رینو) کتێبێکیان لەژێر ناونیشانی (منێکی تر)دا نوسیوە و هەوڵیانداوە لە میانەی باسکردن لە مافی رۆشنبیری کۆمەڵەکان، ئاماژە بۆ ئەوە بکەن کە ئەم مافانە بناغە و کۆڵەکەن بۆ ئازادی تاك و گوزارشتکردن لە ڕەهەندی کۆمەڵایەتی شوناسەکەی؛ بەشێوازێك ئەم مافانە گرەنتی بەدیهاتنی جۆرێك لە دادوەری بێت.

بۆیــە هــەوڵی وێنــاکردنی شـێوەیەکی تریـان لەپەیوەنـــدی نێـــوان مـــن و ئـــەویتردا داوە، کەمەبەست پێی سەلماندنی ئەوەیە کە ئەویتر هاوشێوەو لێکچووی ئێمەیە بەڕێـژەی ئـەوەی یەکسانین، هەروەها دانپێدانانی ئەوەی مافی یەکسان بوون بە ئێمە، لەگەڵ سەلماندنی ماڤ جیاوازبوون لە ئێمە بۆی[51].

هـــەر ئـــەم لایەنەشـــە کـــە وادەکـــات (ئـــەنتۆنی گیـــدنز)یـــش بـــیر لەوەبکاتـــەوە کەچـــــــۆن بتوانرێـــــــت هاوتاییـــــــەك لـــــەنێوان بەرپرســــیارێتی تاکەکەســــەکان و بەرپرســــیارێتی کۆمەڵـــەکان بکرێـــت، لـــەم سـوۆنگەیەوە ئامـــاژە بـــۆ ئـــەوە دەکـــات کـــە چاوخشاندنەوە بە چەمك و تێگەکانی شوناس و کۆمەڵ پێویستییەکی ئەم لایەنەن[52].

لـەم پێنـاوەدا هەوڵیانـداوە پەیوەندییـەکانی نێـوان دەوڵـەت– تـاك – کۆمـەڵ دیـاری بکـەن، هـەروەها ئـەرك و بەرپرسـیارێتی هەریـەکێکیان لەبەرامبـــەر یـــەکتری وێنـــا کـــراوە، بـــەجۆرێك هیـچیان ئـەو دێوەزمەیـە نـین کـە بـەردەوام لـە ســــەنگەرو بۆســــەدا بــــن لەیــــەکتر، بــــەڵکو بەهەماهەنگی و تەبایی نێوانیان دەکرێت زۆرتر گرەنتـی مـاف و ئازادییـەکانی مـرۆڤ مـسۆگەرو پـارێزراوتر بێت، هاوکات یەکانگیری کۆمـەڵیش فەراهەم و بەرجەستە ببێت.

## ئه نجام:

بـەکورتی دەکرێـت بڵـێین لیبرالیـزم ئـەرکی دەوڵــــەتی لەچــــەند خاڵێکــــدا دیــــاری کــــرد، مەودایـــەکی فراوانتربـــوو لـــەوەی لەقۆناغـــە ســــەرەتاییەکانی لیبرالیــــزم دیــــاری کرابــــوو بەتایبـەتی لـەبواری ئابوریـدا، دەوڵـەت هـەموو هەوڵێکی لە لیبرالیزمی نوێدا دژی هەڵئاوسان و چونەوەیەکی ئابوورییەو دەسەڵاتی قۆرخکاریی سـنوردار دەکـات و هـەموو خزمەتگوزارییـەکی گشتی لەئەستۆیەو بەرهەم و داهات بەیەکسانی دەداتـە تاکـەکان و پلانرێـژی و کەمکردنـەوەی مەترسـیەکان و چـاودێری بـازاڕو نەهێـشتنی دروسـت بـوونی گرفتـی میکـانیکی لـەبازاڕدا جێبەجێدەکات[53].

## سەرچاوەو پەراوێزەکان:


1–د.کـەمال پـولادی: مێـژووی هـزری سیاسـی لـەرۆژئاوا–سـەدەی بیـستەم، بـەرگی سـێیەم، و: ئـازاد وەلـــەد بـــەگی–ســیروان زەنـــدی، دەزگـــای چـــاپ و بلاوکردنەوەی موکریان، هەولێر، چاپی یەکەم، 2005، ل106–107.

2–حسێن بەشیریە: بنـەماکانی زانستی سیاسـەت (تیـــۆری–پراکتیکـــی)، وەرگێڕانـــی: ئەبوبـــەکر کاروانی، چاپەمەنی پەیوەند، چاپی یەکەم، سلێمانی، 2005، ل101.

3–موسا غـەنی نـەژاد: کۆمـەڵی مـەدەنی– ئـازادی، ئابووری و سیاسـەت، وەرگێڕانـی لـە فارسـییەوە: رێبـاز مـستەفا، چـاپخانەی دانـاز، سـلێمانی، 2001، ل80–81.

4–سڤێن – ئێرك لیدمان: رێگوزەری بیری سیاسی، وەرگێڕانـی: ئاسـۆس کمـال، دەزگـای چـاپ و پەخـشی سەردەم، چاپی دووەم، سلێمانی، 2004، ل136 ؛ جان توشـــار: تـــأريخ الفكـــر الـــسياسي، دار العالميـــة

للطباعة والنشر والتوزيع، لبنان – بيروت، الطبعة الاولى، 1981، ص327.

5–ژرژ بوردو: ليبراليسم، ترجمه: عبدالوهاب أحمدى، كتابخانه مللى إيران، تهران، چاپ أول، 1378، ص50.

6–د. حسن شحاته: اساطين الفكر السياسي والمدارس السياسية، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، 1959، ص247–248.

7–جون ستيوارت مل: اسس الليبرالية السياسية، ترجمة وتقديم وتعليق: م. د. إمام عبدالفتاح إمام و م.د.ميشيل متياس، مكتبة مدبولي، القاهرة، 1996، ص129–130.

8–د. حسن شحاته: اساطين الفكر السياسي، ص253.

9–جون ستيوارت مل: اسس الليبرالية السياسية، ص131.

10–جۆن لۆك: نامەیەك دەربارەی لێکبوردن، وەرگێڕانی: شۆڕش جوانڕۆیی و فەرشید شەریفی، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، 2004، ل47.

11–عبدالله العروي: مفهوم الحرية، المركز الثقافي العربي، بيروت – لبنان، الطبعة السادسة، 1998، ص43–45.

12–وليم كلي رأيت: تأريخ الفلسفة الحديثة، ترجمة: محمود سيد أحمد، تقديم ومراجعة: امام عبدالفتاح امام، المجلس الاعلى للثقافة، 2001،ص415.

13–رەیدار لاشۆن: گەلە ئایدۆلۆژیای سیاسی هاوچەرخ، تەرجەمەی لە سویدییەوە: ئاسۆس کەمال، کتێبی هەرزان، ستۆکهۆڵم–1999، ل25.

14–د. عبدالرضا الطعان: تأريخ الفكر السياسي، دار الحكمة للطباعة والنشر،1992، ص 614–615.

15–د.کەمال پولادی: مێژووی هزری سیاسی لەرۆژئاوا–سەدەی بیستەم، بەرگی سێیەم، ل111.

16–هەمان سەرچاوە، ل117.

17–تيودور ماير غرين: الليبرالية والموقف الليبرالي، تعريب: جورج زيناتي و فوزي قبلاوي، المؤسسة الشرقية للترجمة والنشر، بيروت، 1957، ص29.

18–إيزايا بيرلين : حدود الحرية ، ترجمة : جمانا طالب ، دار الساقي ، بيروت – لبنان ، الطبعة الاولى ، 1992، ص15.

19–هبة رؤوف عزت: الليبرالية 00 ايدولوجية مراوغة افسدها رأس المال (2004/8/18): ***[ www. Islamonline.net/Arabic / mafaheem / 2004 / 95k ].–08 /18 article 01b- shtml***

20–هیوا عەزیز سەعید: ڕەنگدانەوەی بیری لیبرالی لە باشووری کوردستان (1900–1958)، چاپخانەی یاد، سلێمانی، 2006، ل127.

21–جان توشار: تأريخ الفكر السياسي، دار العالمية للطباعة والنشر والتوزيع، لبنان – بيروت، الطبعة الاولى، 1981، ص313–314.

22–د. عبدالرضا الطعان: تأريخ الفكر السياسي، ص395–396؛ د. حسن شحاته: اساطين الفكر السياسي، ص69.

23–سڤێن – ئێرك لیدمان: ڕێگوزەری بیری سیاسی، ل133.

24–هبة رؤوف عزت: الليبرالية 00 ايدولوجية مراوغة.

25–د. عبدالرضا الطعان: تأريخ الفكر السياسي، ص614و633.

26–هیوا عەزیز سەعید: ڕەنگدانەوەی بیری لیبرالی، ل99.

27–جـان توشـار: تـأريخ الفكـر الـسياسي، ص128.

28–د.كـەمال پـولادی: مێـژووی هـزری سیاسـی لەرۆژئاوا، بەرگی سێیەم، ل161.

29–سـڤێن – ئێـرك لیـدمان: ڕێگـوزەری بـیری سیاسی، ل137.

30–هـەمان سەرچـاوە، ل152. حـسین بـشیریە: لیبرالیسم و محافظە کاری (تاریخ أندیشە سیاسی در قرن بیستم)، ج2، خیابان فاطمی، خیابان رهی معیری، تهران، چاپ پنجم، 1383، ص20–21.

31–حـسین بـشیریە: لیبرالیـسم و محافظـە کـاری (تـاریخ أندیـشە سیاسی در قـرن بیـستم)، ج2، خیابـان فاطمی، خیابان رهی معیری، تهران، چاپ پنجم، 1383، ص20–21.سـڤێن – ئێـرك لیـدمان: ڕێگـوزەری بـیری سیاسی، ل249–250.

32–سـڤێن – ئێـرك لیـدمان: ڕێگـوزەری بـیری سیاسی، ل249–250.

33–عبدالرحیم السلمي: اللیبرالیة نشأتها ومجالاتها (2/2) ،اضیف بتأریخ: الاحد 24 شعبان 1424 هـ: *(www.haramainj.net/index.php?action=show-maqalam-id=35-28k).*

34–جان توشار: تأریخ الفكر السیاسی، ص640.

35–ایزایا بیرلین: حدود الحریة، ص 71.

36–نفس المصدر، ص 74.

37–ڕەیـدار لاشـۆن: گەلـە ئایـدۆلۆژیای سیاسـی هاوچەرخ، ل22.

38–جان سالوین شاپیرو: لیبرالیسم – معناو تأریخ آن، ترجمة: محمد سعید حنای کاشانی، نشر مرکز، تهران، چاپ اول، 1380، ص195.

39–هیـوا عـەزیز سـەعید: ڕەنگدانـەوەی بـیری لیبرالی، ل102.

40–حـسێن بەشـیریە: بنـەماکانی زانـستی سیاسەت، ل103.

41–تحریر: لیو شتراوس وجوزیف کروبسي، تاریخ الفلسفة السیاسیة – من جون لوك الی هیدجر، ترجمة: محمود سید احمد، مراجعة: امام عبدالفتاح امام، الجزء الثاني، المجلس الاعلی للثقافة، القاهرة، الطبعة الاولی، 2005، ص417.

42–نفس المصدر، ص419.

43–د.ابـراهیم الدسـوقي ود.عبـدالعزیز الغنـام: تـاریخ الفكـر الـسیاسي، دار النجـاح، بـیروت، 1973، ص282.

44–جین هیمپتن: فلسفه سیاسی، ترجمة : خشایار دیهمیی، سازمان چاپ و انتاشارات وزراتی فرهنك و إرشاد اسلامي، تهران چاپ اول ،1380، ص300.

45–علـي حـرب: أصـنام النظریـة وأطیـاف الحریـة (نقد بوردیو وتشومسكي)، المركز الثقافي العربي، بیروت – لبنان، الطبعة الاولی، 2001، ص118.

46–هەمان سەرچاوە، ص302.

47–ڕەیـدار لاشـۆن: گەلـە ئایـدۆلۆژیای سیاسـی هاوچەرخ، ل21.

48–د.كـەمال پـولادی: مێـژووی هـزری سیاسـی لەرۆژئاوا، بەرگی سێیەم، ل172.

49–د. حـازم البـبلاوي: عـن الدیموقراطیـة اللیبرالیة، ص 18.

50–د.كـەمال پـولادی: مێـژووی هـزری سیاسـی لەرۆژئاوا، بەرگی سێیەم، ل174.

51–علـي حـرب: أصـنام النظریـة وأطیـاف الحریـة، ص129.

52–نفس المصدر، ص124.

53–د. عبـدالرحیم الـسلمي: اللیبرالیـة نـشأتها ومجالاتها(2\2).

# پارادایمی لیبراڵ

# بۆ لێکۆڵینەوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان

د. ئەنوەر محەمەد فەرەج

**مشتومڕی نێوان پارادیمەکان**

*Interparadigm debate*

قۆناغی پاش کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی دووەم بۆ بواری لێکۆڵینەوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بریتی بوو لەقۆناغی باڵادەست بوونی تێزەکانی پارادایمی ریالیزم بەسەر ئەو بوارە مەعریفییەدا. دیارە هۆکاری هاتنە کایەی ئەم حاڵەتەش لەپێش هەموو شتێکەوە بریتی بوو لە زاڵبوونی زمانی هێزی سەربازی و گەڕان بەدوای بەرژەوەندی نیشتمانی دەوڵەت و بەواقع بوونی ململانێی نێودەوڵەتی. لەم دۆخەدا بابەتەکانی تایبەت بەئاسایش و مانەوەی دەوڵەت ڕیزی پێشەوەی لیستی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتیان داگیرکردبوو هەروەها چەمکەکانی پێکەوە ژیانی ئاشتیانەو ئەگەری پێکەوە گونجاندنی بەرژەوەندی نیشتمانی دەوڵەتان و هاوکاری ئابوری و سیاسی نێوان دەوڵەتان پاشەکشەیان کردبوو.

ئەم بارودۆخە بەردەوامبوو تاوەکو هەفتاکانی سەدەی بیستەم و سەرهەڵدانی ئەو کێشانەی کە لەئەنجامی بەکارهێنانی پەترۆڵ وەك چەکێك لەلایەن وولاتە عەرەبییەکانەوە لەپاش (جەنگی 1973)و دەستەوسان بوونی سیاسی و سەربازییەکان لەبەرامبەر بەرزبوونەوەی نرخی پەترۆڵ بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، لێرەوە ئەم کێشەیە پرسیارێکی گەورەی وروژاند سەبارەت بە ڕۆڵی فاکتەری ئابوری و پرۆسەو میکانیزمەکانی کارکردنی سیستمی ئابوری نێودەوڵەتی و پەیوەندی نێوان بوارەکانی سیاسەت و ئابوریو بابەتە ئەمنی و سەربازییەکان.

ئەم ڕووداوە هاوکات بوو لەگەڵ کۆمەڵێك گۆڕانکاری گەورەی جیهانی لەبواری

پەیوەندییـــە ئابوریـــە نێودەوڵەتییەکانـــدا، بەتایبـــەت زیـــادبوونی ڕێـــژەی ئـــاڵوگۆڕە ئابورییـــەکان و دارِمـانی سیـستمی (بریتـۆن- ودن) و خاوبوونـــەوەی گرژییـــەکانی قۆنـــاغی ســـەرەتای جـــەنگی ســـاردو کرانـــەوەی پەیوەندییـەکانی نێـوان ئـەمریکاو چین ..هتـد. هـــەموو ئەمانـــەش پێکـــەوە بواریـــان کـــردەوە لەبـــەردەم هاتنەکایـــەی گفتوگـــۆو دیـالۆگ لـەنێوان چـەند تیـۆرو قوتابخانەیـەکی تایبەت بەم بوارە.

لـــەڕووی مێژووییـــەوە ســـێ (قوتابخانـــەی فیکـری *School of thought*) لەکێبڕکێـدابوون لەســەر باڵادەســتی بــواری ئــابوری سیاســی نێودەوڵەتیـــدا، ئـــەوانیش: (لیبراڵیـــزم، مێرکانتـــالیزمو ڕادیکـــالیزم)[1] بـــوون. کـــە هەریەکــەیان پێناســەو لێکدانــەوەی تایبــەت بــەخۆی پێــشکەش کــردووە ســەبارەت بــە پەیوەندییە ئابوریە نێودەوڵەتیەکان.

لیبراڵیـــستەکان بەشـــێوەیەك لـــەبوارەکانی سیاسـەت و ئـابوری ئـەڕوانن کـە بەشـێوەیەکی ڕێـــژەیی دوو بـــواری جیـــاوازو تاڕادەیـــەك بـــە ســـــەربەخۆیی لەیـــــەکتر کـــــار ئەکـــــەن. ڕادیکالیستەکان (مارکسیستەکان) ڕایان وابوو کە بواری ئـابوری دیاریکـەری بـواری سیاسـی و بونیادو پەیوەندییە سیاسیەکانە لە ئاستەکانی نـــــاوخۆو نێودەوڵەتیـــــدا. هەرچـــــی مێرکانتالیـستەکانە لـەو پێگەیـەوە هـەنگاویان هەڵئــەهێنا کــە ڕای وایــە بــواری ئــابوری و پەیوەندییـــــە ئابورییـــــەکان پاشـــــکۆی بەرژەوەندییەکانی دەوڵـەتن هـەر لەبەرژەوەنـدیی خۆشـــگوزەرانی ناوخۆییـــەوە بیگـــرە تـــا بەرژەوەندییـــەکانی تایبـــەت بـــە ئاسایـــشی نێودەوڵەتی[2].

ئـەم جیاوازیانـە بەهاوشـانی لەگـەڵ کێـشەو مشتومڕەکانی نێوان ریالیست و لیبراڵیستەکان لـــەبواری پەیوەندییـــە نێودەوڵەتییەکانـــدا بارودۆخێکی نوێی هێنایە کایەوە کە لەڕوانگەی لێکۆڵینـــەوەکانی کۆمەڵناســـی مەعریفـــەو فەلسەفەی زانستەوە بەتایبەت لێکۆڵینەوەکانی "تۆماس کۆن" سەبارەت بەڕۆڵی "پارادایم" لە پەرەســـەندنی زانـــستەکاندا، بیروبۆچـــونێك گەشـــەی کـــرد کـــە چـــیتر ناتوانرێـــت بـــواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لەلایەن یەك تیۆر یـان یـەك قوتابخانـەی فیکـری یـان تـەنها یـەك پارادایمـــەوە قـــۆرخ بکرێـــت و لـــەبری ئـــەوە مشتومڕو دیبەیتی نێوان پارادایمە جیاوازەکان هاتە کایەوە "*Inter paradigm debate*"[3].

گفتوگـــۆی نێـــوان قوتابخانـــە جیاوازەکـــان شـــێوازی جۆراوجـــۆری بەخۆیـــەوە بینیـــووە، لـــــەبواری تیۆرەکـــــانی پەیوەندییـــــە نێودەوڵەتییەکانـدا نـاوی لێنـرا گفتوگـۆی نێـوان پارادایمە جیاوازەکان "*Inter paradigm debate*" کـە بریتـی بـوون لـە پارادایمـەکانی(ریـالیزم و لیبراڵیـزم و ڕادیکـاڵیزم)، بـەڵام لەسـەر ئاسـتی ئابوری و سیاسی گفتوگۆو مشتومڕەکە لەنێوان "لیبراڵیزم و مێرکانتالیزم و مارکسیزم"دا خۆی نواند، ئەمـە لەکاتێکدا هـەمان مشتومڕ لـەڕووی ئایدیۆلۆژییـــەوە لـــەنێوان ئایـــدیۆلۆژیاکانی "محافزکـــاری- کۆنزەڤـــاتیڤیزم، لیبراڵیـــزم و ڕادیکـــالیزم"دا هاتەکایـــەوە، هەرچـــی بـــواری مەنهەجیـەت و میتۆدۆلۆژیا بـوو ئـەوا گفتوگۆکـە لـــەنێوان "تەقلیـــد گـــەرایی و ڕەفتارگـــەرایی و

دیالێکتیکگەرایی"دابوو. لەڕووی خاڵی جەخت کردنەوەی لێکۆڵینەوەکانیانەوە جیاوازییەکە لەشتێکی تردا بەرجەستە ئەبوو ئەویش بریتی بوو لەجەختکردنەوەی ریالیستەکان لەسەر سەنتەریزمی دەوڵەت *State-centric*، لیبراڵیستەکان لەسەر فرەسەنتەری *Multi-centric*، ڕادیکالیستەکان لەسەر جیهان بەگشتی *Global-centric*.[4]

تەواوی ئەم قۆناغەش لەبواری لێکۆڵینەوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا بە قۆناغی (پاش ڕەفتارگەرایی– *post behaviorism*) ناوزەد کرا، کە لەلایەك کاردانەوەیەکی بەهێزبوو لەبەرامبەر تێزەکانی ڕەفتارگەران و ئاراستەکردنی ڕەخنەی توند بەو قوتابخانەیە، لەلایەکی تریشەوە گۆڕانی ئاراستەی لێکۆڵینەوەکان بوو بەرەو چەندین بابەت و کێشەی تر لەبواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بەڵام لەسەر بنەماو گریمانەی نوێ.[5]

ئەم گۆڕانە لەبواری لێکۆڵینەوەکاندا ڕەنگدانەوەی ئەو ئاڵۆزبوون و لێکئاڵانە بوو کە بواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و سروشتی کارلێککردنە نێودەوڵەتییەکان بەخۆیەوە دەبینی لەسەر ئاستی جیهان کە دەتوانرێت بەدیاردەی **"پشت بەستنی هەمەلایەنە بەیەکتر الاعتماد المتبادل *Independence*"** گوزارشتی لێبکرێت. ئەم دیاردە نوێیە پاڵنەرێك بوو بۆ چەندین کەس لەبیرمەندان و لێکۆڵەرەوەکان کە بگەنە ئەو ڕایەی کە چەمك و گریمانە تەقلیدییەکان لەبواری پەیوەندی نێودەوڵەتیدا ناتوانن ئەم کارلێکردنە نوێیانە لەخۆیان بگرن و لێکدانەوەی پێویستیان بۆ بکەن. بۆنمونە "هانریدەر *Hanrieder* " ئاماژە ئەکات بۆ چەندین جۆرو ئاستی جیاواز لەکارلێکردنی نێودەوڵەتی، لەوانە **کارلێکردنە ئاسۆییەکان** کە لەئەنجامی ڕێکەوتننامە دووقۆڵی و فرەلایەنەکانی نێوان دەوڵەتاندا دروست ئەبێت. **کارلێکردنە سەروو نەتەوەییەکان** (فوق القومية) کە لەنێوان کۆمەڵگەو دەوڵەتە جیاوازەکاندا ڕوو ئەدەن بەهۆی مامەڵە جیاوازەکانی نێوان سنوورەکانەوە ڕوو ئەدات بەهۆی ڕێکخراوو گروپ و کۆمپانیا فرەڕەگەزو بانکەکانەوە ڕوو ئەدەن. کارلێکردن و پرۆسەکانی تەواوکاری و یەکگرتنی نێوان دەوڵەتانی لەشێوەی ڕێکخراوو دامودەزگا هەرێمییەکاندا دەبنە هۆی لاوازکردنی سەروەری دەوڵەت و بەرتەسك کردنەوەی ڕۆڵ و ئەرك و بوارە تایبەتەکانی دەوڵەت.[6] هەموو ئەم پێشهات و گۆڕانکاری و دیاردە نوێیانە دۆخێکی تایبەتی لەبواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا دروست کرد کە ئایا ئەم بوارە لەحاڵەتی بەردەوام بووندایە لەسەر هەمان ڕیتمی پێشووی یان حاڵەتێکی گۆڕانکاری و گواستنەوە بەخۆیەوە ئەبینێت لەتەواوی چەمك و گریمانەو میتۆدو ئەجێنداکاندا. هەرچۆنێك بێت ئەوەی کە جێگەی گومان نییە ئەوەیە کە ئەم گۆڕانکارییانە ئەو ڕاستییەیان دووپات کردەوە کە چیتر بواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بەتاکە یەك تیۆرو پارادایم کۆنترۆڵ ناکرێت کە بریتی بوو لەتیۆری ریالیزم بەڵکو لەگەڵ ئەو تیۆرەدا لانی کەم تیۆرێکی نوێ یان پارادایمێکی نوێ هاتۆتە کایەوە کە بریتییە

لـــەپارادایمی لیبراڵیـــزم بـــۆ پەیوەندییـــە نێودەوڵەتییەکان.

## لیبراڵیزم وەك پارادیمێـك بـۆ پەیوەندییـە نێودەوڵەتییەکان.

ئەگەر پارادایمی ریالیزم لەسەر ئەو گریمانە بنیاد نرابێت کە دەوڵەت بەتاکە بکەر (ئەکتەر)ی نێودەوڵــەتی و هێــزی ســەربازیش بــەئامرازی ســـــەرەکی جێبـــەجێکردنی سیاســـەتەکان و ئاســایش بــەئامانجی هــەرەبالاًی پەیوەندییــە نێودەوڵەتیــەکان دابنێــت، ئــەوا پــارادایمی لیبراڵیـــــزم ئـــــەم گریمانانـــــە پێـــــچەوانە ئەکاتەوەو بەشێوەیەك کەبکەرە نێودەوڵەتیەکان سنوری دەوڵـەت تێئەپـەڕێنن و فرەیـی ئـامرازی ئـابوری و دەزگـا ئابووریـە نێودەوڵەتییـەکانیش ئــەبن بــەئامرازی ســەرەکی و ئــابوری ئــەبێت بــەئامانج و خۆشــگوزەرانی جێگــەی ئاســایش ئەگرێتەوە.[7]

سەرەتای کاریگەریی و بەهێزی گریمانـەکانی پـــارادایمی لیبراڵیـــزم لـــەو کتێبـــە گـــرنگ و پڕبایەخەوە دەستی پێکرد کە لەلایەن هەردوو زانـــــای بـــــواری تیـــــۆری پەیوەندییـــــە نێودەوڵەتییـەکان (ڕۆبـەرت کیـۆهین)و (جۆزیـف نـای)ەوە سەرپەرشـتی و ئامـادەکرابوو بـەناوی "*Transnational and world politics*" کە ئـەم کتێبە کۆمەڵێك ووتاری تیۆری گرنگی ژمارەیـەك لەدەســتە بــژێری نــوێی بــواری پەیوەندییــە نێودەوڵەتییـــەکان لـــەخۆی گرتبـــوو کـــە بەشــێوەیەکی بوێرانــە ڕەخنــەیان لەنــەریت و ئـەدەبیات و بنـەما فەلسەفییەکانی قوتابخانـەی لیبراڵیـزم گرتبـوو، پاشـانیش ئـەم دەسـتەبژێرە نوێیـە بـوون بـەخاوەن پێگـەو کاریگـەری تایبـەت لەبەشـەکانی زانسـتە سیاسـییەکانی زانکۆکـانی ووڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاداو وەك چەندین نــاوی نــوێ دەرکــەوتن لــەبواری لێکۆڵینــەوەو شیکاری سیاسی نێودەوڵەتیدا.[8]

لێـــــرەوە بەشـــــداری و بەرهـــــەمی لیبرالیـــــستەکان لـــــەبواری پەیوەندییـــــە نێودەوڵەتییەکانـدا فراوانـی بەخۆیـەوە بینـی و ئـەو هەوڵانــە لەلایــەن پــسپۆڕانەوە بەچــەندین شــێواز پــۆلێنکراون، وەك دابەشــکردنی ئــەو بەرهەمـــــە تیۆرییانـــــەو خاوەنـــــەکانیان بۆســێ ئاراســتەی (لیبراڵیزمــی نێونەتــەوەیی، ئایـــــدیالیزم و لیبراڵیزمـــــی دامودەزگـــــایی مؤسسي).[9]

هەندێکی تـر دابەشـی ئەکـەن بـۆ: لیبراڵیزمی بازرگانی کە پەیوەندی دروست ئەکات لەنێوان بازرگـــانی ئـــازادو هێنانەکایـــەی ئاشـــتیدا، لیبراڵیزمــی کۆمــاری کــە پەیوەنــدی دروســت ئەکات لەنێوان دیموکراسی و ئاشتیدا، هـەروەها لیبراڵزمـی کۆمەڵایـەتی کـە پەیوەنـدی دروسـت ئــەکات لــەنێوان چــالاکی ســەروونەتەوەیی و پرۆسەی تەواوکاری نێودەوڵەتیدا.[10]

هەنـدێکی تـر دابەشـی ئەکـەن بـۆ لیبراڵیزمـی ئاشـــــتیانە لای "شـــــۆمبیتەر" لیبراڵیزمـــــی ئیمپریالیانــە لای "ماکیــاڤیللی" ولیبراڵیزمــی نێونەتەوەیی لای "کانت".[11]

پوختـــەی ئـــەم گریمانانـــەی پـــارادایمی لیبراڵیزم لەوەدا کۆئەبێتەوە کە خاوەن دیـدێکی نوێیـە بـۆ پەیوەندییـە نێودەوڵەتییـەکان و زیـاتر ئــەگونجێت لەگــەڵ پێــشهاتە هاوچــەرخەکانی بـــــواری نێودەوڵەتیـــــداو تێگەیـــــشتن و

لێكدانەوەیەكی باشتر پێشكەش دەكات سەبارەت بەتەكنەلۆژیای نوێو پێشكەوتنی هۆكارەكانی كۆمۆنیكەیشینو گەشەكردنی فراوانو هەمەلایەنی ئابوری نێودەوڵەتی، كە بەگوێرەی ئەم پارادایمە نوێیە تەواوی ئەو پێشهاتانە دیاردەیەكیان خولقاندووە كە پێی ئەووترێت دیاردەی "پشت بەستنی هەمەلایەنە بەیەكتر لەنێوان دەوڵەتاندا– الأعتماد المتبادل بین الدول *Interdependence*" بەچەشنێك كە هیچ دەوڵەتێك ناتوانێت خۆی گۆشەگیر بكاتو لەكارلێكردنە نێودەوڵەتییەكان دوور بكەوێتەوە. (12)

لیبراڵیستەكان رایان وایە كە پەیوەندییەكانی نێوان (دەوڵەت – كۆمەڵگا) كاریگەریی بەهێزی هەیە لەسەر هەڵوێستو رەفتاری دەوڵەت لەسیاسەتە جیهانییەكاندا، واتە بیروباوەڕە كۆمەڵایەتییەكانو بەرژەوەندییەكانو دامودەزگاكانی ناوخۆ كاریگەریان هەیە لەسەر رەفتاری دەوڵەت لەڕێگەی دیاریكردنی ئەجێنداو مەبەستو ئامانجە خوازراوەكانی دەوڵەتەوە، كە ئەمەش خۆی لەخۆیدا خاڵێكی پڕبایەخە لەحساباتی ستراتیژی حكومەتدا. (13) لەهەمان كاتدا لیبراڵیستەكان جەخت ئەكەنەوە لەسەر سودو كەڵكی ئازادی بازاڕو بازرگانیو گرنگترین بەشداری بیروباوەڕی لیبراڵەكان لەم بوارەدا بریتییە لەو بیرۆكەیەی كە پێی وایە تەواوی بەشداربوان لەسیستمی ئازادی بازرگانیدا سودمەند ئەبن، واتە لەبازرگانیدا هەموان براوەنو كەس زەرەرمەند نابێت.!! (14)

## تەوەری یەكەم
## جیهانبینی پارادایمی لیبراڵ

### یەكەم: لیبراڵیزم: چەمكو پەرەسەندن:

ووشەی لیبرالیزم بنەڕەتێكی لاتینی هەیەو مانای "مرۆڤی ئازاد" یان "ئازادی تاكە كەس" ئەگەیەنێت. لەڕووی سەرهەڵدان و مێژووی پەرەسەندنەوە بەتوندی بەستراوە بەسەردەمی رۆشنگەرییەوە. سۆسیۆلۆژیستی فەرەنسی "ئەمیل بۆلا" ئەڵێت: ئەم ئایدیۆلۆژیا نوێیەی كە رۆشنگەری پیشانی جیهانی دا كە دژایەتی مەسیحیەت ئەكات لەرێگەی دەرچوون لێی، ناوێكی رەمزیو پڕمانای هەیە، كە ئاخنراوە بەدەلالەتی واقعی سەردەمی رابردوو، ئەویش ناوی لیبراڵیزمە". (15)

بیرمەندانی رۆشنگەری هەنگاوێكی گەورەیان هەڵگرت كاتێك رایانگەیاند كە: مرۆڤی تاك خۆی لەخۆیدا بەهایەكی پڕبایەخەو پێویستە رێزی لێبگیرێت بەدەر لەوەی كە هەڵگری كام ئایین یان ئاینزا یان بیروباوەڕی سیاسییە. هەروەها سەردەمی رۆشنگەری كاریگەرییەكی زۆری هەیەو لەپێكەوە گرێدانی بیرۆكەی "پێشكەوتن" بەمانا كەلتوریو ئەخلاقییەكەی لەگەڵ رێگەكانی كۆنترۆڵكردنی سروشت لەلایەن مرۆڤ و فەراهەمكردنی بۆخزمەت و بەرژەوەندی مرۆڤ. (16)

لیبراڵیزم بیروباوەڕێكە كە هەوڵو گرنگی پێدانی سەرەكی خۆی لەئازادی تاكدا كۆئەكاتەوە، ئازادی بەسەرەتاو كۆتایی، پاڵنەرو ئامانج، بنەڕەتو دەرئەنجام دائەنێت

لــەژیانی مرۆڤــدا. بــەلای لیبرالیــستەکانەوە دەوڵـەت لـە پێنـاو پاراسـتنی تاکـدا دروسـتبووە جا ئەم پاراستنە لەدەستدرێژییەکانی تاکەکان بێـت یـان لـە دوژمنکـاری دەوڵـەتی تـر، بـۆ بــــەدیهێنانی ئـــەو مەبەســــتەش پێویــــستە حکومــــەت هەمیــــشە خزمــــەتگوزاربێت و دامــــەزراوە دیموکراســــیەکانیش ئــــامرازی گــــەرەنتی و جێبــــەجێکردنی ئــــەو ئامــــانج و مەبەستانەن. [17]

بـــە ڕای (د.عبـــدالله العـــروی) لەدرێـــژەی پەرەســـەندنی مێژوویـیــدا لیبرالیـــزم بەچـــوار قۆناغی گرنگدا تێپەڕ بووە، کە بریتین لە: [18]

أ- **قۆناغی دروستبوون:** کە لەو قۆناغەدا بریتـی بـوو لەیـەکێك لـەڕووداوەکانی فەلسەفەی خۆرئاوایی کە جەختی لەچەمکی تاك و خودی مرۆڤ ئەکردەوە.

ب- **قۆناغی کامڵ بوون**: ئەو قۆناغەیە کە سـەرەتای سـەرهەڵدانی زانـستەکانی ئـابوری و سیاسـەتی بەخۆیـەوە بینـی، کـە لـەو قۆناغـەدا جـەختی ئـەکردەوە لەچـەمکی تاکەکەسـی عاقـڵ کە خـاوەنی ژیـان و جەسـتەو بیروهـۆش و کـاری خۆیەتی.

ج- **قۆناغی سەربەخۆیی**: قۆنـاغی پـاش شۆڕشــــی فەرەنــــسایەو لێــــرەدا لیبرالیــــزم بیروباوەڕەکانی ئاراسـتەی دیموکراسـی لـەخۆی دورخستەوە.

د- **قۆنـاغی کـشانەوە**: لـەم قۆناغـەدا لیبرالیـــزم تووشــــی مەترســــی زۆر دەبێتــــەوەو جێبەجێکردنی لەسەر ئەرزی واقع گەلێك قورس ئـەبێت ئەگـەر ئەسـتەمیش نـەبێت، چـونکە بـۆ بـەدیهێنانی پێویـستمان بـە چـەند پێـشەکییەك هەیــە کــە لــە زۆرکــات و شــوێندا لای مــرۆڤ ئامادەییان نییە.

لەســـەر ئـەو بنەمایــەی پێـشوو ئـەتوانرێت بگوترێت کە "لیبرالیزم" خاوەن دوو مانای لێك ئالاَوو بەیەکداچووە، **یەکەمیان فەلسەفەیە** کە لەسـەردەمی ڕۆشـنگەرییەوە پـەرەی سـەندووەو **دووەمیـان ئابوورییـەو** پەیوەسـتە بـەئابووری بازاڕەوە. [19]

بــەڕای پــسپۆڕان بەشــێوەیەکی گــشتی لیبرالیزم بەدوو قۆناغی سەرەکیدا تێپەڕ بووە، کـە بـریتین لـەقۆناغی لیبرالیزمـی کلاسـیکی و قۆنـاغی لیبرالیزمـی نـوێ. ئەمـەش پـاش ئـەوەی کــە لیبرالیزمــی کلاســیکی شکــستی هێنــا لەبـەڕێوەبردنی ئـابوری سـەرمایەداریدا، لـەژێر کاریگــەری قــەیرانی ئــابووری و لەڕوانگــەی هەســــتکردن بەکێــــشەی گۆڕانکارییــــەوە. لیبرالیزمی نوێ شێوازی دووبارە بنیادنانەوەی لیبرالیزمی کلاسیکی لەئەستۆی گرت، لەڕێگەی سوربوون لەسەر ئەوەی کە پێویستە مافەکانی تــاك لەگــەڵ خۆشــگوزەرانی کۆمەڵایەتیــدا بگونجێنرێـت. [20] هـەر بۆیـە پارێزگـاری کـردن لەیەکــسانی لــە فرســەتدا بەڵگــەو بیــانووی لیبرالیــستە نوێیەکانــە بــۆ پارێزگــاریکردن لەخۆشگوزەرانی، جا ئەگەر گروپی کۆمەڵایەتی هـەبێت تووشـی بێبەشـبوون (حرمـان) بووبێـت بــەهۆی بــارودۆخی کۆمەڵایەتییــەوە ئــەوا پێویـستە لەســەر حکومــەت کــە ئــەو حاڵــەتی بێبەشبوونە چارەسەر بکات، لێرەدا زیادبوونی بەرپرســـیاریەتییەکانی حکومــــەت مانــــای کەمکردنـەوەی مافەکانی تـاك ناگەیـەنێت بـەڵکو ئەو مافانە فراوان ئەکات. [21]

## دووەم: جیهانبینی لیبرالیزم بۆ مرۆڤ:

لیبرالیزم خاوەنی کۆمەڵێك گریمانەیە سەبارەت بەسروشتی مرۆیی (الطبیعة البشریة) کە بریتییە لە: [22]

أ- مرۆڤ باشترین دادوەرە بۆ ناسینی بەرژەوەندییەکانی خۆی، بۆیە پێویستە بەئازادی بهێڵرێتەوە بۆ شوێنکەوتنی بەرژەوەندییەکانی خۆی بەبێ دەستێوەردانی دەوڵەت.

ب- مرۆڤ لەبنەڕەتدا عەقڵانییە، ئەمەش خاڵی جیاکەرەوەی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵە.

ج- مرۆڤ بەشێوەیەکی یاسایی مەیلی بەلای چێژوەرگرتندایە، بۆیە هەموو چالاکییەکی ئامانجداری پێویستە بە ئاراستەی بەرژەوەندی تایبەتدا لێکدانەوەی بۆ بکرێت کە بریتییە لە هەوڵدان بۆچێژوەرگرتن.

لێرەوە ئازادی لەفیکری لیبراڵدا پەیوەستە بەعەقڵەوە، لیبراڵیستەکانیش لەعەقڵانیەتی ڕۆشنگەرییەوە باوەڕێکی بەتینیان بە پێشکەوتن بەمیرات بۆماوەتەوەو هەڵگری دیدێکی گەشبینن بەرامبەر بە سروشت و مرۆڤایەتی، هەرچەندە ئەبێت ئەوە بگوترێت کە ئەوان ڕایان وانییە مرۆڤ کامڵ و میسالییە، ئەمەش بەهۆی تێگەیشتنیان لەکاریگەری بەرژەوەندیە تایبەتییەکان بەڵام بەڕای ئەوان هاوسەنگییەکی سروشتی دروست ئەبێت لەژیانی ئابوری و لەنێوان گروپەکاندا، کە ئەمەش ئەبێتە هۆی ئاشتی و پێکەوە گونجان لەنێوان گەلاندا. [23]

لەئاستی نێودەوڵەتیشدا لیبراڵیستەکان باوەڕیان بەمرۆڤی گەردوونی هەیە، باوەڕیان وایە کە مرۆڤدۆستی لەتوانایدا هەیە کە تەواوی ئەو کۆت و بەندانە تێکبشکێنێت کە مرۆڤەکان خۆیان دروستیان کردوون لەبەر هەندێك هۆکاری خۆپەرستانە کە بوونەتە ئاستەنگ لەنێوان مرۆڤایەتیدا. بەڵام لەگەڵ فراوانبوونی ئاسۆکانی بیرکردنەوەو زیادبوونی پەیوەندی و بڵاوبوونەوەی زانیاری و مەعریفەدا، مرۆڤ ئەگاتە ئەو باوەڕەی کە پێویستە ئەو ئاستەنگانە وەلابنرێن چونکە دروستکراون نەك سروشتی. [24]

لەو ڕوانگەیەوە لیبراڵیستەکان ڕایان وایە کە دیاردەی پشتبەستن بەیەکتر (الاعتماد المتبادل) لەنێوان وڵاتانداو لەئاستی جیهاندا دیاردەیەکی هاوتەریب و گونجاوە لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا کە لەبنەڕەتدا مەیلی بەلای هاوکاری و پێکەوە ژیاندا هەیە، هەرچەندە میراتی جەنگەکانیش دۆخی جیهانیان شێواندبێت. لەم باوەڕەشیاندا ئەگەڕێنەوە بۆ بیرۆکەی (دەیڤید هیوم) کە ڕای وایە باوەڕبوون بەسیستم و ئاسایش لەناخ و سروشتی مرۆڤەوە سەرچاوە ئەگرن. [25]

## سێیەم: جیهانبینی لیبرالیزم بۆ سیاسەت:

سەرەتا جیاوازییەکی ڕوون هەیە لەنێوان جیهانبینی لیبراڵ کە جەخت لەسەر تاکەکەس ئەکاتەوە لەلایەك وە جیهانبینی کۆمەڵخوازی (الجماعیة) کە جەخت لەسەر کۆمەڵ ئەکاتەوە، ئەم جیاوازییەش لەتەواوی بوارەکانی زانستە سیاسییەکان و

زانسته کۆمەڵایەتییەکاندا ڕەنگ ئەداتەوە، بەڕادەیەك کاریگەری هەیە لەسەر ئەکتەرەکان و شێوازەکانی نوێنەرایەتی کردن و پێوەرەکانی ڕێکخستنی کاری دەمودەزگاکان و چۆنیەتی دابەشکردنی داهاتەکان.[26]

شایانی ئاماژەیە کە لەگەڵ ئەو جیاوازییەشدا بەڵام تێبینی ئەمە ئەکرێت کە پارادایمی لیبراڵ دیدێکی یەککگرتووی هاودەنگ بۆ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان ناخاتەڕوو، بەڵکو کەمترین شت لەبارەی ئەم پارادایمەوە بگوترێت ئەوەیە کە فرە دیدوبۆچوونە (پلۆڕاڵە)و هەندێك لەپسپۆڕان ئەم پارادایمە بە (پلۆراڵیزم) ناودەبەن بەجۆرێك لەهەندێ مەسەلەدا جیاوازیو بگرە دژایەتیش هەیە لەنێوان ئەوانەی کە سەر بە پارادایمی لیبراڵن ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی ئەو ڕەگو ڕیشانەی کە ژیان ئەبەخشن بەئاراستەکانی پارادایمی لیبراڵ، بۆنمونە جیاوازی نێوان مافی چارەنووس و پشتگیری کردن لە دادپەروەری لەلایەك و پێویست بوونی پارێزگاریکردن لەئارامی و سەقامگیری سیاسی، هەروەها جیاوازی لەنێوان ڕێزگرتن لەبنەمای سەروەری نیشتمانی و مافی دەستێوەردانی مرۆیی، کە ئەم جیاوازییانە هەڵوێستی جیاواز هەڵئەگرێت و هەمووشیان لەچوارچێوەی پارادایمی لیبراڵدا جێگەی ئەبێتەوە بەڵام لەسەر بنەمای پێوەری بەهای جیاواز.[27]

بەپشت بەستن بەئەدەبیاتی پارادایمی لیبراڵ لەبواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانداو بەگەڕانەوە بۆ سەرەتاکانی فیکری لیبراڵی ئەتوانین چەند خاڵێکی هاوبەش سەبارەت بەدیدێکی هاوبەشی لیبراڵ دیاری بکەین بەم شێوەیەی خوارەوە:[28]

أ- سروشتی مرۆڤ لە ناوەڕۆکدا سروشتێکی خێرخوازە، هەر لەبەر ئەو هۆیەشە کە مرۆڤەکان ئەتوانن ئاڵوگۆڕی بەرژەوەندی بکەن لەنێوان یەکتردا.

ب- یەکێك لەبیروباوەڕە بنەڕەتییەکان ڕۆشنگەری لەسەر ئەوە بنیادنراوە کە گرنگیدانی مرۆڤ بەخۆشگوزەرانی خەڵکی تر لەگەڵ خۆشگوزەرانی خۆیدا ئەو بنەمایەیە کە پێشکەوتنی شارستانی دروست ئەکات.

ج- ڕەفتاری خراپ و شەڕەنگێزی لای مرۆڤ لەناخ و سروشتی مرۆڤەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو بەهۆی خراپی دامەزراوەکان و ڕێکخستنە ستوونییە هیرارکیەکانی کۆمەڵگاوە سەرچاوە ئەگرێت کە پاڵنەرێك دروست ئەکەن بۆ مرۆڤ کە بە خۆپەرستی ڕەفتار بکات.

د-جەنگ شتێکی حەتمی و ناچاری نییە، بەپێچەوانەوە ئەتوانرێت کە ڕێژەکانی ڕوودانی جەنگ کەم بکرێتەوە لەڕێگەی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هۆکارو ئەگەرانەی کە جەنگ بەرپا ئەکەن.

هـ- جەنگ و نایەکسانی لەنێوان مرۆڤەکاندا کێشەی نێودەوڵەتین و چارەسەرکردنیان پێویستیان بەهەوڵ و کۆششی دەستەجەمعی هەیەو بەتەنها یەك لایەن چارەسەر ناکرێت.

و- پێویستە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لەشێوەی دامودەزگای بەردەوام و بەهێزدا خۆی ڕێکبخات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی حاڵەتی فەوزاو پشێوی نێودەوڵەتی.

ز- ئەم ئامانجانەی پارادایمی لیبراڵ شتێکی خەیاڵی نین، بەپێچەوانەوە مێژووی مرۆڤایەتی ئەو ڕاستییەی سەلماندووە کە هاوکاری و گۆڕانکاری نێودەوڵەتی نەك هەر ئەتوانرێت ئەنجام بدرێت بەڵکو زیاتر لەوەش ئەم ئامانجانە لەلایەن خەڵکەوە ویستراون و پشتگیری ئەکرێن.

لەلایەکی ترەوەو بەپشت بەستن بەو بنەمایانەی پێشوو پارادایمی لیبراڵ چەند دیدێکی هاوبەشی سەبارەت بەبارودۆخی نێودەوڵەتی پێشکەش دەکات کە گرنگترینیان ئەمانەن: [29]

أ- باشترین ڕێگە بۆ زامنکردنی ئاشتی جیهان بریتیە لە تەشەنەکردنی دامودەزگای دیموکراسی لەسەر ئاستی هەموو جیهان.

ب- "پێکەوە گونجانی بەرژەوەندییەکان" شتێکی ئاساییە لەنێوان دەوڵەتاندا ئەگەر هەموو لایەنەکان بەشێوەیەکی عەقلانی حسابی بەرژەوەندی و زیانەکانی خۆیان بکەن و لەسەر ئەو بنەمایە هەڵوێست و ڕەفتارەکانیان دابڕێژن.

ج- ئەگەر کێشە نێودەوڵەتییەکان ڕوویاندا ئەوا باشترین ڕێگە بریتیە لە پەنابردن بۆ دادگاو ڕێوشوێنی یاسایی کە لەسەر هەموان جێبەجێ ئەکرێت و لەو بوارەشدا سیستمی ئاسایشی بەکۆمەڵ *Collective Security* جێگەی هەوڵی تایبەتی خودی دەوڵەت ئەگرێتەوە.

لەبواری لێکۆڵینەوەی تیۆرییانەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا پارادایمی لیبراڵ ئەتوانێت لێکدانەوەی پێویست پێشکەش بکات سەبارەت بەسێ دیاردەی هاوچەرخ کە پارادایمی ڕیالیزم لێکدانەوەی گونجاوی نیە بۆیان کە بریتین لە: [30]

أ- پارادایمی لیبراڵ لێکدانەوەی تیۆری پێویست ئەخاتە ڕوو سەبارەت بەفرەیی و جیاوازی لەناوەڕۆکی سیاسەتی دەرەوەدا، بەتایبەت سەبارەت بەگۆڕانکاری لەو ئامانجە ڕاستەقینانەی کە دەوڵەتان هاوکاری یان ململانێیان لەسەر ئەکەن.

ب- پارادایمی لیبراڵ ئەتوانێت لێکدانەوەی تیۆریووردتر لە ڕیالیزم پێشکەش بکات سەبارەت بەپەرەسەندن و گۆڕانکاری مێژوویی لەسیستمی نێودەوڵەتیدا.

ج- پارادایمی لیبراڵ لێکدانەوەی تیۆری پێشکەش دەکات لەبارەی تایبەتمەندییەکانی سیاسەتی نێودەوڵەتی هاوچەرخ لەنێوان دەوڵەتە پیشەسازییە دیموکراسییە گەورەکاندا، کە لە بری ململانێ زیاتر هاوکاری و پێکەوەگونجاندنی بەرژەوەندی لەنێوانیاندا باوە. (چەمکی ئاسایشی فرەلایەن)ی "کارل دۆیچ"و "پشت بەستنی هەموو لایەنێ بەیەکتر"ی (ڕۆبەرت کۆهین و جۆزیف نای) باشترین نمونەن لەم بوارەدا.

لەکۆتاییدا لیبراڵیستەکان ڕایان وایە کە ئاشتی و خۆشگوزەرانی و دادپەروەری و هاوکاری لەلایەن کۆمەڵێك هێزەوە ئەنجام ئەدرێت کە پشت بەیەکتر ئەبەستن و ڕوویەکی هاوبەشی پرۆسەکانی نوێگەرین لەکۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا. هەروەها لیبراڵیستەکان ڕایان وایە کە شۆڕشی زانست و شۆڕشە فیکریە لیبراڵەکان پارێزگاری لەگۆڕانکارییە گەورەکانی بواری پەیوەندی نێودەوڵەتی ئەکات. [31] ڕایان وایە کە ئەگەر هەوڵ و بەشداری لیبراڵیستەکان نەبوایە ئەوا ڕۆڵی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی

وەك كۆمەڵەی گەلان و نەتەوەیەكگرتووەكان (*UN*) وەك ئێستا نە ئەبوو لەبواری ئاشتی و ئاسایش و هاوكاری نێودەوڵەتیدا. [32]

## تەوەری دووەم
## چەمكە بنەڕەتییەكانی پارادایمی لیبراڵ

چەمكەكان لەهەر پارادایمێكدا ڕۆڵێكی گرنگ ئەبینن چونكە ئەبن بەئامرازی سەرەكی لەبنیادنانو دارشتنی گریمانەكاندا بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ. بۆیە هەموو پارادایمێك تۆڕێك چەمكی تایبەتو پێكەوە گونجاوی هەیە كە گریمانەكانیان لەسەر بنیاد ئەنرێت و بەڵگەشن لەسەر متمانە و توانای ئەو پارادایمە.

بەمەبەستی ڕوونكردنەوەی چەمكە بنەڕەتییەكانی پارادایمی لیبراڵ بەشێوەیەكی بنەڕەتی ئەگەڕێینەوە بۆ هەوڵەكانی "جۆزیف نای" لەو بوارەدا چونكە ڕوونترو پێكەوە گونجاوترن.

### یەكەم: چەمكی نەرمە هێز *Soft Power*

"جۆزێف نای" ڕای وایە كە هێز وەك خۆشەویستی وایە لەوەدا كە ئاسانترە بەلای مرۆڤەوە پێی هەستێت نەك باسی بكات یان پێوانەی بكات، یان هێز لەسیاسەتی نێودەوڵەتیدا وەك كەش و هەوا وایە، هەموو لایەك باسی ئەكەن بەڵام كەمینەیەك بەباشی لێی تێئەگەن، هەروەك چۆن زانایانی كەشوهەواو جوتیارو كشتیارەكان هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدان كە پێشبینی باوباران و گەردەلول بكەن، ئاواش سیاسەتمەدارانو پسپۆڕان لەهەوڵی ئەوەدان كە لە دینامیكیەتو میكانیزمە سەرەكییەكانی گۆڕان و دابەشبوونی هێز تێبگەن لەنێوان دەوڵەتاندا. [33]

هەردوو هێزی سەربازی و ئابوری نمونەی (ڕەقە هێزی/القوة الصلبة/ ***Hard pour***) كە ئەتوانرێت لەپرۆسەی باوەڕپێكردن و هەڕەشەكردندا (گێزەرو تێلاً، العصا والجزرة) بەكاربهێنرێت. بەڵام ڕێگەیەكی تری ناڕاستەوخۆ هەیە بۆ پیادەكردنو بەكارهێنانی هێز لەلایەن دەوڵەتەوە كە بەهۆیەوە دەوڵەت ئەتوانێت هەمان ئەو دەستكەوتانەی دەست بكەوێت كە بەهۆی بەكارهێنانی ڕاستەوخۆی هێزەوە دەستی ئەكەوێت، بەڵام لەم حاڵەتەدا هۆكارەكە جیاوازە چونكە دەوڵەتانی تر بەهۆی سەرسامبوونیان بەنمونەو بەهاكانی ئەم دەوڵەتەوە ئەكەونە ژێر كاریگەرییەوەو ئەیانەوێت بگەنە هەمان ئاستی پێشكەوتن و خۆشگوزەرانی ئەم دەوڵەتە، ئەم هێزە ناڕاستەوخۆیەو وائەكات كە دەوڵەتانی تر ئەو كارەبكەن كە ئەتەوێت بەبێ ئەوەی پەنا بەریت بۆهێزی ڕاستەوخۆ بۆ ناچاركردنیان بەڵكو خۆیان بەویستی خۆیان ئەو كارە ئەكەن ئەم هێزەش پێی ئەوترێت "نەرمەهێز ***soft power***". [34]

ڕەگەزە پێكهێنەرەكانی "نەرمەهێز" زیاتر لایەنی مەعنەوی و نامادی لەخۆ ئەگرێت، وەك كەلتورو ئایدیاو بەهێزی دامودەزگاكان. بەپێچەوانەی "ڕەقەهێز" كە پشت بەئامرازە مادییەكان ئەبەستێت. [35]

ئەتوانرێت بگوترێت کە "نەرمەهێز" جەخت لەسەر ئەوە ئەکاتەوە کە دەوڵەت بتوانێت ئەجێنداکان بەشێوەیەك دابڕێژێت کەزیاتر دەربڕی ویست و ئامانجە خوازراوەکانی ئەوانی تر بێت، توانای سەلماندنی ئەم ویستانەش پابەندە بەسەرچاوەکانی ئەم هێزە لەکەلتوورو ئایدیاو دامەزراوەکان.[36] ئەم توانایەش بەندە بە هێنانەکایەی دۆخێك کە دەوڵەتانی تر ئامانجەکانیان و بەرژەوەندییەکانیان بەشێوەیەك ڕێکبخەن کە لەگەڵ ئەجێنداو بەرژەوەندی ئەم دەوڵەتانەدا هاوتەریب و گونجاوبێت.

## دووەم: دووبارە پێداچوونەوەی چەمکی بەرژەوەندی نیشتمانی:

ڕیالیستەکان ڕایان وایە کە پێگەو هێزی دەوڵەت لەبارودۆخی نێودەوڵەتیدا بەرژەوەندییە نیشتمانییەکانی دەوڵەت دیاری ئەکاتو پێشبینی جۆری سیاسەتی دەرەوەی ئەو دەوڵەتە دیاری ئەکات. بەڵام لیبراڵیستەکان ڕایان وایە کە بەرژەوەندییە نیشتمانییەکانی دەوڵەت بەشێوەیەکی فراوانترو هەمەلایەنتر لەوە دیاری ئەکرێت و هۆکارە ناوخۆییەکانیش کاریگەرییان هەیەو بگرە پێناسەکردنی بەژەوەندییە نیشتمانییەکانی پەیوەستە بەجۆری سیستمی سیاسی ناوخۆیی دەوڵەتەوە، بۆنمونە ئەگەر کۆمەڵگایەك گرنگی زۆر بەئاسودەیی ئابوری و بازرگانی بدات و جەنگی لەگەڵ دەوڵەتێکی دیموکراتخوازدا بەکارێکی ناشەرعی بزانێت، بێگومان ئەم کۆمەڵگایە بەشێوەیەکی جیاواز پێناسەی بەرژەوەندییە نیشتمانییەکانی خۆی ئەکات لەو کۆمەڵگایەی کە ستەمکارێك حوکمی ئەکاتو خاوەن پێگەیەکی ڕێزلێگیراویش نییە لەکۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا. بەڕای لیبراڵیستەکان ئەم دیدەی ئەوان ڕوونترو کاریگەرتر ئەبێت کاتێك سیستمی هەرێمی یان نێودەوڵەتی زیاتر کرانەوەو میانەڕەوی بەخۆیەوە ببینێتو دوور بێت لەفەوزاو پشێوی، وە ئەگەر دامەزراوەکانو کەناڵەکانی میدیاو کۆمۆنیکەیشنی گونجاو لەبارەی ئاشتییەکی بەردەوامو سەقامگیری سیاسی پێشکەش بکەن ئەوا هاوکاری نێودەوڵەتی زیاتر ئەبێت بەواقع.[37]

لێرەوە بەپێچەوانەی ڕیالیستەکانەوە کە وەك شتێکی چەسپاوو بەڵگەنەویست تەماشای بەرژەوەندی نیشتمانی ئەکەن، لیبراڵیستەکان ڕایان وایە دیاردەی پشت بەستن بەیەکترو دەزگا نێودەوڵەتییەکان بەڕاستەوخۆ کاریگەرییان هەیە لەسەر دیاریکردنی چەمکی بەرژەوەندیو ئەگەری گۆڕانکاری لەو بەرژەوەندییانەدا.[38]

بەگوێرەی گریمانەکانی پارادایمی لیبراڵ لەسیستمە دیموکراسییەکاندا بەرژەوەندی نیشتمانی لەلایەن خەڵکەوە تاوتوێ ئەکرێت و ڕای لەسەر ئەدرێت و حکومەتیش ڕای خەڵك و ویستی خەڵك بەهەند وەرئەگرێت، بۆیە ئەگونجێت لەو سیستمانەدا ڕێزگرتن لەمافی مرۆڤ و دیموکراسی بە بەرژەوەندی دابنرێت یان بەرژەوەندییە نیشتمانییەکان لەگەڵ ژمارەیەك بەرژەوەندی جیهانی فراواندا پێکەوە گرێبدرێت، بۆنمونە مەترسی تیرۆر لەکۆتاییدا ئەبێت بەمەترسی بۆ هەموو کۆمەڵگاکان، یان

بازرگانی جیهانی ئەگونجێت سودی بۆ ئێمەو بۆ دەوڵەتانی تریش هەبێت، هەروەها چۆن ئەگونجێت گەرمبوونی زەوی ئاستی دەریاکان لەهەموو کەناری دەریاو زەریاکان بەرز ئەکاتەوەو تەواوی ئەو وولاَتانە زیانیان لێئەکەوێت، هەروەها هەندێك نەخۆشی تەشەنەکەر (معدي) ڕەنگە بگاتە تەواوی بەشەکانی جیهان لەڕێگەی فڕۆکەو کەشتییەوە، یان نائارامی و ناجێگیری ئابوری ڕەنگە زیان بگەیەنێت بەئابووری جیهانی بەگشتی، بۆیە ئەم مەترسییانە کاریگەرییان لەسەر بەرژەوەندی هەموو دەوڵەتان هەیە. [39]

### سێیەم: پشت بەستنی هەمەلایەنە بەیەکتر، الأعتماد المتبادل، *Interdependence*

ئەم دیاردەیە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی سیستمی سیاسی نێودەوڵەتی هاوچەرخ، هەرچەندە لە قۆناغە مێژووییەکانی ڕابردوودا دیاردەیەکی سنوردار بوو، بەلاَم بەهۆی پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆژیا و گەشەکردن و فراوانبوونی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و کەناڵەکانی کۆمۆنیکەیشن و گۆڕانکاری ئابوری جیهانیدا ئەم دیاردەیە بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش پەرەی سەندووە کە هاوشێوەی لەمێژوودا نەبووە. ئەم حاڵەتەش بەگشتی مەیلێك لای دەوڵەتانی جیهان دروست ئەکات کە هەوڵی پڕکردنەوەی بۆشاییەکان و تێرکردنی پێداویستییەکانی خۆیان بدەن لەڕێگەی بەشداری چالاك لەم دۆخە نوێیەدا، بەشێوەیەك کە تێبینی ئەکرێت بەردەوام ئەم حاڵەتە لەفراوانبووندایە. [40]

ئەوەی جێگەی سەرنجە کە ووشەی (پشت بەستنی هەمەلایەن بەیەکتر) بەشێوەیەکی تاڕادەیەك تەمومژاوی بەکارئەهێنرێت وەك ئەو ووشانەی تر کە زیاد لە مانایەك هەڵئەگرن وەك نەتەوایەتی، ئیمپریالیزم. بەلاَم لەئاستی شیکاریدا ئەم زاراوەیە زیاتر ئاماژەیە بۆ هەڵوێستێك کە کەسانێك یان ڕووداوگەلێك کاریگەرییان ئەبێت لەسەر یەکترو لەسەر بەشە پێکهێنەرەکانی سیستمێکی دیاریکراو. یان ڕوونتر ئەو ووشەیە واتە پشتبەستنی هاوبەش بەیەکترو هەڵوێستێکە مەرج نییە خۆی لەخۆیدا باش یان خراپ بێت بەڵکو تەواوی پرۆسەکە لەسەر ڕێژەی پشتبەستن و جۆرو مەبەستی پشتبەستنەکەوە وەستاوە. [41]

لەلایەکی ترەوە پشتبەستن بەیەکتر مانای ئەوە ئەگەیەنێت کە تاچەند دەوڵەت دووچاری کاریگەریی و فشاری ئابووری دەرەکی دەبێت، واتە ئاستی کاروباری ئابووری لە وولاَتێکدا تەنها لەسەر ئەوە ناوەستێت کەئەو دەوڵەتە چۆن لەناوخۆی خۆیدا کاروباری ئابووری خۆی ڕێکدەخات و بڕیارەکانی دەرئەکات، بەڵکو لە سیستمی ئابووری نێودەوڵەتییدا لایەنە بەشدارەکان کاریگەرییان لەسەر یەکتر هەیەو تەواوی سیستمەکەش کاریگەری لەسەر لایەنەکانی هەیە. هەروەها مەرج نییە کە کاریگەری یان فشاری دەرەکی هەمیشە لایەنی نیگەتیڤ و خراپ بەجێ بهێڵێت، بەڵکو زیاد لەوە زۆرجار کاریگەرییەکان پۆزەتیڤ و باش دەبن بۆ ئابووری وولاَت بەگشتی و دەرگای نوێ والاَ دەکەن لەبەردەم ئابووری وولاَتدا بەتایبەت کاتێك پەیوەندی بە بەرزبوونەوەی ڕێژەی

گەشـــەکردن و نزمکردنـــەوەی ڕێـــژەکانی هەڵئاوسانەوە هەبێت.[42]

لـە لێکۆڵینـەوە هاوچـەرخەکاندا هـەوڵ و گرنگیپێـدانی پـسپۆڕان زیـاتر جـەخت لەسـەر بوارەکـانی ئـابووری تایبـەت بەسـامان و هۆیـەکانی خۆشـگوزەرانی و داهـات ئەکەنـەوە لـەبری بابەتـەکانی ئاسـایش. چـونکە ڕادەی پێکەوەبەستران و تێکەڵاوبوون و پشت بەیـەکتر بەسـتن بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ زیـاد ئـەبێت لەگـەڵ بەرزبوونـەوەی بەپیـشەسازیکردن ونوێگـەری لـە وڵاتـدا. هەربۆیـە ئاسـتی پێکەوەبەسـتران بـەرز ئەبێتـەوەو "فیـدباك *Feedback*"ێکی ئاڵۆز دروست ئـەبێت لـەنێوان هەنـدێك ئامـانجی ئـابووری و دەرئەنجامـەکانی پرۆسەی پێکەوە بەستراندا. سیستمی بازرگانی جیهـانیش تاڕادەیـەکی بـاش نموونەیـەکی گونجـاوە بـۆ ئـەم حاڵەتـە چـونکە تاڕێـژەی بازرگـانی دەرەکـی بـەرزتر بێتـەوە لەڕێـژەی داهـاتی نـاوخۆیی وڵات ئـەوا پلـەو ئاسـتی پـشتبەستن بـەبازرگانی دەرەکـی زیاتر ئەبێت.[43]

## تەوەری سێیەم
## گریمانەکانی پارادایمی لیبراڵ

**"گریمانە"** لە دەلالەتی میتۆدۆلۆژیدا مانای وەڵامێکی گریمانەکراو ئەبەخشێت، واتە کاتێك توێژەر چاودێری دیاردەیەك ئەکات چاوەڕوانی ئەوە ئەکات کە لەئەنجامدا بگاتە ڕاستییەك کە واقعـی ئـەو دیاردەیـەی پـێ لێکبداتـەوە، ئـەم ڕاستییە چاوەڕوانکراوە بریتییە لە**"گریمانە"**.

هـەر پارادایمێك کۆمـەڵێك گریمانـەی تیـۆری هەیـە کـە بەشـێوەیەکی لـۆژیکی پێکـەوە بەستراون و ئەتوانرێت بە "ئەرێ" یان "نەرێ" ئـەزموون بکـرێن و بـسەلمێنرێن. پـارادایمی لیـبراڵ ژمارەیـەك گریمانـەی تیـۆری هەیـە کـە ئەتوانرێت بەمشێوەیە پۆلێن بکرێن:

### یەکەم: ئـەو گریمانانـەی کـە پەیوەنـدیان هەیە بە ئەکتەرە نێودەوڵەتییەکانەوە:

بـەپێی ئـەدەبیاتی تەقلیـدی قوتابخانـەی ریـالیزم، دەوڵـەت بریتییـە لـە تاکـە ئەکتـەری سیاسـەتی نێودەوڵـەتی، بـەڵام ئـەم گریمانەیـەی ڕیالیـستەکان لەلایـەن پـسپۆڕانەوە بەتایبـەت لەلایـەن لیبراڵیـستەکانەوە ڕەخنـەی زۆری لێگیراوە. چونکە لەلایەکەوە دەوڵـەت وەك تاکـە یەکەیـەکی یـەکگرتوو کارناکـات بـەڵکو لـەبری ئەوە کۆمەڵێك بەرژەوەندی جیاوازو هەندێکجار دژ بەیەکیش هەن کە کاریگەرن لە دروستکردنی سیاسـەتی دەرەوەداو دابەشـبوون بەسـەر سـەنتەرەکانی بیرۆکراتییـەت و گرووپـەکانی بەرژەوەنـدی و فـشارو دامـەزراوە میدیاییەکان و..هتد.[44]

لەلایـەکی تریـشەوە پێناسـەی ئەکتـەری نێودەوڵـەتی گـۆڕانی بەسـەردا هـاتووەو بەتـەنها دەوڵـەت ناگرێتـەوە بـەڵکو هـەموو ئەوانـەی کـە بڕیارەکانیان کاریگـەرییان هەیە لەسـەر داهات و بـەهاکان و ئـەتوانن لـەدەرەوەی سـنوور کاریگـەرییان هـەبێت لەسـەر یـەکتر، بـەگوێرەی ئەم تێگەیشتنە نوێیـەش ئێستا لـە بارودۆخی نێودەوڵەتیـدا چـەندین هێـزی تـر هاوشـانی دەوڵەت دروستبوون و کاریگەرییان هەیە لەسەر

ئاکامەکانی سیاسەتی نێودەوڵەتی، لەگرنگترین ئەو هێزانەش:

## 1-ڕێکخــــراوە نێودەوڵەتیـــــە حکــــومی و ناحکومەییەکان:

لەدیدگای لیبراڵیستەکانەوە پێویستە لەسەر ئەو کەسانەی کە شیکردنەوەو لێکدانەوە بۆ سیاســەتە جیهانییــەکان ئەکــەن بەشــێوەیەك لــەجیهان بــڕوانن کــە لــەژێر ســێبەری تــۆڕێکی گەورەو ئاڵۆزی ڕێکخـراوە جیهانییەکاندایـە کـە لــــە بــــوارە جیاوازەکانــــدا تایبەتمەنــــدییان وەرگرتــووەو هەریەکـەیان خزمـەت بـەئامانجێکی دیاریکراو ئەکەن لەپێناو پێشکەوتنی مرۆیی و هاوسـەنگدا لەئاسـتەکانی ئاشـتی و ئاسـایش و ئـــابووری و خۆشـــگوزەرانی و پێکگەیـــشتنی کەلتوری و پێکەوە گونجان و یەکتر تەواوکردنی بەها مرۆییەکاندا. [45]

بـەم مانایـەش ڕێکخـراوە نێودەوڵەتییـەکان بـریتین لەچەند بونیادێکی دامەزراوەیی فـەرمی کـــە ســـنوورە نیـــشتمانییەکانی دەوڵـــەتان تێئەپەڕێنن و بەپێی ڕێکەوتننامەیەکی فرەلایەن دروست ئەکرێن. ئەم ڕێکخراوانـە دابـەش ئـەبن بۆ دووجۆری سەرەکی: جۆرێکی گشتی ***Public*** کــە بــەڕێکخراوە نێودەوڵەتییــە حکومیــەکان ناودەبرێـت، جـۆرێکی تایبـەت ***Private*** لەبـە ڕێکخـراوە نێودەوڵەتییـە ناحکومیـەکان نـاوزەد دەکرێت. [46]

ڕێکخـراوە نێودەوڵەتیـەکان ئـەرك و فـەرمانی تایبەتمەندو جیاواز لەناوەڕۆکدا ئەنجام ئەدەن کە ڕەهەندێکی نێودەوڵـەتیان هـەبێت، هەربۆیـە لەلایەکـەوە بەیـەکێك لـەئامرازەکانی کـۆنترۆڵ و خۆگونجانـــدن دائـــەنرێت بـــۆ حاڵەتـــەکانی نائارامی و پشێوی کە لەسیستمی نێودەوڵەتیدا ڕوو ئـــەدەن و لایەنـــەکان هـــان ئـــەدەن بـــۆ گرتنەبـەری ڕەفتـاری ململانـێ ئـامێز. لەلایـەکی تریـــشەوە هۆکـــارێکی گونجـــاون بـــۆ پاڵپـــشتی کـــردن و چەســـپاندنی سیاســـەت و چـــالاکی هاریکارییانە لە بوارەکانی ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و کەلتووریدا. [47]

لێـرەدا پێویـستە جیـاوازی بکرێـت لـەنێوان دوو ئـەرکی جیـاوازدا کـە ڕێکخراوەکـان پێـی هەڵئەسـتن، ئـەوانیش هاوکـاری و تـەواوکارین، چـونکە ئـەو ڕێکخراوانـەی کـە تـەنها ئـەرکی هاوکاری جێبەجێ ئەکەن، تـەنها مامەڵـە لەگـەڵ دەوڵەتانــدا ئەکــەن و هەوڵئــەدەن دەوڵــەتان هانبــدەن بــۆ ڕێکخــستن و هەماهــەنگی لــە سیاسەت و ڕەفتارەکانیاندا، ئەمە لەکاتێکدا ئەو ڕێکخراوانەی کە بە ئەرکی تەواوکاری هەڵئەستن چوارچـــێوەی هەماهـــەنگی و گونجانـــدن تێئەپـەڕێنن و لـەبری دەوڵـەتانی ئەندام هەنـدێك ئـەرك و فـەرمان ئـەنجام ئـەدەن، وەك دانوسـتان کـردن لـەبری ئەندامان لەگـەڵ ئەوانی تردا، یـان هەڵسان بەهەندێك ئەرکی نێودەوڵـەتی بنـەڕەتی وەك یاسادانان و دادوەری کردن. [48]

ڕێکخـــراوە نێودەوڵەتییـــە ناحکومیـــەکان (***INGO***) بریتین لەو ڕێکخراوە ناحکومیانەی کە ســـنوورەکانی دەوڵـــەتان تێئەپـــەڕێنن و بـــەبێ ئـــەوەی مەبەســـتیان بەدەســـتهێنانی قـــازانج و بەرژەوەنـــدی مـــادی بێـــت. لێـــرەوە چـــالاکی دامەزراوەیی ناحکومی دوو خاسیەتی بەرچاوی هەیـە کـە بـریتین لـە ئـازادی بڕیـارو کـاری خۆبەخـــشی. لەبـــەر ئـــەوە زۆرینـــەی ئـــەم

ڕێکخراوانە ناسیاسین، بەڵکو لەشێوەی چەند گروپێکی دیاریکراودان. بەڵام ئەگونجێت هەنگاو بنێن بەرەو سیاسەت هەرکاتێك هەل و پێویستی هەبێت. [(49)]

لێرەوە (*NGO*)کان پەراوێزێکی فراوانی جوڵەیان هەیە لەڕێگەی چەندین چالاکی هەمەچەشنەوە، وەئەم خاسیەتەیە کە توانای ئەوەی پێدەبەخشێت کاریگەریی هەبێت لەسەر شێوازەکانی کارلێککردنە نێودەوڵەتییەکان بەهۆی دروستکردنی فشار لەسەر دروستکەری بڕیار یان ناچارکردنیان بەوەی کە وەڵامدانەوەیان هەبێت بۆ ئامانجەکانی ڕێکخراوەکان. [(50)]

ئەوەی جێگەی ئاماژەیە لێرەدا ئەوەیە کە لەنێوان ڕەوتە لیبراڵەکاندا جیاوازی هەیە سەبارەت بە ووردەکاری ڕۆڵ و کاریگەری ڕێکخراوە نێودەڵەتییەکان، بۆ نمونە ڕەوتی **لیبراڵی نێودەوڵەتی** ڕای وایە کە بەرژەوەندی نێوان دەوڵەتان پێکەوە گونجاون و ئەتوانرێت حکومەتێکی جیهانی دروست بکرێت، ڕەوتی **ئایدیالیزمی نوێ** بانگەشەی ئەوە ئەکات کە چاکسازی لەڕێکخراوەکانی نێودەوڵەتیدا بکرێت بەتایبەتی (*UN*)، لەکاتێکدا ڕەوتی **لیبراڵیزمی دامەزراوەیی نوێ** ڕای وایە کە ڕۆڵی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان بریتییە لەڕێکخستنی بەرژەوەندییەکان و ناتوانرێت هاوکاری لەخۆوە دروست بکرێت بەبێ پلاندانان. [(51)]

**2- هێزە سەروو نەتەوەییەکان:**

کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان بەیەکێك لەو ئەکتەرە نوێیە گرنگانە دائەنرێت کە لەسەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتی دەرکەوتووەو بەیەکێك لەئاستەنگەکانی بەردەم دەوڵەت دائەنرێت لەڕووی ئابوورییەوە. ئەم کۆمپانیایانە خاوەن هێزو نفوزن لە پەیوەندییەکانیاندا لەگەڵ دەوڵەتاندا، ئەم دۆخەش وادەکات کە زۆربەی دەوڵەتان توانای ئەوەیان نەبێت کە کۆنترۆڵی چالاکییەکانیان بکەن. بۆنموونە بازاڕەکانی دراوی جیهانی خاوەنی پلەیەکی بەرزی سەربەخۆیین کە دەتوانن سزای دەوڵەتان بدەن یان پاداشتیان بکەن لەڕێگەی وەبەرهێنانی دەرەکییەوە. [(52)]

لەڕاستیدا کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان (*MNC*) دیارترین دیاردەکانی پەرەسەندنی ئابووری جیهانن، لەسەدەی بیستەمدا. ئەم کۆمپانیایانە پرۆسەی بەرهەمهێنان بەڕێوەدەبەن لەزیاد لەدەوڵەتێکداو، پرۆژەکانی وەبەرهێنانیان لەچەندین دەوڵەتدا بلاودەکەنەوەو لە ڕێگەی تۆڕێکی فراوانی پەیوەندیکردنەوە پێکەوە بەستراون و چەندین ئەرك بەجێ ئەهێنن، هەر لەبواری توێژینەوەو پەرەپێدانەوە تابەرهەمهێنان و بازاڕ پەیداکردن. [(53)] کرانەوەی وولاتان هەلی ئەوەیان پێئەبەخشێت کە توێژینەوەکانیان لە وولاتێکدا ئەنجام بدەن و، شتومەکەکانیان لە ولاتێکی تردا دروست بکەن و، لە ولاتێکی سێیەمدا کۆیان بکەنەوەو، کالاکانیان لە ولاتی چوارەمدا بفرۆشن و، قازانجەکانیان لەبانکەکانی ولاتی پێنجەمدا هەڵبگرن و .. هتد. وە هەروەها ئەتوانێت پرۆسەکانی یەکگرتنی نێوان کۆمپانیاکان لەدەیەها دەوڵەتدا ئەنجام بدات. [(54)]

هەرچەندە ئەم کۆمپانیایانە هێزی سەربازییان نییە، بەلآم خاوەنی توانایەکی ئابوری زەبەلاحن. بۆنموونە فرۆشراوی ساڵانەی (10) کۆمپانیای فرەڕەگەز زیاترە لەکۆی داهاتی نیشتمانی نزیکەی (80)دەوڵە لە وولاّتانی جیهان. بەرهەمی ساڵانەی کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان زیاترە لەقیمەتی بازرگانی جیهانی. کۆی فرۆشراوی ساڵانەی (12) کۆمپانیا لەمانە زیاترە لە کۆی داهاتی نیشتمانی نزیکەی نیوەی هەموو وولاّتانی جیهان. فرۆشراوەکانی کۆمپانیای(*I.B.M*) بەرزترە لە داهاتی نیشتمانی کۆمەڵێك دەوڵەتی وەك: نەرویج، بەلجیکا، یۆنان و تورکیا. وەقازانجی ساڵانەی کۆمپانیای (شێل) زیاترە لە بودجەی ساڵانەی هەندێك دەوڵەتی وەك: فلیپین، پیرۆو یوگسلاڤیای جاران.[55]

ئاشکرایە کە ئەم کۆمپانیایانە بەشێوەیەکی یەکسان دابەش نەبوون بەسەر جیهاندا، بۆنموونە لە (100) گەورەترین کۆمپانیا لەجیهاندا (59)یان ئەکەونە ئەمریکا، (31)یان بەر ئەورووپا ئەکەون، (7)یان یابانییە. وەلەنێوان (500) گەورەترین کۆمپانیای جیهانیدا کە (فاینەنشاڵ تایمز) پۆلێنی کردوون لە لیستێکدا، (219)یان ئەمریکی و، (158)یان ئەوروپی و، (77)یان یابانین.[56]

گرنگی و بایەخی ڕۆڵی ئەم کۆمپانیایانە لە سیستمی نێودەوڵەتیدا لەوەدا بەرجەستە ئەبێت کە چالاکییەکانی چڕن و ئامرازەکان و کارلێکردنەکانیان هەمەلایەنن.[57]

(جۆزیف نای) هەندێك لە چالاکییە سیاسییەکانی ئەم کۆمپانیایانە ڕوون ئەکاتەوەو جیاوازی ئەکات لەنێوان:

أ- ڕۆڵێکی سیاسی ڕاستەوخۆ کە بە سیاسەتی دەرەوەی تایبەت ناوزەدی ئەکات.

ب- ڕۆڵی سیاسی ناڕاستەوخۆ، کە لەوەدا دەرئەکەوێت کە حکومەتەکانیان هەوڵی بەکارهێنانی ئەم کۆمپانیایانە ئەدەن بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان.

ج- ڕۆڵی ئەم کۆمپانیایانە لەدیاریکردنی لیستی بابەت و مەسەلەکانی سیاسەتی دەرەوە. هەروەها بەشێوەیەکی گشتی ئەم کۆمپانیا فرەڕەگەزانە ڕۆڵێکی گەورە دەبینن لەکێشە ئابوریە نێودەوڵەتییەکاندا کە جێگەی گرنگی پێدانی دەوڵەتە پێشکەوتووەکانە.[58]

جێگەی ئاماژەیە کە چالاکییەکانی ئەم کۆمپانیایانە تەنها لە وولاّتە تازە پێگەیشتووەکاندا نییە، بەڵکو چالاکییەکانی لەدەوڵەتە پیشەسازییە گەورەکانیشدا پەرەپێ ئەدات و فراوانتری ئەکات، بۆنموونە کۆمپانیا ئەمریکییە زەبەلاحەکان خاوەنی نزیکەی (50٪)ی تەواوی سەرمایەی پیشەسازی وولاّتی (کەنەدا)ن، هەر لەبەر ئەمەش ئەگوترێت کە (بڕیارە ئابورییەکانی کەنەدا لەشارە ئەمریکییەکانەوە دەرئەکرێت).[59]

| ئەکتەرەکان / پێوەرەکان | حکومەتی وڵاتێکی مامناوەندی | یەکێتی ئەوروپا | کۆمپانیای General Motors | ڕێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستین | پاپای فاتیکا |
|---|---|---|---|---|---|
| ئامانجەکان | بەرژەوەندی کۆمەڵەکە (فراوان و فرەلایەن) | بەرژەوەندییە نیشتمانیەکان (فراوان و فرەلایەن) | بەرژەوەندی بازرگانی ئاڵۆز (بەدەستهێنانی قازانج) | بەدەستهێنانی رزگاری نیشتمانی | ئاینی و مرۆیی (گشتی وديارىكراو) |
| کارلێکردن | بەردەوام، فراوان، دامەزراوەیی | بەردەوام، فراوان جەختکردنەوە لەسەر مەسەلە ئەوروپییەکان | بەردەوام،ناسیاسی | بەردەوام، هەرێمی سیاسی وسەربازی | بەردەوام و چڕوپڕ |
| بونیادو تواناکان | حکومەتێکی نیشتمانی، دەسەلاتی وڵات بەگوێرەی پابەندی جیهانی | بونیادێکی بیرۆکراتی و سیاسی بەپاڵپشتی حکومەتەکانی وڵاتە ئەندامەکان | بیرۆکراتی پیشەسازی تەکنیکی وکارگێڕی جیهان | حکومەتێکی سنوردار، پشتیوانی دۆستان،شارەزای لەبواری سەربازیدا | کێشەی کاسۆلیکی، پشتیوانی چەندین لایەنی جیاواز |
| ئاستی بەشداری | حکومەتێکی نیشتمانی چالاکی لەدەرەوەی سنور | دەسەلاتی حکومی فرەلایەن و تێپەڕێنەری سنور | تێپەڕێنەری سنور، هەندێکجار هەرێمی و لۆکاڵی | پەیوەندی بەحکومەتەکان، چالاکی دیبلۆماسی | تێپەڕێنەری نەتەوەکان لۆکاڵی،ئاستی تاکە کەس |

خشتەی(1) بەراوورد ئەکات لە نێوان ژمارەیەك لە ئەکتەرە نێودەوڵەتییەکاندا بە چەند پێوەرێك:

## دووەم: ئەو گریمانانەی کە پەیوەستن بە سروشتی سیاسەتی نێودەوڵەتییەوە:

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە سیستمی هاوسەنگی نێوان زلهێزان بە چەند پرۆسەیەکی بە پیشەسازیکردن و بە شارستانیکردندا تێپەڕبوو کە بەشداریکردنێکی فراوانی جەماوەری لەبواری سیاسیدا بەدوای خۆیدا هێنایە کایەوە. ئەمانەش ڕایەڵەیەکی بەهێزتری لەنێوان دەوڵەت و کۆمەڵگاکاندا دروستکرد. لە ئاکامی ئەوەش ئەکتەرە نوێیەکانی بواری سیاسەت چیتر نەیانئەتوانی لە بۆشاییەکی سیاسیدا کاربکەن بەبێ ئەوەی ڕەفتارەکانیان سنووردار بکرێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە بە شێوەیەکی فراوان کەوتنە ژێر کاریگەری ئەو گروپانەی کە بە ئاراستەیەکی بەرهەڵستکاری ئامانجە حکومییەکان تێئەکۆشان.[60]

ئەم پرۆسەیەش بە درێژایی سەدەی بیستەم بەردەوامبوو بەتایبەت لە نیوەی دووەمیدا و لە پاش جەنگی جیهانی دووەم زیاتریش پەرەیسەند. لێرەدا ڕەنگە ئەو ووتەیەی (هێنری کێسنجەر) لە پەنجاکاندا کە دەڵێت: (لەڕاستیدا شێوازە جیهانییە کۆنەکان هەرەسدێنن، ئێمە ئەمڕۆ لە جیهانێکدا ئەژین کە لە ڕووی ئابووری و پەیوەندییەکان و خۆزگە و ئاواتەکانی مرۆڤەوە بە توندی پێکەوە بەستراوە).[61] ئەم دانپێدانانە لەلایەن یەکێك لە ڕیالیستە ناودارەکانەوە گەواهیدانە لەسەر ئەوەی کە چیتر جیهان وەك خۆی نەماوە و پەرەسەندنەکانی بواری تەکنەلۆژیا و کۆمۆنیکەیشن و گواستنەوە گۆڕانکاری شۆڕش ئاسایان لە بواری ئابووری و سیسەتدا دروستکردووە.

پێشتر خەڵك ووتەکەی (ماوتسی تۆنگ)یان ئەگوتەوە: (هێز لەڕێگەی لوولەی تفەنگەکانەوە گەشەئەکات). بەڵام لە پاش قەیرانی پترۆڵی ساڵی (1973)، هەموو جیهان بینیان کە (هێز لە ڕێگەی بەرمیلێك نەوتیشەوە گەشەئەکات). تەنانەت هەندێك لە ڕیالیستەکان خۆیان زیادەڕۆییان کرد لەوەی ئەم قەیرانەیان بە قەیرانی ساڵانی (1914، 1939) بەراوورد ئەکرد، بۆ نموونە (مۆرگانتاو) ڕای وابوو کە (ئەم قەیرانە هاوشێوەی نەبووە لە مێژوودا، چونکە زۆر بە ڕوونی سنووری نێوان هێزی سەربازی و هێزی ئابووری جیاکردەوە).[62]

قەیرانی پترۆڵ پرسیارێکی گرنگی ووروژاند: بۆچی دەوڵەتە زلهێزەکانی جیهان دەستەوسان بوون لەبەردەم گواستنەوەی سەدان ملیار دۆلار بۆ

دەوڵەتە لاوازەکان، بەبێ ئەوەی بتوانن بەهۆی هێزی سەربازییەوە شتێك بکەن؟

لەپاش کۆتایی ئەم قەیرانەو پەرەسەندنەکانی دواتری بەشێك لە توێژەران بەتوندی ئەم ڕایەیان وروژاند کە ئەو دەوڵەتی نەتەوەیەی کە نزیکەی چوار سەدەیە باڵادەستە بەسەر سیاسەتی نێودەوڵەتیدا ئێستا ڕۆڵی کۆتایی هاتووەو بەهۆی ژمارەیەك ئەکتەری نێودەوڵەتی نوێی وەك ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و کۆمپانیا فرەڕەگەزەکانەوە پشتگوێخراوە. لە بەرامبەریشدا ژمارەیەك توێژەرە تەقلیدگەراکان لەسەر هەمان دیدوبۆچوونە کۆنەکانیان بەردەوامبوون و سووربوون لەسەر ئەوەی کە هێزی سەربازیو پێکەوەبەسترانی سەربازی نێوان دەوڵەتان گرنگی خۆی لەدەستنەداوەو هێزی ئەتۆمیش بەڵگەیەکی ڕوونە لەم بوارەدا.

پێکەوەبەستران و پشتبەستی هەمەلایەنە بە یەکتری (*Interdependence*) سیفەتێکی جیاکەرەوەی هەموو سیستمێکە، بیرکردنەوەی سیستمی بیرکردنەوەیەکی هەمەکییە (کلانی)، هەمیشە جەخت لەسەر وێنە گەورەکە ئەکاتەوە، لێرەوە ئەم میتۆدە لەلایەك گرنگی بە پەیوەندییە ناوخۆییەکانی نێوان ئەکتەرەکانی سیستمی نێودەوڵەتی ئەدات و لەلایەکی تریشەوە بایەخ بە شێوازەکانی کارلێکردنی سیستمەکە ئەدات، بەم مانایەش ئەم پێکەوەبەسترانە کاریگەریی دەبێت لەسەر ویست و خواستەکانی دروستکەری بڕیار لە سیاسەتی دەرەوەدا. [63]

لێرەوە ئەتوانین پێناسەی پشتبەستی هەمەلایەنە بە یەکتری (*Interdependence*) بکەین بەوەی کە دیاردەیەکی سەروونەتەوەیی ئاڵۆزە چەندین چەشن لە کارلێکردنی فرەلایەن و بواری جیاواز لەخۆی ئەگرێت لە نێوان دەوڵەتاندا، ئەمەش پلەیەکی بەرزی هەستیاری لێئەکەوێتەوە لەلایەن دەوڵەتانی ئەندامی سیستمەکەوە بەرامبەر ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە دەرەوەی سنووری دەوڵەتەکان ڕووئەدەن، هەروەها پلەیەکی بەرزی ئەگەری کارتێکردن و کارتێکرانی ئەو دەوڵەتانەی لێئەکەوێتەوە بەهۆی ڕووداوە دەرەکییەکانەوە، لە ئاکامدا پرۆسەکە لەسەر توانای ڕووبەڕووبوونەوە یان شکستهێنانی دەوڵەتەکە ئەوەستێت لە بەرامبەر هەڵگرتنی ئەرك و تێچوونی ئەو کاریگەرییە دەرەکییانەوە. لێرەوە دیاردەی پشتبەستن بەیەکتر دیاردەیەکی فرە ڕەهەندە، ئەگونجێت هەرێمی یان کیشوەری یان جیهانی بێت. هەروەها بواری جیاوازیش لەخۆی ئەگرێت بۆیە ئەگونجێت سیاسی، ئابووری، سەربازی یان بواری تر لەخۆی بگرێت لە هەمان کاتدا. [64]

کتێبی (هێزو پشتبەستن بەیەکتری) هەردوو نووسەر (ڕۆبێرت کیوهێن) و (جۆزێف نای) بۆ پارادایمی لیبراڵ هەمان ڕۆڵی کتێبی (سیاسەت لە نێوان نەتەوەکاندا)ی (مۆرگانتاو) ئەبینێت بۆ پارادایمی ڕیالیست. هەروەها دیاردەی (پشتبەستن بەیەکتر) بۆ لیبراڵەکان هەمان ڕۆڵی میکانیزمی (هاوسەنگی هێزەکان) ئەبینێت بۆ ڕیالستەکان یان چەمکی (وابەستەیی) بۆ پارادایمی ڕادیکاڵ. [65]

هەریەکە لە (کیۆهین و نای) ئەوە دووپات ئەکەنەوە کە کارەکەی ئەوان لە ڕیزی کاری توێژەرە تەقلیدگەراکان یان توێژەرە هاوچەرخەکاندا ناوەستێت، چونکە بەردەوامبوون و گۆڕانکاری هەردووکیان دوو ئەگەری واقیعین لە سیاسەتە جیهانییەکاندا. بەڵکو کارەکەی ئەوان هەوڵێکە بۆ پێشکەشکردنی چوارچێوەیەکی تیۆری نوێ بۆ شیکاری و لێکدانەوەی سیاسی دیاردەی پشتبەستنی هەمەلایەن بەیەکتری. (66)

(کیۆهین و نای) جیاوازی ئەکەن لە نێوان دوو جۆری جیاواز لە دیاردەی پشتبەستن بەیەکتر. یەکەمیان بونیادێکی پتەو، یان چوارچێوەیەکی گونجاو دروست ئەکات کە هەموو لایەنەکان پێی ڕازی دەبن. لەم حاڵەتەدا ئەو هۆکارانەی کە سیاسەتی دەرەوە بەکاریان دەهێنێت گۆڕانکاریی لە بونیادە پتەوەکەدا دروست ناکات، بەڵکو تەنها هەندێك گۆڕانکاری بچووك و لەسەرخۆ دروست ئەکات کە بەدرێژایی کات کەڵەکە ئەبێت و بە (چەشنی هەستیاری دوولایەنە *Sensitivity*) ناوزەد دەکرێت. هەرچی جۆری دووەمە ئەوا بونیادی پەیوەندییەکان تووشی هەرەسهێنان ئەکات، واتە سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتێك دژ بە بونیادی سیستەمەکە ئەبێت و لەکاری ئەخات، ئەمەش ئەبێتە هۆی ئەوەی دەوڵەتەکانی تری سیستەمەکە شێوازی تۆڵەسەندنەوە بەکاربهێنن. ئەم جۆرەش بە (چەشنی ئەگەری کەوتنەژێر کاریگەری *Vulnerablity*) ناودەبرێت. (67)

لێرەوە دیاردەی پشتبەستن بەیەکتر بەندە بە چەند ئاماژەیەکەوە(68):

أ. قەبارەی ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە لە نێوان ئەندامە سەرەکییەکانی سیستەمەکەدا ڕووئەدەن.

ب. پلەی هەستیاریی ئەکتەرەکانی سیستەمەکە بەیەکتری.

ج. ڕادەی ئەگەری کاریگەربوونی ئەندامانی سیستەمەکە بە گۆڕانکارییە دەرەکییەکان.

د. هەبوونی چوارچێوەی دامەزراوەیی بۆ کارلێککردن لە نێوان ئەکتەرەکاندا.

لەلایەکی ترەوە ئەگەر چاوخشاندنێك کەین بە ئەدەبیاتی دیاردەی پشتبەستن بەیەکتردا ئەوا سێ جۆری جیاواز لەم دیاردەیە ئەبینین: (69)

أ. پشتبەستن بەیەکتر لە نێوان سیاسەتە ئابوورییە گشتییەکانی دەوڵەتە پیشەسازییە گەورەکاندا، ئەمەش بە لێکئالأنی ماکرۆ- ئابووری ناودەبرێت.

ب. پشتبەستن بەیەکتری لە نێوان وڵاتە پێشکەوتووەکان و تازە پێگەیشتووەکاندا، یان لە نێوان باکوور و باشووردا.

ج- دیاردەی پشتبەستن بەیەکتر بەهۆی ڕووداوێك یان هەڵوێستێك کە لە دەوڵەتێك ڕووئەدات، بەڵام ئەبێتە هۆی دروستکردنی ئاسەواری ئابووری لە دەوڵەتێکی تردا، ئەمەش بە تێکەڵاوبوونی ژینگەکان.

لێرەوە لیبرالیستەکان ئەوە دووپاتئەکەنەوە کە دۆخی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە بارودۆخی پشتبەستی هەمەلایەنە بە یەکتری نزیکە نەوەك ژینگەی پشێوی و جەنگ. چونکە جۆرێکی نوێ لە سیستمی نێودەوڵەتی لە

فراوانبوون و تەواوکاریدایە، وە لە هەولّی ئەوەدایە کە وەك جۆرێك لە یاساو نەریتی نێودەوڵەتی خۆی بسەپێنێت بەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا کە لەلایەن زۆرینەی دەوڵەتەکانەوە قبوڵدەکرێت، ئەمەش بەهۆی گرنگیدانی زیاتری دەوڵەتان بە بوارەکانی ئابووری و تەکنەلۆژیا لەسەر حیسابی بابەتە ئەمنییەکان، کە لە ئاکامدا بارودۆخێکی لێکترگەیشتن و هاوکاری لە نێوان دەوڵەتاندا لێدروست دەبێت. [70]

لە هەمانکاتدا پێویستە چەمکی پشتبەستی هەمەلایەنە بە یەکتری لە هەندێك ناوەڕۆکی سادەی وەك یەکسانی نێوان دەوڵەتان و هاریکاری و خێرو خۆشی هاوبەش ڕزگاربکرێت و فراوانبکرێت بۆ هەموو پەیوەندییەکانی کاریگەری و کاریگەربوون، بۆ ئەوەی لە هەمان کاتدا هەڵگری ئەگەری هاریکاری و ململانێش بێت. [71]

بۆ نموونە ئەو ناوەڕۆکەی کە پێی وایە دیاردەی پشتبەستن بەیەکتر واتە هاریکاری و ئاشتی، بەلاّم لە ڕاستیدا کارەکە بەو سادەیە نییە، چونکە مەرج نییە هەموو کاتێك مانای ئیجابی بگەیەنێت، بۆ نموونە لەو جیهانەی کە دیاردەی پشتبەستی هەمەلایەنە بە یەکتری تێدایە هێشتا کێشەو ناکۆکییەکان بەردەوامن و لەناونەچوون. وە لەبەرئەوەی هاوپەیمانێتی ئالۆزەو شێوازی جیاواز لە هێز بەکاردەهێنرێت، ناکۆکی و کێشەکان وەك یاریکردنی شەترەنج وایە لەسەر زیاتر لە یاریگایەك بەلاّم لە هەمان کاتدا. [72]

لێرەوە ئەتوانین ئاماژە بۆ پەیوەندی نێوان دیاردەی پشتبەستی هەمەلایەنە بە یەکترو ئەگەرەکانی بەرپابوونی جەنگ بکەین، بەلاّم ناتوانین بە شێوەیەکی ڕەها پێداگری بکەین لە گریمانەی گەشبینی یان ڕەشبینی لەم بوارەدا، ئەوەی کە ئەتوانرێت ئەنجامبدرێت بریتییە لە دیاری کردنی ئەو هۆکارانەی کە پێشبینییەکان لە بارەی بازرگانی لە داهاتوودا دەرئەخەن، وە بە شێوەیەکی گشتی، ئەتوانرێت ئەنجامگیری ئەوە بکرێت کە کاتێك پێشبینیەکان لەبارەی بازرگانی لە داهاتوودا پۆزەتیڤ بێت، ئەوا سەرکردەکان بە ئاراستەی پێشبینی کردنی سوودو دەستکەوت لە بازرگانی لە داهاتوودا کارئەکەن و لەلای خۆیانەوە هەولّی ئەوە ئەدەن کە ئەگەرەکانی بەرپابوونی جەنگ کەمبکەنەوە، بەهەمان شێوەش لەکاتی ڕەشبینیدا ئەنجامەکان بە پێچەوانەوە دەبێت. [73]

کەواتە مەرج نییە کە دیاردەی پشتبەستی هەمەلایەنە بە یەکتری هەمیشە پۆزەتیڤ بێت، بەڵکو لە ڕاستیدا حاڵەتێکە کە هەردوو ئەگەری پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ لەخۆی ئەگرێت. وە بە پێچەوانەی لۆژیکی سادەگەری لە پەیوەندییەکان ئەم دیاردە نابێتە هۆی لەناوبردنی دژایەتی نێوان بەرژەوەندییەکان، بەڵکو ئەوەی کە لە توانادایە پێشبینی بکرێت ئەوەیە کە ئەم دیاردەیە ڕەنگە ببێتە هۆی کاڵکردنەوەی دژایەتییەکان و دروستکردنی ڕادەیەك لە پێکەوەگونجان لە نێوانیاندا. [74]

هەروەها مەرج نییە کە هەمیشە حاڵەتی سەقامگیریو ئارامی لێبکەوێتەوە بەڵکو هەمیشە ئەگەری نائارامیش بوونی هەیە. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو تێبینیانەدا پێویستە ئەو ڕاستییە دووپات بکرێتەوە کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا دیاردە پشتبەستی هەمەلایەنە بە یەکتری بووتە ڕاستییەكو هەڕەشەی لەناوبردنو تێکدانی ئەو بارودۆخە شتێکی ئاسان نییە بۆ هیچ لایەنێكو تێچوونو ئەرکی زۆریشی لێئەکەوێتەوە بەجۆرێك کە ئەنجامدانی ئەو کارە ئەستەم ئەکات.[75]

لەوەش زیاتر پاش ئاڵۆزتر بوونی پەیوەندییە ئابووریو تەکنەلۆژییەکانو پێکەبەسترانی زیاتری ولاٌتانو بەرژەوەندییەکانیان ئێستا باس لە دیاردەی (پشتبەستی ئاڵۆزی هەمەلایەنە بە یەکتری *Complex Interdependence*) ئەکرێت کە ئەم خاسیەتانە لە خۆی ئەگرێت:[76]

أ- پێکەوەبەسترانی کۆمەڵگاکان بە چەندین پەیوەندی نا فەرمی لە نێوان دەستەبژێرە فەرمانڕەواکاندا، ئەمە سەرباری پەیوەندییە فەرمییە دەرەکییەکانو، پەیوەندییەکانی نێوان دەستەبژێرە نا فەرمییەکانو ڕێکخراوە سەروونەتەوەییەکان.

ب- لە ئەجێندای پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا چەندین بابەت هەیە کە بە شێوەی ڕیزبەندی ستوونی ڕێکنەخراونو ئەگونجێت هەمیشە بابەتە ئەمنیو سەربازییەکان لە پێشەوە نەبن لە ئەجێنداداندا.

ج- لەو کێشەو ناکۆکییانەی کە سروشتێکی ئابوورییان هەیەو لە نێوان ئەو ولاٌتانەدا ڕووئەدەن کە جۆرێك لە (پشتبەستی ئاڵۆزی هەمەلایەنە بە یەکتری) لە نێوانیاندا هەبێت مەرج نییە کە هێزی سەربازی ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی هەبێت لە چارەسەرکردنیاندا.

هەریەکە لە (کیوهینو نای) بەراووردێك لە نێوان پارادایمی ڕیالیزمو دیاردەی پشتبەستی ئاڵۆزی هەمەلایەنە بە یەکتری ئەنجامئەدەن، بە پشتبەستن بە چەند پێوەرێکی وەك (ئامانجی ئەکتەرەکان، ئامرازە سیاسییەکانی دەوڵەت، داڕشتنی ئەجێنداکان، پێکەوەبەسترانی بابەتەکانو ڕۆڵی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان) بەم شێوەیەی خوارەوە:

| تیۆرەکان/ پێوەرەکان | ڕیالیزم | پشتبەستی هەمەلایەنەی ئاڵۆز بە یەکتری |
|---|---|---|
| ئامانجی ئەکتەرەکان | ئامانجی ئاسایشو سەربازی گرنگترین ئامانجن | ئامانجی دەوڵەتەکان بەپێی (بابەت- ناوچەکان issue-area) ئەگۆڕێت |
| ئامرازە سیاسییەکانی دەوڵەت | هێزی سەربازی کاریگەرترین ئامرازەو ئەتوانرێت ئامرازی تریش بەکاربهێنرێت | داهاتی هێزی دیاریکراو بە (بابەت- ناوچەکان) زیاتر پێکەوەبەستراون، ئاکترەکانی جگە لە دەوڵەت بوون بە ئامرازی بنەڕەتی |
| داڕشتنی ئەجێنداکان | گۆڕانکارییەکانی هاوسەنگی هێزەکانو هەڕەشەکانی ئاسایش ئەجێندای سیاسەتی بەرز دیاریئەکەنو کاریگەرن لەسەر ئەجێنداکانی تر | کاریگەریی لەسەر ئەجێندا دروست ئەبێت بەهۆی گۆڕانکاریی لە دابەشکردنی داهاتی هێز بەپێی (بابەت-ناوچەکان) |
| پێکەوەبەسترانی بابەتەکان | پێکەوەبەستران ڕادەی جیاکردنەوەی نێوان دەرئەنجامەکان کەمئەکاتەوە بە پێی (بابەت-ناوچەکان)و پشتگیری حاڵەتی دابەشبوونی ستوونی ئەکات | پێکەوەبەستران لەلایەن دەوڵەتە بەهێزەکانەوە گرانترە بەشێوەیەك کە بووەتەهۆی بێبایەخکردنی هێزی سەربازی |
| و ڕۆڵی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان | ڕۆڵەکانیان ناوەندییە، سنووردارە بەهۆی دەوڵەتەوە، هێزی سەربازی بەهێزترە | ڕێکخراوەکان ئەجێنداکانیان دائەڕێژن، هاندەری بنیادنانی هاوپەیمانین، ئەبن بە گۆڕەپانی کاری سیاسیدەوڵەتە لاوازەکان |

* خشتەی (2) بەراوردێك لە نێوان پارادایمی ڕیالیزمو دیاردەی پشتبەستی ئاڵۆزی هەمەلایەنە بە یەکتری پیشان ئەدات بە هۆی هەندێك پێوەرەوە.[77]

## تەوەری چوارەم
## بنەماکانی ڕاڤەکانی پارادایمی لیبراڵ

هەر پارادایمێك بە پشتبەستن بە چەمکەکان و گریمانەکانی تایبەت بەخۆی هەوڵئەدات کۆمەڵێك بنەمای گشتی پێشکەشبکات بۆ ڕاڤەکردن و، قوڵکردنەوەی تێگەیشتن و، دیاریکردنی گرنگترین ئەو جومگانەی کە کاریگەرییان هەیە لەسەر ئەو بوارەی کە لێکۆڵینەوەکانی تێدا ئەنجامئەدات. لێرەوە پارادایمی لیبرالیزم هەوڵئەدات کە لەسەر بنەمای ئەو چەمك و گریمانانەی هەیەتی جۆرێك لە ڕاڤەکردنی گونجاو پێشکەش بکات بە بوارەکەی خۆی کە بریتییە لە بواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان. لەم بەشەی توێژینەوەکەدا هەوڵئەدەین دوو تێز یان تیۆری تایبەتی پارادایمی لیبراڵ وەربگرین سەبارەت بە جیهانی سیاسەتی نێودەوڵەتی کە بریتین لە (تیۆری ئاشتی دیمۆکراتی و تیۆری تەواوکاری نێودەوڵەتی).

### یەکەم: (تیۆری ئاشتی دیمۆکراسیانە *(Democratic Peace Theory)*:

ئایا پەیوەندی هەیە لە نێوان دیمۆکراسی ناوخۆیی و ئارەزووی دەوڵەت لە بەرپاکردنی جەنگێك لە دەرەوەی سنوور؟

بێگومان وەڵامی ئەم پرسیارە مشتومڕێکی زۆری لەسەرە، بۆ نموونە لە کۆنفرانسێکدا کە (پەیمانگای ئاشتی) لە واشنتۆن لە ساڵی (1990)دا سازی کردبوو، دوو کەس لە لێپرسراوە باڵاکانی سەردەمی ئیدارەی سەرۆك (ڕۆناڵد ڕێگان) دوو وەڵامی جیاوازیان پێشکەش کرد. (کارڵ جێرشمان) سەرۆکی (بەخشینە نیشتمانییەکان لە پێناو دیمۆکراسیدا) ڕای وابوو کە شتێکی بەڵگەنەویستە کە هەر کۆمەڵگایەك بتوانێت بە شێوەیەکی دیمۆکراسییانە خۆی ڕێکبخات ئەوا شێوازی ئاشتیخوازانە باڵادەست ئەبێت بەسەر پەیوەندییەکانی دەرەوەیدا. بەڵام (یۆجین ڕۆستۆ) سەرۆکی پێشووتری (ئاژانسی سنووردانان بۆ خۆپڕچەککردن و چەکداماڵین) بە پێچەوانەوە وەڵام ئەداتەوەو ڕای وایە کە ئەو بیرۆکەیەی کە ئەڵێت دەوڵەتە دیموکراتخوازەکان جەنگ بەرپاناکەن، بیرۆکەیەکە ئەکەوێتە کۆتایی لیستێکەوە لە ئەفسانەی بۆش و بەتاڵ کە خەڵکانێکی ئایدیالیست پەنای بۆ دەبەن بۆ ئەوەی بەهۆیەوە خۆیان لە جەنگ ڕزگاربکەن.[78]

سەرەتای ئەم مشتومڕە ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (ئیمانوێل کانت) و کەسانێکی تری پشتیوانیکەر لە لیبرالیزی تەقلیدگەرا کە ڕایان وابوو لە وڵاتێکدا کە دیموکراسی باڵادەست بێت خەڵکی ئەتوانن دژ بە جەنگ دەنگبدەن. بەڵام ئەوانەی ڕەخنە لەم تێزە ئەگرن ڕایان وایە کە دیموکراسیبوونی دەوڵەتێك مانای ئەوە ناگەیەنێت کە گەلەکەی هەمیشە لە دژی جەنگ دەنگ ئەدەن، چونکە ئامارەکان پێمان ئەڵێن کە دەوڵەتە دیمۆکراسییەکانیش وەك دەوڵەتانی نادیمۆکراسی جەنگیان بەرپاکردووەو لەوەش زیاتر گەلەکانیشیان دەنگیان لە بەرژەوەندی جەنگ داوە.

لە دیدی (کانت)دا (سیستمی کۆماری) ئەو سیستمەیە کە ڕێز بۆ موڵکایەتی تایبەت دائەنێت و یەکسانی یاسایی لە نێوان هاولاّتیاندا دائەمەزرێنێت و خاوەنی حکومەتێك ئەبێت کە نوێنەرایەتی ڕاستەقینەی هاولاّتیانی ئەکات و بەپێی پرانسیپی جیاکردنەوەی دەسەلاّتەکان کاردەکات. بەلاّم لێرەدا مایکڵ دۆیل *Michael W. Doyle*) ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە ئەتوانرێت پێشنیازێکی ڕوونترو سنووردارتر لە ڕاو بۆچوونەکانی (کانت) وەربگرین، بەوەی بڵێین (سیستمە دیمۆکراتخوازەکان جەنگ لەدژی یەکتر بەرپاناکەن).

ئاشتی دیمۆکراتیانە پشتئەستووره بەو مشتومرە دێرینەی کە ڕای وایە ئەنگێزەی شەڕەنگێزی لای سەرکردە دەسەلاّتخوازەکان و سیاسەتەکانی پارتە تۆتالیتارە دەسەلاّتدارەکان ئەبێتە هۆی بەرپاکردنی جەنگ. بەلاّم دەوڵەتە لیبراڵە ئازادیخوازەکان کە لە ئەنجامی یەکسانی مافی هاولاّتیبوون لەبەردەم یاساو ئازادی ڕادەربڕین و ئازادییە مەدەنییەکان و موڵکایەتی تایبەت و هەڵبژاردنی نوێنەراندا دروستبوون ئەوا بێگومان دژ بە جەنگن. وە لەبەرئەوەی حکومەت لەلایەن گەلێکەوە هەڵدەبژێردرێت کە جەنگی ناوێت، بە شێوەیەکی لۆژیکی جەنگ ئەبێت بە شتێکی ناڕەواو ئەستەم. بنەمای ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ بیروڕایەکی فراوانتر کە ئەڵێت دەسەکەوتە بازرگانییەکان ئارام و سەقامگیر نابن لە سایەی ئاشتیدا نەبێت.[79]

لەلایەکی ترەوە کۆمەڵگا دیمۆکراسییەکان لە کێبڕکێیەکی بەردەوامدان لە پێناو دەوڵەمەندبوون و خۆشگوزەرانی و شکۆمەندی و تەندروستی و گەشەی کەلتووریدا، هەموو ئەمانە دوور لە پەنابردن بۆ جەنگ وەك ئامرازی یەکلاکەرەوەی ئەم کێبڕکێیانە.[80] لێرەوە (کیۆهین) ڕای وایە کە سیستمە کۆمارییەکان و دیمۆکراتییەکان لە نێوان یەکتردا بە ئاشتیانە مامەڵە ئەکەن، بەلاّم مەرج نییە بە هەمان شێوازی ئاشتییانە مامەڵە لەگەڵ دەوڵەتە نادیمۆکراسییەکان یان ئەو کۆمەڵگایانەدا بکات کە لە شێوەی دەوڵەتی هاوچەرخدا خۆیان ڕێکنەخستووەو خاوەنی سیستمێکی سیاسی مۆدێرن نین.[81]

هەندێك لە پسپۆڕان هەوڵی ئەوەیان داوە کە ئەم پێشەکییە فیکرییە تیۆرییانە لە بواری واقیعی نێودەوڵەتی ئەم ڕۆژگارەدا جێبەجێبکەن، بۆ نموونە لە توێژینەوەیەکی (بابست *Babst*)دا گەشتۆتە ئەو دەرئەنجامەی کە هیچ جەنگێك لە نێوان دوو دەوڵەتی نەتەوەیی سەربەخۆی خاوەن حکومەتێکی هەڵبژێردراودا لە نێوان سالاّنی(1789-1941)دا ڕووی نەداوە. هەروەها لە توێژینەوەیەکی (ڕومێل *Rummel*) بە ناوی (تێگەیشتن لە ململانێ و جەنگ)دا ئەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە (سیستمە لیبرالیستەکان هەر یەکەو لای خۆیەوە دژ بە جەنگن). هەروەها (جەیمس لی ڕای *James lee Ray* ) لە توێژینەوەیەکی ڕووپێودا بۆ (14) لێکۆڵینەوەی زانستی کە لە نێوان سالاّنی (1975-1996)دا نووسراون و لەسەر پەیوەندی نێوان دیمۆکراسی و ئاشتی ولە بوارەکانی (ئەبستمۆلۆژیا، فەلسەفە، فۆرمووکار،

مێژوویی، ئەنترۆپۆلۆژی، دەروونی، ئابوری و سیاسی)دا کاریان کردووە، ئەو وەڵامەی کە سەبارەت بە پرسیاری: ئایا دیموکراسی ئاشتی بەرهەم ئەهێنێت؟ دەستی کەوتووە، پۆزەتیڤ بووە، واتە بە بەڵێ بووە. [82]

هەرچەندە کە ئەو ڕەخنانەی کە ئاراستەی ووتەزای (سیستمە دیموکراسییەکان جەنگ دژ بەیەکتر ناکەن) جەخت لەسەر ئەوە ئەکەنەوە کە ئەو ماوە مێژووییەی زۆرجار بە نموونە ئەهێنرێتەوە بۆ سەلماندنی ئەو بۆچوونە بە زۆری ماوەی پاش جەنگی جیهانی دووەمە، ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دەوڵەتە دیموکراسییەکان دژ بەیەکتر جەنگیان نەکردووە چونکە دوژمنێکی هاوبەشیان هەبووە و زۆربەی تواناکانیان دژ بە ئەو دوژمنە و گەمارۆدانی تەییار کردووە. [83]

لیبرالیستەکان وەڵام ئەدەنەوە بەوەی کە سەردەمی جەنگەکان لە نێوان دیموکراتخوازەکاندا بەسەرچوون و، بۆ سەلماندنی ئەمەش چوار بەڵگەی سەرەکییان هەیە: [84]

أ. فراوانبوونی قەبارەی ئابووری جیهانی بە شێوەیەك کە تێچوونی جەنگی کردووە بە شتێکی زۆر گران لەسەر ئابووری وڵاتان.

ب. تەشەنەکردنی سیستمە دیموکراتخوازەکان لە جیهاندا مانای ئەوەیە کە بڕیاردانی جەنگ و ئاشتی تەنها ئەرکی دەستەبژێرێکی سیاسی و سەربازی دیاریکراو نییە، بەڵکو ئەبێت زۆر بە هۆشیارییەوە مامەڵە لەگەڵ ڕای گشتیدا بکرێت لە هەر هەنگاوێکی گرنگی سیاسەتی دەرەوەدا بەتایبەت بابەتێکی وەك جەنگ.

ج. ئەو پەرەسەندنەی کە یاسای نێودەوڵەتی بەخۆیەوە ئەیبینێت، بەشدارییەکی چالاکە لە بواری چارەسەرکردنی کێشەکان بەشێوازێکی ئاشتییانە.

د. لە ڕاستیدا شارستانییەتی خۆرئاوایی کە زۆربەی وڵاتانی دیموکراتخواز پێکدێنن زۆریان چەشتووە بەهۆی جەنگەوە و لە هەردوو ئاستی سەرکردەکان و جەماوەریشدا هەست بە تاڵی و دەرئەنجامەکانی جەنگ ئەکەن.

لێرەوە ئەتوانین کە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان بە یەکێك لە ڕێگەکانی بڵاوکردنەوەی دیموکراسی و بەها لیبرالییەکان، فراوانکردنی ناوچەکانی ئاشتی دابنێین. چونکە ڕێکخراوە ناحکومییەکانی تایبەت بە بواری مافی مرۆڤ و چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان ڕۆڵێکی کاریگەر ئەبینن لە پەرەپێدانی ڕێگەی بونیادنانی ئاشتی جیهانیدا. [85] لەو ڕوانگەیەوەو لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا گفتوگۆیەکی جیدی هەیە لە نێوان دوو ئاراستەی جیهانیدا سەبارەت بەوەی کامەیان گرنگترە: سەرکەوتن لە جەنگی تیرۆر و پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤدا یان سەرکەوتن لە ئەرکی بونیادنانی ئاشتی جیهانیدا؟ [86]

لەلایەکی تریشەوە دوو گریمانەی سەرەکی هەیە سەبارەت بە بەکارهێنانی هێز لەلایەن دەوڵەتە لیبرالیستەکانەوە: [87]

أ. لیبرالیستەکان پشتگیری لە جەنگ ئەکەن یان دژی ئەوەستن بە پشتبەستن بە بنەمای ڕادەی شەرعیبوون یان

ناشـــەرعیبوونی کـــارێکی دیـــاریکراو، بـــەپێی پێوەری (دادپەروەری جەنگ).

ب. لیبرالیـــستەکان ڕێگرێکـــی زیاتریـــان لەبەردەمدایە لە بەکارهێنانی هێزدا بە بەراوورد لەگەڵ ئەکتەرەکانی تردا لـە بارودۆخی سیاسـی گـــشتیدا. (لەگـــەڵ تێبینـــی کردنـــی ئـــەو حاڵەتانـــەی کـــە بنـــەما لیبراڵییـــەکان خۆیـــان ڕێگـــە بـــە بـــەکارهێنانی هێـــز ئـــەدەن وەك سیـــستمی ئاسایـــشی بەکۆمـــەڵ و پێـــشێلکاری مافی مرۆڤ).

هەرچـەندە بنـەمای ئاشـتی دیموکراتییانـە باڵادەســـــتە لـــــە نێـــــوان دەوڵەتـــــە دیموکراتخوازەکانـــدا، بـــەڵام لایـــەنگرانی دیموکراســی ئـــەڵێن چـــەند بەڵگەیـــەك هەیـــە سەبارەت بەوەی کە دەوڵەتە دیموکراسییەکان چانـــسێکی بـــەهێزتریان هەیـــە بـــۆ ئـــەوەی جەنگەکان ببەنەوە ئەگەر لەبەرامبەر دەوڵـەتێکی نادیموکراسـیدا جـەنگان، ئـەویش لەبەرئـەوەی، ئەو دەوڵەتانە:

أ. دەوڵەمەندترین وڵاتانی جیهان پێکدێنن.

ب. خـــاوەنی هاوپـــەیمانێتی باشـــترو بەهێزترن.

ج. پابەنـدن بـە سـتراتیژگەلێکی بـەهێزو کاریگەرەوە.

د. پشتئەستوورن بە پاڵپشت و پشتیوانی گەل.

ه. جەنگاوەری باشتریان هەیە لە سیستمە دەسەڵاتخوازو تۆتالیتارەکان. (88)

## دووەم: تـــــەواوکاری نێودەوڵـــــەتی
## International Integration

لەگـەڵ فراوانبـوون و پەرەسـەندنی دیـاردەی هەرێمایەتیـدا لـە ناوچـە جیاوازەکـانی جیهانـدا پـــەنابردن بـــۆ تیۆرەکـــانی تـــەواوکاریی نێودەوڵـەتی و هـەرێمی زیـاتر ئـەبێت، بەتایبـەت پاش ئـەزموونی یـەکێتی ئـەوروپا لـە نێـوان ئـەو دەوڵەتانـەی کە لە ماوەی کـەمتر لە سـەدەیەکدا سـێ جـەنگی وێرانکـەریان بـەخۆوە دیبـوو سـەرەڕای ئـەوەش ئـەزموونی تـەواوکاری ئـابووری لـەو نموونانـە ئـەژمێردرێت کـە سەرکەوتنی بەدەستهێناوە. لەلایەکی تریشەوە زیادبوونی دیاردەی پشتبەستی هەمەلایەنە بە یەکتری لە نێوان دەوڵەتاندا پاڵنەرێکی ترە بۆ ئـەوەی ئـەم دەوڵەتانـە هاریکـاری ئـابووری لـە نێـوان خۆیانـدا ڕێکبخـەن بەتایبـەت لـە ژێـر سـایەی باڵادەسـتبوونی بـەجیهانیکردنی ئابووریدا. (89)

بـە شـێوەیەکی گـشتی ئـەو تیۆرییانـەی لـەم بـوارەدا پێـشکەش کـراون بـریتین لـە وەزیفەگـەرایی (الوظیفیة) و وەزیفەگـەرایی نوێ لەگـەڵ تـەواوکاری ئـابووری. لێـرەدا تێـزە سـەرەکییەکانی هـەردوو تیۆرەکـە ڕوون ئەکەینەوە.

### 1. وەزیفەگـــەرایی و وەزیفەگـــەرایی نـــوێ
### Functionalism and Neo-Functionalism

تیۆری وەزیفەگەرایی لەسەر ئەو گریمانەیە کارئـەکات کـە ڕای وایـە هۆکـاری سـەرەکی بـەرپابوونی جـەنگ بریتییـە لـە ناهاوسـەنگی کۆمەڵایـەتی و ئـابووری، لەلایـەکی تریـشەوە گەشـەکردن و خۆشـگوزەرانی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی مـەرجی یەکـەمی بەرقـەراربوونی

ئاشتییە. لەم بارەیەوە (دەیڤید میترانی) ڕای وایە کە زیادبوونی ڕادەی ئاڵۆزی لە سیستمە حکومییەکاندا زیادبوونێکی گەورەی پیشەو وەزیفە تەکنیکیی و ناسیاسییەکانی بەدوای خۆیدا هێناوە، ئەم وەزیفە نوێیانەش لەلایەك داواکاریی لەسەر تەکنۆکرات و ڕاهێنەرەکان زیادکردووە لەسەر ئاستی نیشتمانی و لەلایەکی تریشەوە کاریگەری هەبووە لەسەر کێشە تەکنیکییەکان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی. لە بڕوای لایەنگرانی تیۆری وەزیفەگەرایی ئەگەر ئەم کێشە تازانە ڕووبەڕووی تەکنیککارو پیشەگەران بکرێتەوە و دووربخرێتەوە لە بواری سیاسیی و کاری سیاسییەکان ئەوا بێگومان بارودۆخەکە لەبارئەبێت بۆ دروستبوونی پرۆسەی تەواوکاری نێودەوڵەتی.[90]

واتە تیۆری وەزیفەگەرایی پشتئەبەستێت بە هۆکارە ئابووریەکان و ڕای وایە کە چارەسەری یەکجارەکی بۆ کێشەی تەواوکاری بریتییە لە بنیادنانی تۆڕێکی فراوان لە ڕێکخراوە وەزیفەگەرا تەکنیکییەکان سەروونەتەوەییەکان و دووبارە فۆرمەلەکردنەوەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لەسەر بنەمایەکی تەکنیکی وەزیفی نەك لەسەر بنەمای هەرێمی و جوگرافی.[91]

(میترانی) ڕای وایە کە سیستمی نێودەوڵەتی هاوچەرخ کە لە سەر بنەمای دەوڵەتی مۆدێرن پێکهاتووە ناتوانێت کە بەرەنگاری کێشە ئابووریە بنەڕەتییەکان ببێتەوە چونکە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بەشێوەیەکی ناڕێك دابەشبووە بەسەر چەند یەکەیەکی سیاسیدا، واتە لەسەر بنەمای ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کێشانە دروست نەبووە. ئەمەش وائەکات کە (میترانی) پێشنیازی چەند دامەزراوەیەکی نێودەوڵەتی نوێ بکات کە لەسەر بنەمای ئەرك و وەزیفە دروست ببن، لەسەرەتاوە بە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشە تەکنیکییەکان دەست پێبکەن و دواتریش بەشێوەیەکی پلە بەندی لە گۆڕەپانی هاریکاری نێودەوڵەتیدا پەرەبسێنن بەگوێرەی پرانسیپی (فۆرمی هەر شتێك بەگوێرە ئەرك و وەزیفەکەی ئەبێت).[92]

بەڕای (کارڵ دۆیچ) وەزیفەگەرایی واتە یەکگرتنی جوزئی، کە تێیدا حکومەتە بەشدارەکان بە ڕازەمەندی خۆیان کۆمەڵێك ئەرك ئەسپێرن بە ئاژانسێکی هاوبەش، بەلام ئەم ئەرکانە زۆر گرنگ نین و ئەمەش ئەبێتە هۆی ئەوەی کە ئاژانسە تازەکە زۆر دەسەلاتی نەبێت و نەتوانێت بڕیاری یەکگرتنی تەواو بدات لە نێوان بەشداراندا. واتە ئەم ئاژانسە نوێیە تەنها تایبەتمەند ئەبێت لە یەکگرتنی جوزئیدا. هەرچەندە لە هەندێك کاتدا ئەم یەکگرتنی جوزئییە ئەبێتە هۆی یەکگرتنی تەواو و یەکجارەکی.[93]

لێرەوە وەزیفەگەرایی نوێ سەریهەڵدا کە لەگەڵ بوارو ئەرکە تەکنیکیی و وەزیفییەکاندا گرنگی بە بواری سیاسیی و ڕۆڵی هێزە سیاسییەکانیش ئەدات لە پرۆسەی گواستنەوە لە تەواوکاری وەزیفی بۆ تەواوکاری سیاسی. وەزیفەگەرایی نوێ ڕای وایە سەرکەوتنی پرۆسەی تەواوکاری وەزیفی لە هەندێك بواردا ئەبێتە هۆی بەشداری کردنی هێزە سیاسییەکان لە پرۆسەی تەواوکاریدا لە ڕێگەی باوەڕکردنیان

بەو سوودانەی کە لێی ئەکەوێتەوە، ئەمەش پاڵنەرێکی تر ئەبێت بۆ پێشخستنی پرۆسەکە بۆ ئاستی پێشکەوتووتر. [94]

(ئێرنست هاس) ڕای وایە کە تەواوکاری ئەو پرۆسەیەیە کە تێیدا وابەستەیی و (الولاء) ئەگوێزرێتەوە بۆ سەنتەرێکی نێودەوڵەتی نوێ کە دامودەزگاکانی دەسەڵاتێکی سەروونەتەوەییان دەبێت و سنووری دەوڵەتە ئەندامەکان تێپەڕدەکات. هەروەها ڕای وایە کە ئەم دەسەڵاتە سەروونەتەوەییە شتێکی گرنگە بۆ ئەوەی هاریکاری ئابووری نێودەوڵەتی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. (ئێرنست هاس)یش وەك (دەیڤید میترانی) گرنگی ئەدات بە فاکتەری تەشەنەکردن و ڕای وایە کە سەرکەوتن لە یەکێك لە ڕەهەندەکانی هاریکاری ئابووریدا ئەبێتە هۆی بەهێزکردنی بەرژەوەندییەکانی دەستەبژێری سیاسی و دامەزراوە حکومییەکان و ڕێگەخۆش ئەکات بۆ بەدیهێنانی هاریکاری لە بوارەکانی تردا بەم جۆرەش پرۆسەی تەواوکاری فراوانتر ئەبێت. [95]

لەلایەکی ترەوە (هاس) چەند مەرجێك دائەنێت بۆ پرۆسەی وەزیفەگەرایی نوێ) بە شێوەیەك پرۆگرامەکانی هاریکاری نێودەوڵەتی خۆشگوزەرانی و تەواوکاری لێبکەوێتەوە لە هەمانکاتدا، ئەمانەی خوارەوە گرنگترین ئەو مەرجانەن: [96]

- ئەبێت لە ڕووی وەزیفەو ئەرکەوە دیاریکراو بێت، واتە پێویستە ئەرکەکانی سوودێکی ئابووری تێدابێت بۆ دەوڵەتە ئەندامەکان.
- پێویستە نوێنەرانی وڵاتانی ئەندام قورساییان هەبێت لە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری وڵاتەکانیاندا.
- پێویستە ئەو وڵات و گروپانەی ئەندامن لە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکاندا لە ڕووی ژیارییەوە پێکەوەگونجاوبن.
- پێویستە ئاستێکی باشی لێکترگەشتن هەبێت لە نێوان دەستەبژێری فەرمی و ناڕەسمی هەردوو دیوی سنوورەکاندا، بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانیان لە ئاستێکی بەرزتری سەروونەتەوەییدا ڕێکبخەن.

(هاس) پرۆسەی تەواوکاریی ئەبەستێتەوە بەو سیستمی نێودەوڵەتییەوە کە پێشنیازی ئەکات بۆ داهاتوو، لەو بارەیەوە ئەڵێت: (ئەگەر بەم شێوەیە لە بارودۆخی ئێستا تێبگەین کە بریتییە لە زنجیرەیەك لە کارلێککردن و تێکەڵاوبوونی نێوان ژمارەیەك لە ژینگە ناوخۆیی نیشتمانییەکان لە ڕێگەی بەشداریکردن لە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکاندا، ئەوا پێویستە لەسەر تەواوکاریی ئەو پرۆسەیە دیاریبکات کە لە ڕێگەیەوە ئاستی ئەم کارلێککردنە زیاتر ئەکرێت بە مەبەستی کاڵکردنەوەی ئەو سنوورانەی کە لە نێوان ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و ژینگە نیشتمانییەکاندا هەیە. [97]

جیاوازی سەرەکی نێوان وەزیفەگەرایی و وەزیفەگەرایی نوێ لەوەدا چڕ ئەبێتەوە کە یەکەمیان سەروەریی لاواز ئەکات لە ڕێگەی دابەشکردنیەوە بەسەر ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکاندا، بەڵام دووەمیان کار لەسەر لاوازکردنی سەروەریی بکات لە بەرژەوەندی

دامەزراندنی دەزگایەکی نوێی سەروونەتەوەیی. لەلایەکی ترەوە وەزیفەگەرایی لە ئاراستەی هەرێمگەرایی (الإقليمية) دوورکەوتووەتەوە بەڵام وەزیفەگەرایی نوێ نزیکبووەتەوە لە ئاراستەیەکی هەرێمگەرایی فراوان کە نزیکە لە فیدرالیزمی نێودەوڵەتییەوە. واتە وەزیفەگەرایی نوێ پشت ئەبەستێت بە ستراتیژیەتی پلەبەندی کە هەوڵئەدات لە چەند قۆناغێکی یەك لەدوای یەکداو لە ڕێگەی دامەزراوە نێودەوڵەتییە سەروونەتەوەییەکانەوە سەرکەوتن بەدەستبهێنێت، کە هەرچەندە دەسەڵاتی دامەزراوەکان کەمیش بێت بەڵام بڕیارەکانی کاریگەریی ڕاستەخۆیان دەبێت.[98]

## 2. تەواوکاریی ئابووری (التكامل الإقتصادي *Economic Integration*)

فەرهەنگی (لالاند) پێناسەی (تەواوکاری) ئەکات بەوەی (هاتنەکایەی پێکەوەبەسترانێکی ئاڵوگۆڕە لە نێوان بەشەکانی کۆمەڵگادا) بەم مانایە تەواوکاری پرۆسەیەکە لە پێناو یەکخستنی کۆمەڵگادا، لە ڕێگەی گۆڕینی بۆ شێوەی (شار)ێك کە پێکەوە گونجاوبێت لەسەر بنەمای پەیڕەوکردنی سیستەمو یاساکان. لێرەوە تەواوکاری مانای کۆتایهێنان بە ناکۆکی ناگەیەنێت بە تەنها بەڵکو مانای بەدیهێنانی هاریکاریش لە خۆی ئەگرێت لە هەمان کاتدا.[99]

بەڕای (تینبێرگن *Tinbergen*) تەواوکاری ئابووری بریتییە لە بونیادنانی فۆرمێکی ئابووری تۆکمەتر لەوەی کە هەیە، بە جۆرێك ببێتە هۆی لادانی ئەو کۆسپو تەگەرانەی کە دروستکراون لەبەردەم جێبەجێکردنی پرۆسەی ئاڵوگۆڕی ئابووریدا، بەشێوەیەك کە دامەزراوەی تایبەت بە هەماهەنگی و یەکگرتن دروستبکرێت. واتە دوو ڕەگەزی گرنگمان پێویستە، یەکەمیان لایەنی نێگەتیڤە کە بریتیە لە پرۆسەی لادانی کۆسپە بازرگانییەکانی وەك گومرگو سانسۆری کارگێڕیو چاودێری، دووەمیان لایەنی پۆزەتیڤە کە بریتییە لە پرۆسەی هەماهەنگی بە مەبەستی بەدەستهێنانی ئاستێکی باشی کارکردنو بەرهەمهێنانو گەشەپێدان لە نێوان وڵاتانی ئەندامدا.[100]

بە شێوەیەکی گشتی پرۆسەی تەواوکاری لە سەنتەرێکەوە دەست پێئەکات کە بریتییە لە دەوڵەتێکی بەهێز یان ژمارەیەك لە دەوڵەتی بەهێز لەڕووی سیاسییەوە، کە لەو ناوچەیەدا یەکێکیان ڕۆڵی سەرکردەی پرۆسەکە یان یەکخەری هەوڵەکان دەبینێت لە پێناو سەرخستنی پرۆسەی تەواوکاریدا.[101]

لەلایەکی ترەوە (فێلیپ جاکوب) هۆکارەکانی سەرکەوتنی تەواوکاری لە چەند خاڵێکدا کۆئەکاتەوە کە بریتیین لە:[102]

1. لێکنزیکبوونەوە: ئەو گەلو نەتەوانەی کە لە ڕووی جوگرافییەوە لێکتر نزیکن زیاتر ئامادەییان تێدایە بۆ بەدیهێنانی تەواوکاری لە نێوانیاندا.
2. پێکەوەگونجان: ئەو گەلو نەتەوانەی لێکچوونی زیاتر لە نێوانیاندایە باشتر ئەتوانن پرۆسەی تەواوکاری ئەنجام بدەن.

3. مامەڵـەی ئـاڵوگۆڕ: ڕادەی تونـدوتۆڵی تـەواوکاری بـە قـەبارەو ئاسـتی مامەڵـەی نێـوان لایەنەکان ئەپێورێت.

4. مەعریفـــــەی هاوبـــــەش: ئەگــــــەر نزیکبوونەوەی عەقڵی زیادبێت ئەوا تەواوکاری جێگیرتر ئەبێت.

5. بەرژەوەنــــدی: ئەگــــەر لایەنــــەکانی بەرژەوەنـدی فـراوانتر بێـت ئـەوا تـەواوکاری بەهێزتر ئەبێت.

6. ڕادەی ڕۆحـــی کۆمـــەڵکاری: ئەگـــەر ویستی بەشداریکردن هەبێت ئەوا باشتر ئەبێت بۆ پرۆسەی تەواوکاری.

7. چوارچـــێوەی بونیـــادی: تـــا ڕادەی بەشـداری لـە دروسـتکردنی بڕیـاردا زیـاتر بێـت ئەوا هێزی پێکەوەبەستران زیاتر ئەبێت.

8. سـەروەری: تـا دەوڵـەت زیـاتر پێداگری بکــات لەســـەر ســـەروەری ئــەوا ئاراســـتەی تەواوکاری لاوازتر ئەبێت.

9. چـالاکی حکـومی: هـەر حکومـەتێك توانـای وەڵامدانـەوەی داواکارییـەکانی خـەڵکی زیاتر بێت ئەوا بەهێزترە لە تەواوکاریدا.

10. ئـەزموونی تـەواوکاری پێشوو: ئەگـەر سەرکەوتن هـەبێت لـە ئەزموونی پێشوودا ئـەوا ئەگەری دووبارە بوونەوەی هەیە.

ئــــەوەی جێگـــەی هـــاودەنگی نێـــوان پــــــسپۆڕانە ئەوەیـــــە کـــــە پێویـــــستە پرۆســـــەی تـــــەواوکاری بـــــە شـــــێوەی ئارەزوومەندانــەو هــاودەنگی بێــت. هــەروەها پێویستە لەسـەر کۆمەڵـەی سیاسـی بەشـدار لـە پرۆسـەی تەواوکاریـدا کـە هـەوڵی ئـەوە بـدات کـە خۆشەویـستی و پـشتگیری زۆرینـەی خـەڵك بەدەســت بهێنێــت لــە پێنــاو سەرخــستنی تەواوکاریـدا. لـە مێـژوودا بـیری ناسـیۆنالیزم ڕۆڵی ئەوەی بینیوە کە پرۆسـەی تەواوکاری لـە ناوخۆی دەوڵەتدا سـەرکەوتوو ببێـت، بـەڵام بـۆ بنیادنــــانی پــــشتگیریو وابەســــتەیی ســەرروونەتەوەیی کــە ســنوورەکانی دەوڵــەتی نەتــەوەیی تێبپــەڕێنێت ئــەوا پێویــستە سـەنتەرێکی نـوێ بهێنرێتـە کایـەوە کـە ببێتـە مایـەی بەدەستهێنانی پاڵپشتی کردنی خـەڵك و وەلانـــــانی ئاراســــتە ناسیۆنالیــــستە توندڕەوەکان.[103]

بــەڵام لــە ڕاســتیدا لەگــەڵ ئــەو هــەموو پەرەسـەندنەو تـەواوی ئـەو لێکدانەوانـەش کـە پێشکەشکراون پێویـستە دان بـەوەدا بنـێین کـە هەمیــشە واقیعــی نێودەوڵــەتی ئــاڵۆزترە. بــۆ نموونـە (سـتانلی هۆفمـان *Stanley Hoffman*) ڕای وایە کە هێشتا جیهان بریتییە لـە جیهانی (دەوڵـەت)ەکـان، هەرچـەندە چـەندین کێشەش هەیە کە بـە تـەنها بـە دەوڵـەت چارەسەرناکرێت. هـەروەها ئەوپێشتر لـە ژێـر کـۆنترۆڵی دەوڵەتـدا بـوون ئێـستا لـە دەسـت ئاکتـەری تـردان کـە لـە بازاڕی سـەرمایەداری جیهانیـدا کارئەکـەن. هـەر بۆیــە جیهــان بــە دوو ئاراســتەی جیــاوازدا ئــــەجوڵێت: یەکــــەمیان بــــە ئاراســــتەی یــــەکگرتنو تێکەڵاوبوونــــەوەو بــــەهێزکردنی میکانیزمــــەکانی بــــازاڕو تەشــــەنەکردنی تەکنــەلۆژیای هاوچــەرخ، دووەمیــشیان بــە ئاراستەی لەبەریـەك هەڵوەشـانەوە کارئـەکات لـە ژێـر کاریگـەری ململانـێ نـەژادیو ئایینیەکانـدا یـان لـە ڕێگـەی پەیوەسـتبوون بـە کـەلتووری نەتەوەییو لۆکاڵییەوە.[104]

به گوێرەی لیبرالیستەکان ئەزموونی یەکێتی ئەوروپا بەم هەنگاوانەدا تێپەڕبووە.

| پێوەرەکان ئاستەکان | لادانی ڕەسمی گومرگ | دانانی گومرگی دەرەکی | ئازادی جوڵەی هۆکارەکانی بەرهەمهێنان | هەماهەنگی سیاسەتە ئابووریەکان | یەکخستنی سیاسەتەکانو دامەزراوەکان |
|---|---|---|---|---|---|
| ناوچەی بازرگانی ئازاد | * | | | | |
| یەکێتی گومرگی | * | * | | | |
| بازاڕی هاوبەش | * | * | * | | |
| یەکێتی ئابووری | * | * | * | * | |
| تەواوکاری ئابووری | * | * | * | * | * |

خشتەی( 3 ) ناسراو بە خشتەی (بالیسیا) کە ئاستەکانی تەواوکاریو بواری ئابووری ڕووندەکاتەوە. [105]

## تەوەری پێنجەم
## ئەجێندای توێژینەوەکانی پارادایمی لیبراڵ

لە جیهانبینی لیبرڵدا دابەشبوونێکی ستوونی ڕوون نییە لە نێوان بابەتەکانی ناوەڕۆکی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، ئەم بۆچوونەش ئەگەڕێتەوە بۆ سروشتی گۆڕانکاریی لە ڕۆڵی هێزو کاریگەریی جەنگو ئامرازی سەربازی لە بەدیهێنانی ئامانجە سیاسییەکاندا، لە کاتی پرۆسەکانی ململانێو کێبڕکێی نێوان ئەکتەرە نێودەوڵەتییە تازەکانو بابەتە نوێیەکاندا کە زیاتر سروشتێکی ئابوورییان هەیە.

لەو بارەیەوە (ستانلی هۆفمان) ڕای وایە کە پەیوەندی نێوان هێزی سەربازیو بەدیهێنانی ئامانجی پۆزەتیڤ لاوازبووە. ئەمەش بەهۆی چەند هۆکارێکەوە لەوانە: **یەکەم:** بەهێزترین ئامرازی هێزی سەربازی بریتییە لە چەکی ناوکی کە ئێستا بەکارهێنانی زۆر سنووردارە. **دووەم:** چەکە تەقلیدییەکانیش ئاستی تێچوونیان زۆر زیادیکردووە بەتایبەت ئەگەر بەرامبەر نەتەوەیەك بەکاربهێنرێت کە بە قۆناغی ڕابوونێکی نیشتمانیدا تێپەڕببێت. **سێیەم:** یەکێکی تر لە سنوورەکانی هێزی سەربازی بریتییە لە کۆتوبەندی ناوخۆیی ئەم سنووردانانەش هەمیشە لەگەڵ فراوانبوونی بەهاکانی دیمۆکراسیو مافی مرۆڤدا تەشەنەئەکاتو شتێکی ئاسان نییە لە وڵاتێکی دیمۆکراتخوازدا بڕیاری جەنگ بدرێت. **چوارەم:** هەندێك بابەت هەیە لە ڕاستیدا بە هیچ جۆرێك بە هێزی سەربازی چارەسەر ناکرێت بۆ نموونە پەیوەندییە ئابوورییەکانی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو یابان. [106]

لێرەوە ئەتوانین بڵێین کە ململانێ بەردەوام ئەبێت بەڵام بە هۆکارو ئامرازی نوێی ناسەربازی، واتە ڕادەی کاریگەریی هێزی سەربازی نزمتر ئەبێتەوە لە جاران لە بەرامبەر هەندێك بابەتو مەسەلەی نوێدا. لێرەوە هەیەکە لە (کیۆهینو نای) ڕایان وایە کە پەیوەندییە تەقلیدییەکەی جاران لە نێوان هێزی سەربازیو هەڵوێستەکانی دانوستاندا نەماوە بەڵکو لەبری ئەوە کاریگەری هەندێك ڕەگەزو گۆڕاوی تر زیادی کردووە وەك تەکنەلۆژیاو ئابووری. [107]

لەبەرئەوەشە کە ئەبینین بابەتە ئابووریەکان بەردەوام کاریگەرییان لە بڕیاردانی سیاسەتی دەرەوەدا زیاد ئەبێتو پێویستە لەسەر تەواوی دەوڵەتان، هەژاربن یان دەوڵەمەند، کە بەووردی ناوەڕۆکی بابەتە سیاسیو ئابوورییەکان هەڵسەنگێنێت پێش بڕیاردان لە هەر جۆرە سیاسەتێك. [108]

لەبەر ئەو هۆكارانەی پێشوو (كاڵ هۆلستی) ڕای وایە كە پارادایمی لیبراڵ خاوەنی چەندین خاڵی پۆزەتیڤە، لەوانە: لیبرالیستەكان ڕایان وایە كە ڕەفتارو كارلێككردنی نێودەوڵەتی لە ئەنجامی چەندین هۆكارەوە دروست ئەبێت نەك تەنها بەهۆی باری ئاسایشەوە وەك ئەوەی كە ریالیستەكان باوەڕیان وایە، لەلایەكی ترەوە گرنگی ئەدات بە چەندین كارلێك و پرۆسەی نێودەوڵەتی كە بەهۆی دەوڵەتی نەتەوەییەوە دروست نەبوون بەڵكو لە دەرئەنجامی كاریگەری ئاكتەرە نوێیەكانەوە هاتوونەتەكایەوە. لێرەوە پارادایمی لیبراڵ بە تەنها توانای خۆی پیشان نادات بۆ خوێندنەوەو تێگەیشتنی بابەتە نوێیەكان بەڵكو زیاد لەوەش ئەتوانێت لیستێكی فراوانتر لە داواكاریو خواست و دەرئەنجامی نوێ پێشكەش بكات لە ئاستی نێودەوڵەتیدا كە لە توانای پارادایمی ڕیالیستدا نییە ئەو كارە بكات چونكە هەموو توانایەكی تەرخانكردووە بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی. بە دەربڕینێكی تر ئەتوانین بڵێین كە لیبرالیستەكان زیاتر هەستیارن بەرامبەر ئەجێنداكانی بواری سیاسەتی بازرگانی، ئاڵوگۆڕی ماڵی، كۆچكردن، تەندروستی، ژینگەپارێزی، كێشەكانی دانیشتوان و نیشتەجێكردن كە لە ڕاستیدا ئەم بابەتانە تەواو جیاوازن لە بابەتە تەقلیدیەكانی ئاسایشی نیشتمانی دەوڵەت.(109)

بۆ زیاتر ڕوونكردنەوەی ئەم بابەتەش لە یەكێك لە توێژینەوە بەپێزەكاندا (*Jean-Francois Rischard*) نزیكەی بیست بابەتی جیهانی دەستنیشان ئەكات كە پێویستیان بە چارەسەر هەیە لە ماوەی بیست ساڵی داهاتوودا لە ئاستێكی فراواندا، بەڵام لە شێوەی سێ گروپدا دایانئەڕێژێتەوە، بەم شێوەیە:

| گروپی گەردوونی: بابەتە گەردوونییەكان | گروپی مرۆیی: ئەو بابەتانەی پێویستیان بە بەڵێنی جیهانی هەیە | گروپی یاساو بنەما جیهانییەكان: ئەو بابەتانەی پێویستیان بە میتۆدێكی گەردوونی هەیە |
| --- | --- | --- |
| • بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای زەوی<br>• زیانەكانی سیستمی ژینگەییو فرەچەشنی بایۆلۆژی<br>• بەبنهێنانی ڕاوی دەریایی<br>• ڕووتاندنەوەی دارستانەكان<br>• كەمبوونەوەی ئاوی خواردنەوە<br>• پاراستنی دەریاكان لە ژەهراوی بوون | • بەرەوپێشچوون لە بواری ڕووبەڕووبوونەوەی هەژاری<br>• پاراستنی ئاشتی، چارەسەری كێشەكان، دژایەتی تیرۆر<br>• خوێندن بۆ هەمووان<br>• نەخۆشییە گوازراوەكان<br>• تەكنەلۆژیای دیجیتاڵ<br>• كەمكردنەوەی كارەساتە سروشتییەكان | • داهێنانكاری لە بواری باجەكاندا<br>• یاساكانی زیندە– تەكنەلۆژی<br>• توندكردنەوەی سیستمی ئابووری نێودەوڵەتی<br>• دەرمانە نایاسایییەكان<br>• یاساكانی بازرگانیو وەبەرهێنان<br>• مافی خاوەندارێتی فیكری<br>• بنەماكانی بازرگانی ئەلكترۆنی<br>• بنەماكانی كۆچ و كاری نێودەوڵەتی |

خشتەی (4) گرنگترین بابەتەكانی ئەجێندای سەدەی بیست ویەكەم ڕووندەكاتەوە.(110)

ئەوەی سەرنج ڕاكێشە لەو خشتەیەدا ئەوەیە كە بابەتەكان هەمان بابەتەكانی پارادایمی ڕیالیست نییە بەڵكو گۆڕانكارییەكی گەورە هەست پێئەكرێت بە ئاراستەی گرنگیدان بە بابەتە مرۆییەكان كە زیاتر خەون و خەمی تەواوی مرۆڤایەتیین هەر لە مەترسییەكانەوە تا دەگاتە ئاواتەكان، ئەمەش یەكێكە لەو خاڵانەی وادەكات كە پارادایمی لیبراڵ گشتگیرتر بێتە پێشچاو.

## پەراوێزەكان:

*1-Thomath D. Lairson, David Skidmore: International Political Economy: The Struggle for Power and Welth, (florida: Harcourt Brace & Company, 1997), P. 9.*

2-د. نادية محمود مصطفى: **حول تجدد الاهتمام بالاقتصاد السياسي الدولي**، **مجلة العلوم الاجتماعية**،

جامعة الكويت، مجلد 14، ع/ 3، خريف 1986، ص 18.

*3-Stefano Guzzini: Realism in International Relations and International Political Economy, (New York: Routledge,1998), P. 108.*

*4-Ole Waver: The Rise and Fall of the Inter-paradigm Debate, in: Steve Smith, K. Booth and M. Zalewski (Ed.): International Theory: Positivism and Beyond (Cambridge: Cambridge University Press, 1996), P. 154.*

5-د. نادية محمود مصطفى: نظرية العلاقات الدولية بين المنظور الواقعي والدعوة إلى منظور جديد، مجلة "السياسة الدولية"، العدد 82 ، أكتوبر 1985، ص 56.

6-مروة محمود فكري: أثر التحولات العالمية على الدولة القومية خلال التسعينات: دراسة نظرية، رسالة ماجستير مقدمة إلى كلية الاقتصاد والعلوم السياسية بجامعة القاهرة، بإشراف: د. نادية محمود مصطفى، 2004، ص 95.

7-جوزيف س. ناي: المنازعات الدولية: مقدمة للنظرية والتاريخ، ت: د. أحمد أمين ومجدي كامل (القاهرة: الجمعية المصرية لنشر المعرفة والثقافة العالمية، 1997)، ص 245.

8-د. محمد وقيع الله: مداخل دراسة العلاقات السياسية الدولية، مجلة "إسلامية المعرفة"، فصلية يصدرها "المعهد العالمي للفكر الإسلامي"، مكتب ماليزيا، السنة الرابعة، ع/ 14، خريف 1998، ص 76.

*9-Tim Dunne: Liberalism, in: John Baylis, Steve Smith (Ed.): The Globalization of World Politics, (Oxford: Oxford University Press, 2001), P. 165.*

*10-David Baldwin (Ed.): Neorealism and Neoliberalism: The Contemporary Debate, (N. Y.: Columbia University Press, 1993), P. 4.*

*11-Michael W. Doyle: Liberalism and World Politics revisited, in: Charles W. Kegley (Ed.): Controversies in International Relations Theory: Realism and The Neoliberal Challenge, (New York: Martin's Press, 1995), P. 83.*

12-تماضر الطيب أحمد: الاعتماد المتبادل في العلاقات الدولية: دراسة حالة العلاقات السودانية القطرية(1980-2000)، رسالة ماجستير مقدمة إلى جامعة الخرطوم ، كلية الدراسات الاقتصادية والاجتماعية، 2002، ص 34.

*13-Andrew Moravcsik: Taking Preferences Seriously: A Liberal Theory of International Politics, International Organization, Vol. 51, No. 4 Autumn 1997, P. 513-14.*

*14-Thomas Lairson, David Skidmore: International Political Economy: The Struggle for Power and Wealth (Florida: Rinehart & Winston Inc, 1997), P. 9.*

15-برتراند رسل: حكمة الغرب، ت: فؤاد زكريا (الكويت: سلسلة عالم المعرفة، 1983)، ص 149.

16-د. كريم أبو حلاوة: إشكالية مفهوم المجتمع المدني: النشأة . التطور . التجليات (دمشق: دار الأهالي للنشر، 1998)، ص 24-25.

*17-Tim Dunne: Liberalism, Op. Cit., P. 163.*

18-د. عبد الله العروي: مفهوم الحرية، ط/3 (بيروت: دار التنوير، 1984)، 39-42.

19-جان نويل فربيه: العدل والملائمة: التجاهل الاقتصادي لأخلاقيات الليبرالية، في: د. نازلي معوض

أحمد: الليبرالية الجديدة: أعمال الندوة المصرية–الفرنسية السادسة، (القاهرة: مركز البحوث والدراسات السياسية، 2000)، ص 119–120.

20–د. مالك عبيد أبو شهيوة وآخرون: الأيديولوجيا والسياسة: دراسات في الأيديولوجيات السياسية المعاصرة، (ليبيا: الدار الجماهيرية، 1993)، ص 269.

21–هبة رؤوف عزت: الليبرالية: أيدلوجية مراوغة أفسدها راس المال، شبكة إسلام اون لاين 2004/8/8.

22–د. مالك عبيد أبو شهيوة وآخرون: الأيديولوجيا والسياسة، مرجع سابق، ص 270–272.

23–هبة رؤوف عزت: الليبرالية: أيدلوجية مراوغة، مرجع سابق، (بتصرف).

24–فضيل أبو النصر: الإنسان العالمي: العولمة والعالمية والنظام العالمي العادل، (بيروت: دار بيسان للنشر، 2001)، ص 119.

25–محمد وقيع الله: مداخل دراسة العلاقات السياسية الدولية، مرجع سابق، ص 85.

26–د. آلان روسيون: التحرير الليبرالي ظاهرة اجتماعية كلية وحمال أوجه، في: د. نازلي معوض أحمد (محررة): الليبرالية الجديدة، مرجع سابق، ص 17–18.

27–مروة محمود فكري: أثر التحولات العالمية على الدولة القومية، مرجع سابق، ص 93.

*28-Charles W. Kegley Jr.: The Neoliberal Challenge to Realist Theories of World Politics: An Introduction, in: Charles W. Kegley Jr. (Ed.): Controversies in International Relations Theory: Realism and The Neoliberal Challenge, (N. Y.: Martin's Press, 1995), P. 4.*

29–غراهام إيفانز، جيفري نوينهام: قاموس بنغوين {*http://elibrary.grc.to/ar/penguin.php*}.

*30-Andrew Moravcsik: Taking Preferences Seriously, Op. Cit., P. 534-35.*

*31-Mark W. Zacher, Richard A. Matthew: Liberal International Theory: common Threads, Divergent Standards, in: Charles W. Kegley Jr. (Ed.): Controversies in International Relations, Op. Cit., P. 117.*

32–غراهام إيفانز، جيفري نوينهام: قاموس بنغوين {*http://elibrary.grc.to/ar/penguin.php*}.

33–جوزيف س. ناي: حتمية القيادة: الطبيعة المتغيرة للقوة الأمريكية، ت: عبد القادر عثمان (عمان: مركز الكتب الأردني، 1991)، ص27.

*34-Joseph S. Nye, Jr.: Limits of American Power, Political Science Quarterly, Vol. 117, No. 4, Winter 2002-03, P. 522.*

35–جوزيف س. ناي: حتمية القيادة، مرجع سابق، ص 32.

36–جوزيف س. ناي: مفارقات القوة الأمريكية: لماذا لا تستطيع القوة العظمى الوحيدة في العالم أن تمضي وحدها، ت: د. محمد توفيق البجيرمي، (الرياض: مكتبة العبيكان، 2003)، ص 38– 39.

37–جوزيف س. ناي: المنازعات الدولية، مرجع سابق، ص 69.

38–جوزيف س. ناي: حتمية القيادة، مرجع سابق، ص 158.

39–جوزيف س. ناي: مفارقات القوة الأمريكية، مرجع سابق، ص 248– 250.

40–د. عبد القادر محمد فهمي: النظام السياسي الدولي: دراسة في الأصول النظرية والخصائص المعاصرة (عمان: دار وائل، 1997)، ص 122.

41–جوزيف س. ناي: المنازعات الدولية، مرجع سابق، ص 134.

42–د. سعيد النجار: الاعتماد المتبادل وعالمية الاقتصاد بالإشارة إلى الواقع العربي، في: طاهر سعدي

كنعان وإبراهيم سعد الدين (محرران): **الاعتماد المتبادل والتكامل الاقتصادي والواقع العربي: مقاربة نظرية**، (بيروت: مركز دراسات الوحدة العربية، 1990)، ص 16.

43-غراهام إيفانز، جيفري نوينهام: **قاموس بنغوين** {http://elibrary.grc.to/ar/penquin.php} .

*44-Joshua S. Guldstein: International Relations, (New York: Longman, 1999), P. 102.*

45-د. محمد وقيع الله: **مداخل دراسة العلاقات السياسية الدولية**، مرجع سابق، ص 95.

46-غراهام إيفانز، جيفري نوينهام: **قاموس بنغوين** {http://elibrary.grc.to/ar/penquin.php}.

47-د. عبد القادر محمد فهمي: **النظام السياسي الدولي**، مرجع سابق، ص 41.

48-د. الحسان بوقنطار: **العلاقات الدولية**، (الدار البيضاء: دار توبقال، 1990)، ص 88.

49-غراهام إيفانز، جيفري نوينهام: **قاموس بنغوين** {http://elibrary.grc.to/ar/penquin.php}.

50-د. مازن إسماعيل الرمضاني: **السياسية الخارجية: دراسة نظرية**، (بغداد: جامعة بغداد، 1989)، ص274.

*51-Tim Dunne: Liberalism, Op. Cit., P. 156-158.*

52-مروة محمود فكري: **أثر التحولات العالمية على الدولة القومية**، مرجع سابق، ص 110.

*53-Thomath Lairson, David Skidmore: International Economy, Op. Cit., P. 304.*

54-ألفن توفلر: **حضارة الموجه الثالثة**، ت: عصام الشيخ قاسم، (بنغازي: الدار الجماهيرية، 1990)، ص352.

55-جوزيف س. ناي: **المنازعات الدولية**، مرجع سابق، ص 22.

56-جوزيف س. ناي: **مفارقات القوة الأمريكية**، مرجع سابق، ص 82.

57-د. عبد القادر محمد فهمي: **النظام السياسي الدولي**، مرجع سابق، ص 49.

58-د. محمد السيد سعيد: **الشركات عابرة القومية ومستقبل الظاهرة القومية** (الكويت: سلسلة عالم المعرفة، أكتوبر/1986)، ص 71-72.

59-سمير كرم: **الشركات المتعددة الجنسية**، (بيروت: معهد الإنماء العربي، د.ت)، ص60.

*60-Paul A. Papayoanou: Interdependence, Institutions and The Balance of Power: Britain, Germany, International Security, Vol. 20, No. 4, Spring 1996.*

61-جوزيف س. ناي: **حتمية القيادة**، مرجع سابق، ص 157.

62-جوزيف س. ناي: **المنازعات الدولية**، مرجع سابق، ص 233.

*63-Bruce Russet, Harvey Starr: World Politics: The Menu for Choice (New York: W. H. Freeman and Company, 1989), P. 485.*

64-د. نادية محمود مصطفى: **نظرية العلاقات الدولية**، مرجع سابق، ص 68.

*65-Paul R. Viotti, Mark V. Kauppl: International Relations Theory: Realism, Pluralism, Globalism (New York: Macmillan Publishing Company, 1987), P. 209.*

*66-Robert Keohane, Joseph S. Nye: Power and Interdependence: World Politics in Transition, 2d ed., (Boston: Little Brown, 1989), PP. 2-4.*

67-د. محمد السيد سعيد: **الشركات عابرة القومية**، مرجع سابق، ص 95-96.

68-د. محمد السيد سليم: **تحليل السياسة**

**الخارجية** (القاهرة: مركز البحوث والدراسات السياسية، 1989)، ص 278–80.

69–د. سعيد النجار: **الاعتماد المتبادل وعالمية الاقتصاد**، مرجع سابق، ص16–17.

70–د. محمد وقيع الله: **مداخل دراسة العلاقات السياسية الدولية**، مرجع سابق، ص 84.

71–شريف عبد الرحمن عبد الحميد: **نظرية النظم ودراسة التغير الدولي**، رسالة ماجستير غير منشورة، بإشراف د. نادية محمود مصطفى، مقدمة إلى كلية الاقتصاد والعلوم السياسية بجامعة القاهرة، 2003، ص 89.

72–جوزيف س. ناي: **المنازعات الدولية**، مرجع سابق، ص 233.

*73-Dale C. Copeland: Economic Interdependence and War: A Theory of Trade Expectation, International Security, Vol. 20, No. 4, Spring 1996.*

74–د. عبد القادر محمد فهمي: **النظام السياسي الدولي**، مرجع سابق، ص 124.

75–جوزيف س. ناي: **حتمية القيادة**، مرجع سابق، ص 170.

*76-Robert Keohane, Joseph S. Nye: Power and Interdependence, Op. Cit., PP. 20-25.*

*77-Robert Keohane, Joseph S. Nye: Power and Interdependence, Op. Cit., P. 37.*

78–جوزيف س. ناي: **المنازعات الدولية**، مرجع سابق، ص 67.

*79-Michael W. Doyle: Liberalism and World Politics, Op. Cit., P. 83.*

*80-Michael W. Doyle: Ways of War and Peace, Op. Cit., P. 210.*

*81-Robert O. Keohane: International Institutions and State Power, (Colorado: West view Press, 1989), P. 11.*

*82-James lee Ray: Does Democracy Cause Peace? Annual Review Political Science, 1998, at:*

*{http://www.mtholyoke.edu/acad/intrel/ray.htm}.*

*83-Stephen M. Walt: International Relations: One World, Many Theories, Foreign Policy (Spring, 1998).*

*84-Paul Viotti, Mark Kauppi: International Relations Theory, Op. Cit., P. 195-96.*

*85-Oliver P. Richmond: NGOs and an Emerging of Peacemaking: Post-Westphalian Approache, Annual Convention of International Study Association, Los Anglos, March 14-18, 2000, at: Columbia International Affairs Online (ciao).*

*86-Ekaterina Stepanova: War and Peace Building, The Washington Quarterly, Vol. 27, No.4, Autunm 2004. P. 127.*

*87-John Macmillan: Liberalism and the Democratic Peace, Review of International Studies, (2004), No. 30, PP.179-200.*

*88-Mechae C. Desth: Democracy and Victory: Why Regime Type Hardly Matters, International Security, Vol. 27, No. 2, Fall 2002, P. 25.*

89–د. ريمون حداد : **العلاقات الدولية** ، **العلاقات الدولية** (بيروت: دار الحقيقة، 2000)، ص 205.

90–جيمس دورتي، روبرت بالستغراف: **النظريات المتضاربة في العلاقات الدولية**، ت:

د. وليد عبد الحي (بيروت: المؤسسة الجامعية للنشر، 1985)، ص 270.

91-محمد فايز فرحات: **الإقليمية الجديدة وتطبيقاتها: دراسة حالتي الأوبك وتجمع المحيط الهندي**، رسالة ماجستير مقدمة لكلية الاقتصاد والعلوم السياسية جامعة القاهرة، 2001، بإشراف: د. محمد السيد سليم، ص 17.

92-د. ريمون حداد: **العلاقات الدولية**، مرجع سابق، ص 206.

93-كارل دويتش: **تحليل العلاقات الدولية**، ت: شعبان محمد محمود (القاهرة: الهيئة العامة للكتاب، 1983)، ص 269.

94-محمد فايز فرحات: **الإقليمية الجديدة وتطبيقاتها**، مرجع سابق، ص 22.

95-د. ريمون حداد: **العلاقات الدولية**، مرجع سابق، ص 207.

96-محمد محمود إمام: **التكامل الاقتصادي: الأساس النظري والتجارب الإقليمية مع الإشارة إلى الواقع العربي**، في: طاهر حمدي كنعان وإبراهيم سعد الدين (محرران): **الاعتماد المتبادل**.. ، مرجع سابق، ص 228.

97-جيمس دورتي، روبرت بالستغراف: **النظريات المتضاربة**، مرجع سابق، ص 271.

98-د. ريمون حداد: **العلاقات الدولية**، مرجع سابق، ص 207.

99-موريس دوفرجيه: **مدخل إلى علم السياسة**، ت: د. سامي الدروبي (دمشق: دار دمشق، د.ت)، 221.

100-د. سمير التنير: **التكامل الاقتصادي وقضية الوحدة العربية** (بيروت: معهد الإنماء العربي، 1978) ص18.

101-كارل دويتش: **تحليل العلاقات الدولية**، مرجع سابق، ص 267.

102-جيمس دورتي، روبرت بالستغراف: **النظريات المتضاربة**، مرجع سابق، ص 300.

103-غراهام إيفانز، جيفري نوينهام: **قاموس بنغوين** {http://elibrary.grc.to/ar/penguin.php}.

104-د. مروة محمود فكري: **أثر التحولات العالمية على الدولة القومية**، مرجع سابق، ص 118.

105-د. ريمون حداد: **العلاقات الدولية**، مرجع سابق، ص 208.

106-جوزيف ناي: **المنازعات الدولية**، مرجع سابق، ص 23.

*107-Robert Keohane, Joseph S. Nye: Power and Interdependence, Op. Cit., P. 24.*

108-روبرت كانتوري: **السياسة الدولية المعاصرة**، ت: أحمد ظاهر (عمان: مركز الكتب الأردني،1989)، ص 153.

*109-Ole R. Holsti: Theories of International Relations and Foreign Policy: Realism and its Challengers, in: Charles W. Kegley Jr. (Ed.): Controversies in International Relations, Op. Cit., P. 44.*

*110-Jean-Francois Rischard: Global Issues Networks: Desperate Times Deserve Innovative Measures, The Washington Quarterly, Vol. 26, No.1, Winter 2002, P.17.*

# زەمینە مێژوویی و فکریەکانی لیبڕاڵیزم لە سەدەی بیستدا

حسین بشیریە

لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

هەندێك لە نوسەران چەمکەکانی لیبڕاڵیزم و دیموکراسی و ئەو بیرو ئەندێشانەی پەیوەندی پێیانەوە هەیە، لەگەڵ ئەو هەموو نزیکیەی لەیەکەوە هەیانە، بە جیا دەهێنە ئاراوە و تاوتوێیدەکەن. بیرە لیبڕاڵی و دیموکراتیەکان بنەما و سەرچاوەی هاوبەشیان هەیە، بەڵام لە بەکارهێنانی مێژوویی هەردوکیاندا، ئاڵۆزیگەلێك دروستبووە. لێرەدا سەرەتا بەشێوەیەکی گشتی ئەو دو چەمکە بە جیا باسدەکەین. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئەو خاڵە لەبەرچاو بگرین کە ئەگەرچی جیاکاری لەنێوان ئەم دوو چەمکەدا لە شیکردنەوەدا مومکینە، ئەوا پاراستنی ئەم جیاکاریە لە کردار و پراکتیکدا یەکجار ئەستەمە. بیرە لیبڕاڵیەکان بنەمای فەلسەفی و تیوری سیستەمە دیموکراتیەکانی ڕۆژئاوایە. ناوەڕۆکی لیبڕاڵیزم بریتیە لە جیاکردنەوەی بوارەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگا، و سنورداركردنی دەسەڵاتی دەوڵەت لەبەرامبەر مافەکانی تاك لە کۆمەڵگادا. لیبڕاڵیزم لە سەرەتادا هەوڵێکی فکری بووە بە مەبەستی دیاریکردنی بواری تایبەتی (تاکەکەسی، خێزانی، ئابوری) لەبەرامبەر دەسەڵاتی دەوڵەتدا و وەك ئایدۆلۆژیایەکی سیاسی بەرگری لە بواری کۆمەڵگای مەدەنی لەبەرامبەر دەسەڵاتی دەوڵەت و لێرەوە بەرگری لە دەوڵەتی دەستوری و پابەند بە یاساو ئازادیە فەردی و مافە مەدەنیەکان و بەتایبەتی موڵکایەتی تایبەتی کردووە. بە پێی بنەماکانی لیبڕاڵیزم دەبێ مافی دەوڵەت لە دەستێوەردانی ژیانی تایبەتی و مەدەنیدا، بە چەندان کۆتوبەندی بەهێز و دیاریکراو سنوردار بکرێت. بناغەی فەلسەفیی ئەم تێڕوانینە ئەوەیە کە هەموو مرۆڤەکان خاوەن عەقڵن و عەقڵانیەتیش زامنی پاراستنی ئازادی تاکەکەسیە، و مرۆڤ تەنها لە ئازادیدا دەتوانێت بە پێی حوکمی عەقڵ چۆن دەیەوێت بژی. عەقڵانیەت و ئازادی فکر دوو بەشن کە لەیەك جیانەبنەوە. سەندنەوەی ئازادی لە تاکەکەس، بەمانای نەفیکردنی عەقڵانیەتی تاکەکەسە، و نەفیکردنی توانای عەقڵانی مرۆڤیش دەبێتە هۆی نەفیکردنی

ئازادی. تاکەکەسی ناعەقڵانی و دیل دەبێت بە حوکمی عەقڵی باڵاتر بژی، جا ئەم عەقڵە باڵاترە لەنـــەریت و مەزهەبـــدا بدۆزرێتـــەوە یـــان لـــە ئایدۆلۆژی سیاسیدا. بەپێی بنەماکای لیبڕاڵیزم ئـــازادی تاکەکەســـی لـــە شـــکڵە جیاوازەکانیـــدا زامنی دابینکردنی بەرژەوەندیە راستەقینەکانی تاك و کۆیە، و پێداویستی شەوکەت و شەرەفی مرۆڤـــە وەك بونـــەوەرێکی عـــەقڵانی. لـــەمڕووەوە دەبێت داهێنانی تاکەکەسی و تایبەتی لەهـــەموو بوارەکـــانی ژیانـــدا پارێزگـــاری لێبکرێـــت و بەهێزبکرێت. هـەر لێرەوەیـە کـە جـەخت لەسـەر دژایەتی لیبڕاڵیزم بۆ دەستێوەردانی دەوڵـەت لە بـــواری ئابوریـــدا دەکرێـــت. دیـــارە ئەمـــە تـــەنها بەشـــێکە لـــــە دژایەتیـــــەکی گـــــشتی تـــــری دەستێوەردانی دەوڵـەت لـە ژیـانی گـشتیدا کـە بەتایبـەتی دژایـەتی دەسـتێوەردانی دەوڵـەت لـە ژیانی فکریدا دەگرێتـەوە. بـەرگریکردن لـە مافـە ســـــەرەکیەکانی تاکـــــەکان (بـــــەپێی یاســـــا دانراوەکـــان)، بـــــەرگریکردن لـــــە سیـــــستەمی نوێنەرایـــــەتی، ســـــنورداركردنی شـــــێوەی بەکارهێنانی دەسـەڵات بـە کۆمـەڵێك کۆتوبەنـدی قـــابیلی جێبـــەجێبوون، توانـــای هەڵبـــژاردنی پلـــەکان، جـــەختکردن لەســـەر پێویـــستی جیاکردنـــەوەی دەســـەڵاتەکان..و هتـــد، هـــەموو ئەمانـــە لـــە بنـــەما ســـەرەکیەکانی لیبڕاڵیزمـــەوە سەرچاوە وەردەگرن.

دیـــارە وەك دواتـــر زیـــاتر رونیدەکەینـــەوە ئازادی تاکەکـەس و سنورداركردنی دەسـەڵاتی دەوڵـەت وەك دوو بنـەمای سـەرەکی لیبڕاڵیـزم، ئەگەرچـی تەواوکـەری یـەکترن، هەنـدێکجار دژی یەکـدەبن، بـەو مانایـەی هەنـدێکجار پاراسـتن و فراوانبوونی بواری ئازادی فـەردی بەسـتراوە بـە دەســـتێوەردانی دەوڵەتـــەوە. هـــەر لـــەمڕووەوە دیموکراســـی وەك بـــەدیهاتنی لیبڕاڵیـــزم، لـــە کـــرداردا هـــەڵگری بەرگریکردنـــــە لـــــە دەستێوەردانەکانی دەوڵـەت لـە بـوارە ئـابوری و کۆمەڵایەتیەکانـدا. لێـرەوە لەسـەدەی بیـستدا لیبڕاڵیزمی دیمـوکراتی بـەمانا باوەکـەی، لەگـەڵ لیبڕاڵیزمـــی ســـەرەتایی لەســـەدەی نـــۆزدەدا جیـــاوازە. بێگومـــان دەوڵەتـــە لیبڕاڵـــە دیموکراتیـــەکانی ســـەدەی نـــۆزدە و ســـەدەی بیـــست، سیاســـەتی ئـــابوری و کۆمەڵایـــەتی جیاوازیـان هـەبووە، و تەنانـەت بـۆ بـەرگریکردن لـە مـافی کۆمەڵایـەتی چـینەکانی خـوارەوە، رویانکردۆتـــە سیاســـەتی خۆشـــگوزەرانی و دەســـتێوەردان لـــە ئابوریـــدا. لێـــرەوە تـــەنها دەستێوەردانی دەوڵـەت لـە ئابوریـدا لەبـەر هـەر هۆیـەك بـووە، ئەگەرچـی پێـچەوانەی بنـەمای سەرەکی لیبڕاڵیزمە واتە بازاڕی ئازاد، بەڵام ئەم حاڵەتـە خەسـڵەتەکانی تـری دەوڵـەتی لیـبڕاڵ دیمـوکراتی نـەفیی ناکـات. بـەم مانـا فراوانـەش دەوڵەتـە سۆشیال دیموکراتیەکانیش بەتـەواوی لیبڕاڵن. بەکورتی دەکرێ بگوترێت لیبڕاڵیزم لـە پراکتیکـدا زۆر ناڕەسـەنترە لـە لیبڕاڵیـزم وەك فەلـسەفە و تیـورە. دەکـرێ بـۆ ئاسـانکردنی بابەتەکە باسی دووجۆر لیبڕاڵیزم بکەین: یەکەم لیبڕاڵیزمـی ئـابوری بـەمانای بـاو کـە بـە مانـای پاراســـتنی بـــازاڕی ئـــازاد و رکەبەرایەتیـــە و دەشـــــێت لـــــە دەوڵەتـــــە دیکتـــــاتۆر و فاشیستیەکانیـــشدا بـــەرپا بێـــت، دوهـــەمیش لیبڕاڵیزمی کلتوری بەمانای ئازادی بیرکردنـەوە و دەربـڕین کـە مومکینـە لـەو رژێمانەشـدا کـە

ئابوری دەوڵەتیان هەیە، بەڕیا بێت. لیبڕاڵیزم لە بیرکردنەوەی سیاسیدا زۆرتر بەمانای فەلسەفەی ئازادی بەمانا کلتوریەکەی بەکارهێنراوە. بەڵام لە بیرکردنەوە ئابوریەکاندا پتر جەخت لەسەر مانا ئابوریەکەی دەکرێتەوە. لێرەوە ناکرێت دەستێوەردانی دەوڵەتی دیموکراتی لە ئابوریدا ، بەمانای کەمی لیبڕاڵیزم بەمانای فراوان بزانرێت، بەڵکو بەمانایەك تەواوکەری بنەماکانی لیبڕاڵیزمە. بەهەرحاڵ دەبێت بەردەوام ئەو خاڵەمان لەبەرچاو بێت کە هیچکاتێك دەستێوەردانی دەوڵەتی دیموکراتی لە ئابوریدا، نەبۆتە هۆی لەناوبردنی سیستەمی سەرمایەداری و موڵکایەتی تایبەتی بەسەر ئامێرەکانی بەرهەمهێنانـدا و بەردەوام بە ئاراستەی چاکسازی ئەم سیستەمە کاری کردووە. لێرەوە زوربەی لیبڕاڵەکان بەتایبەتی لە وڵاتە ئەوروپییەکاندا، ئەمڕۆ بە بەشێك لە هێزی راست وکۆنزەرڤاتیڤ دادەنرێن و ئازادی ئابوری بە مەرجی بەدیهاتنی ئازادیەکانی دی دادەنێن. بە بڕوای لیبڕاڵەکان ئازادی سیاسی تەنها لە سیستەمی سەرمایەداریدا دێتە دی، لەبەرئەوە لەم تێڕوانینەدا ئازادی بەر لە یەکسانی مەرجی دیموکراسیە و تەنانەت دروستکردنی یەکسانی لەرێگەی دروستکراو و سیاسیەوە، زیان بە ئازادی و لیبڕاڵیزم و دیموکراسی دەگەیێنێت.

ناکرێ ئەم مانا سنوردارەی لیبڕاڵیزم وەك پێشتر ئاماژەی بۆکرا، لە وەسفی هەلومەرجی سیستەمە لیبڕاڵ دیموکراتیەکانی هاوچەرخدا بەکاربهێنرێت. لیبڕاڵیزم لە مانا سەرەکیەکەیدا دیاردەیەکی سەدەی نۆزدەهەمە. لەکاتێکدا لیبڕاڵیزم بەومانایەی لە دەوڵەتی خۆشگوزەرانیدا پەیدایکردووە، لەگەڵ بنەماکانی دیموکراسی و بەتایبەتی بیرۆکەی یەکسانی سیاسی و ئابوریدا ئاوێزان بووە. دیارە ئەمڕۆ لە کۆتایەکانی سەدەی بیستدا بە ئاوابوونی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی و روکردنە ئەو سیاسەتە لیبڕاڵیزمە ئابوریانە لەژێر ناونیشانی ئایدۆلۆژیای لیبڕاڵیزمی نوێ، ناکۆکیەکانی لیبڕاڵیزم و دیموکراسی ئاشکراتر بووە. هەرچەند دەبێ دیسان دوبارەی بکەینەوە کە لیبڕاڵیزم لەمبارەیەوە بەمانا سنوردارە ئابورییەکەی بەکاردێت. بەمشێوەیە لیبڕاڵیزم کە لەسەردەمی دەوڵەتی خۆشگوزەرانیدا پێدەچوو هەڵوێستێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی نەبێت، جارێکی دی بە پەیدابوونی لیبڕاڵیزمی نوێوە لەم بوارانەدا هەڵوێستی وەرگرتۆتەوە. دیارە لایەنگرانی دیموکراسی بەمانای دەوڵەتی خۆشگوزەرانی ئەم هەڵوێستانەی لیبڕاڵیزم و لیبڕاڵیزمی نوێ بە کۆنەپەرستانە دادەنێن. بێگومان لیبڕاڵیزم لەرووی مێژویی و ماناوە زیاتر لە دیموکراسی لەگەڵ سەرمایەداریدا ئاوێزان بووە. دیموکراسی بەمانا مۆدێرنەکەی هیچکات هێندەی لیبڕاڵیزم ئاشکراکەری ئایدۆلۆژیا و بەرژەوەندیەکانی چینە باڵادەستەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری نەبووە. بەمشێوەیە گەرچی لیبڕاڵیزم لە مانا کلتوری و فەلسەفیەکەیدا زەمینەی سەرەکی بیرکردنەوەی دیموکراتی و تەنانەت سۆشیالیستی بووە، لەرووی ئابوریەوە لە سیستەمی سەرمایەداریەوە نزیکە. لەگەڵ ئەوەشدا وەك دەزانین رەخنەگرانی سیستەمە دیموکراتیەکان

جیاوازی لەنێوان دیموکراسی و لیبڕاڵیزمدا بەو مانایەی کە گوتمان، ناکەن و دیموکراسییە مۆدێرنەکان بە سیمای ئایدۆلۆژی و بەرژەوەندییەکانی چینە باڵادەستەکانی سەرمایەداری دەزانن. ئەگەرچی ئەم رووداوە شایەنی بیرلێکردنەوەیە، بەڵام دەبێ ئەوەمان لەبیر بێت کە لەگەڵ پەرەسەندنی هێزەکانی خەڵك و گەشەکردنی دیموکراسی، پەیوەستبوونی دەوڵەت بە چینە باڵادەستەکانەوە (بەبەراورد لەگەڵ سەردەمی لیبرالیزمدا) کەمدەبێتەوە، بەتایبەتی پەیدابونی بزوتنەوەکان، رێکخراوەکان و حیزبە کرێکاریەکان، دەسەڵاتی چینە باڵادەستەکان بەسەر دەوڵەتدا هاوسەنگ کردۆتەوە. تەنانەت دەبێ بگوترێت لیبڕاڵیزم لە سەرەتادا رویەکی خۆشی پیشانی بیرۆکەی یەکسانی داوە و هێواش هێواش بیرۆکەی دیموکراسی بەمانا فراوانەکەی قبوڵکردووە. لەم روانگەیەوە دیموکراسی زادەی لیبڕاڵیزمە. بەشێوەیەکی گشتی لیبڕاڵیزم بەمانا فراوانەکەی وەك میراتی سەرەکی شارستانیەتی رۆژئاوا، بە زەمینەی فکری دیموکراسی، سۆسیال دیموکراسی و سۆشیالیزم دەژمێرێت. بەڵام لە مانا سنوردارە ئابوریەکەیدا، ئایدۆلۆژیای حیزبەکان و ئەو دەوڵەتە تایبەتانەیە کە بەرگری لە ئابوری بازاڕ بەمانا کلاسیکیەکەی دەکەن.

لیبڕالیزم لە روانگەی فەلسەفەی سیاسیەوە بەمانا فراوانەکەی، فەلسەفەی زیادبوونی ئازادی فەردیە لە کۆمەڵگادا تا ئەوپەڕی مومکین و دوژمنی سەرەکیشی چڕبونەوەی دەسەڵاتە کە زۆرترین زیان بە ئازادی فەردی دەگەیێنێت. لەدیدی لیبڕاڵیەوە تاك و بەرژەوەندی تاك لەپێش کۆمەڵگا و بەرژەوەندی کۆمەڵگاوەیە. لەراستیدا لیبڕاڵیزم نەك هەر ئایدۆلۆژیایەکی سیاسی، بەڵکو جۆرێك شێوازی ژیانە. بەم مانایە لیبڕاڵیزم هەر لە سەرەتاوە هاوکات و هاوڕێی سکولاریزم (جیابونەوەی دین لە دەوڵەت)، مۆدێرنیزم یان دژایەتی نەریت، فەلسەفەی سەربەخۆیی یان دژایەتی دیترمنیزم، بازاڕی ئازاد، رکەبەرایەتی تەواو، تاکگەری، بەشداریکردنی سیاسی، سیستەمی نوێنەرایەتی، عەقڵانیەت، پێشکەوتنخوازی و زانستخوازی بووە. جەختی سەرەکی لیبڕاڵیزم لەسەر پاراستنی هەمەڕەنگیە لەهەموو بوارەکانی ژیاندا. لێرەوە لیبڕاڵیزم دژی یەکێتیخوازی، چڕبونەوەخوازی، پاوانخوازی و دەسەڵاتخوازیە. لە لیبڕاڵیزمدا تاك و ئامانجەکانی بنەمان و دەزگا کۆمەڵایەتیەکانیش لەوانە دەوڵەت، ئامێرەکانی دابینکردنین. لەروانگەی لیبڕاڵەکانەوە دەسەڵات خاڵیە لەهەموو خەسڵەتێکی پیرۆز و جێی رێز. هەر لەبەرئەمەش لیبڕاڵیزم دژایەتیەکی تایبەتی لەگەڵ شێوازە کلاسیکیەکانی دەسەڵاتدا هەیە و بەتایبەتی نەیاری هەموو جۆرێك ئیلیتخوازی (دارێژراو لەسەر بناغەی ئەسڵ و فەسڵ، مەزهەب، ئەرستۆکراتی فکری و شتی لەم بابەتەیە) و تا ئەوپەڕی توانا بەرگری لە فراوانبوونی بواری هەڵبژاردنی تاکەکان دەکات. لیبڕاڵیزم دژایەتی هەموجۆرە نەریتێکی دەستوپێکگر دەکات کە سەربەخۆیی و دەسەڵاتی بیرکردنەوەی تاك سنوردار دەکات. دیارە لیبڕاڵەکان بە پاراستنی ئەم ئامانجە سەرەکیانە،

بەدرێـژایی زەمـەن گۆڕانکاریـان لـەو دەزگـا و ئامێرانـەدا کـردووە کـە بـۆ گەیـشتن بـۆ ئـەم مەبەسـتە پێویـستە. هـەر لەبـەر ئەمـەش بـوو گوتمـان دیموکراسـی و تەنانـەت سۆشـیال دیموکراسـی لـە لیبڕاڵیزمـەوە هاتونەتـە دەرێ و ئامـانج و بنـەما سـەرەکیەکانیان لەگـەڵ پێداویـستیە گۆڕاوەکـانی سیـستەمی کۆمەلایەتی_ئابوریدا، گونجاندووە.

لیبڕالیـزم بـەمانا فراوانەکـەی لـە رووی مێژوویـەوە سـەرەتا لـە بەرامبـەر دەسـەڵاتی مەزهـەبی و پاشـان لـە بەرامبـەر دەسـەڵاتی سیاسـی فـەرمانڕەوایانی دیکتـاتۆردا، دروسـتبوو. روبەروبونـەوەی لیبڕاڵیـزم لەگـەڵ دەسـەڵاتی مەزهـەبی کەنیـسەدا، لەگـەڵ بزوتنـەوەی ناسـیۆنالیزمی سـەرەتادا ئـاوێزانی کرد. لەگەڵ ئەمەشدا لیبڕاڵیزم دژی دیکتاتۆری فەرمانڕەوا رەهاکانی نوێخواز و ناسیۆنالیزم و دژ بـە کەنیـسەش راوەسـتاوە. گـرنگترین خواسـتی لیبڕاڵـەکان لەبەرامبـەر فـەرمانڕەوا رەهاکانـدا، سـنورداركردنی دەسـەڵاتیان بـوو بـە یاسـا کـە بەشـێوەیەکی سـەرەکی لـە رێگـەی شۆڕشـەکانەوە بەرهـەمهات و لـە بەڵگـە گرنگەکانی وەك بڵاوکراوەی مافەکانی شۆڕشـی شـکۆمەندی 1688ی ئینگلتـەرا و راگەیانـدنی سـەربەخۆی 1776ی ئەمـەریکا و راگەیانـدنی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتی ئەنجومەنی شۆڕشـی فەرەنـسی لـە 1789دا دەرکـەوت. بـۆ نمونـە بـەپێی راگەیانـدنی مافـەکانی مـرۆڤ و هـاوڵاتی "مرۆڤـەکان ئـازاد و لـەروی مافەکانـەوە یەکسان لـەدایك دەبـن...ئامـانجی کۆمـەڵگا پاراسـتنی مافەکانی مرۆڤە...ئەم مافانە بریتین لە: ئازادی، موڵکایەتی، ئاسایش و بەرگریکردن لەبەرامبەر ستەمدا.......ئازادی دەسەڵاتی ئەنجامدانی هەر کارێکـە کـە زیـان بـە کەسـانی دی نەگـەیێنێت... نـاکرێ هیـچکەس بـەتاوانی بیروڕاکـانی ئازار بدرێت".

گـرنگترین چـەمکی تیـوریی بیرکردنـەوەی لیبڕاڵیـزم پـەیمانی کۆمەڵایەتیـە کـە بـەپێی ئـەم پەیمانـە حکومـەت دەزگایـەکی دروسـتکراوە و خەڵکی بۆ دابینکردنی رێکخستن و ئاسایش و بەدەستهێنانی ئاسانتری مافەکانیان، دروستیان کردووە. بەکورتی دەکرێت گرنگترین بنەماکانی لیبڕاڵیـزم بـەمانا فراوانەکـەی لـە بڕوابـوونی بـە یەکسانی مرۆڤەکان، سەربەخۆیی ئیرادەی تاك، عەقڵانیـەت و خەسـڵەتی باشـی مـرۆڤ، مافـە سروشـتیەکان کـە قـابیلی سـەندن نیـە، دروستکراوی دەزگای دەوڵەت و سنورداربوونی دەسـەڵاتی حکومـەت بەیاسـا دانراوەکانـدا بدۆزرێتـەوە. ململانـێ لەگـەڵ دیـسپۆتیزمی چینایەتی، جـەماوەری، مەزهـەبی و حیزبیـدا، بەردەوام ئامانجی سەرەکی لیبڕاڵەکان بووە.

لیبڕالیـزم لـە رووی مێـژووی بیرکردنـەوەی سیاسـی لـە رۆژئـاوادا، ئایـدۆلۆژیای چـینی بۆرژوازی تازە پێگەیشتوو بوو کە دژی دەوڵەتە رەهاکـانی ئـەوروپا راپـەڕیووە و و خوازیـاری ئـەوەبوو دەسـەڵاتی دیکتاتۆریـەکان بـە یاسـا سنوردار بکرێت. هەروەها لەرووی مێژوویـیەوە جـەختکردنی لیبڕاڵیـزم لەسـەر تـاك و توانـا عەقڵیـەکانی، رەگـی لـەناو بیرکردنـەوە مەسیحیەکاندا هەیە، بەتایبەتی ئەوەی ئەم دینە لـەبواری یەکـسانی و یاسـا و مافـە سروشتیەکانەوە لە قوتابخانەی رەواقیەکانەوە

وەریگرتووە. دەکرێ لەرووی فەلسەفەی سیاسیەوە بەڵگە بهێنرێتەوە کە بیرکردنەوەی سەرەکی لیبرالیزم لەبواری جیاکردنەوەی سنورەکانی کۆمەڵگا و دەوڵەت، لە فەلسەفەی تۆماس هۆبزەوە دروستبووە. لەگەڵ رەهاگەری تیورەی هۆبزدا، دەبێ رەگی سەرەتایی ناسینەوەی بوارێکی جیاواز لە دەوڵەتدا وەك دەسەڵاتێکی گشتی یان مرۆڤی دروستکراو، لەم تیورەیەدا بدۆزرێتەوە. لەم بوارەدا کە لە دەوڵەت جیابۆتەوە، هەموو تاکەکان یەکسانن و هەرکەسێك بە ئاراستەی دابینکردنی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆی هەوڵدەدات و سودخوازی سەرەکیترین پاڵنەری کارکردنە. کاتێك تاکەکان مافە رەهاکانی خۆیان لە دۆخی سروشتیدا بە دەسەڵاتێکی بالاتر دەبەخشن، بوارێکی گشتی و بوارێکی تایبەتی (دەوڵەت و کۆمەڵگا) بەشێوەیەکی دیاریکراو و رەوا دروستدەبێت. حاڵەتێکی وا دەرئەنجامی پەیمانی کۆمەڵایەتیە. فەرمانڕەوا دەبێت مافەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، بەتایبەتی مافی موڵکایەتی و ژیان و دروستکردنی خێزان بپارێزێت. بەمشێوەیە تیورەکەی هۆبز ئەگەرچی لەرووی دەرئەنجامە سیاسیەکانەوە نالیبرالیە (چونکە دەسەڵاتی دەوڵەت سنوری نیە)، بەڵام لەرووی هەڵوێستی لەبارەی ماهیەت و رەگوریشەی دەوڵەتەوە، لیبرالیە و گریمانە سەرەکیەکەی بریتیە لە جیاکردنەوەی کۆمەڵگا و دەوڵەت و گواستنەوەی مافەکانی کۆمەڵگا بۆ دەوڵەت. ئازادی لە روانگەی هۆبزەوە تەنها لەژێر سایەی لیڤیساندا دێتە دی. لیڤیسان دەسەڵاتێکی رەهای هەیە، بەڵام زامنی ئازادیەکانی تاکەکەسە:"دەوڵەت وەك ئەو دیوارانەی رێگایە کە مەبەست لە دروستکردنی راوەستاندنی موسافیرەکان نیە، بەڵکو رێنمای و رێگەگرتنە لە گومڕاهیان".لیڤیسان ناتوانێت تاکێك ناچار بە قبوڵکردنی بیروڕایەك بکات، چونکە بیروڕا ئازادە. لیڤیسان تەنها نرخێکە کە دەبێت لە پێناوی دابینکردنی ئاشتی و رێکخستن و ئارامیدا بیدەین. بەهەرحاڵ لیڤیسان دەستکردە و دەرئەنجامی رازیبوونی گشتیە و خاڵیە لەهەر رەمزو رازێك. ئامانجی دەوڵەتیش خزمەتکردنی تاك و دابینکردنی ئاشتی و ئاسایشی تاکە. ئامانجی کۆمەڵگای سیاسیش دابینکردنی بەرژەوەندی دەوڵەت نیە، بەڵکو دابینکردنی بەرژەوەندی تاکە. جۆن لۆکیش وەك هۆبز دەوڵەتی بە بەرهەمی پەیمانی کۆمەڵایەتی بۆ کۆتایهێنان بە دۆخی سروشتی دەزانی، بەڵام بە پێچەوانەوەی هۆبزەوە بڕوایوابوو مرۆڤ تەنانەت لە دۆخی سروشتیشدا خاوەن مافی سروشتیە و دەوڵەتیش بۆ پارێزگاریکردن لەم مافانە دامەزراوە. لەئەنجامدا تاك مافی هەیە لەبەرامبەر هەر دەسەڵاتێکی دیکتاتۆردا کە پێشێلکەری مافە سروشتیەکانی بێت، رابوەستێت. لۆك گەورەترین فەیلەسوفی قوتابخانەی لیبرالیزم و ناوەڕۆکی بیرکردنەوەی هەوڵدانە بۆ سنوردارکردنی دەسەڵاتی دیکتاتۆریانە. لەدیدی لۆکدا دەوڵەت تەنها ئامێرێکە بۆ بەرگریکردن لە مافەکانی کۆمەڵگا. کۆمەڵگا بەر لە دەوڵەت بوونی هەبووە و هەموو مافەکانی بە دەوڵەت ناسپێرێت. دەسەڵات سنوردارە بە دابینکردنی بەرژەوەندی و ئارەزووەکانی

کۆمەڵگا. لە دۆخی سروشتیدا مرۆڤ " ئازادە لە دەسەڵاتی سەرەوە بەسەر زەویدا " بەڵام ملکەچی یاساکانی سروشتە و مافە سروشتیەکان و بەتایبەتی مافی ژیان و موڵکایەتی، لە مافە سروشتیەکانەوە هاتووە. لەگەڵ ئەوەشدا لەدۆخی سروشتیدا ئەگەرچی جەنگ نیە، ئەوا ئاشتیش زەمانەتی نیە و لێرەوەیە پەیمانێك بۆ دروستکردنی کۆمەڵگای مەدەنی یان دەوڵەت دەبەسترێت. بە بڕوای لۆك گرنگترین ئامانجی تاکەکان لە چونە ناو کۆمەڵگای مەدەنی و ملکەچی بۆ دەوڵەت، پاراستنی موڵکایەتیە. حکومەت بەشێوەیەکی گشتی وەکالەتێکە لەلایەن خەڵکەوە و بەرهەمی پەیمانە، نەك لایەنێکی پەیمان.

پاش لۆك، مۆنتیسیکۆ و ئادەم سمیس بنەما یاسایی و ئابوریەکانی لیبڕاڵیزمیان هێنایە پێشێ. مۆنتیسیکۆ بەرگری لە جیابونەوەی دەسەڵات و مافە فیودالیەکان لەبەرامبەر دەوڵەتی رەهای لویی چواردەهەمدا دەکرد، و دیکتاتۆرەکانی بەو دڕندانە دەشوبهاند کە بۆ خواردنی میوەیەك، درەختەکە هەڵدەکەنن (مەبەستی لویی چواردەهەمە کە بەبڕوای مۆنتیسیکۆ دەیویست بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی رەهای خۆی، رەگ و ریشەی خێزانە گەورەکانی فەرەنسا هەڵبکەنێت). مۆنتیسیکۆ بۆ سنوردارکردنی دەسەڵاتی دیکتاتۆرانە، باشترین دەستور یان حکومەتی بەوە دەزانی کە لە سێ رەگەزی تاکەکەسی (پاشا)، ئەرستۆکرات (نەجیبەکان) ودیموکراسی (ئەنجومەنی چینە سێ لایەنەکان) پێکهاتبێت. لە روانگەی مۆنیسیکۆوە گرنگترین خەسڵەتی ئەم حکومەتە جیابونەوەی دەسەڵاتەکان و چاودێریکردنیانە بەسەر یەکدیەوە. مۆنتیسیکۆ هەروەها بەرگری لە جیابونەوەی دەوڵەت و کەنیسە و چاودێریکردنی هەریەکێکیان بەسەر ئەوی دیەوە دەکرد.

لەسەدەی هەژدەهەمەوە تۆمس پین (1737–1809) لە بەرهەمەکانی خۆیدا کۆنترین دەربڕینی بۆ بنەماکانی لیبڕاڵیزمی سەرەتایی بەدەستەوەداوە. پین سەرقاڵی خەباتکردن بوو بۆ شۆڕشی سەربەخۆیی ئەمەریکا و شۆڕشی فەڕەنسا. پین لە کتێبی عەقڵی تەندروستدا (1766) بەرگری لە بزوتنەوەی سەربەخۆیی ئەمەریکا کردو لە کتێبی مافەکانی مرۆڤدا (1793) هێرشی کردە سەر حکومەتە ئەرستۆکراتە کۆنەکان و ستایشی دەستکەوتەکانی شۆڕشی فەڕەنسی کرد. بەبڕوای پین حکومەتی دیموکراتی بە حوکمی عەقڵ و یاسای سروشت پێویستە و حکومەتێکی لەمچەشنە زامنی مافە سروشتیەکانی مرۆڤە. بەپێی یاسا و مافە سروشتیەکان هەرکەس مافی ئەوەی هەیە بە حوکمی عەقڵی خۆی بڕیار بۆ ژیانی ئەخلاقی، مەزهەبی، سیاسی، ئابوری خۆی بدات. پین بەتایبەتی لە کتێبی سەردەمی عەقڵدا (1796) بەرگری لە ئازادی مەزهەبی کرد و گاڵتەی بە کەنیسە کرد و رایگەیاند "زیهنی من، کەنیسەی منە". پین هەروەها بنەمای دەوڵەتی بچوکی لە یاسا و مافە سروشتیەکانەوە هەڵێنجا و تەنها ئەرکی حکومەتی بە پاراستنی مافە سروشتیەکانی تاك دەزانی. بەبڕوای پین لەبواری ئابوریشدا تاکەکان دەتوانن بەبێ

دەستێوەردانی و پاراستنی دەوڵەت، بەدوای بەرژەوەندیەکانی خۆیاندا بڕۆن.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەبیرکردنەوەکان تۆمس پینیشدا تێکەڵبونێك لەنێوان بنەماکانی لیبڕاڵ-دیموکراسی و ئایدۆلۆژیەکانی تردا، بەتایبەتی سۆشیالیزم و رادیکالیزم، دەبینرێت. بیرکردنەوەکانی تۆمس پین لەپراکتیکدا بووە ئیلهام بەخشی بزوتنەوەی چینی کرێکاری ئینگلیز. هەروەها پین بەرگری لە مافە کۆمەڵایەتیەکانی چینەکانی خوارەوە دەکرد. پین زەمانی کۆمەڵایەتی بە بەشێك لە مافە سروشتیەکانی تاکەکان دەژمێرێت و دانانی باجی لەسەر میرات و سامان، بە گرنگترین سەرچاوەی دابینکردنی بودجە دەزانی.

بەشێوەیەکی گشتی بزوتنەوەی فکریی لیبڕاڵیزم شۆڕشێکی تیوری لەسەدەی حەڤدە و هەژدەدا بەرپاکرد و بیرۆکەی سنورداركردنی دەسەڵات بە یاسا، ئەوەی کە دەوڵەت لەسەر پەیمانێك دامەرزاوە، ئازادی کارو دارایی لەهەرجۆرە کۆتێکی فیودالی، بەرهەمهێنا. لەو سەدانەدا بیرکردنەوە لیبڕاڵیەکان بنەمای سەرەکی شۆڕشەکان و ریفۆرمی گەورە بوو کە لە ئەوروپادا رویدا. ئەو سیستەمە ئابوری و کۆمەڵایەتیەی لەدوای لیبڕاڵیزمەوە دروستبوون، وەرگێڕانی دروشم و بیرکردنەوە لیبڕاڵیەکان بوو. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لەو سەردەمەدا تەنها چینە بازرگانەکان سودیان لەم گۆڕانانە بینی و ئایدۆلۆژیای لیبڕاڵیزم رەنگدانەوەی بەرژەوەندیەکانی ئەم چینانە بوو. بەڵام پاشتر خەباتی کۆمەڵایەتی بۆ سودمەندبوونی چینەکانی دی کۆمەڵگا لە دەستکەوتە شۆڕشگێڕانەکانی لیبڕاڵەکان، هێواش هێواش بیرکردنەوەی لیبڕاڵیزمی دیموکراتیتر کرد. لیبڕاڵیزم پاش شۆڕشی ساڵی 1848 دەبوو خۆی لەگەڵ پێداویستیەکانی دیموکراسی تازەدا بگونجێنێت و دروشمە سەرەکیەکانی لیبڕاڵیزم و بیرۆکەی یەکسانی، بۆ چینی کۆمەڵایەتی فراوانتر، پەرەپێبدا. پەیڕەوانی لیبڕاڵیزم کە ئایدۆلۆژیاکەی خۆیان لەگەڵ بەرژەوەندی چینە باڵادەستەکانی سەردەمی سەرمایەداری بازرگانیدا گونجاندبوو، هەنوکە دەبوو بیرکردنەوەیەکی دی لە دروشمەکانی خۆیان بکەن و لەگەڵ دیموکراتیەکاندا بیگونجێنن. بەمشێوەیە بیرۆکەی یەکسانی (سیاسی و کۆمەڵایەتی) لەپاڵ بیرۆکەی ئازادیدا، لە ئایدۆلۆژیای لیبڕاڵیزمدا بەهێز بوو. بەشێوەیەکی گشتی لە فەلسەفەی لیبڕاڵیزمدا وەك بینیمان بواری گشتی لە بواری تایبەتی جیا دەبێتەوەو، بەرگری لە مافەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بەتایبەتی مافی موڵکایەتی لەبەرامبەر دەسەڵاتی دەوڵەتیدا دەکرێت و جەخت لە پێویستی سنورداركردنی دەسەڵاتی دەوڵەت دەکرێت. بەڵام لە روانگەی لیبڕاڵیەوە دەوڵەت لەبەرامبەر کۆمەڵگادا هیچ بەرپرسیاریەکی جگە لە پاراستنی مافەکانی تاك نیە. لەبەرامبەر ئەمەدا فەلسەفەی دیموکراسی کە هێواش هێواش بە گۆڕانکاری لیبڕاڵیزم دروستبوو، جەخت لەسەر بەرپرسیاری بەربڵاوی دەوڵەت بۆ دابینکردنی جۆرێك لە یەکسانی لەبەرامبەر کۆمەڵگادا دەکات. دیارە دەوڵەت نابێت زیاد لە لایەنیکەمی پێویست و ناچاری، دەست لە ئابوری و کلتورەوە بدات، بەڵام دەبێت

هەوڵبدات بۆئەوەی لایەنی زۆری خوشبەختی و شادی بۆ لایەنی زۆری خەڵکی دابینبکات. بەمشێوەیە دەوڵەت لە دیموکراسیدا تەنها پارێزگاری لە کۆمەڵگای مەدەنی ناکات، بەڵکو بەرپرسیارە لە پەرەسەندنیشی. لێرەوە لە دیموکراسیدا تارادەیەك دەستتێوەردانی دەوڵەت پێویستە.

لیبڕاڵیزم لەرووی مێژووی بیرکردنەوەی سیاسییەوە سەرەتا لە بیرکردنەوەکانی قوتابخانەی سودخوازی و بەتایبەتی لای جرمی بنتهام (748–1832) ئاراستەیەکی دیموکراتیانەتری وەرگرت. ئەم قوتابخانەیە لە نیوەی سەدەی هەژدەهەمەوە تا نیوەی سەدەی نۆزدەهەم لە ئینگلتەرادا بیرکردنەوەی سیاسی باڵادەست بوو، و بیریارانی وەك دیڤید هیوم و جیمز میل و جرمی بنتهام نوێنەری بوون.

لە روانگەی بنتهامەوە تەنها بەهانەی بوونی دەوڵەت ئەوەیە کە ئەگەری بەدیهاتنی لایەنی زۆری بەختەوەری بۆ زۆرینەی خەڵك، ئامادەبکات. بەشێوەیەکی دیاریکراوتر بنتهام بڕوای وابوو بەپێی بنەماکانی سودخوازی سەرەتا دەبێت بەدوای شادی و بەختەوەری شەخسی و پاشان شادی و بەختەوەری ئەوی دی و پاشان زۆرترین شادی بۆ زۆرترین ژمارە و دواجار بەرزترین سنوری شیاوی شادی و بەختەوەری، بگەڕێین. کارێك راستە گەر ببێتە هۆی دابەشکردن و هاوسەنگی شادی و لەزەت، لەناو ژمارەیەکی زۆرتی خەڵکیدا. ئامانج لە دروستکردنی دەوڵەت پاراستن و زیادکردنی شادی و بەختەوەری گشتیە. بنتهام مافە سروشتیەکانی بە بڕوایەکی پوچ دەزانی و تەنها دەوڵەتی بە سەرچاوەی مافە فەردیەکان دەژمارد، بەڵام هەمان مافی سروشتی فەیلەسەفە لیبڕاڵەکانی بەتایبەتی مافی موڵکایەتی تایبەتی بۆ تاك بە رەوا دەزانی. لەگەڵ ئەمەشدا بەبڕوای بنتهام ئامانجی کۆتایی دەوڵەت نەك دابینکردنی زۆرترین ئازادی، بەڵکو دابینکردنی لایەنی زۆری شادی و بەختەوەری هەموانە. ئازادی دەبێت تەسلیمی شادی و بەختەوەری بێت. لێرەوە بنتهام لایەنگری دیموکراسی و یەکسانی رێژەیی بوو لە موڵکایەتیدا، بە مەبەستی دابینکردنی بەختەوەری گشتی. هەرلەبەر ئەمەش هەندێك لە رەخنەگران شادیخوازی زۆرینە بە جیاواز لە تاکگەری لیبڕاڵی و هاودەنگ لەگەڵ دیموکراسی نالیبڕاڵیدا دادەنێن. بەدەربڕینێکی دی لە بیرکردنەوەی بنتهامدا هەندێك ناکۆکی لیبڕاڵیزم لەگەڵ دیموکراسیدا ئاشکرا بووە. ئەم ناکۆکیانە لەبیرکردنەوەی جۆن سیتوارت میلدا زۆرتر دەردەکەوێت.

جۆن ستیوارت میل گرنگترین نوێنەری فەلسەفەی دیموکراسی لە سەدەی نۆزدەدا بوو. میل بە پێچەوانەی ئابوریزانانی کلاسیکەوە، بەڵگەی دەهێنایەوە کە دابەشکردنی کاڵا و سامان لە کۆمەڵگادا ملکەچی یاساگەلێکی سروشتی نەگۆڕ نیە، و هەر لێرەشەوە بەرپرسیارێتی هوشیارانەی دەوڵەت لەم بوارەدا دەستدەکەوێت. هەروەها بەپێی بنەماکانی لیبڕاڵیزم بەڵگەی دەهێنایەوە کە مافی بەشداریکردن لە ژیانی سیاسیدا دەبێت گشتی بێت. لەروانگەی میلەوە بەشداری خەڵکی لە ژیانی سیاسیدا، بە باشترین رێگەی

پـــــەروەردەکردنی خـــــەڵکیش دەژمێرێـــــت. بەشێوەیەکی گشتی لە روانگەی جۆن ستیوارت میلــەوە دیموکراســی بــەمانای بەشــداریکردنی هــەموان لـە سیاسـەتدا، زیـاتر لـە لیبڕاڵیـزم کـە دەرئەنجامەکـــەی بۆتـــە حکومـــەتی چـــینی بۆرژوازی، لە دادپەروەریەوە نزیکە. لە روانگەی میلـــەوە دەرئـــەنجامی لـــۆژیکی لیبڕاڵیـــزم، دیموکراســـیە. دەوڵـــەتی دیمـــوکراتی دەبـــێ بەرپرســـــیاری بــــەربلاو بـــۆ دابینکردنـــــی خۆشگوزەرانی گشتی و کەمکردنـەوەی توندی ناکۆکیـە چینایەتیەکان، لـە ئەستۆ بگرێت. لـەم روانگەیــەوە دەســتێوەردانی دەوڵــەت خــۆی، بەشێکە لە سیاسەتی لیبڕاڵی، چونکە ئامانجی ((ئـەم دەسـتێوەردانە)) نەهێـشتنی ئـەو رێگـرە نـائیرادی و نەخوازراوانەیــە کــە دێنــە بــەردەم هەوڵــــە ســــودخوازەکانی تاکەکــــەس. میــــل بەپێچەوانەی بنتهامەوە بەڵگەی دەهێنایـەوە کە ئامانجی مرۆڤ تەنها شادی و لـەزەت نیە، بەڵکو ئازادی و کەرامەت و شەرەفی مرۆڤ لەو بەرزترە. دەوڵــەت دەزگایــەکی ئەخلاقیــە و ئامــانجێکی ئـەخلاقی هەیـە کـە بریتیـە لـە پـەروەردەکردنی فەزیلــەت لــە تاکەکەســدا. بــە دەربڕینێکــی دی ئـــازادی تـــەنها بـــۆ دابینکردنـــی شـــادی و بەختـەوەری پێویـست نیـە، بـەڵکو پێداویـستی پەرەسـەندنی کەرامـەتی مرۆییە. بـەڵام ئـازادی بەمانای رزگاربوونی تاك لە هـەموو شێوەیەکی دەســـتێوەردانی دەرەکـــی نیـــە، دیـــارە لـــەو کردارانـــەدا کـــە رووی لـــە خـــودە (کـــردارە ئەخلاقیـــەکان)، دەســـــتێوەردانی دەوڵـــــەت رێگەپێدراو نیـە، بەڵام لـەو کردارانـەدا کـە رووی لــەوانی دیــە، دەســتێوەردانی یاســا و دەوڵــەت پێویــستە. بەمپێیــە بەدواداچــوونی شــادی و بەرژەوەنــدی تایبــەتی بــە پێــچەوانەی بــڕوای بنتهامــەوە، نابێتــە هــۆی دابینکردنــی شــادی و بەرژەوەندی گشتی. لێرەوە دەوڵـەت دەبێـت لـە رێگــەی دەســتێوەردانی ئابوریــەوە کاریگــەری نایەکسانی کۆمەڵایـەتی کەمبکاتـەوە و ژیـان بـۆ جــەماوەری خــەڵکی بکاتــە شــتێکی قــابیلی تەحــەمولکردن. کــەوابوو بنــەمای دابینکردنــی شــادی و بەختــەوەری بــۆ زۆرینــەی خــەڵك، پێویـستی بـە دەسـتێوەردانی ئـابوری دەوڵـەت هەیـە. لەگـەڵ ئەمەشـدا میـل نیگـەرانی ئـەوەبوو نــەوەکا دیموکراســی بگۆڕێــت بــۆ دیکتــاتۆری زۆرینـە. بـەبڕوای میـل دیموکراسـی ژمـارەیی، دیموکراســـیەکی درۆزنانەیـــە کـــە جیاوازیـــە سروشتیەکانی تاکەکان، فەرامۆشدەکات.

لێرەدا دەتوانین ئەو ئەنجامگیرییە بکـەین کـە لـە گـۆڕانی لیبڕاڵیزمـدا بـۆ لیـبڕاڵ-دیموکراسـی، ئــازادی نیگــەتیڤ جێگــەی خــۆی بــە ئــازادی پــۆزەتیڤ دەدات. لـــە لیبڕاڵیزمـــی ســـەرەتادا ئازادی بەمانای ئاسایشی گیـان و سـامانی تـاك بــوو لەهــەر جــۆرە دەســتدرێژیەکی دەرەکــی (لەوانـە دەسـتدرێژی دەوڵـەت)، لەکاتێکـدا لـە لیـبڕاڵ- دیموکراسـیدا ئـازادی واتـە توانـای هەڵبـژاردن و دەسـەڵاتی خاوەنـدارێتی تـاك بـۆ مافـە سروشـتیەکان. لـەم مانایـەدا دەوڵـەتیش بەرپرســیار دەبێــت کــە لــەکاتی پێویــستدا، هاوکاری تاك بکات بۆ زیاترکردنی تواناکانی. لە مانای یەکەمدا دەوڵەت خراپیەکی پێویستە کە دەستکاری ئازادی ئابوری تاك دەکات، بەڵام بـۆ پاراسـتنی دارایـەکانی پێویـستە. بـەڵام لـە مانای دوهەمدا دەوڵەت بە دەزگایەکی سودمەند

دەژمێرێت کە دەتوانێت قەرەبووی ئەو زیان و ناڕەواییانە بکات کە دەرئەنجامی بازاڕی ئازادە. لە لیبڕاڵیزمی سەرەتادا دەبێ واز لە تاک بهێنرێت بۆئەوەی بتوانێت لە ئەوپەڕی ئازادی شیاودا، رکەبەرایەتی لەگەڵ ئەوانی دیدا بکات، بەتایبەتی تاک دەبێت لەبواری ئابوریدا بەپێی پاڵنەرە سودخوزایەکانی خۆی کاربکات، بۆئەوەی بەرژەوەندی تاک و کۆمەڵگا بەپێی یاسا سروشتیەکانی دانوستان دابین بکرێت. بەڵام لەمانای دوهەمدا خودی بیرۆکەی ئازادی ئابوری بێسنور، بە سنورداریتیەك بۆ ئازادی و پێشێلکردنی بنەما سەرەکیەکانی لیبڕاڵیزم دەژمێرێت. تیورەی سودخوزای بنتهام ئازادی فەردی نێگەتیڤی لەگەڵ بنەمای شادی و بەختەوەریدا تێکەڵکردو، بەمشێوەیە بنەمای ئازادی بە بنەمای یەکسانی تاکەکان بۆ بەهرەمەندبوون لە شادی و بەختەوەری، کاملکرد. جۆن ستیوارت میلیش بە ئاشکراکردنی پێویستی دەستێوەردانی دەوڵەت لە مەسەلەی وەك: هاندانی پەروەردە، چاودێری بارودۆخی کۆمەڵایەتی کرێکاران، دابینکردنی تەندروستی گشتی..وهتد، جەختی لەسەر ئازادی پۆزەتیڤ، وەك بەشێکی سەرەکی لیبڕاڵ–دیموکراسی کرد. بەمشێوەیە نوسەرانی لیبڕاڵ لەکۆتایی سەدەی نۆزدەدا هێواش هێواش جەختیان لەسەر گرنگی و پێویستی دەستێوەردانی دەوڵەت لە مەسەلەکانی کۆمەڵگادا کرد بۆ دابینکردنی ئازادی و یەکسانی تاکەکان. بەمشێوەیە لیبڕاڵیزمی نیگەتیڤ گۆڕا بۆ لیبڕاڵیزمی پۆزەتیڤ کە دواجار لەسەدەی بیستدا بوو بە بنەمای تیوریی پەیدابوونی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی. وەك پێشتر ئاماژەی بۆ کرا تا پێش پەیدابوونی بزوتنەوە و بیرکردنەوەی لیبڕاڵیزمی نوێ کە جارێکی دی بەرگری لە دروشمەکانی لیبڕاڵیزمی سەرەتا دەکاتەوە، لیبڕاڵەکان و لیبڕاڵیزم بەشێوەیەکی گشتی ئاراستەیەکی ریفۆرمخواز و دیموکراتیان وەرگرتبوو کە بەرگریان لە بونیاد و سیاسەتەکانی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی دەکرد. بە دەربڕینێکی دی لیبڕاڵیزمی سەدەی بیستەم جەختی لەسەر پێویستی بەشداری سیاسی هەموو گروپ و چینە کۆمەڵایەتیەکان، دژایەتی فەقیری و بێکاری، پتەوکردنی دەزگای ئەنجومەن، بەرپرسیاری کۆمەڵایەتی دەوڵەت (دەوڵەتی پۆزەتیڤ) و شتی دی کردووە. بەمشێوەیە لیبڕاڵیزم لە 1880 وە تا 1914 ئاراستەیەکی پۆزەتیڤ و دیموکراتی وەرگرت. ئەو خاڵەش شایستەی دوبارەکردنەوەیە کە جیاکردنەوەی لیبڕاڵیزم لە دیموکراسی –وەك لەبارەی حیزب و گروپ و رژێمە سیاسیەکانەوە پێویستە– لە باسکردنی بیرکردنەوەی سیاسیدا نەك پێویست نیە، بەڵکو هەندێکجار دروستکراو دەردەکەوێت. وەك پێشتر گوتمان لیبڕاڵیزم بەمانا فراوانەکەی وەك بزوتنەوەیەکی فکری گشتی، سەرچاوەی دیموکراسی، سۆشیالیزم، رادیکالیزم و ریفۆرمخوازی بووە و بنەماکانی لەگەڵ ئایدۆلۆژیا سیاسیەکانی راست و چەپ و ناوەڕاستدا گونجاوە. بەڵام لەسەدەی بیستدا لیبڕاڵیزم وەك تیورەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابوری دیاریکراو و سنوردار، تەنها لە ئەندێشە و پراکتیکی لیبڕاڵیزمی نوێدا، جیاکاریەکی رونی

لەگەڵ ئایدۆلۆژیای لیبراڵ – دیموکراسیدا پەیداکردووە، و لەم شێوەیەشدا لێکچوونی زۆری لەگەڵ کۆنزەرڤاتیڤدا هەیەو هەندێکجار بۆ وەسفکردنی زاراوەی کۆنزەرڤاتیڤی نوێ بەکارهێنراوە (دیارە لیبراڵە نوێکان گریمانە سەرەکیەکانی کۆنزەرڤاتیڤ وەك ئەسڵ و فەسڵ و خێزان و مەزهەب قبوڵناکەن). لەراستیدا تیورەی لیبراڵیزم کە لەسەدەی نۆزدەهەمدا بە سەرنجدان لە سنورداریێتی کارەکانی دەوڵەت، سەرنجی لە کۆمەڵگا و بازاڕ دابوو، لەسەدەی بیستدا بە زیادبوونی کارەکانی دەوڵەت ناچاربوو دەوری دەوڵەت لەبەرچاو بگرێت. هەموو لیبراڵەکانی سەدەی بیستەم بەشێوەی جیاواز هەستیان بە پێویستی پێداچونەوە بە مەسەلەی دەوری دەوڵەتدا کردبوو، لەمڕوەشەوە بیروڕای خۆیان گوتبوو. بەشێوەیەکی گشتی ئەم بیروڕایانە لەگەڵ بنەماکانی لیبراڵیزمدا لەبارەی ئازادی تاك لە دیکتاتۆری و دەسەڵاتی سیاسی، ناکۆك نیە. لە بنەڕەتدا لیبراڵیزم خوازیاری ئازادی تاك لە دەسەڵاتی مەزهەبی، سیاسی، نەریت و چینایەتی بووە، و هەنوکەش کە چڕبونەوەی دەسەڵاتی ئابوری لە پاوانکردنەکاندا ڕێگری تازەی بۆ ئازادی تاك دروستکردووە، روکردنە دەوڵەت وەك هۆکارێکی هاوسەنگی، لەگەڵ بنەما سەرەکیەکانی لیبراڵیزمدا ناکۆك نیە، و دیارە نەفی روبەروبونەوەی ئازادی و دەسەڵاتداریێتی ناکات. بە سەرنجدان لە ئاراستەی روو لە زیادی لیبراڵیزمی کلاسیك بەرەو بیرۆکەی یەکسانی و پێویستی دەستێوەردانی دەوڵەت لەسەدەی بیستدا، ئەمڕۆ دەبێت روبەروبونەوەی سەرەکی لەنێوان لیبراڵ دیموکراسی یا سۆشیال دیموکراسی لەلایەك و ئاراستەکانی لیبراڵە نوێکاندا بدۆزینەوە.

بەپێی ئەوەی گوترا دیموکراسی لەرووی مێژووییەوە دیاردە و چەمکێکی دەوڵەمەندتر و فراوانتر لە لیبراڵیزم بووە. بەگشتی دیموکراسی بە پێکهاتوو لەم رەگەزانە دەزانن: یەکسانی یاسایی و سیاسی هەموو تاکەکان، دەسەڵاتداریێتی خەڵکی، هەڵبژاردنی فەرمانڕەوایان، جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، بنەمای حکومەتی زۆرینە، فرەیی بەهاکان و گروپە کۆمەڵایەتیەکان، بەشداریکردنی بەردەوامی کۆمەڵگا لە بڕیارە سیاسیەکاندا، ئەگەری یاساڕێژی لەهەموو بوارەکاندا بەپێی رای خەڵك و بێ سەرنجدان لە بەڵگەی نەریتە دێرینەکان، رەسەنایەتی عەقڵی تاك بۆ بڕیاردان لە شێوەی ژیانی خۆی، سنورداربوونی دەوڵەت بەیاسا دانراوەکانی و شتی دی. فرەیی رەگەزەکانی دیموکراسی تارادەیەکی زۆر دەرئەنجامی ئەوەیە دیموکراسی لەبنەڕەتدا سیستەمێکی حکومەتیە، لەکاتێکدا لیبراڵیزم سیستەمێکی فکرییە. لێرەوە دیموکراسی چەمکێکی ئاڵۆز و فرە رەهەندە و ئەو ئاڵۆزیەی لە ماناکەیدا هەیە دەرئەنجامی ئەو جەختکردنەیە کە بیریاران و لایەنگرانی دیموکراسی لەسەر هەندێك رووی تایبەتی دیموکراسی دەیکەن. لە پراکتیکیشدا زوربەی حکومەتەکان هەندێك رووی دیموکراسیان لەگەڵ هەندێك رووی رژێمە نادیموکراتیەکاندا (ئولیگارشی، حکومەتی ئەرستۆکراتی، رژێمە

دیکتاتۆریەکاندا) ئاوێزان کردووە. جگە لەمەش پاشگری جیاوازیان بۆ دیموکراسی زیادکردووە کە دەرئەنجامی ئایدۆلۆژیگەلێکی دی و هەلومەرجی مێژوویی بووە "دیموکراسی رێنمایکەر، دیموکراسی دینی، دیموکراسی کۆمەڵایەتی، دیموکراسی واقعی، دیموکراسی جەماوەری، دیموکراسی پەتی".

ئەوەی کە حکومەتە جیاوازەکان خۆیان بە دیموکراتی ناودەبەن، لەبەر چەند هۆیەك سەرسوڕهێنەر نیە. سەرەتا لەبەرئەوەی بیرکردنەوەی دیموکراتی زۆر بەربڵاو و پڕە لە بیرکردنەوەی جیاواز و تەنانەت ناکۆك بەیەك لەبارەی بناغەی دروستبونی دەوڵەت، خەسڵەتی مرۆڤ، کارە تایبەتیەکانی حکومەت، و شتی دی. لێرەوە هەموو کەسێك دەتوانێت بەپێی بەرژەوەندی و پێویستیەکانی خۆی سودی لێببینێت. لە نەریتی فکری دیموکراسیدا لەبارەی سەرچاوەی دەوڵەتەوە هەم تیورەی پەیمانی کۆمەڵایەتی هەیە، هەم تیورەی سودخوازی، مرۆڤ هەم بە بونەوەرێکی تەواو ئەخلاقی، عەقڵانی و سروشتی دەزانرێت، هەم بە بونەوەرێکی تەواو بەرژەوەندیخواز. بۆ نمونە یەکێك لە جیاوازیە فکریە سەرەکیەکان سەبارەت بە خەسڵەتی نوێنەرایەتیەوە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە ئایا نوێنەران دەبێ نوێنەری خواست و بیروڕای خەڵکی بن، یان نوێنەری بەرژەوەندیەکانیان. بنتهام بڕوای وابوو کە خەڵك باشتر لەهەرکەسێك بەرژەوەندیەکانی خۆیان دەزانن و لێرەوە نوێنەران دەبێ نوێنەری بیروڕای خەڵکی بن. لەبەرامبەر ئەمەدا جۆن ستیوارت میل بەڵگەی دەهێنایەوە کە نوێنەران ناتوانن تەنها نوێنەری بیروڕا تێپەڕ و ناکامڵەکانی خەڵکی بن و دەبێت چاویان لەسەر بەرژەوەندییە واقعیەکانی خەڵکیش بێت. هۆی دوهەم ئەوەیە خەڵکی بە پێچەوانەی رابردووەوە چیدی نەزان و نەخوێندەوار نین و پێویستیان بە سەرپەرشتی و رێنماییکردن نیە، و لەسەردەمی تازەدا بەکردەوە یان لە رووی فکرییەوە، لەشانۆی سیاسەتدا ئامادەن. هەروەها ئەوەی کە رابەرانی تەنانەت دیکتاتۆریش پشت بەوان دەبەستن و بۆ رەوایەتی بەخشین بە خۆیان بەدوای لایەنگری خەڵکیدا دەگەڕێن، تا ئەندازەیەك ئاماژە بۆ ئاراستەی دیموکراتی حکومەت دەکات.

دیموکراسی لە مانای تازەدا هەم جۆرێك حکومەت و هەم جۆرێك کۆمەڵگایە. بەبێ کۆمەڵگایەکی دیموکراتی یان بنەما کۆمەڵایەتیەکانی دیموکراسی، حکومەتی دیموکراتیش بوونی نابێت. لە بنەڕەتدا لە فەلسەفەی سیاسی کۆندا دیموکراسی بەجۆرێك حکومەت دەژمێررا، لەکاتێکدا لەفەلسەفەی سیاسی سەردەمی تازەدا مانایەکی فراوانتر لە حکومەتی هەیە. جگە لەمەش بەشێوەیەکی گشتی لە فەلسەفەی سیاسی کۆندا دیدێکی بەدبینانە بەرامبەر بە دیموکراسی و بەتایبەتی دیموکراسی پەتی هەبوو، و زۆرجار بەرگری لە دیموکراسیەکی تێکەڵ بە هەندێك رەگەزی ئولیگارشی و حکومەتی ئەرستۆکرات (بەو شێوەیەی ئەرستۆ رایگەیاندبوو) دەکرا. دیموکراسی پەتی بە حکومەتی خەڵکی نەزان و ئامادە بۆ ناسەقامگیری و دیکتاتۆری و خەڵك فریودان دەژمێررا. لە شۆڕشی فەرەنسیدا بوو

کــە وشــەی دیموکراســی مانایــەکی پــۆزەتیڤی وەرگــرت. لــە دیــدی لایــەنگران و نەیارانــەوە دیموکراســی بەرهــەمی شــۆڕشــی فەرەنــسایە، هەرچــەندە دیموکراســی یاکۆبینــەکان یــان زۆرینەیەك کە پاش شۆڕش پێکهات، تێکەڵەیەك بوو لە دیموکراسی و دیکتاتۆری شۆڕشگێڕانە کە لە دروشمەکانی لیبڕاڵ دیموکراسیەوە زۆر دوور بوو. دیارە خەمی سەرەکی شۆڕشگێڕانی فەرەنــسا رووی لــە تێکــشکانی سیــستەمی ئەرســـــتۆکراتی و ئیمتیـــــازاتی چـــــینە ئەرســتۆکراتەکان بــوو، ((واتــە)) دیموکراســی خەســڵەتێکی خەباتگێڕانــە و شۆڕشــگێڕانەی هەبوو. لەئەنجامدا دیموکراسی شۆڕشگێڕانەی فەرەنسا، سیمایەکی تۆتالیتارانەی وەرگرت و نەیارانی بە سیستەمێکی جگە لە دیسپۆتیزمی زۆرینەیان نەدەژمارد. ژان ژاك رۆسۆ تیورەزەنی ســەرەکی دیموکراســی جاماوەریــە. بــەبڕوای رۆسـۆ لـە دیموکراسـی جەماوەریـدا، ئـیرادەی گـشتی بەتـەواوی دەردەکـەوێت و ملکەچـی بـۆ ئـیرادەی گـشتی وەك ملکەچـی بـۆ ئـیرادەی خوداوەنـدە. لەدیـدی رۆسـۆوە ئـیرادەی گـشتی قـابیلی سـپاردن و تـەوکیل نیـە و ئـەم ئیرادەیـە ئاشـکراکەری بەرژەوەندیـە گـشتیەکانە. دواتـر زۆر رەخنــە لــە دیموکراســی شۆڕشــگێڕانەی فەرەنــسا و نمونــە گــشتیەکەی، دیموکراســی زۆرینە گیرا.

گرنگرتــرین بابــەتی وتوێــژ وروژێنــەری دیموکراسی مەسەلەی یەکسانی بووە و، هەرلەم خاڵەشــــــدا دیموکراســــــی و لیبڕاڵیــــــزم بەریەکدەکـەوتن. دیموکراسیە دژ بـە لیبڕاڵـەکان (چ شۆڕشــگێڕانە و چ جــەماوەری) جــەختیان لەســەر یەکــسانی زیــاتر لــە ئــازادی کــردووە. بێگومــان دروســتکردنی هاوســەنگی لــەنێوان یەکــسانی و ئازادیـــدا کـــە لـــە دروشمـــە سەرەکیەکانی فەلسەفەی سیاسیە، وردترین و ســـەختترین ئامـــانجی دیموکراســـی بـــووە. جـەختکردن لەسـەر هەریـەك لـە دوو دروشمـی یەکسانی و ئـازادی، دەبێتـە هـۆی دورکەوتنـەوە لـە دیموکراسـی یـان لیبڕاڵیـزم. جگـە لەمـەش لایەنگرانی سودخوازی لەسەدەی نۆزدەشدا کە لـەبری یەکـسانی و ئـازادی، جـەختیان لەسـەر شادی و بەختەوەری هاوڵاتیان دەکرد، بەهەمان رێژە لە دروشمەکانی لیبڕاڵ دیموکراسیەکانەوە دوردەکەوتنــەوە، لەراســتیدا شۆڕشــگێڕانی فەرەنــساش دەیانویــست لــە دیموکراســیە دیکتاتۆرئاساکەی خۆیانـدا، دروشمـی ئـازادی لەژێر سەردێڕی ئامانجی شادی و بەختەوەریدا دابنێن، دیارە بۆ گەیشتن بەم ئامانجەش سڵیان لە بەکارهێنانی توندوتیـژی نەدەکردەوە. تـەنها لایــەنگرانی شــۆڕش بــە هــاوڵاتی و یەکــسان دەژمێرران و نـەیاران و دوژمنـانی شۆڕشیش بە هاوڵاتیانی یەکسان نەدەژمێرران.

لەلایـەکی دیـەوە لەدێرزەمانـەوە نوسـەرانی کۆنەرڤاتیڤتر بەردەوام نیگەرانی ئەو مەترسیانە بـوون کـە پەرەسـەندنی یەکـسانی بـۆ ئـازادی دروستیدەکات. بۆ نمونـە ئەلەکسی دۆتۆکڤیـل نوسـەری ئەرسـتۆکرات و پارێزگـاری فەرەنـسی، بــەپێی ئــەزمونی دیموکراســی جەکــسۆنی ئەمــەریکا، رەخنــەی لــە دیموکراســی مــۆدێرن بەشێوەیەکی گشتی و ئاراستەوەرگرتنی بەرەو دیکتاتۆریــەتی زۆرینــە، کۆمــەڵگای جــەماوەری وچـونیەکتر کردنـی سەرتاسـەری خـەڵك گـرت.

تۆكڤیـل نیگـەرانی پەرەسـەندنی ناچـارانەی یەكسانی بـوو لەهـەموو بوارەكـانی ژیانـدا و بەتایبەتی یەكسانی دەسەڵات و سەرچاوەكانی دەسـەڵاتی كـە بـە جەوهـەری دیموكراسـی دەژمێرێـت، بـە شـتێكی زەرەرمەنـد بـۆ ئـازادی دەزانـی كـە دەبێتـە هـۆی دروسـتبوونی دیكتاتۆری زۆرینە یان رژیمە دیكتاتۆرەكان كە لەلایـەن جـەماوەرەوە پـشتگیری دەكـرێن. لـە روانگەی دۆ تۆكڤیلەوە مەترسیەكانی یەكسانی یـان بـەدەربڕینێكی رونـتر كۆمەڵگایـەكی پێكهـاتوو لـە تـاكی لێكـچوو و چـونیەك (كۆمـەڵگای جـەماوەری) بـۆ ئـازادی، لـە مەترسیەكانی ئازادی بۆ یەكسانی، واقعیتر و جـدیتر بـوو، دیـارە نوسـەرە رادیكـاڵ و سۆشیالیستەكان بـەردەوام جـەختیان لەسـەر دوهـەم كـردووە ((واتـە لەسـەر مەترسـیەكانی ئـازادی بـۆ یەكـسانی)). لەراسـتیدا لـەم روانگەیـەوە ئـازادی بـەو مانایـەی لەسـەردەمی لیبڕاڵیزمـدا دەهێنرایـە پێـشێ، لـە ئـازادی بازرگـانی و بـازاڕی ئـازاد زیـاتر نـەبوو. بەشێوەیەكی گشتی كۆنزەرڤاتیڤەكان نیگەرانی مەترسـیەكانی یەكـسانی بـۆ ئـازادی بـوون و رادیكاڵەكانیش نیگەرانی مەترسیەكانی ئازادی بۆ یەكسانی. هەندێك لە نوسەرانیش لەدیدێكی فەلـسەفیەوە بڕوایـان وابـوو لـەنێوان خـودی ئـازادی و یەكـسانیدا نـاكۆكی هەیـە. بـەدەربڕینێكی دی ئـەم ناكۆكیـە تـەنها دەرئـەنجامی بونیـادی كۆمـەڵگاكانی ئـەمڕۆ و دابەشكردنی نایەكسانی سەرچاوە ئابوریـەكان نیە. ماكس فیبەر كاتێك باسی فرەیی و ناكۆكی ودژایـەتی ئامانجـە سـەرەكیەكانی ژیـانی مـرۆڤ دەكات (ئازادی، یەكسانی، شادی، بەختەوەری، ئاسایش، دادپەروەری و رزگاربوون و شتی لەم بابەتە) ئەم مانایە لە ناكۆكی مەبەستە. ئیزایا بـەرلین فەیلەسـوفی لیبڕاڵـی ئینگلیـزیش بڕوایوایـە كـە "مـرۆڤ لەبـەردەم هەڵبـژاردنی ئامانجگەلێكدایـە كـە بەیـەك ئەنـدازە رەهـا و ئامـانجن، و بـەدیهاتنی هەنـدێكیان خۆبـەخۆ دەبێتە هۆی قوربانی هەندێكی دیان".

لەسـەدەی بیـستدا زوربـەی لیبڕاڵـە راستڕەوەكان، وەك فردریك هایك و رابرت نوزیك و میلتون فریدمان، یەكسانی بە زەرەرمەند بۆ ئـازادی دادەنـێن و بڕوایـان وایـە كۆنابنـەوە، و قـسەكردن لـە دادپـەروەری كۆمەڵایـەتی بـۆ كۆمەڵگایـەكی پێكهـاتوو لـە تـاكی ئـازاد، بـە هۆكـاری پەیـدابوونی دەسـەڵاتێكی بـالاتر و سەندنی ئازادی مرۆڤەكان دەژمێرن. لەلایەكی دیـەوە زوربـەی لیبڕاڵـە چـەپەكان وەك هارۆلـد لاسكی و ئار ئیچ تاونی و جۆن دیوی، نكوڵی لە بوونی ناكۆكی لەنێوان ئازادی و یەكسانیدا دەكـەن و هـەردوكیان بـە بەشـێك لـە ئامـانجی فـراوانتر و دێـرینتر دەژمێـرن، یـان بـەدوای زنجیرەكـانی پەیوەنـدی لـەنێوان یەكـسانی و ئازادیـدا دەگـەڕێن. هەنـدێك لـە تیوریزەنـانی لیبڕاڵی هاوچەرخ باسی یەكسانی لە ئازادیدا و ئازادی تاكە یەكسانەكان دەكەن.

وەك بینیمـان دیموكراسـی لـەدوو چـەمكی ئـازادی و یەكـسانیدا، زۆرتـر بـە گەڕانـەوە بـۆ چەمكی یەكسانی پێناسدەكرێت، ئەگەرچی بە باشـترین سیـستەمی سیاسـیش بـۆ بـەدیهاتنی ئازادی دەژمێرێت. بەمشێوەیە ئاڵۆزی چەمكی یەكسانی بۆتە هۆی ئەوەی هەندێك لە نوسەران

ئەم چەمكە بەپێی چەمكە سەرەكیەكانی دی، وەك ئازادی و بەرژەوەندی گشتی رونبكەنەوە. یەكێك لە كێشەكانی دروستكردنی پەیوەندی لەنێوان یەكسانی و دیموكراسیدا ئەگەڕێتەوە بۆئەوەی گەر یەكسانی بە سەرەكیترین بەهای دیموكراسی بزانین و گەر یەكسانی مانای جیاوازی هەبێت (یەكسانی یاسایی، یەكسانی ئابوری، یەكسانی سیاسی)، ئەوا دیموكراسیش بەمانای جیاواز دەردەكەوێت و جگە لەمەش دیموكراسی لەمڕووەوە بەدرێژای زەمەن دینامیكی دەبێت و دەگۆڕێت. لەم ناوەدا یەكسانی سیاسی واتە مافی بەشداریكردن لە ژیانی سیاسیدا، وەك جەوهەری دیموكراسی مۆدێرن دەردەكەوێت. دەكرێت بەپێی رادەی بەشداریكردنیش، باس لە پلەی جیاوازی دیموكراسی بكرێت. بەپێی چەمكی یەكسانی سیاسی دیموكراسی دەبێت هەركەس لە كۆمەڵگادا مافی ئەوەی هەبێت بەشداری لەو بڕیارانەی حكومەتدا بكات كە كار دەكەنە سەر بەرژەوەندی گشتی. مافی یەكسانی هەموو تاكەكان لە بەشداریكردن لە بڕیارە سیاسیەكاندا، بە مانای دەوری یەكسانی هەمویان نیە، بەڵام تەنها بوونی تاك لەناو كۆمەڵگای سیاسیدا، مافی بەشداریكردنی لە ژیانی سیاسیدا پێدەبەخشێت. لە روانگەی لایەنگرانی دیموكراسیەوە سنورداركردنی ئەم مافە بەهەر بیانویەك بێت، لەرادەی سامان و خوێندەواریەوە بیگرە تا خەسڵەتی ئەخلاقی و فكری، نادیموكراتیانەیە، ئەگەرچی هەندێك لە بیریارە سەرەكیەكانی دیموكراسی وەك جۆن لۆك و جۆن ستیوارت میل بڕوایان بەهەندێك سنور لەم ئاراستەیەدا هەبووە و ئەمكارەشیان بە بیانووی پاراستنی بەرژەوەندی گشتی، ئاراستە كردووە. لەدیدی دیموكراتیەوە كۆمەڵگای ئازاد تەنها لەحاڵەتی قبوڵكردنی مافی یەكسانی هەموان بۆ بەشداریكردن لە بڕیاردانی سیاسیدا دێتە دی، ئەم مافەش لە بەهای خۆبەخۆ یەكسانی هەموان بۆ بەشداریكردن لە بڕیاردانی سیاسیدا بەدەست دێت. هیچ گروپێكی كۆمەڵایەتی ناتوانێت بە بیانوی ئەسڵی رەسەن، دەستگەیشتن بە سەرچاوەكانی هەقیقەت و هەڵبژێرراو و لەمبابەتە شتانە، خۆی لەرووی مافی بەشداریكردنی سیاسیەوە بە بەرزتر بزانێت.

لەرووی مێژوویەوە شۆڕشی فەڕەنسا بیرۆكەی دەسەڵاتدارێتی خەڵك و سەرچاوەگرتنی دەسەڵاتی لە ئیرادەی گشتیەوەی وەك یەكێك لە بنەما سەرەكیەكانی دیموكراسی راگەیاند. بەپێی ئەم بیرۆكەیە دەسەڵاتی دامەزرێنەر، موڵكی خەڵكە و لەرێی میكانیزمی وەك سیستەمی نوێنەرایەتی و بنەمای زۆرینەوە، پیادە دەكرێت. مەبەست لە دەسەڵاتی دامەزرێنەر ئەوەیە خەڵك مافی ئەوەیان هەیە لەرێگەی نوێنەرانی خۆیانەوە، راستەوخۆ دەستوری دەوڵەت و كۆمەڵگای خۆیان كە هەموو یاساكان لێوەی سەرچاوە دەگرن، دابنێن، بێ ئەوەی بەناچار سنورداربن بەو نەریت و رێسایانەی كە خۆیان دەستیان لەدانانیدا نەبووە. وەك مازینی سیاسەتمەداری دیموكراتی ئیتالیایی دەیگووت نەتەوەیەك گەر هێزی دامەزرێنەری نەبێت، تەنها بەناو نەتەوەیە. لەگەڵ ئەمەشدا لەبەرئەوەی

بەکارهێنانی دەسەڵاتی دامەزرێنەر بەدەستی خەڵکی بە دەگمەن ڕێکدەکەوێت، مافی هەڵبژاردنی نوێنەر و چاودێریکردنی فەرمانڕەواکان، بە دەرکەوتی بنەمای دەسەڵاتداریێتی خەڵکی دەژمێرێت. لێرەوە دیموکراسی سەدەی بیستەم لەرووی شکڵی سیاسیەوە حکومەتێکە کە لەماوەیەکی زەمەنی دیاریکراودا لەرێگەی هەڵبژاردنی گشتی و ململانێی دوو یان چەند حیزبێکەوە دروستدەبێت، و لەسەردەمی حکومەتکردنیشدا لەژێر چاودێری گروپی ئۆپۆزسیۆندایە. کەوابوو دیموکراسی بەمانای دەسەڵاتداریێتی خەڵك، پێویستی بە بوونی حیزبی جیاواز و گروپەکان یان فرەیی سیاسیە کە ڕێگری لەوە دەکات نوێنەرانی خەڵك و حکومەت لە ڕەوتی دەسەڵاتداریێتی خەڵکی بچنە دەرێ. بەتایبەتی ئەو ڕاستیەی کە دەزگای ئاڵۆزی حیزبەکان لە دیموکراسیە هاوچەرخەکاندا، دەبێتە ڕێگر لەبەردەم چاودێری ڕاستەوخۆی خەڵکی بەسەر نوێنەرەکانیەوە، گرنگی بوونی فرەیی گروپەکان و حیزبەکان زیاتر دەکات. لەمڕووەوە سیستەمی چەند حیزبی و ئۆپۆزسیۆنی ڕێکخراو بە مەرجی ناچارانەی دیموکراسی دەژمێرێت. ئەگەرچی وەك ڕەخنەگران جەختی لەسەر دەکەن، حیزب و سیستەمی نوێنەرایەتی و ڕێسای حکومەتی زۆرینە، ڕەنگە زیانێکی بنەڕەتی بە بنەمای دەسەڵاتداریێتی خەڵکی بگەیێنێت. هەرلەبەر ئەم هۆیە تیورە دیموکراتیە هاوچەرخەکان، تەنها چەمکی دەسەڵاتداریێتی خەڵك و بنەمای حکومەتی زۆرینە بۆ پەیدابوونی دیموکراسی، بە بەس نازانن و بۆ کامڵکردنی جەخت لە بنەمای سنورداریێتی و یاساییبوون دەکەنەوە.

لەسەدەی بیستدا چەمکی دیموکراسی لە چەمکی دەوڵەتی سنوردار و مەرجدار بە یاسا، جیا نابێتەوە. دیموکراسی بەپێچەوانەی ڕای فەیلەسوفە کلاسیکیەکانەوە بەمانای حکومەتی زۆرینە بەناچار دژی دیکتاتۆریەت و دیسپۆتیزم نیە، وەك چۆن دیکتاتۆریەتی کەمایەتی هەیە، هەرواش دیکتاتۆریەتی زۆرینە هەیە. لەبەرامبەردا حکومەتی یاسا ڕێگە لە دیسپۆتیزمی تاك و کەمایەتی و زۆرینە دەگرێت. کاری تایبەتی یاسا بریتیە لە دیاریکردنی سنور و توانای فەرمانڕەوایان و مافەکانی هاوڵاتیان. هەرچەندە ناکرێت بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەمانای دیموکراسی بەمانای ئیرادەی باڵادەست و دابەشنەبووی خەڵکەوە وەربگیرێت، بەڵام جیاکردنەوەی ڕون و لایەنیکەمی دەسەڵاتەکان بەپێی یاسا، یەکێك لە پشتیوانیە سەرەکیەکانی حکومەتی یاسایە. لە دیدی ئەو بیریارانەوە کە دیموکراسی بە حکومەتی سنوردار و مەرجدار بە یاسا دەزانن، دیموکراسی لەمانا کلاسیکیەکەی دەسەڵاتداریێتی خەڵکیدا (یان زۆرینە) ڕووی لەجۆرێك لە تۆتالیتاریزمە. لەبەرامبەردا دیموکراتیە ڕادیکاڵەکان بەردەوام دیموکراسیان بەمانای حکومەتی ئیرادەی گشتی یان دەسەڵاتداریێتی خەڵکی زانیوە و جەختیان لەسەر دروشمەکانی وەك دادپەروەری، یەکسانی و ئازادی کردووە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەم دوو پێناسەیە بۆ دیموکراسی قابیلی کۆبونەوە و گونجاندنن، بەو

مانایـەی بـەپێی چەمکی سـەرەکی و سـەرەتایی دیموکراسـی، دەوڵـەت دەبێت سنووردار بێت بە یاسـای دانـراو کـە لـە ئـیرادەی دەسـەڵاتدارێتی خەڵکــەوە سەرچــاوە دەگرێــت. یاســا نابێــت سنورداریێتیەك بۆ ئیرادەی دەسەڵاتدارێتی خەڵك بـژمێرێت، چـونکە خـەڵك دەبـێ بتـوانن بـەپێی دەسـەڵاتی دامەزرێنـەری خۆیـان، یاسـا بگـۆڕن. بەمشێوەیە چەمکی دەوڵەتی سنوردار بە یاسـا، گەرچـی لـە تیـورە یاسـاییەکانی لیبراڵـەکانی سـەدەی نۆزدەهەمـەوە سەرچـاوەی گرتـووە، لەسـەدەی بیستدا بـە پێویـستیە سـەرەکیەکانی دیموکراسی دەژمێرێت.

بەشــێوەیەکی گــشتی دەکــرێ چــەمکی دیموکراســی لەچــەند بنەمایــەکی ســەرەکیدا کورتبکەینــەوە کــە گرنگترینیــان بریتیــە لــە: سەرچاوەگرتنی دەسـەڵات و یاسـا لـە ئـیرادەی خەڵکیـەوە، ئـازادی دەربڕینـی بیروڕای گشتی و پـشتبەستنی حکومـەتی پێـی، بـوونی شـێوە دیاریکراوەکان بۆ ئاشکراکردنی بیروڕای گشتی لەوانـە حیزبـە سیاسـیەکان، بنـەمای حکومـەتی زۆرینـەی ژمـارەیی لـەو مەسـەلانەدا کـە جێگـەی بیروڕای جیـاوازن لـە بیروڕای گشتیدا مەرجدار بـە بـوونی لێکبـوردن و ئاسـانگرتنی سیاسـی، سنورداربوونی بەکارهێنانی دەسەڵات حکومەت بـە رەچـاوکردنی مـاف و ئازادیـەکانی تـاك و گروپەکان، فرەیی گروپەکان و بەرژەوەندیەکان و بــەها کۆمەڵایەتیــەکان، ئەگــەری وتوویــژی گـشتی و ئـاڵوگۆڕ ئـازادی بیروڕاکـان لـەبارەی مەسـەلە سیاسـیەکانەوە و بـەهێزی کۆمـەڵگای مـەدەنی، بنـەمای رێـژەیی ئـەخلاق و بـەهاکان، لێبــوردن لــە بەرامبــەر بــیروڕا جیــاواز و نەیارەکانــدا، یەکــسانی سیاســی گروپــە کۆمەڵایەتیـەکان لـەرووی دەستگەیـشتنیان بـە دەسەڵات، ئەگەری گۆڕینی کەمایەتیە فکریـەکان بــۆ زۆرینــە لەرێگــەی پروپاگەنــدەوە بــۆ بیروڕاکانیـان، سـەربەخۆیی دەسـەڵاتی دادوەری بەئاراسـتەی زامنکردنـی ئازادیـە مەدەنیـەکانی تاکــــەکان و گروپــــەکان، جیاکردنــــەوەی دەســـەڵاتەکان یــان ســەربەخۆیی لایەنیکــەمی ســـێ دەســـەڵاتەکە لـــە یەکـــدی، ئەگـــەری ئاشــکراکردنی نــەیارێتی رێکخــراو و بــوونی گروپی نەیاری یاسایی.

لەسەدەی بیستدا مەترسـی تـازە هەڕەشـە لـە دیموکراســـی کلاســـیکی دەکـــات کـــە لـــە دیکتاتۆریەتی زۆرینە کەمتر نیە. لەراستیدا ئەم مەترسـیانە بونەتـە هـۆی گـۆڕان لـە ماناکـانی دیموکراسیدا. بێگومان ئابوری سەرمایەداری لە پراکتیکــدا ســنوردارێتی بــۆ بەشــداریکردنی سیاسـی دروسـتکردووە. لـە دیموکراسـیەکانی ئــەمڕۆدا مــافی دەنگــدان بێمەرجــە و مــافی هەڵبـژاردنی حیزبـە سیاسیە جیاوازەکان هەیـە، بــەڵام ئــەم مافانــە زامــنی یەکــسانی هەلــە پراکتیکیــەکان لــە بەشــداری کۆمەڵایــەتی و سیاســیدا ناکــات، گــۆڕاوی جۆراوجــۆر وەك: رادەی دەرامـــەت، پـــەروەردە، شارنـــشینی، پەراوێزنــشینی و.....هتــد، کــاری لــە رادەی بەشـداری سیاسـی کـردووە. هـەروەها بـوونی ئیلیتـی رێکخـراو و بـەهێز لـە دیموکراسـیەکانی ئەمڕۆدا، رێگری واقعی بۆ بەشداری گشتی لە سیاسەتدا دروستکردووە، تا ئەو جێگەیـەی کە هەنـدێك لـە تیوریزەنـانی هاوچـەرخ دیموکراسـی بــە شــتێکی جیــاواز لــە فرەیــی و ململانێــی

ئیلیتەکان نازانن. باڵادەستی ئیلیتەکان و بڕیاردانی سیاسی لە دیموکراسیە هاوچەرخەکاندا، بۆتە ڕێگر لەبەردەم پەرەسەندنی یەکسانی ئابوری و کۆمەڵایەتیشدا. بەمشێوەیە چەمکی کۆنی دیموکراسی زۆرینە جێگەی خۆی بە دیموکراسی ئیلیتخواز داوە. لە دیموکراسی ئیلیتەکاندا ئازادی تاك و حکومەتی زۆرینە و یەکسانی، واتە بنەماکانی دیموکراسی کلاسیك، جێگەی خۆی بە دیموکراسی وەك شێوازێك بۆ دروستکردنی ڕابەری سیاسی دەدات. فرەخوازانی هاوچەرخ دیموکراسی لە پراکتیکدا بە شتێکی زیاتر لە چالاکی و ململانێی چەند ئیلیتێك دەزانن. ئەوان ڕوانگەی دیموکراسیخوازانی وەك ڕۆسۆیان کە پێیوابوو "دەنگی خەڵکی دەنگی خودایە" و"کەمایەتی هەمیشە هەڵە دەکات"، بە ئایدیالیستانە دەژمارد. بەبڕوای ئەوان دیموکراسی نەك حکومەتی زۆرینە و جەماوەر، بەڵکو لایەنی زۆری ڕاوێژکردنە لەگەڵیاندا و پاراستنی بەرژەوەندیەکانی کەمایەتیەکانە. تێگەیشتنی خەڵکی بۆ بەدواداچونی مەسەلە ئاڵۆزەکان بەس نیە، دەوری ئەوان دەبێت ڕازیبوون بێت، نەك حکومەتکردن. لێرەوە دیموکراسی کاتێك بەدی دێت کە حکومەت لە داواکاری ڕاستەوخۆو توندڕەوی جەماوەر، پارێزراو بێت.

لەسەدەی بیستەمدا تیورەزەنی لەبارەی دیموکراسیەوە ئاراستەیەکی دژ بە زۆرینەی پەیدا کردووە. لەراستیدا ئەزمونی فاشیزم و بەسیجی جەماوەر لەنێوان دوو جەنگی جیهانیدا، کاریگەری لەسەر ئەم گۆڕانەی تیورەزەنی بووە. تەنانەت لە دیموکراسیەکانیشدا، جەماوەر بە هەڕەشەیەك بۆ دیموکراسی دەژمێرێن. چونکە بە بڕوای فرەخوازان جەماوەر خاوەنی هوشیاری و ئاسانگیری و لێبوردنی پێویست نین بۆ ژیانی دیموکراتی و لە هەڵبژاردنە سیاسیەکاندا دەکەونە ژێر کاریگەری هۆکارە هەستی و ناعەقڵانیەکانەوە. بەشێوەیەکی گشتی لە دیموکراسی فرەیی و ململانێی ئیلیتەکاندا، ڕەگەزە غایی و ئەخلاقیەکانی تیورەی کلاسیکی دیموکراتی، وەك کۆمەڵێك ڕەگەزی پوچ و ئەفسانەیی وەلاوە دەنرێن و لەراستیدا شێوەی کارکردنی دیموکراسیە هەبووەکان، وەك تیورەی دیموکراسی قبوڵدەکرێت. لەسەر ئەم بناغەیە بەشداریکردنی زۆرینەی خەڵك لە سیاسەتدا، نە مومکینە و نە خوازراو. ئاڵۆزی مەسەلە سیاسیەکان لە کۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا و ئاراستەی ڕوو لە زیادی خەڵکی بەرەو مەسەلە تایبەتیەکان، بەشداری سیاسی خەڵکی نامومکین کردووە. جگە لەمەش بەشداریەکی وا خوازراو نیە، چونکە داواکاری زیاد لە سنور بەسەر سیستەمی سیاسیدا دەسەپێنێت و فەزای سیاسی بە خەیاڵ و وەهم دەتەنێت. کەوابوو دیموکراسی تەنانەت پێویستی بە بڕێك لە بێهودەیی و گوێپێنەدانی جەماوەر هەیە.

بە کورتی دیموکراسی تا هەنوکە لە سێ مانادا بەکارهاتووە: یەکەم بەمانای حکومەتی زۆرینە، دوهەم بەمانای حکومەتی یاسا و سێهەمیش بەمانای فرەیی ئیلیتەکان و گروپەکانی دەسەڵات. لەنێوان ئەم سێ

تێگەیشتنەشدا ناکۆکیگەلێك هەیە کە بۆتە هۆی ئالۆزبوونی ماناکانی دیموکراسی و دواجار لەسەدەی بیستدا بۆتە هۆی زەمینە رەخساندن بۆ دەربڕینی جیاواز لێی.

*****

لەوەی تائیستا گوترا وا دەردەکەوێت کە لەرووی فەلسەفیەوە تیورەی لیبڕاڵ دیموکراسی رۆژئاوا لەسەر بناغەی دوو تێگەیشتنی بنەڕەتی و لەهەمانکاتدا ناکۆك بۆ سروشتی مرۆڤ راوەستاوە: یەکێکیان تێڕوانینی لیبڕاڵی و تاکگەریانە کە مرۆڤ بە بونەوەرێکی سودخواز دادەنێت، ئەم تێگەیشتنە بناغە و پێویستی گەشەکردنی سەرمایەداری بووە، ئەوی دیشیان بە ئازاد زانینی مرۆڤە کە لەسەدەی نۆزدەهەمەوە هێواش هێواش لەپاڵ تێڕوانینی یەکەمدا سەریهەڵداوە و بناغەی دیموکراسی بەمانایەکی کامڵتر لە لیبڕاڵیزمە. ئەم دوو تێڕوانینە ناکۆکە بۆ مرۆڤ لە مێژووی بیرکردنەوەی سیاسی پێش سەدەی بیستدا، لە هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی جیاوازدا دروستبوو. بێگومان لەکرداردا پەیوەندیەك لەنێوان ئەم دوو مانایەدا دروستبووە، بەو مانایەی مرۆڤ لە کۆمەڵگایەکدا کە لەسەر بناغەی بازاڕی ئازادی سەرمایەداری راوەستاوە، بونەوەرێکی سودخوازە و بە حوکمی ئازادی و هەڵبژاردنی خۆی بەدوای دابینکردنی بەرژەوەندیەکانی خۆیەوەیەتی. بەڵام لەرووی لۆژیکیەوە مرۆڤی سودخواز لەبەرئەوەی بە حوکمی پاڵنەر و غەریزە و سروشتی خۆیەوە بەدوای بەرژەوەندی خۆیدا دەگەڕێت، کەوابوو لەبنەڕەتدا ئازاد و سەربەخۆ نیە.

دەکرێ رەگ و ریشەی تیورەی لیبڕاڵ — دیموکراسیەکان لە رژیمە کۆمەڵایەتی و سیاسیە لیبڕاڵەکاندا بدۆزینەوە کە لەسەدەی حەڤدە و هەژدەی ئەوروپادا و بەتایبەتی لە ئینگلتەرادا پەیدابوون. وەك بینیمان بیریارانی لیبڕاڵ لە لۆکەوە تا بنتهام قسەکەری ئەم سیستەمە بوون و بەپێی ئارەزوەکانی ئەم سیستەمە، وێنایەکی تیوریان بۆ خەسڵەت و ئارەزوەکانی مرۆڤ بەدەستەوەداوە. لەم روانگەیەوە ئامانجی کۆمەڵگا بریتیە لە دابینکردنی لایەنی زۆری شادی و بەرژەوەندی تاك. مرۆڤ بریتیە لە کۆمەڵێك خواست کە دەبێت بهێنرێتە دی، وەك خواستی بەناوبانگبوون، دەسەڵات، بەزەیی، ئاسایش و موڵکایەتی. لە دیدی لیبڕاڵەکانەوە ئاسایشی موڵکایەتی لە پێش یەکسانی موڵکایەتیەوەیە، چونکە جەختکردن لەسەر یەکسانی دەبێتە هۆی سستبوونی پاڵنەری کۆکردنەوەی سامان و سەرمایە لە کۆمەڵگادا. بەتایبەتی لە قوتابخانەی سودخوازی بنتهامدا، خێری کۆمەڵگا لە زیادبوونی سامان و کالا مادیەکاندایە. بنتهام لە دەربڕینە بەناوبانگەکەی خۆیدا دەڵێت: "یەکەم لەبەرامبەر هەر بەشێك سامان لە کۆمەڵگادا، بەشێك لە شادی و بەختەوەری دروستدەبێت، دوهەم لەدوو کەسدا کە سامانی نایەکسانیان هەیە، ئەوەی کە سامانێکی زۆرتری هەیە شادترە". بەکورتی زیادبوونی سامان دەبێتە هۆی زیادبوونی شادی تاك و کۆمەڵگا. لەگەڵ

پەرەســـەندنی کۆمـــەڵگای ســـەرمایەداریدا لەســەدەی حەڤــدە بــەدواوە وێنــای مــرۆڤ وەك بونەوەرێکی سودخواز و مەسرەفکەر، عەقلانی و لەرووی ئەخلاقیەوە بە رەوا زانرا. لەکاتێکدا تێگەیــشتنێکی وا بــۆ مــرۆڤ لــە سیــستەمە کۆمەڵایـــەتی و ئەخلاقیـــەکانی پێـــشودا، بەشـێوەیەکی گـشتی قێـزەون بـوو. لەراسـتیدا سـودخوازی و لیبڕاڵیـزم بەرهـەمی گۆڕانکاریـە فکرییـە سـەرەکیەکان بـوو لـە چـەند سـەدەی مێـــژووی ئـــەوروپادا کـــە لـــە هیومـــانیزم و بزوتنـەوەی ریفـۆرمی دینیـەوە بـۆ عەقلگـەری و سـکولاریزم، بوونـە هـۆی زیـادبوونی روکردنـە دنیا. سیستەمی سەرمایەداری و بازاڕی ئازاد کە لەسەر بناغەی مافی تاك بۆ بەدەستهێنانی سامان بەشێوەیەکی بێسنور دامەزرابوو، وێنـای تـاکێکی وا قوتابخانـەی سـودخوازی لـەرووی تیوریـەوە دەیکێـشا. مـرۆڤ وەك مەسـرەفکەری کالا و سامانی بێسنور وێنا دەکرا. ئەم وێنایـە بـۆ مـرۆڤ بـۆ رەوایـەتی بەخـشین بـە مـافی بەدەســتهێنانی ســامان و کــالا بەشــێوەیەکی بێسنور، پێویست بوو، ئەم مافەش بە بناغەی کۆمـەڵگای بـازاڕی تـازە دەژمێـررا. دیـارە ئـەم وێنەیـــە تـــا ئەوکاتـــەی کۆمـــەڵگا لەســـەر پاڵنـــەرەکانی بـــازاڕ دامـــەزرابێت، پێویـــستە. بەمشێوەیە خواستی بێسنور و سودخوازی، بە شتێکی عەقلانی و ئەخلاقی دەژمێررا.

دوهەمین بونیادی فەلسەفی دیموکراسـی کـە هـەڵگری تێڕوانینێکـی جیـاوازە بـۆ سروشـتی مـرۆڤ، لـە سـەدەی نۆزدەهـەم و بەتایبـەتی لـە بیرکردنـەوەی بیریـارانی وەك جـۆن سـتیوارت میلــدا پێــشکەشکرا. ئــازادی، هەڵبــژاردن و یەکسانی مرۆڤ وەك جەوهەری دیموکراسـی بـۆ سودخوازی وەك جەوهەری لیبڕاڵیزم، زیادکرا. رەخنـــەگرانی ئـــەخلاقی بـــازاڕی و تاکگـــەری لیبڕاڵیـــــزم، بـــــەدوای پێـــــشکەشکردنی بەهاگەلێکدابوون لەسەرو بەها سودخوازەکانی لیبڕاڵیزمـــەوە. لـــەمجۆرە رەخنانـــەدا لـــەبری جـــەختکردن لەســـەر موڵکایـــەتی بەشـــێوەی لیبڕاڵیزمـی کلاسیکی، جـەخت لەسـەر توانـا و شایـــستەییەکانی تـــاك دەکـــرا و مـــرۆڤ بـــە بونەوەرێکی ئازاد و سەربەخۆ و یەکسان لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیـدا دەژمێـررا. بەمپێیـە ئامـانجی مرۆڤ پەرەپێدانی توانا ئاڵۆزەکانی مرۆڤە، نەك تەنها بەدەستهێنانی سود و کۆکردنەوەی کالا. ژیانی مرۆڤ دەبێت کامڵ بێت، نەك ئەوەی تـەنها بـۆ زیـادکردنی بەرژەوەندیـە مادیـەکان تـەرخان بکرێـت. لەراسـتیدا رەخنـەگرانی لیبڕاڵیزمـی تاکگـەری، بـەدوای کۆکردنـەوەی سـودخوازی فـــەردی کۆمـــەڵگای لیبڕاڵـــی و یەکـــسانی و سەربەخۆیی کۆمەڵگای دیموکراتیەوە بوون.

ئـەم دوو تێڕوانینـە بـۆ سروشـتی مـرۆڤ و چالاکیەکان، لـە دیموکراسـیە هاوچـەرخەکاندا لەپاڵ یەکەوەبوون، بەڵام ئایا بەیەکەوە ئاوێزان بوون یان لەبنەڕەتدا دەتوانن بەیەکەوە ئاوێزان بن، ئەوا ئەمە مەسەلەیەکی ترە. تێگەیشتنی دوهـەم ئەگەرچـی لـە کاردانـەوە بەرامبـەر بـە زیـادەڕەوی لیبڕاڵیزمـی تاکگەریانـەی سـەدەی هـەژدەدا دروسـتبوو، رەگـو ریـشەی لـە گۆڕانـە فکریـــەکانی پێـــشودا هـــەبوو، بەتایبـــەتی بیرکردنـەوە هیومـانیزم و شۆڕشـی دیمـوکراتی. لەگەڵ ئەمەشـدا بـە سـەرنجدان لـە بـەردەوامی و پەرەســـەندنی سیـــستەمی ســـەرمایەداری لـــە

سەدەی نۆزدە و بیستدا، تێگەیشتنی دوهەم بۆ مرۆڤ نەبووە هۆی لاوازی و لەناوچوونی تێگەیشتنی لیبڕاڵی. چونکە تیگەیشتنی لیبڕاڵی پەیوەندیەکی بەهێزی لەگەڵ واقعی سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا هەبووە. بەشێوەیەکی گشتی دوو بونیادی فەلسەفی لیبڕاڵ-دیموکراسی لەرووی تیوری و پراکتیکەوە، بەردەوام ناکۆکی لەنێوانیاندا هەبووە. لێرەوە دەکرێ بگوترێت دیموکراسی مۆدێرن دوو سیمای هەیە: یەکێکیان سیمایەکی لیبڕاڵیانە کە بەکردەوە دەبێتە هۆی نایەکسانی کۆمەڵایەتی و ئابوری یان لانیکەم رێگر نابێت لەبەردەمیاندا و لەئەنجامدا زیان بە بیرکردنەوەی یەکسانی یاسایی و سیاسی دەگەیێنێت. لەهەمانکاتدا ئەم سیمایە لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداریدا گونجاوە کە بە ویست و ناویست رووی لە کۆکردنەوەی سامانە. دوهەم سیمای دیموکراتی کە لایەنیکەم لەرووی فکریەوە بەرگری لە یەکسانی و سەربەخۆیی و ئازادی هەموو تاکەکان دەکات، ئەگەر ئەم سیمایەش بە دروستی جێبەجێ بکرێت، لەگەڵ هەندێك پێداویستی سیستەمی سەرمایەداریدا دەکەوێتە ناکۆکیەوە. بەهەرحاڵ تیورەکانی لیبڕاڵ - دیموکراسی لەسەدەی بیستدا، هەڵگری ئەم دوو تێگەیشتنە ناکۆکە بووە و دەکرێت لە روانگەیەکەوە هەر یەکێکیان بەپێی جەختکردنی زیاتر لەسەر یەکێك لەو دوانە ((واتە ئازادی و یەکسانی)) پۆلێنبکرێت.

بەشێوەیەکی گشتی تیورەی لیبڕاڵ دیموکراسی پێکهاتەیەکی ناهاوئاهەنگە لەنێوان لیبڕاڵیزمی کلاسیکی و بنەماکانی دیموکراتی یەکسانی تاکەکان بۆ هەڵبژاردنی حکومەت. ئەم پێکهاتەیە لەو روەوە ناهاوئاهەنگە کە تیورەی کلاسیکی لیبڕاڵیزم جەخت لەسەر مافی تاك بۆ بەدەستهێنانی سامان و موڵکایەتی بێسنور و ئابوری بازاڕی و دواجار نایەکسانی دەکات، لەکاتێکدا تیورەی یەکسانی دیموکراتی ئەم بنەمایانەی بە ناکۆك لەگەڵ ئازادی و یەکسانی واقعی مرۆڤەکاندا دەزانی. کێشەی سەرەکی تیورەی لیبڕاڵ دیموکراسی بەردەوام دروستکردنی گونجان لەنێوان ئەم دوو بونیادە فەلسەفیەدا بووە. تیورەزەنانی لیبڕاڵ دیموکراسی لەسەدەی هەژدەهەمدا، بەتایبەتی جۆن ستیوارت میل، وابەستەبوونی زۆری لیبڕاڵیزمیان بە سەرمایەداریەوە لەبەرچاو نەدەگرت و لێرەوە لەرووی فکریەوە کاریگەری ئەخلاقی بازاڕیان بە شتێکی ئەوتۆ نەدەژمارد. لە کرداردا کاریگەریی ئابوری سەرمایەداری بەسەر تیورەی لیبڕاڵ دیموکراسیدا، هەروا بەهێزە و لەسەدەی بیستەمدا بیرکردنەوەی لیبڕاڵە نوێکان، جارێکی دی جەختیان لەسەر وابەستەیی لیبڕاڵیزم و سەرمایەداری کردۆتەوە.

**سەرچاوە:**

فەسڵی یەکەمی کتێبی: (حسین بشیریة: تاریخ اندیشەهای سیاسی در قرن بیستم: لیبرالسم و محافظەکاری. تهران . نشر نی. 1376-1378).

# دەربارەی لیبرالیزم

# گفتوگۆیەك لەگەڵ "د. زەواوی بەغورە"* دا

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**

***یەکێك لە بەناوبانگترین ئەو تێرمانەی لە دوای هەرەسهێنانی بلۆکی خۆرهەڵاتەوە لە دەزگاکانی راگەیاندندا باسی لێدەکرێت لیبرالیزمە، ئێمە لێرانەدا دەمانەوێت لە مانای ئەو تێرمە شارەزا بین و سەرەتاکانی دروست بوون و سەرهەڵدانی بزانین؟**

–لیبرالیزم سەرچاوەکەی وشەی ***Liberty*** کە مانای ئازادی دەگەیەنێت. هەرچی مێژوی لیبرالیزمیشە ئەوا مێژوییەکی تازەیەو دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەو بیست. یەکەمین کەس کە چەمکی لیبرالیزمی بەکارهێنا، فەیلەسوفێکی فەرەنسیە بەناوی "مینی دی یەران" لە ساڵی 1818، پاشان لە فەرهەنگی ئۆکسفۆردی ساڵی 1819دا باسی هاتووە. زاراوەی لیبرالیزم رێبازێکی سیاسیە کە ئازادی تاکەکەس لە کۆمەڵگە بە گرنگترادەنێت، واتە ئەوەی گرنگی پێدەدات و کاری بۆ دەکات ئازادی تاکەکانە، ئەمەش بۆچونێکی گشتی لیبرالیزمە. بەڵام دەبێت ئەوە بڵێین کە لیبرالیزم لای فەیلەسوفەکانی پێناسەی جیاجیای هەیە. بۆ نمونە هەیە پێیوایە لیبرالیزم فەلسەفەیەکی سیاسیە کە ئازادی وەك بەهایەکی ئەخلاقی و سیاسی بەرز سەیر دەکات، واتە ئازادی دەکاتە بەهایەکی ئەخلاقی و سیاسی ڕەها. هەندێکی کەش پێیان وایە کە تاکە کەس بنەمایەکی سەرەکی لیبرالیزمە. ئەمە وەکو بۆچونی گشتی و وەك لایەنی مێژوویی.

***ئایا پەیوەندی لە نێوان لیبرالیزم و رۆشنگەریدا هەیە و کێن ئەوانەی بەناوبانگترین رێبەرانی لیبرالیزمن، وە ئایا لیبرالیزم چۆن چۆنی گەشەی کرد؟**

–رەگوڕیشەی لیبرالیزم دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی رێنیسانس و رۆشنگەری، بە تایبەتی رۆشنگەری کە بەهای ئەقڵ و ئازادی بەرز نرخاند، لەبەرئەوە دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین لیبرالیزم کوڕی شەرعی رۆشنگەری ئەوروپییە،

لەبەرئەوەی لەسەر پرانسیپەکانی رۆشنگەری و تیۆریــای پــەیمانی کۆمەڵایــەتی "جــان جــاك رۆسۆ" هاتە ئارا. هاوکات لیبرالیزم پشت بە هاتنەئارای ئابووریـەکی ئـازادیش دەبەستێت. ئەوانەشی کە بە گرنگترین ڕابەرانی لیبرالیزم دەژمێردرێن ئەمانەن: "تۆماس هـۆبس، جـۆن لـۆك، جـان جـاك رۆسـۆ، مۆنتسکیۆ". ئەمە لە ڕووی فەلسەفیەوە. بەڵام لە ڕووی ئابوورییەوە "ئادەم سمس و ریکاردۆ" لە کەسە دیارەکانن. هەروەها فەیلەسوفانی وەك: "جـۆن ستیوارت میل و جێرمی بنتام و ئەلکسی دی تۆکڤێل"، رۆڵیان لە بەرفراوانکردنی مانای لیبرالیزمدا هەبووە. دەتوانین بڵێین ئاقاری لیبرالیزم لەسەر بنەمای چوار ئایدیای سەرەکی فۆرمەلە بوو:

**یەکەم/** لیبرالیزم فەلسەفەیەکی سیاسیە و بڕوای بەوەیە کە لە پرۆسەی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا، تاکەکەس رۆڵی سەرەکی و چارەنوسساز دەگێڕێت.

**دووەم/** لیبرالیزم بیرکردنەوەیەکی عەلمانی – دنیاییە و هەموو شتێك دەگێڕێتەوە بۆ بەرژەوەندی و هەڵبژاردنی تاکەکەس، بەبێ هیچ دەستێوەردانێکی ئایین، لێرەشدا لیبرالیزم لەگەڵ پراگماتیزمی سودخوازدا یەکدەگرێتەوە.

**سێیەم/** لیبرالیزم فەلسەفەیەکە بڕوای بەوەیە ئازادی بەهایەکە هەموو بەهاکانی تری لەسەر دروست دەبن. واتە بەهای ئازادی چاوگی هەموو بەهاکانی ترە.

**چوارەم/** لیبرالیزم وا دەکات هەموو تاکەکان لە بەردەم یاسادا چون یەك بن، لێرەشەوە بیرۆکەی هاوڵاتی بوون سەرهەڵدەدات.

***هەنوکە یەکێك لەو تێرمانەی قسەو باسی لەبارەوە دەکرێت لیبرالیزمی نوێیە یاخود نیو – لیبرالیزمە، مەبەست لەمە چییە؟**

–ناکرێت وەك یەك قەوارە و یەك تاکە ئاقار سەیری لیبرالیزم بکەین، بەڵکو زیاد لە بۆچونێك بۆ لیبرالیزم هەیە، بەڵام دەتوانین بڵێین لیبرالیزم لە دوو ئاقاریان لە دوو قوتابخانەی سەرەکی پێکدێت کە ئەوانیش بریتین لە:

**یەکەم/** لیبرالیزمی ڕادیکالی (یان لیبرالیزمی نوێ): دەتوانین پرانسیپەکانی ئەم ئاقارەیان لەوەدا کۆبکەینەوە کە خەبات لە دژی دەوڵەت دەکات بە مەبەستی کەمکردنەوەی دەستێوەردانی لە بوارەکانی ژیاندا و بەگژاچونەوەی ئەو خواست و داواکاریانەی پەیوەندییان بە دادپەروەری کۆمەڵایەتیەوە هەیە، لەگەڵ بەخشینی ئازادیەکی ڕەها بە ئابووری بازاڕ. "جان جاك جیلیناس"ی فەیلەسوف لای خۆیەوە کۆمەڵێك پرانسیپی دیکەی سەرباری ئەوانە خست، وەك: مافی ڕەها لە موڵکداریێتی و فەزڵدانی بەرژەوەندی تایبەتی بەسەر بەرژەوەندی گشتیدا، لەگەڵ ململانێ و کێبڕکێ کردن بەبێ سنور و نەرمی نواندن لە کارکردندا. واتە ئەم ئاقارە (یان ئەم قوتابخانەیە)، کار بۆ ئەوە دەکات ئازادی ڕەها و بێسنوری بازاڕ بگەیەنێتە ئەو پەڕی، بەبێ گوێدانە هیچ لایەنێکی کۆمەڵایەتی. لە بەناوبانگترین ڕێبەرانی ئەم ئاقارە"ملتۆن فریدمان" و "ڕۆبەرت نوزیك"ن.

**دووەم/** لیبرالیزمی کۆنسێرڤاتیڤ یاخود (لیبرالیزمی دیموکراسی کۆمەڵایەتی):

لە گرنگترین پرانسیپەکانی ئەم ئاقارە:

بـــازاڕی ئـــازاد و دەســـتێوەردانی دەوڵـــەت و دەرچـون لــە ململانێــی نێـوان ڕاسـت و چــەپ، بــەرەو مەســـەلە هاوبەشـــەکان و ئاشـــتی نێـــو دەوڵـــــەتی و ئافـــــەرۆزکردنی توندوتیـــــژی و داکـۆکیکردن لــە مافـە ئـاینی و کلتوریــەکانی کەمایەتیــەکان. لــە گــرنگترین بیریــارانی ئــەم قوتابخانەیەش "کارل ویر"ە.

***ئایا ئەمە مانای وایە کە لە لیبرالیزمـدا چـەمکی دادپەروەری غایبەو بونی نییە؟**

—یــەکێك لــە گــرنگترین ئــەو گۆڕانکــاری و ســـەربار خـــستنانەی لیبرالیـــزم لـــە قۆنـــاغی هاوچـــەرخدا بەخۆیـــەوە بـــینی، مەســـەلەی دادپــەروەری بـــوو کــە فەیلەســوف و بیریــاری ئـەمریکایی "جـۆن ڕۆلـز" فۆرمەلـەی کـرد و داوا دەکـات کـار بـە پرانسیپی دادپـەروەری بکرێـت، هــەروەها وەك بونــەوەری ئــازاد مامەڵــە لەگــەڵ تاکەکاندا بکرێت کە هەموویان لە بەردەم یاسادا چونیەکن و بەیـەك چاو سەیر دەکرێن. دەرهـەق بـــەم مەســـەلەیە "جـــۆن ڕۆلـــز" دەڵێـــت: (ئـــەو کێـــشەیەی ڕووبـــەرووی لیبرالیزمـــی سیاســـی دەبێتـــــەوە، بریتییـــــە لـــــە هێنانـــــە ئـــــارای تێگەیـشتنێکی سیاسـی بـۆ دادپــەروەری کــە بەســـەر ســـستمی دیموکراســـی — دەســـتوریدا پراکتیـزە بکرێـت). هــەروەها "ڕۆلـز" جــەخت لەسـەر ئـەوە دەکاتـەوە کـە دەبێـت هاوڵاتیـان لـە بوونی ئەو ئازادیە بێسنور و ڕەهایە بپارێزرێن.

***هەندێ جـار چـەمکی لیبرالیـزم و دیموکراسـی تێکەڵ بەیەك دەکرێن، ئایا ئەمە مانای ئەوەیە ئەو دوو چەمکە یەك مانایان هەیە؟**

**—یەکــەم/** دیموکراســی ســستمێکی کــۆنی حوکمڕانییە کە لـە وڵاتـی یۆنانـدا هـەبووە، بەڵام لیبرالیزم چەمکێکی نوێیە و لەسەر ئازادی ڕەها دروست بووە، بە پێچەوانەی دیموکراسیەوە کە لەســـەر فـــرە حیزبـــی و ئـــاڵوێردی دەســـەڵات دامـەزراوە. لەبەرئـەوە بـەبێ بوونی دیموکراسـی لیبرالیزم نابێت، بـەڵام ئەمـە ئـەوە ناگەیـەنێت کـە یەك مانایان هەیە، بەڵگەش بۆ ئـەوە ئەوەیـە کـە لـە سـستمە سوسیالیـستیە نـا — لیبرالیەکانـدا دیموکراسی هەیە، بـەڵام ناشێت لیبرالیـزم بـەبێ دیموکراسی دروست بێت و بێتە ئاراوە.

***ئەمریکا وەها نیشاندەدرێت کە ڕابەری لیبرالیزمە لە جیهانی هاوچەرخدا، ئەمە بۆچی؟**

—وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جیاوازە لـە ســەرجەم وڵاتــانی دیکــەی خۆرئــاوا، چــونکە ئەمریکا لە ساتەوەختی دروستبونیەوە، جگە لە سستمی فیدرالی بەهیچ سستمێکی تر ئاشـنا نەبووە، لە کاتێکدا وڵاتانی ئەوروپایی ئەزمونی سستمی نـا—لیبرالیـان لـە حوکمڕانیدا کـردووە. تەنانــەت لــە زۆربــەی زۆری وڵاتــانی ئەوروپیــدا پـــارتی سوسیالـــستی هەیـــە، وەکـــی پـــارتی کرێکـاران لـە بـەریتانیا و پارتگـەلێکی دیکـە کـە ڕێبازێکی سۆسیالیستیان هەیە، بـەڵام لـە وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا پارتی سۆسیالیستی نییــە. بەشـێوەیەکی گـشتی ئاقـاری سۆشـیال دیموکراسی ئامادەگیەکی گەورەی لە ئەوروپادا هەیە، بەڵام لە ئەمریکادا وا نییە.

***هـــیچ پەیوەندییـــەك لـــە نێـــوان لیبرالیـــزم و بەجیهانیبووندا هەیە؟**

—ئەگەر لیبرالیزم لەسەر ئازادی موڵکایەتی و بازرگـانی دامـەزرا بێـت، ئـەوا بـەم پێیـە دەبێتـە یەکـــەمین قۆنـــاغ بـــۆ بـــە جیهـــانیبوون. بـــە جیهـــانیبونیش دەبێتـــە مـــۆدێلی سیاســـی و

ئابووری لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی، ئەمەش بە مانـای بـازاڕی ئـازاد و هاتوچـۆکۆدنی پـارەو شمەك لە نێوان تەواوی وڵاتاندا.

***هەڵوێـستی لیبرالیـزم لـە ئـایین چـییە؟ ئایـا هەڵوێـستێکە ئـایین ڕەتدەکاتـەوە یـاخود داکۆکی لێدەکات؟**

—لیبرالیزم ئایین ڕەتناکاتـەوە، بەڵکو کار بۆ ئـەوە دەکـات کـە ئـایین بێلایـەن بکـات، چـونکە لیبرالیزم سستەمێکی عەلمانییە، واتە دەیـەوێت ئـایین بکاتـە شـتێکی شەخـسی. لیبرالیـزم ئـایین ڕەتناکاتـەوە، بەڵگـەشمان بـۆ ئەمـە ئەوەیـە کـە سستەمێکی لیبرالی لە ئەمریکادا هەیـە، بـەڵام لـە هەندێ بۆچونیدا ئایینی و ئسوڵیە.

***ئەی هەڵوێستی لیبرالیزم لە مۆراڵ چییە؟**

—بە هـەمان شـێوە دەیـەوێت لەسـەر ئاسـتی سیاسی و کۆمەڵایەتی، موراڵ دووربخاتەوە.

***واتە دژی مۆراڵە؟**

—نا وانییە، بەڵکو لـەو کایانـەدەری دەکـات و دەیکاتە شتێکی شەخسی و فەردی.

***فیکری عەرەبی و ئیسلامی چۆن بە لیبرالیزم (بە چەمکە تازەکەی) ئاشنابوون؟**

—ئاشـنابوون بـە لیبرالیـزم لـە سـەرەتاکانی سـەردەمی ڕێنیسانـسی عەرەبییـەوە دەسـت پێـدەکات، سەرمەشـقی ئەوانەشـی بـەم کـارە هەڵدەسـتن "ڕەفاعەتـەهتاوی"یـە. دوای ئـەوەی دەسـت بـە وەرگێڕانـی بەرهـەمی سـەردەمی ڕێنیسانـسی ئـەوروپی کـرا، ئیـدی فیکـری عـەرەبی و ئیـسلامی ئاشـنایەتیان لەگـەڵ لیبرالیزمـدا پەیـدا کـرد، بەمـەش ئاقارێـك هاتـە ئـاراوە کـە بـە ئاقـاری لیبرالیزمـی — ئـەقڵانی ناودێر کراو دیارترین کارەکتەرەکانیشی "ڕەفاعە تەهتاوی و قاسم ئەمین و ئەحمەد لوتفی سەید و تـەها حـسێن و ئیـسماعیل مەزهـەر" بـوون. هەموو ئەمانە کاریان بۆ ئەوە دەکرد تا سوود لـە فیکـری لیبرالـی جیهـانی وەرگـرن و بەرهەمەکانیان وەرگێڕنە سەر زمانی عەرەبی. لە ئێـستاشدا بیرمەندگـەلێکی دیکـەمان هـەن کـە مـەیلی لیبرالیزمیـان هەیـە، نمونـەکانیان وەك: "ناصـیف نەصـار، فـەهمی جـدعان" لەگـەڵ بیریـاری بـەناوبانگی ئـابووری میـسری "حـازم بەبلاوی".

***ئایا ئاڕاستەی ئـەو بیریارانـە ڕادیکالانەیـە یـان موحافیزەکارە؟**

—هـــەموویان مـــەیلێکی لیبرالـــی— موحافیزکارانـەیان هەیـە، لەگـەڵ ئەوەشـدان دەوڵـەت ڕۆڵـی لـە زۆرێـك لـە چالاکیە گشتی و کۆمەڵایەتیەکاندا هەبێت

***تایبەتمەندیەکی فیکر خۆرئاوایی ئەوەیە بەردەوام ڕەخنە لە هەموو شتێك دەگرێت، کەواتە گرنگترین ئەو ڕەخنانە چین کە ئاڕاستەی لیبرالیزم کراون؟**

—لـە گـرنگترین ئـەو ڕەخنانـەی ئاڕاسـتەی لیبرالیـزم کراوە، ڕەخنەگرتنە لە ئازادی ڕەهای بازاڕ. لەبەرئەوەی بازاڕ یەکێکە لە چالاکیەکانی مـرۆڤ، کەواتـە ناکرێـت بخرێتـە سـەرو چالاکیەکانی دیکەوە یاخود زیاد لـە پێویست بایـەخی پێبـدرێت. چـونکە هـەرگیز ناکرێـت بـە تەواوەتی بازاڕ و ئابووری لـە کۆمەڵگـە دابـڕین و لێکیان جیابکەینەوە. هەروەها پێویستە ئازادی ئازادیەکی بەرپرسیار بێت و ڕەهانەبێت کەوای لـێ بێـت لەگـەڵ پـشێوی و بێـسەروبەرەیەدا جیاوازیـەکی ئەوتۆی نـەبێت. لێرەوەیـە هەنـدێك پێیان وایە دەبێت دەوڵەت لانی کەمی بەشداری

بكات و به تەواوەتی دەست لە بازاڕ و ئابووری نەکێشێتەوە. لەلایەکی ترەوە "کارل ویەر" رەخنەی لە ئازادی میدیا دەگرێت لە خۆرئاوادا، چونکە کلتووری توندوتیژی پەخشدەکەن. لێرەوە داوا دەکات کە پێویستە هاولاتیان لەسەر کلتوری ناتوندوتیژی رابهێنین و گۆشیان بکەین، ئەمەش بەوە دەکرێت ئاستێك بۆ ئەو وێنەی توندوتیژیانە دابنێین کە سەرجەم کەناڵەکانی راگەیاندن بلاوی دەکەنەوە.

*د. زەواوی بەغورە جەزائیرییە و پسپۆڕە لە فیکری فەیلەسوفی فەرەنسی "میشیل فۆکۆ"دا. تێزەی دکتۆراکەی لە زانکۆی سۆربۆن لەسەر چەمکی گوتارە لە فەلسەفەی میشیل فۆکۆدا. خاوەنی چوار کتێبەو مامۆستای یاریدەدەرە لە بەشی فەلسەفە لە زانکۆی کوەیت.

**سەرچاوە:**

رۆژنامەی (القبس)، 2007/11/11.

# گەڕانەوە بۆ مەسەلەی لیبرالیزم و پەیوەندیی بە دیموکراتیەتەوە

د. بورهان غلیون
لە عەرەبییەوە: فەرهاد

دوا وتارم لە بارەی پێویستیی جیاکردنەوەی دیموکراتیەت و لیبرالیزم گەلێك ڕەتدانەوەی لەلایەن ئاکتیڤستە سیاسیەکان و خاوەن ڕاکانەوە بە دوای خۆیدا هێنا. ڕەنگە لە هەموو ڕەتدانەوەکان توندتر ئەو رەخنانە بێت کە هاوڕێم کەمال لبوانی بلاوی کردەوە، کە ئێستا لە سەروبەندی دروستکردنی حیزبێکی لیبراڵدایە لە سوریا. دەمەوێت لە بەراییەوە ئەوە بڵێم کە ئێمەی "دیموکرات و لیبراڵ سەر بە بەرەیەکین کە ئازادیە" بەلام جیاوازیمان یەکەم لە هەڵسەنگاندنی رەوایەتی ئەو لێکچوونە تیوریەدایە کە لە نێوان دیموکراتیەت و لیبرالیزمدا هەیە لەلایەکەوە. دووەم دەربارەی سەرکەوتنی لێکچوونەکەیە لە رووی پراکتیك و ستراتیژەوە. لێرەدا راکانی خۆم لە وروژاندنی مەسەلە تیوریەکاندا پوخت دەکەمەوە. بەو هیوایەی لە وتارێکی تردا مشتومڕەکە بە ئەنجام بگەیەنم.

چەمکی لیبرالی و دیموکراسی وەك هەموو چەمکە تیوریەکانی دی وشك و وەستاونیە، بەڵکوو لەدایك دەبێت و لەگەڵ رەوتی سەردەم و لە چوارچێوەی ئەزموونە فیعلیە مێژووییەکانەوە مانای بە بڕشت تر لە خۆ دەگرێت.

لە سەرەتادا لیبرالیزم ئاماژە بوو بۆ فەلسەفەیەکی نوێ کە هەر لە سەرەتاوە پەیوەندی بە هیومانیزمەوە هەیە و بەرەهایی هەموو جۆرە کەم کردنەوەیەك لە ئازادی و مافی تاك رەت دەکاتەوە. واتا لە هەموو شێوەیەکی چەوساندنەوەی سیاسی جا لەلایەن دەسەڵاتەوە بێت یان لەلایەن دەزگا کۆمەلایەتیەکانەوە. لەم ئاستەدا لیبرالیزم

ئاماژەیە بە بیرو فەلسەفەیەکی پۆزەتیف لە بەکارهێنانی رۆژانەدا بەرانبەر بە مەیلی سیستمە ئاینی و نەتەوەییەکان کە بڕوای بە تاکایەتی ئازاد نییە و جەخت لەسەر مافە کۆمەلأیەتیەکان دەکات بۆ فشار خستنە سەر تاکەکان و سنووردارکردنی ئازادییە تایبەتیەکان. بەلأم مانای لیبرالیزم لەسەر ئەم ئاستەو بە درێژایی مێژووی رابووردوو هەروا بە وەستاوی نەماوەتەوە. چونکە سیستمە لیبراڵە کلاسیکیەکان کە لە سەدەی نۆزدەدا ولأتە پیشەسازیەکان رابەریان دەکرد تووشی قەیرانی گەورەی کۆمەلأیەتی بوون، لەبەرئەوەی هۆکارە ئابووری و کۆمەلأیەتیەکانی لە مومارەسەی ئازادیدا پشت گوێ خستبوو، بەڕای من قوولترین دەربڕین دەربارەی ئەم قەیرانانە، گۆڕانی خودی کۆمۆنیزم بوو وەك فەلسەفەیەکی رەخنەیی و بنەڕەتی و گشتگیر لەسەر چەمکە بەڵگەنەویستە سەرەکیەکانی لیبرالیزم. هەروەها وەك ئەوەی کە لە ڕووی میتۆد و پراکسیسەوە تەواو دژ بە لیبرالیزمە، بەلأم هەر لە چوار چێوەی بەرپەرچدانەوەی کۆمۆنیزم و ڕوو بە ڕوو بوونەوەی ئەو شۆڕشە کۆمەلأیەتیەی کە کۆمۆنیزم لە دەوڵەتە پیشەسازیەکاندا بەرپای کرد، یەکەم قەڵەمباز بوو کە لە ناو بیری خودی لیبرالیزمدا دروست بوو، بەرەو ئاراستەی دانانی بەو هەڵەیەی کە بڕوابوونە بەوەی لێکچوونێکی خۆبەخۆ و گونجاندنێکی خۆڕسك هەیە لە نێوان ئازادی ئابووری و ئازادی سیاسی لەگەڵ بەرژەوەندی تاك و بەرژەوەندیی کۆمەڵدا. ئابووری ناسەکان لە سەرووی هەموویانەوە (کینز)کەوتنە بەرەو پێش بردنی تیوری دەست تێوەردانی دەوڵەت لە ئابووری لە ڕێی ئاراستەکردن و خەرجکردن و سیاسەتی کڕینەوە. بۆ یەکەمجار (تابۆ)ی دەست تێوەردانی دەوڵەتیان لە ژیانی ئابوری شکاند بەرانبەر بەمە لە ژێر کاریگەریی هەوڵی رۆژانەی بەرهەمهێن و چینی کرێکاردا گۆڕانێك لە بیری سیاسی لیبرالیزمدا ڕوویدا بە ئاراستەی قبووڵ کردنی ئەو بەرەو پێشەوە چوونەی کە بەسەر سیستمی ماف و بیمە کۆمەلأیەتیەکاندا دێت و بوە بە یەکێك لە مەرجی بەشداریکردن لە ژیانی نیشتمانی و تێکەڵ بوون لەگەڵیدا. لەوساوە زاراوەی سیاسی لە دەوڵەتە پیشەسازیەکاندا گەشەی کرد تا ئەو ڕادەیەی کە زۆر لە پێکهاتە سیاسییەکان نەمایەوە کە ناوی خۆی ببەستێتەوە بە ناوی لیبرالیزمەوە، لە کاتێکدا ئەو حیزبانەی کە ڕابەریی ئەوروپایان کرد بۆئەوەی لە قەیرانە سەختەکەی سالأنی سی رزگاری بێت ناوی خۆیان بە دیموکراتیزم ناودێر کرد. ئیدی دیموکراتیەکە سۆشیالیستی بێت یان دیموکراتیەتیەکی مەسیحی. ئامانج لەمە ئاماژەیە بەوەی کە ئەم ئەزموونە سیاسیە گەورەیە لە لیبرالیزمی کلاسیکی ڕەت کردووە کە دەست تێوەردانی دەوڵەتی لە پرۆسەی سیستمی ئابووری و کۆمەلأیەتی بۆ بەرژەوەندی چەمکی ئازادی تاکەکەس بە تاوان و (تابۆ) داناوە. ڕەتکردنەکەیشی بە ناوی دیموکراتیەوەیە. واتا بە ناوی بە گشتی کردنی بەهای خودی ئازادی و ڕەگ داکوتانی نەك بە ناوی نەهێشتنی یان گۆڕینی بە کۆمۆنیستی یان سوشیالستیەوە. مارکسیزم لە دیاری کردنی خاڵە ناکۆکەکانی بیری لیبرالیزمدا بە

هەڵنەچوە، بەڵام لەوەدا هەڵەی کردووە کە نەیتوانیوە چارەسەرەکەی دیاری بکات. ئەگەر ئازادیی پەتی دوور لە هەلومەرجی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی تاك لەبەرچاو بگیرێت و دیموکراتیەکی فیعلی ئەنجام نەدات، هەرگیز ئەو دیموکراتیە لەسەر رەتکردنەوەی ئازادی تاك دروست نابێت.

بەڵام کاتێك قسە لە سەر مانای لیبرالیزم و دیموکراتیەت و تێگەیشتنیان لەمڕۆدا دەکەین، مەبەستم چرکەساتی هەڵگەڕانەوەیە لە سوسیال دیموکراتی ئەوروپا، نابێت چرکەساتی سێیەم لە بیر بکەین. گومان لەوەدا نیە قەیرانی ئابووری و پاشەکشەی تێکڕایی گەشەکردن و تەشەنەکردنی بێکاری و قەیرانی دارایی و هەڵئاوسانی ئامادەگیەکی زۆری بۆ شۆڕشێکی فیکری دروستکرد دژ بە دیموکراتیەتی سوشیالیستی یان کۆمەڵایەتی لە پێناوی گەڕانەوەدا بۆ پرنسیپە سەرەتاییەکانی لیبرالیزم. لە سەرووی ئەم شۆرش گێڕانەوە مارگریت تاچەر و پاشان روونالد ریگان دیارن، لە دواییدا بیرۆکەکە لە هەموو دنیادا بڵاوبوەوە کە ئەمڕۆ لە چاوەڕوانی لیبرالیزمدایەو وەك فوکویاما دەڵێت بەو هیوایەی بەسەر هەموو بیرو باوەرە کۆمەڵایەتیەکانی تردا سەر بکەوێت بێجگە لە ئیسلام کە هێشتا بەردەوامە لە بەرەنگاری کردنی مۆدێرنەو پرانسیپەکانیدا.

تێزی نیولیبراڵ یان شەپۆلی لیبراڵی تازە کامەیە؟

لیبرالیزمە نوێکان بە سیانیان داناوە: یەکەمیان هۆی سەرەکی قەیرانی ئابووری دەست تێوەردانی دەوڵەتە گەورەکانە لە سیستمی ژیانی ئابووری، بەتایبەتی لە ڕێی بەشداریکردن بە کەرتێکی گشتی و فراوانەوە و زیادکردنی خەرجی گشتی و کۆمەك کردن بە پرۆژەکانی بیمەی تەندروستی و کۆمەڵایەتی، تێزی دووەم کارکردنە لەسەر فراوان کردنی بازنەی ئاڵوگۆڕە بازرگانیەکان و، دروستکردنی بازاڕێکی ئابووری جیهانی کە هەر ئەو دەتوانێت چوارچێوەیەك دیاری بکات بۆ گەشەکردن و کەڵەکەبوونی ئابووری جیهانی و، پێشنیارکردنی چارەسەری ئەو قەیرانانەی کە وڵاتە پیشەسازیەکان تووشی بوون، لە پێش هەموەوە لاوازبوونی گەشەسەندن و بڵاوبوونەوەی بێکاری. تێزی سێیەمیش پەیوەندی بە رزگاربوونەوە هەیە لەو گرێی گوناهە کۆنینەیە کە لە ڕابووردوودا بەرانبەر بە گەلانی داگیرکراو هەبوەو گەڕانەوەی تازە بۆ جەخت کردن لەسەر ئەوەی کە کلتوری خۆراواو بەهاکانی باڵادەستن وەك هنتینگتون لە کتێبەکەیدا باسی دەکات. لەم رەوتەدا، ئەزموونی کۆلۆنیالیزم دێتەوە گۆڕێ وەك چۆن لە رەوتی لیبرالیزمیشدا وەك ئەزموونێکی پۆزەتیڤ ناودێرکرا، هەروەها دەوڵەتە گەورەکان بە ناوی بیروباوەڕی لیبرالیزم و دیموکراتیەتەوە هەوڵ ئەدەن بە هەر رێگایەك بێت دەسەڵاتی خۆیان بەسەر گەلانی تردا بسەپێننەوە. بەلای منەوە پێویستە رای گشتی عەرەبی ئاسایی و رووناکبیران درکی مانای دوەم بکەن کە داواکاری دروستکردنی پارتی لیبراڵە. لەو بڕوایەدام ئەوەی رووناکبیری عەرەب مەبەستیەتی لە لیبرالیزم لە راستیا دیموکراتیەتە نەك ئەو سیاسەتە راستڕەوەی

وڵاتـــە پیـــشەسازیە گـــەورەکان و تـــۆڕی بەرژەوەنـــدی مافیاکـــان لـــەپاڵ چـــالاکییە بازرگانیەکانیاندا لە وڵاتە عەرەبیەکاندا کاری بۆ دەکـەن. بـەڵام ئەگـەر بەرەیـەکی عـەرەب هەیـە بەراسـتیی مـەیلی بـەلای تێـزی لیبرالیزمـی تازەدایـە، بـەمانای سیاسـەتێکی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی بەرانبـەر بـە سیاسـەتی دیموکراتی دەوڵەتی کە نە سیاسەتی کۆمۆنیستی بێت و نە مارکسی، بـەڵکو تـەنیا بـەرگری کـردن بێـت لـە بیمە کۆمەڵایەتیەکان بەپلەی یەکەم و ، هـەروەها بۆ ئـەوە بێـت کـە رۆڵێکـی گـەورەتر بـە دەوڵـەت بـدرێت بـۆ بـەدیهێنانی هاوسـەنگیەك لـە نێـوان بەرژەوەندیـە جیاوازەکانـدا، ئـەوا هـەقی تـەواو رەوای هەیـە بـۆ پـەیڕەو کردنـی ئـەم زاراوەیـە و بـەرگری لێکردنـی. دەبێـت ئـەوەیش بڵـێین کـە ململانێکـە ئـەمڕۆ لـە نێـوان لیبرالیەتێکدایـە کـە هەندێك جار سیمایەکی وەحشەتگەرانەی هەیـە. چـونکە لـە هـەوڵی ئەوەدایـە هـەموو ترادسـیۆنی سـەردەم، لـە پاراسـتنی ژینگـەی کـارو چـینە بەرهـەم هێنـەکان کـاول بکـات لەسـەر حـسابی دابین کردنی ئازادی زیاتر بۆ سەرمایەدارەکان و بـەدیهێنانی کێبڕکێیـەکی نموونـەیی لـە بەرهـەم هێنـان لەلایەکـەوە، لەلاکـەی تـرەوە بـەدیهێنانی دیموکراتیـەتێك کـە هـەوڵ دەدات بـۆ مـاڵیکردنی یاسـاکانی بـازاڕ لـە مەیـدانی شمـەك و کارگوزاریو کاردا بۆ نـزمترین پلـەی دیسپلین و گونجانـدن. ئەمـەیش بـە نـاوی زیـاتر کردنـی ئـازادی و یەکسانی و داپـەروەریی کۆمەڵایـەتی نەك دژی ئازادی تاکەکەس یان ئازادی کۆمەڵ.

بـە گـشتی ئەمـە جیـاوازی نێـوان دیموکراتیـەتی ئـەوروپایی و نموونـەی دیموکراتیەتی ئەمریکیە، کە ئەمەی دواییـان تـا ئێـستا لـە ژێـر بـاری کلتـووری گەورەکـەی لیبرالیزمی کلاسیکدایە.

**سەرچاوە:**

لە ئەنتەرنێتەوە: (***www.mokarabat.com***).

# هۆنراوە بۆ گەل

**کیتی جانسن**

**لە ئینگلیزییەوە: شاهۆ قادر خانزادە**

**به گوێرەی وتەی تێد کۆسەر (*ted Kooser*)، شای شاعیرانی (*Poet laureate*) ئەمریکی و براوەی خەڵاتی پولیتزر (*Pulitzer*)ی شیعر لە 2005، "نوسین و خوێندنەوەی هۆنراوە هاوبەشیکردنە لە دۆزینەوە نایابەکان".**

**هۆنراوە ئەتوانێ چاوەکانمان بەرەو ڕێگەگەلی نوێی بینینی ئەزموونەکان، سۆزەکان، خەڵك، شتی ڕۆژانە و هتد بکاتەوە. هۆنراوە لە ڕێگەی ئامرازی شاعیری وەك ووتەی مەجاز (*imagery*)، بریتیکاری (*metaphor*)، ریتم (*rhythm*) و کێش (*rhyme*) بەرەو گەشتێکی دوور و درێژ دەمان بات. هۆزانوان لەگەڵ خوێنەران و بیسەراندا بۆچوونەکانی بەش دەکات، خوێنەران و بیسەران لەگەڵ یەکدا بۆچوونەکانیان بەش دەکەن و هەر کەسێك ئەتوانێ لایەنێکی ئەم ئاڵ و گۆڕە بێت.**

**هەرچەندە، لەوانەیە بەشێوەیەکی ناڕاست، هۆنراوە زۆرجار وەك مەودای تایبەتی کەمینەیەکی ڕۆشنبیر چاوی لێکرابێت، زۆربەی نووسەران و خوێنەرانی هۆنراوە دژی ئەم نموونە وشکەن. ڕێی تێ ئەچێ هەردەم لەسەر ئەوەی کە هۆنراوە ئەبێ چەند شەفاف و چەندە ئاسان بێت بۆ تێگەیشتن، مشتومڕ هەبێت و زۆر هۆنراوە بە هۆی سروشتیانەوە هەردەم ژمارەیەکی تایبەت لێی تێبگەن. بەڵام ئەوە نابێتە هۆی دوورخستنەوەی هۆنراوە، ئەمڕۆ زوربەی شاعیرانی بەناوبانگ لەسەر ئەو بیروڕایەن کە ئەبێ هەموان بە ئاسانی لە هۆنراوە بگەن: زۆر لە لایەنگرانی بە ئاسانی تێگەیشتن لە شیعر، شای شاعیرانن. لە ڕاستیدا پلە و پایەی شاعیری کۆشکی شاهانە لەگەڵ ئەو فەرمانەدا دێت کە هۆنراوە لە خەڵك نزیك بکاتەوە.**

تێد کوسەر یەکێك لەو شاعیرانەیە و لەبارەی شتە بەناو ئاساییەکانی وەك مانگا، ئەستێرە، دەرگای لە تەل دروست کراوو ساجی سەتەلایت ئەنووسێت. کوسەر بە شوێنەوارناسی جۆرەکان ناوی لێنراوە چونکە کاتێك لە بارەی شتی رۆژانە ئەنووسێ، ژیانی ئەو کەسانە دروست ئەکاتەوە کە خاوەنیان یان بەکاریان دەهێنن. کوسەر ئەڵێ کاری هۆزانوان ئەوەیە کە تێلیدوسکوپێك (*teleidoscope*) بۆ جیهانی ئاسایی بەرز بکاتەوە و بیگەڕێنێتەوە بۆلای خوێنەر بۆئەوەی تەماشای پێ بکات. (تیلیدوسکوپ جۆرێك کالیدوسکوپە (*kaleidoscope*) کە بە جێی وردە شیشەی رەنگاورەنگ گۆیەکی روونی هەیە. کاتێك لە کونەکەوە تەماشا بکەیت، وێنەیەکی کالیدوسکوبیك دروست ئەبێت لە هەر شتێکەوە تەماشای بکەیت).

کوسەر لە ساڵی 1939 لە ئەیمز (*ames*) لە ویلایەتی ئایۆوا (*Iowa*) لەدایك بوو. بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە زانکۆی ویلایەتی ئایودا و ماستەری لە زانکۆی نێبراسکا (*Nebraska*) وەرگرت. ویلایەتەکانی ئایووا و نێبراسکا هەردووکیان لە ناوچەی دەشتە گەورەکانی ناوەڕاستی ئەمریکان، ناوچەیەك کە زۆرجار ناوچە قەرەباڵغتر و خۆشترەکانی کەنارەکانی دەریاکانی رۆژهەلات و رۆژئاوا دایئەپۆشن. رۆژئاوای ناوەڕاست (*Midwest*) بە هەبوونی زۆر شاری گەورەوە شانازی دەکات بەلام شارۆچکەی بچوك، رووبەری زەوی و زار، کێڵگە و شوێنی کراوەی لە شارەکان زیاتر هەیە. ناوچەی رۆژئاوای ناوەڕاست کە بە دڵی ئامریکا ناسراوە بە کشتوکاڵ، بەرهەم هێنانی خواردن، و ژیانی خانەوادەوە گرێدراوە. کوسەر، کە بە "پیاوێکی گوێڕایەڵی رۆژئاوای ناوەڕاست" باسی خۆی ئەکات، ئەوەی کە زۆر لە ئەمریکیەکان وەك بەها نموونەییەکانی رۆژئاوای ناوەڕاست بیری لێ دەکەنەوە تێکەڵ بە شیعری خۆی دەکات: شارەزایی زگماکی راستگۆیی، کاری زۆر، کردنخوازی، رەوشتی جوان، خۆهەڵنەکێشان، بێدەنگی. نووسراوەکانی کۆسەر بە ڕوونی و وردەکارییەوە ناسراون و تایبەتمەندیەکانی تر زیاتر بە ناوچەی رۆژئاوای ناوەڕاستەوە گرێدراون.

روونی و وردکاری لە رێگەی کردنخوازی کاری زۆرەوە دەرئەکەون. وەك زۆربەی شاعیران، کوسەر ساڵانێکی زۆر "ئیش و کارێکی رۆژانە"ی هەبوو و لە کۆمپانیایەکی بیمەکاری دەکرد و لە دواییدا بوو بە جێگری سەرۆك. هەموو بەیانییەك زوو هەڵئەسا بۆئەوەی بەر لە چوون بۆ سەر کار لە ئۆفیسی بیمە خەریکی نووسین بێت. زۆر جار هەڵبەستەکانی پیشان هاوکارەکانی ئەدا و ئەگەر نەیانتوانیایە هەڵبەستێکی بخوێننەوە ئەوا دەینوسییەوە چونکە کوسەر نەیدەویست شاعیرێك بێت کە تێگەیشتن لێی دژوار بێت. کوسەر دەڵێت هەرگیز هەڵبەستێکی لەیەك بەرنووسدا تەواو نەکردووە: کوسەر زۆر جار سی تا چل جار هەڵبەستێك ئەنووسێتەوە ئینجا هەست ئەکات ئامادەیە. کوسەر لە کۆبوونەوەیەکی نوێ بۆ خوێندنەوەی شیعردا ووتی "من لایەنگری ئەو جۆرە

هۆنراوەیەم کە خەڵکی ئاسایی بتوانن لێی تێبگەن و پێی بزانن".

ئێستا کوسەر لە کۆمپانی بیمەوە خانەنشین کراوە و لەگەڵ ژنەکەی، کاتلین راتلیج کە نووسەری (*editor*) رۆژنامەی لینکولن جورنال ستارە، لە زەوییەك لە نزیك لینکولندا ئەژی. کوسەر کە یانزە کۆمەڵە هۆنراوەی بەناوی خۆیەوە هەیە وەك مامۆستای میوان لە بەشی ئینگلیزی لە زانکۆی نێبراسکا وانە ئەڵێتەوە و ئێستاش هەموو رۆژێك زوو لە خەو هەڵئەستێت تا لەسەر هەڵبەستەکانی ئیش بکات.

کوسەر زیاد لەوەی کە بە شای شاعیرانی ولاّتە یەکگرتووەکان ناسراوە، زۆر شانازی تریشی وەرگرتووە وەك یارمەتی دارایی لە هۆنراوەدا لەلایەن خەلاّتی نەتەوەیی بۆ هونەرەکان ( *the national Endowment for the arts*)، خەلاّتی پوشکارت ( *Pushcart Prize*)، خەلاتی ستەنلی کونیتز ( *the Stanley kunitz prize*) و خەلاّتی لێهاتوویی ئەنجوومەنی هونەرەکانی نێبراسکا. کوسەر خەلاّتی پولیتزری لەسەر هۆنراوە بۆ کتێبی "خۆشییەکان و خەمەکان" ( *delights and shadows*) بردەوە.

کوسەر ئێستا لە دووهەم خولدا وەك شای شاعیرانی ولاّتە یەکگرتووەکان خزمەت ئەکات. لە یەکەم خولیدا زیاتر لە حەفتا هەڤپەیڤینی ئەنجام داو زیاتر لە سەد چاوپێکەوتنی کەسی بۆ خوێندنەوەو دوان لەسەر شیعر سازدا. کوسەر هەروەها نووسەرێکی ئاواز و چەند شاعیری بۆ زنجیرە ویژەییەکان لە کتێبخانەی کۆنگرێس بانگهێشت کرد بۆ خوێندنەوە و باسکردنی هۆنراوە بە هەڵبەستی گۆرانیشەوە. لەمەش زیاتر، دەستی کرد بە بەرنامەی "ژیانی ئەمریکی لە هۆنراوەدا"، وتارێکی سەربەخۆی ناو رۆژنامەکان، کە بۆ هەڵبەستێکی هەستیارێکی زیندوویی ئەمریکی لەگەڵ سەرەتایەك بە پێنووسی کوسەر سەرنج رادەکێشێت. وتارەکە لەسەر سایتی ***www.americanlifeinpoetry.org*** بەردەست دەکەوێت و ئەگاتە بەردەستی دەیان هەزار خوێنەر. کوسەر ئەڵێت کە ئەیەوێت پاش تەواو بوونی ماوەی مانەوەی لەسەر کار وەك مەلیکی شاعیران درێژە بەو وتارە بدات.

جەیمز بیلینگتون، بەڕێوەبەری کتێبخانەی کونگریس بە "دەنگێکی سەرەکی دێهاتەکان و شارۆچکە بچوکەکانی ئەمریکا و یەکەم شاعیر کە لە ناوچەی دەشتە گەورەکانەوە (*great plains*) هەڵبژێراوە" ستایشی کوسەر ئەکات. "هۆنراوەکانی لە ناوچە ناوخۆییەکەی خۆی تێدەپەڕێن تا سەرپێیی و بە جۆرێك کە هەموان تێیبگەن باس لە بابەتە جیهانییەکان بکەن".

ئێوە ئەتوانن لە وێبسایتی خوارەوەدا ژیاننامەی کوسەر بخوێننەوە، خوێندنەوەکان و هەڤپەیڤینەکانی ببینن و گوێیان لێ بگرن و هەندێك پارچە هەڵبەستی هەڵبژێردراو بخوێننەوە:

***www.tedkooser.com***

## هەندێك ڕاستی سەبارەت بە شاعیری شاهانە
(هەڵگەوتوو)

### شای شاعیران چییە؟

شای شاعیران شاعیرێکی بەرچاو و نوێنەری ولاٌتێك یان ناوچەیەکە. ئەم سەر ناوە لە نەریتی کۆنی یۆنان و رۆم بۆ ڕێزگرتن لە شاعیرانی زۆر باش، قارەمانانی شەڕ، و وەرزش وانان و کەسانی تر، لەگەڵ تاجێکدا دروستکراو لە لق و پەلی داری دەفنە (*laurel*) وە هاتووە. داری دەفنە لای ئاپۆلۆ خودای یۆنانیەکان و پارێزەری شاعیران، پیرۆز بووە.

یەکەم شای شاعیرانی ئینگلیزی زمان، کە بە بن جانسون لەساڵی 1616ەوە دەست پێ دەکات، ئەندامانی موچە خۆری خێزانی پاشایەتی بەریتانیا بوون کە لە بۆنە نیشتمانیەکاندا یان بۆ کۆڕی پاشا، کۆبوونەوەی فەرمی راوێژکاران و ئەفسەرانی شا یان شاژن شیعریان ئەهۆنییەوە. لە ساڵی 1843 دا کاتێك ویلیام وردزورس (*William wordsworth*) بە شای شاعیران دانرا، دەزگای پاشایەتی بوو بە بەخششێك بۆ ناوداری هونەری.

پلە و پایەی شای شاعیران لە ولاٌتە یەکگرتووەکان زۆر تازەترە. هەرچەندە فەرمانێکی کۆنگرێس سەرناوی "شای شاعیرانی راوێژکار لە هۆنراوەدا" لە 1986 دروست کرد، بەلاٌم پلە و پایەکە لە 1937 وە تا 1986 وەك "راوێژکار لە هۆنراوەدا بۆ کتێبخانەی کۆنگرێس" بوونی هەبوو.

شای شاعیرانی خۆجەیی هەتا دێت بەناوبانگتر ئەبن، لە ولاٌتە یەکگرتووەکان، ژمارەیەك لە شای شاعیرانی ویلایەتی، ناوچەیی، و تەنانەت شارەوانی لە حاڵی زیادبووندایە.

### شای شاعیری ئەمریکی تاکەی خزمەت دەکات؟

دانان لەسەر ئەو پەل و پایە بۆ ماوەی ساڵێکە، و لە مانگی سێپتەمبەرەوە تا مانگی مەی بەردەوامە. زۆر جار ماوەکە بۆ ساڵی دووهەم تازە دەکرێتەوە. رۆبرت پینسکی لە 1997 وە تا 2000 بۆماوەی سێ جار ئەو پلە و پایەی هەبوو.

### شای شاعیران چۆن هەڵدەبژێردرێت؟

بەڕێوەبەری کتێبخانەی کۆنگرێس شای شاعیرانی نیشتمانی دیاری دەکات. بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنێك، بەڕێوەبەری کتێبخانە لەگەڵ شای شاعیران، ئەوەی کە خەریکە دەڕوات و ئەوانەی پێشوو، هەروەها لەگەڵ رەخنەگرانی هۆنراوە ڕاوێژ دەکات. کۆمیتەکانی شاعیرانی خۆجەیی زۆرجار شای شاعیرانی خۆجەیی لەسەر بنچینەی زۆر باشێتی هونەری هەڵدەبژێرن.

### ئایا شای شاعیران موچەی پێ ئەدرێت؟

شای شاعیرانی ئەمریکا سی و پێنج هەزار دۆلار وەك مووچە وەردەگرێت. مووچەکە لەلایەن ئارچر هانتینگتون (*archer m.huntington*)ی مرۆڤدۆست (1995−1870)، کە بە هۆی دامەزراندنی کۆمەڵگای

هیسپانیکی ئەمریکا (*Hispanic society of America*) زۆر بەناوبانگ بوو، دابین دەکرێت. شای شاعیرانی خۆجەیی لە ئاستێکی زۆر نزمتردا موچەیان پێ ئەدرێت، ئەگەر هەر پێیان بدرێت.

### کاری شای شاعیران چییە؟

ساڵی جارێک شای شاعیران وتارێک و خوێندنەوەیەکی شیعرەکانی پێشکەش ئەکات و زۆرجاریش لە زنجیرە هۆنینەوەی ساڵانەدا لە کتێبخانەی کۆنگرێس شاعیران دەناسێنێت. هەروەها لەسەر بەرنامەی وێژەیی ئامۆژگاری کتێبخانەی کۆنگرێس ئەکات و کۆمەڵە هۆنراوەی نوێ بە ئارشیفی وێژە و هۆنراوەی تۆمارکراوی کتێبخانە پێشنیار دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا، بەپێی وێب سایتی کتێبخانەی کۆنگرێس، شای شاعیران "بە شوێن بەرزکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەییە بۆ پێزانینی باشتری خوێندنەوە و نووسینی هۆنراوە".

شای شاعیرانی خۆجەییش بۆ بەرزکردنی ئاستی ئاگاداری سەبارەت بە هۆنراوە هەوڵ ئەدەن. بۆ وێنە لە ساڵی 2001دا، جەیمز بەیکر هاڵ (*James Baker Hall*)، مامۆستایەکی نووسینی داهێنەر، لە ویلایەتی کێنتاکی بوو بە شای شاعیران. ئەو وەک مامۆستایەک ئەیزانی کە رۆشنبیرانەکردنی هۆنراوە و هونەرەکانی تر رێک وەک چەشتنیان نییە. لە ماوەی مانەوەی لەسەر ئەو پۆستەدا، هاڵ لە ئامادەبوونی زیاتری هونەرمەندان لە خوێندنگاکان پشتگیری کرد بۆئەوەی دەرفەتێک بدات بە خوێندکاران لەگەڵ هونەرمەنداندا بدوێن و تەنیا لە دوورەوە لە بارەی کارەکانیان زانیاریان دەست نەکەوێت.

خۆزێ مونتۆیا (*Jose montoya*) شای نوێی شاعیران لە ساکرامێنتۆی کالیفورنیا پشتگیری خوێندەواری دەکرد و دەیویست وا بکات لە هۆنراوەکە هەموان، بێ سەرنج دان بە تەمەن یان رابردووی فەرهەنگی و خوێندەواریان، تێبگەن. مونتۆیا لەسەر ژیان لە باریۆ (*barrio*) (کۆمەڵگایەکی ئیسپانی زمان یان ناوچەیەک لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا) دەنووسێت و بە هاوبەشی کۆمەڵەیەکی هونەرمەندانی دروست کرد کە بە بەرەی هونەری چیکانۆی سەرکێش (*rebel chicano Art Front*) ناسراوە و لەبەر چالاکی کۆمەڵگا و هەروەها نیگارەکانی سەر دیوار و پۆستەرەکانی ناوی دەرکرد. وێستگەیەکی تەلەفزیۆن لە ساکرا مینتۆی کالیفۆرنیا، بە باڵوێزی هونەری گەلی وێژەیی ناوی لە مونتۆیا برد.

### چەند کەسێك لە شای شاعیران لە دوو دەهەی رابردوودا

زۆر لە شای شاعیرانی نیشتمانی هەوڵیان داوە وا لە شیعر بکەن کە هەموان تێیبگەن. هەوڵەکانی هەندێکیان لە خوارەوە باس دەکرێت. (ئەو ساڵانەی کە ئەوان وەک شای شاعیرانی ولاتە یەکگرتووەکان خزمەتیان کردووە لە دوو کەوانەدا نووسراوە).

خاتو ماکسین کومین (*Maxine kumin*) (1981–1982) لە کتێبخانەی کۆنگرێس چەند

کارگەی هۆنراوەی بە ژنان دا. کومین نەك هەر لەبارەی باسگەلی جیهانی وەك شەڕ و مردن لە برسا بەڵکو لە بارەی ژیانی نهێنی ژنان، دۆستایەتی، پەیوەندیگەلی خانوادەیی و ژیانی لادێ لە نێو ئینگلەندیش ئەنووسێت. زۆربەشی هەڵبەستەکانی لەسەر بناغەی ئەزموونەکانی خۆیەتی لە مناڵیدا. کومین ماوەی چوار ساڵ راوێژکارێکی ئاکادیمیای هەستیارانی ئەمریکا (*Academy of American Poets*) بوو بەڵام دەستی لە کار کێشایەوە، هاوڕێ لەگەڵ کارۆلین کیزر (*Carolyn Kizer*) راوێژکار و شاعیری هاوڕێی وەك شێوەیەکی دژایەتی کردنی سنووردارکردنی ژمارەی ئەو شاعیرانەی کە سپی پێست نین.

خاتوو گویندۆلین بروکس (*Gwendolyn Brooks*) (1985–1986) جۆرەکان و پێشبڕکێکانی هۆنراوەیی بردە ناو قوتابخانە سەرەتاییەکانی گەڕەکە هەژار و قەرەباڵغەکانی ناوەوەی شار تا یارمەتی منداڵان بدات "لە ژیانیاندا هۆنراوە ببینن". بروکس لە بزوتنەوەی کارگەی هۆنراوەدا چالاك بوو. بروکس، کە لە ژێر کاریگەری ئەزموونەکانی خۆی لە قوتابخانە تێکەڵاوو جیاوازەکان لە باری رەگەزییەوە لە گەڕەکە هەژارو قەرەباڵغەکانی شیکاگۆ بوو، لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە هۆنراوە بۆ هەموانە نەك هەر بۆ چینی هەڵبژاردەی کۆمەڵگا. بروکس، کە یەکەم ئەمریکی بە رەگەز ئەفریقی براوەی خەڵاتی بولیتزرە (لە ساڵی 1950 دا لەبەر کۆمەڵە شیعری ئەنی ئالین (*Annie Allen*)، هەڵبەستی لەسەر باسگەلێك دەهۆنیەوە کە ژیانیماڵبات و ژیانی ئەمڕۆ بە سەبەی لە گەڕەکە هەژار و کەمینە قەومیەکاندا دەگرتە خۆ. بروکس لە 1968 وە تا کاتی مەرگی لە ساڵی 2000 دا شای شاعیرانی ویلایەتی ئیلینۆیز بوو.

جۆزیف برۆدسکی (*Joseph Brodsky*) (1991–1992) پشتگیری بلاْوکردنەوەی زیاتری هۆنراوەی دەکرد. بۆچوونی ئەوەبوو کە کتێبگەلی شیعر لە شوێنە گشتیەکان دابنرێن بۆئەوەی خەڵك شیعر بخوێننەوە، کاتێکی خۆشی لەگەڵدا بەرنەسەر و تێیدا بەشداری بکەن. نووسەرێکی لاو بە ناوی ئەندی کارول (*Andy Carroll*) لە 1993 دا هێزەکانی لەگەڵ برودسکییەك خست بۆ ئەوەی پرۆژەی ئەمریکی خوێندەواری و هۆنراوە (*American Poetry and Literacy Project - APLP*) دابمەزرێنن، کە ئەم پرۆژەیە نموونە بەخشراوەکانی گوڵبژێری وێژەیی جۆل کۆنارۆ (*Joel Conarroe*)ی بە ناوی "شەش شاعیری ئەمریکی" لە ژووری ئوتێلەکانی سەر ڕێ بلاْو دەکردەوە. لەم کتێبەدا کارەکانی لانگستن هیوز[1]، والت ویتمەن[2]، رۆبرت فرۆست[3]، والیس ستیڤێنز[4]، ویلیام کارلۆس ویلیامز[5]، و ئێمیلی دیکنسۆن[6] بەرچاو دەکەون. پرۆژەکە، لەو کاتەوە دەستی پێکرد، زیاتر لە یەك ملیۆن کتێبی هۆنراوەی بە خۆڕایی لە قوتابخانەکان، سوپێرمارکیتەکان، ئوتێلەکان، نەخۆشخانەکان، فرۆکەخانەکان، باخچەکانی ئاژەڵ، ژوورەکانی چاوەڕێ بوون، وێستگەکانی لۆری و جێگە گشتیەکانی تر لە هەموو ولاْتە یەکگرتووەکان دابەشکردووە.

پرۆژەکە تەنانەت هەندێك بڵاوكاری قایل کرد کە لە کتێبی ژمارە تەلەفوندا شیعر چاپ بکەن.

بەرهەمە چاپکراوە شیعریەکانی تری ***APLP*** کە بەبەلاش بڵاوکراونەتەوە چەند بەرهەمی ئێرگار ئالین پۆی بە ناوی "قەلەرەشە و چەند هەڵبەستی پەسەندی تری" بۆ هالۆوین، و "هەڵبەست گەلی ئەوینی مەزن" بۆ ڕۆژی ڤەڵنتاین، و گوڵبژێرێکی وێژەیی بەناوی "بە درێژایی هێڵەکانی وڵات: پەنجا ویلایەتی ئەمریکا بەو چەشنەی لە هۆنراوەدا نیشان دراون" بۆ مانگی هۆنراوەی نیشتمانی لە 2003 دا لە خۆ گرتبوو. هەروەها لە هەڵە برین، ئامادەکردن، و دابەش کردنی پانزە هەزار نموونە لە گوڵبژێرێکی شیعر وەك بەشێك لە پرۆژەی ریداسۆن (***Read-a-Thon***)بۆ منالآنی تەمەن دە تا چواردە ساڵ هاوبەشی ئاکادیمی هەستیارانی ئەمریکای کرد. ئەم پرۆژەیە خوێندنەوەو نووسینی لەسەر شیعر هان دا. ***APLP*** بە تەواوی لە لایەن خۆبەخشان و باربووەوە پشتگیری دەکرێت.

خاتو ریتا داڤ (***RITA DOVE***) (1995-1993) نووسەرانی لەیەك کۆکردەوە بۆئەوەی رەوەندی ئەفریقا لە چاوی هونەرمەندەکانیەوە لێکبدەنەوە. لەگەڵ کتێبخانەی ڤێرجینیا، کە رۆڵی کتێبخانە، ئارشیف و ژووری سەرچاوەی ئەو ویلایەتەی هەیە، ریتاداڤ لە دەرکەوتنێکی یەك کاتژمێری تەلەفزیونیدا لەسەر هۆنراوە بەناوی "وشەکانت پرشنگدار بکە: بەیانییەك لەگەڵ ریتا داڤ"، سەرنجی بۆ منالآنی قوتابخانە سەرەتاییەکان راکێشا. داڤ هەروەها هۆنراوە، جاز، و خوێندنەوەی هەڵبەستی بە دەنگی بەرز لەلایەن شاعیرانی لاوی کرەو (***Crow***) بردە ناو زنجیرەی وێژەیی کتێبخانەی ڤێرجینیاوە. لە جانویەی 2000 وە تا جانویەی 2002 بۆ رۆژنامەی واشینگتون پۆست وتارێکی هەفتانەی بەناوی "هەڵبژاردەی هۆزان وان" ئەنووسی. ئێستاکە داڤ شای شاعیرانی کامنویلسی ڤێرجینیایە. (***The Commonwealth of Virginia***)

رۆبرت پینسکی (***Robert Pinsky***) (1997-2000) پرۆژەی هەڵبەستی پەسەندی دامەزراند. پرۆژەکە رایگەیاند کە ناولێنانی هەڵبەستە پەسەندەکان بۆ ماوەی یەك ساڵ قەبوڵ دەکات. لەو ماوەیەدا، هەژدە هەزار ئەمریکی هەڵبەستە پەسەندەکانی خۆیان بۆ لێکدانەوە پێشکەش بە پرۆژەکە کرد، کە پاشان کۆکرانەوە و کران بە سێ گوڵبژێری وێژەیی. پرۆژەکە بەردەوامە لەسەر وەرگرتنی بەرهەمی پێشکەش کراوی زیاتر بۆ پێگەی زانیاری (***database***) خۆی. بەپێی وێب سایتی پرۆژەکە، ***www.Favoritpoem.org***، وەڵامی ئەم پرۆژەیە پێوەندی نێوان هۆنراوە و فەرهەنگی دیموکراتیك دەرئەخات. پینسکی هەروەها هەڵەبڕی هۆنراوەیی گۆڤاری سلەیت (***slate***)ە، کە هەفتانە لەسەر ئینتەرنێت دەرئەچێت، و لەوێدا خوێنەران ئەتوانن بە کلیك کردنی پێوەندییەك (***Link***) لە خوێندنەوەی پارچە هەڵبەستێك بە دەنگی شاعیر خۆی گوێ بگرن.

بیلی کولینز (***Billy Collins***) (2003-2001) لە رێگەی هۆنراوە 180، ***www.loc.gov/poetry/180***، وێب سایتێکی

کتێبخانه کونگرێس، که هەڵبەستی جۆراوجۆر بۆ هەموو رۆژانی ساڵی خوێندن پێشکەش ئەکات، هۆنراوە دەباتە ناو قوتابخانە ناوەندییەکانی ولاّتە یەکگرتووەکانەوە. کۆلینز لە هۆنراوەکانیدا لە نوکتە و قسەی خۆش وەك "دەرگا"یەك کەڵك وەردەگرێت کە بەرەو جێگەگەلی زۆر جیدی تر ئەکرێنەوە. رێی تێئەچێ لەبەر ئەمە بێت کە کولینز هونراوەکانی خۆی وەك شێوازێکی نووسینی گەشتنامە دەبینێت. کولینز هۆنراوەکانی بەساکار، هی ناو ماڵ و هی چینی ناوەندی کۆمەڵگا نیشانە دەکات. کولینز لە بارەی شتگەلی رۆژانە وەك کاتالۆگی شت کڕین لە ڕێگەی پۆستەوە، کتێبی کۆن، گژو گیا، و شتی تریش دەنووسێت و حەز دەکات هەڵبەستەکانی سەرەتا، ناوەڕاست و کۆتاییەکی روونیان هەبێت.

## مێژووی کتێبخانەی کونگرێس

ماڵی فەرمی شای شاعیران لە ناوەندی وێژەو هۆنراوەیە لە کتێبخانەی کونگرێس لە واشینگتون دی سی. ئەم ناوەندە سەرپەرشتی خوێندنەوە جەماوەریەکانی هۆنراوە و چیرۆك و هەروەها وانەکان و رووداوە وێژەییەکانی تر دەکات. هەرچەندە سەرەتاکانی ناوەندەکە بۆ 1936 دەگەڕێتەوە بەلاّم کتێبخانەی کونگرێس خۆی زۆر کۆنترە.

لە 1800 دا سەرۆك کۆمار جۆن ئادامز گەلاّلەیەکی واژو کرد کە حکومەتی فیدراڵی لە واشینگتون (نەك لە فیلادلفیا) دامەزرانـد و کتێبخانەی کونگرێسی هاوریّ لەگەڵ کومیتەیەکی هاوبەش لەسەر کتێبخانە دروستکرد. مەبەست لە کتێبخانەی کونگرێس کتێبخانەیەکی سەرچاوە بوو، تەنیا بۆ کەڵك لێ وەرگرتنی کۆنگرێس. ماڵی کتێبخانەکە کۆشکی نوێی کاپیتۆڵ[7] (*the new Capitol Building*) بوو تا ئەو کاتەی سەربازانی بەریتانیا لە 1814 دا ئاگریان تێبەردا. کەمێك دوای ئەو رووداوە، تۆمەس جیفرسۆن، کە ئەو کات سەرۆکێکی خانەنشین بوو، پێشنیاری کرد کە ئەو ناواخنە سوتێنراوە بە کتێبخانەی کەسی ئەو، کە 6.487 کتێبی تێدا بوو، پڕ بکرێتەوە. لەبەرئەوەی کە کتێبەکانی جیفرسون جۆرەها باسیان لەخۆ گرتبوو، و هەندێکیان بە زمانە بیانیەکان بوون، بناغەیەکیان بۆ کتێبخانەیەکی نیشتمانی گەلێك گشتگرتر دارشت. بەپێی وێب سایتی کتێبخانەی کۆنگریس، "چەمکی جیهانێتی جیفرسون، ئەو بۆچوونەی کە هەموو باسەکان بۆ کتێبخانەی ئەنجومەنی یاسادانەرانی ئەمریکا گرنگن، فەلسەفە و هۆی بنچینەیی پشت سیاسەتە رێك و پێکەکانی کۆکردنەوەیی کتێبخانەی کۆنگریسی ئەمرۆکەیە".

کتێبخانەکە لە 1864 ەوە تا 1897 لە ژێر بەرێوەبەری ئەینزورس رەند سپۆفورد (*Ainsworth Rand spofford*)، بەرێوەبەری کتێبخانەی کۆنگریس، بەرەو بوون بە ئەنستیتۆیەکی نیشتمانی گەشەی سەند، سپۆفۆرد لە 1870 دا یاسای ماف چاپ کردن (*copyright*)ی پێشکەش کرد کە داوای لە سەرجەم داواکارانی ماف چاپکردن ئەکرد دوو بەرگ لە کارەکانیان بۆ کتێبخانەی کۆنگریس بنێرن. لە 1886 دا لەبەر لێشاوی کتێب،

سپۆفورد لە تەك "دانیەل ڤورهیز" سیناتوری ئیندیانا و "جاستین مۆریل" سیناتوری ڤێرمۆنت کۆنگریسیان قایل کرد ڕێگە بدات بە پێشبڕکێیەك لەسەر نەخشەیەك بۆ تەلارێکی نوێ و گەورەتر. تەلاری شێواز ڕێنسانسی ئیتالی لە پێشبڕکێکەدا سەرکەوت و لەلایەن "جۆن سمیزمەیەر" و "پۆل بیلز" ئەندازیارانی تەلارسازی واشینگتونەوە نەخشەی بۆ داڕێژرا.

لە 1888دا ڕەوتی تەلارسازی بە لێپرسراوێتی ژێنرال "تۆمەس لینکولن کەسیی"،سەرۆکی لقی ئەندازیارانی سوپا، دەستی پێکرد. کوڕەکەی، "ئیدوارد پیەرس کەیسی"، لە 1892 دا دەستی بە چاودێری کردنی کاری ناوەوەی تەلارەکە کرد کە پەیکەرەکان و نیگارە کێشراوەکانی دەستکردی زیاتر لە پەنجا هونەرمەندی ئەمریکی ئەگرتە خۆی. لە یەکی نۆڤامبری 1897دا کتێبخانە نوێکە بۆ گشت خەڵك کرایەوە.

تەلاری جۆن ئادامز، دروستکراوی ساڵی 1938، و تەلاری یادەوەری جەیمز مەدیسون (*James Madison memorial Building*) دروستکراوی ساڵی 1981، ئێستاکە خراونەتە سەر تەلاری یەکەمی تۆمەس جیفرسۆن.

یەکەم جار لە 1936 دا ئارچر هانتینگتون (*Archer Huntington*)پارەیەکی زۆری دا بە کورسی هۆنراوەی کتێبخانەکەو لە ساڵانی 1940ەکاندا ناوەندی وێژە و هۆنراوە دامەزرا. یارمەتی کتێبخانەکە بەشێوەی سەرەکی لە میراتی گێرترود کلارك ویتال ( *Gertrude Clarke Whitall*)ەوە دێت، کە وەك زۆر لە شای شاعیران دەیویست وێژە و هۆنراوە بخاتە بەردەست خەڵکێکی زیاتر. ئێستا کتێبخانەی کۆنگریس زیاتر لە 29 میلیون پەرتوك بە 460 زمان، 58 ملیون دەسنووس، گەورەترین کۆمەڵە پەرتوکی نایابی لە ئەمریکای باکور، و گەورەترین کۆمەڵە نووسراوی تایبەت بە یاسا، فیلم، نەخشەی جوگرافی، مۆسیقای چاپکراو، و دەنگی تۆمار کراو لە خۆیدا جێ کردۆتەوە.

بەڕێوەبەری هەنوکەی کتێبخانەی کۆنگریس، جەیمز بیلنگتون، لە 1987ەوە لەسەر ئەو کارەیە.

### پەراوێزەکان:

*1-Langstan Hughes*

*2-Walt Whitman*

*3-Robert Frost*

*4-Wallace Stevens*

*5-William Carlos Williams*

*6-Emily Dickinson*

7-کۆشکی کۆنگریسی ئەمریکایە لە واشینگتون (وەرگێڕ).

### سەرچاوە:

*English Teaching Forum*

*Volume 44 number 1 2006*

*Published by the U.S Department of state For teachers of English.*

# تابلۆیەکی هێلکەیی

ئێدگار ئالان پۆ
لە ئینگلیزییەوە: پشتیوان مبارەك کەریم

بەسەر لوتکەی دارستانەکەوە تارماییەکمان دی. زۆر دوور نەبوو. بەلاّم سەفەر کردن لەو بەشە سەخت و دژوارەی شاخەکەدا زەحمەت بوو. نەگەیشتینە سەرەوە تاکو شەو داهات. خانوویەکی جوان بوو بەلاّم سەیر و غەمگین بوو. شوێنەوارێکی سەدان ساڵە بوو. پیدرو، خزمەت کارەکەم، لە دەرگایەکی بچوکی پشتەوە رۆشتە ژوورەوە و بە وریاییەوە منیشی بردە ژوورەوە. ئەوەندە بە خراپی بریندار کرابووم کە ئەگەر تا بەیانی بمامایەتەوە دەمردم.

پیدرۆ ووتی: خەڵکی تا ماوەیەکی زۆر کەم بەر لە ئێستا لێرەدا ژیاون، بە پەلە بەجێیان هێشتووە. لە چەند ژوورێکی رازاوەی بەرزەوە بردمیە ناو ژوورێکی بچووك لە سوچێکی ماڵە گەورەکەدا. یارمەتی دام تاکو لەسەر جێگاکە راکشام. لەم ژوورەدا چەند وێنەیەکی زۆر جوانو تازەی تێدا بوو. لە تاریکیدا بۆ ماوەیەك تەماشایانم کرد. بە دەوروبەرمدا و بە هەموو شوێنێکی دیوارەکانەوە بوون. دوای تاریك بوون لەبەر ئازار نەمتوانی بنوم. هەروەها ئێستا ئەوەندە بێهێز بووم کە ترسام بمرم لەبەرئەوە داوام لە پیدرۆ کرد کە چرای تەنیشتی جێگاکە داگیرسێنێت. دەستم کرد بە تەماشاکردنی وێنەکانی سەر دیوارەکان، ئینجا کتێبێکی بچوکم خوێندەوە کە لەسەر جێگاکەی تەنیشتم دۆزیبوومەوە. ئەم کتێبە باسی هەموو وێنەکانی ناو ژوورەکەی دەکردو یەك بە یەك چیرۆکیانی دەگێڕایەوە. بۆ ماوەیەکی زۆر سەیرم کردن و خوێندنمەوە. کاتیش بە خێرایی تێدەپەڕی، نیوە شەو هات و رۆیشت. چاوەکانم زیاتر و زیاتر ماندوو بوون، کتوپڕ هەستم کرد بەزەحمەت وشەکانی سەر لاپەڕەکە دەخوێنمەوە. لەبەرئەوە هاتمە دەرەوە بە ئێش و ئازار و زەحمەت چراکەم نزیکتر کردەوە. ئێستا

روناكی چراكه بەشێكی تری ژوورەكەی رووناك كـردەوە ئـەو بەشـەی كـە تـاكو ئێـستا لـە سێبەرێكی زۆر تاریكدا بـوو. چەندین تـابلۆی ترم بینی كە لە نێوانیاندا تـابلۆی ژنێكی گەنج بوو. هەر كە تەماشام كرد چاوەكانم نوقاند. هەروا بە چاو نوقاوی هەوڵم ئەدا تێبگەم بۆچی كتوپڕ چاوەكانم ئاوا نوقاند .

پاشان زانیم لەبەرئەوە بوو كە پشوویەك بە خۆم بدەم. پێویستم بە پشوویەك بوو تاكوو بیربكەمەوە . ئایا دڵنیام كە بە ڕاستی ئەوەی كە بیرم لێدەكردەوە بینیم؟ یان خەون دەبینم؟ نەخێر كتوپڕ زۆر وووریا بومەوە.

چاوەڕێم كرد تاكو دووبارە هێور بومەوە، ئینجا چاوەكانم كردەوە بۆ جاری دووەم سەیرم كردەوە. نەخێر، هەڵە نەبوو، چاوەكانم هەر ئەوەیان دەبینی كە جاری یەكەمیش، چەند چركەیەك لەوەو پێش هەر ئەوەیان دیبوو.

تابلۆكە، وەك ووتم، نیگارێك بوو، كە لە شێوەدا هێلكەیی بوو، سەروشانی ژنێكی گەنجی دەنواند. باشترین و جوانترین تابلۆی دەستكرد بوو كە لە هەموو تەمەنمدا دیبێتم. هەروەها دەشزانم كە هەرگیز ئافرەتی ئەوەندە جوانم نەدیوە. بەڵام ئەوە جوانی ئەو ژنە نەبوو كە كاتێك چاوم چوو بووە خەو كتوپڕ رایچڵەكانم. هەروەها جوانی ئیشی شێوەكارەكە نەبوو كە بەرێگایەكی چەند سەرسوڕهێنەر ووروژانـدمی! نزیكـەی كاتـژمێرێك بـە قنجكەمامەوە هەرگیز چاوم لە تابلۆكە نەدەتروكاند. دواجار تێگەیشتم كە چ نهێنیەكی راستەقینە لە وێنەكەدا هەبوو. دووبارە گەڕامەوە ناو جێگاكە. چاوەكانی، زەردەخەنەی جوانی، بەو شێوەی كە سەیری منی دەكرد، زۆر راستەقینە بوو. زۆر دژوار بوو باوەڕ بكەی كە ئەوە تەنها تابلۆیەكە، مرۆڤێكی زیندوو نییە.

یەكەم جار كە سەیری تابلۆكەم كرد بە ئاسانی نەمتوانی باوەڕ بكەم كە چاوەكانم چیان بینی. بەڵام ئێستا تێگەیشتم كە هەستێكی زۆر جیاواز لە ناخمدا گەشەی كرد. زیاتر تەماشای ئەو چاوانەم كرد، زیاتر سەیری ئەو زەردەخەنە جوانەم كرد. زیاتر نیگەران بووم. پێم سەیر بوو، ترسێكی تۆقێنەر كە نەمدەتوانی لێی تێبگەم. ترسێكی تۆقینەرانە. چراكەم گەڕاندەوە بۆ شوێنی پێشوو. ئێستا تابلۆكە دووبارە لە ناو تاریكیدا وون بوو. بە خێرایی سەیری كتێبەكەم كرد هەتاكو چیرۆكی "نیگارە هێلكەییەكەم" دۆزییەوە ئەم ووشانەم تێدا خوێندەوە:

"گوڵێكی گەنجی جوان بوو. هەمیشە دڵخۆش بوو، بەڵێ، دڵخۆش بوو هەتاكو ئەو رۆژە نەگریسەی كە شێوەكاری تابلۆكەی بینی و كەوتە داوی ئەڤینیەوە، زەماوەندیان كرد، بەڵام بە غەمگینی. پێشتر ژنی هێنابوو ئیشەكەی، كاری شێوەكاری بۆ ئەو لە هەموو شتێكی جیهان گرنگتر بوو.

پێشتر روخسارێكی كراوەو بە زەردەخەنەی هەبوو. هەموو شتێكی لە جیهاندا خۆشدەویست بەڵام ئێستا هەموو شتێكی خۆش دەویێت جگە لە كاری مێردەكەی. كاری وێنەكێشان و شێوەكاری تاقە دوژمنی سەرسەختی بوو. تا وای لێهات بەرەبەرە رقی لە وێنەكێشان دەبووەوە كە بەردەوام مێردەكەی

لیٚ دووردەخستەوە. لەمەش ناخۆشتر ئەوە بوو کاتێك كە مێردەكەی پێی ووت كە ئەیەوێت وێنەیەكی ژنە گەنجەكەی بكێشێت.

بۆ ماوەی چەندین هەفتە، لە ڕێرەوەكەدا دانیشت كاتێك كە ئیشی دەكرد ژوورەكە تاریك بوو، پیاوێكی بێدەنگ بوو، هەمیشە كاری دەكرد، هەمیشە لە چەمووشی و سەرەڕۆیی خۆیدا وون بوو بوو. خەون گەلی شاراوە. هێشتا دانیشتبوو، هەمیشە پێدەكەنی، سات لە دوای سات، ڕۆژ دوای ڕۆژ، كاتێك كە وێنەكەی دەكێشا هەرگیز نەدەجولاٚ. سەیری نەدەكرد كە ڕۆژانە لاوازتر دەبێت. هەرگیز تێبینی ئەوەی نەدەكرد كە چیتر لەش ساغ و دڵخۆش نییە. گۆڕانكاریەكان لە پێش چاویدا ڕوویاندەدا، بەلاٚم ئەو نەیدەبینی. بەلاٚم بەردەوام بوو لە پێكەنین، هەرگیز لە پێكەنین نەدەوەستا چونكە بینینی مێردەكەی كە ئێستا زۆر بەناوبانگ بووە، زۆر چێژی لە كارەكەی وەرگرتووە، بە شەو بە ڕۆژ كاری دەكرد، وێنەی ئەو ژنانەی دەكێشا كە خۆشی ویستبوون. كاتێك كە وێنەكەی دەكێشا، ژنەكە كە خۆشی دەویست وورده وورده لاوازتر و غەمگینتر دەبوو. چەندین كەس تابلۆ نیوە تەواو كراوەكەیان بینی. ووتیان بە شێوەكارەكە چەند سەرسوڕهێنەرە. كاتێك كە ئیشی دەكرد بە نەرمی و لەسەرخۆ قسەی دەكرد. پێیان ووت تابلۆكە پیشانی دەدات كە چەندێك ژنە جوانەكەی خۆشویستووە. بە بێدەنگی لەبەردەم مێردەكەی و میوانەكانیدا دانیشت، ئێستا نە هیچ دەبیستێت و نە هیچ دەبینێت. تابلۆكە نزیك بوو بووەوە لە تەواو بوون. چیتر بەخێرهاتنی میوانەكانی نەدەكرد لە ژوورەكەدا. ئێستا ئاگرێكی سامناك لە ناخیدا دەسوتا. هۆڤانی بوو بوو خەریك بوو شەیدا دەبوو بە كارەكەیەوە. ئێستا هەرگیز چاوەكانی تابلۆكەیان جێنەدەهێشت. تەنانەت بۆ تەماشاكردنی ڕووخساری ژنەكەشی كە وەك بەفر سپی بوو. نیگاركێشەكە سەیری نەدەكرد ڕەنگەكان كە نەخشاندوونی هێندەی ڕووخساری ڕاستەقینەی ژنەكەی درێژ نییە. چەند هەفتەی تر تێپەڕی تاكو ڕۆژێكی ناوەڕاستی زستان، تابلۆكەی تەواو كرد دەستی دا لە دواهەمین ڕەنگی سەر لێوەكانی هێڵێكی باریكی لەسەر چاوێكی كێشا، دواهەمین كاری تەواو كرد، پاشان لە تابلۆكە دوور كەوتەوەو تەماشای كارە تەواوكراوەكەی كرد.

هەر كە تەماشای كرد ڕاچڵەكی. ڕەنگی لە ڕوو نەما و بڕسكا. واقی لە وێنەكە وڕمابوو. پڕ بە دەنگی بەرەو دەرەوە هاواری كرد: ئەم ژنە لە بۆیاخ دروست نەكراوە، بەڵكو زیندووە.

پاشان كتوپڕ ئاوڕیدایەوە هەتاكوو تەماشای ئەو ژنە بكات كە زۆری خۆشدەویست كە سەیری كرد ژنەكە مردبوو.

**سەرچاوە:**

*The Black Cat And Other Stories*

# سلێمانی و بەرەبەیانی جیهان

پێشەکی: سەید عەلی ساڵحی
لە فارسییەوە: ڕەزا مەنوچەهری

چەند کۆمەڵە شیعرێکی دیکەی شێرکۆ بێکەس وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی فارسی و لە دووتوێی کتێبێکدا بە ناونیشانی (سلێمانی و بەرەبەریانی جیهان)لە تاران چاپکراوە. ئەو دیوانە هەمەرەنگە لەلایەن چاپ و پەخشی (نگاه)وە بە چاپ گەیشتووە. سلێمانی و بەرەبەیانی جیهان لە قەبارەی (392) لاپەڕەدا بە بەرگێکی جوانەوە بلاّوبووەتەوە. شیعرەکانی نێو ئەم کتێبە جۆراو جۆرن و لە چەند سەرچاوەی جیاوازەوە وەرگێردراونەتە سەر زمانی فارسی. ئەوەی کە من بەدواداچوونم بۆ کردووە سود لە بەرگی دووەمی دیوانی شێرکۆ بێکەس، شیعرستان، سی دی و کاسێت وەرگیراوە و سەرباری ئەوەش قەسیدەی (دەربەندی پەپولە) و (بۆننامە)ی تێدایە. سەرەتای کتێبەکە بەو کورتە شیعرانە دەستپێدەکات کە لە زەمان و کاتی جیاواز و دوردا نوسراون. بە دوای کورتە شیعرەکاندا دەربەندی پەپولە و لە درێژەیدا بە بۆننامە کۆتایی پێی دێت. بۆ وەرگێرانی ئەو شیعرانە شێوازێکی تایبەت بەکارهاتووە کە جیاوازە لە وەرگێرانی باوی بابەت، دەق، یان کتێب و شیعر، چونکە لە وەرگێردراوە فارسییەکەیدا ناوی زۆرێك لە شیعرەکان گۆڕاون و ناوی تریان بۆ دانراوە. ئەم شێوازە پێشتر (ئەحمەد شاملو) لە ئێران بۆ وەرگێرانی شیعری شاعیرانی دیکەی بەکارهێناوە، بەلاّم ئەوەی جێگای هەڵوەستەکردنە ئەوەیە کە دوور و نزیك لە پەراوێزی شیعرەکاندا ئاماژە بەوە نەکراوە کە ناوی شیعرەکان گۆڕاون، یان ئەو شیعرە لە کام دیوان و سەرچاوەوە وەرگیراوەو ئەو ناونیشانە تازەیەیان بۆ داناوە.

هەرچەند سەید عەلی ساڵحی لە پێشەکییە کورتەکەی سلێمانی و بەرەبەیانی جیهان بەم

شێوەیە باس لەم دەستکاریکردنە دەکات: "بەڵێ بۆ سەرلەنوێ خوێندنەوەی شیعرەکانی شێرکۆ و بە پاراستنی تەواوی مانا و مەبەستی سەرەکیی شاعیر (نەك شێوەی بێ جوڵەی دەق) قەڵەمەکەم لە زنجیری نەکاو شەرت و مەرجی خەم رزگار کرد تاکو ئەو رادەیە کە تەنانەت هەندێك لە ناوی شیعرەکان — — بە مەبەستی بە ئێرەیی کردن و خۆماڵیتر کردنی هەست و وشیاری گێڕانەوە — گۆڕیوە. هەڵبەت گومان لەوەدا نییە کە ناونیشانی تازەی شیعرەکان هەر لە ناخی هەمان شیعرەوە لەدایکبووە".

بێگومان ئەوە روونکردنەوەیەکی سەرەتایی و باشە بۆ خوێنەر، بەڵام ئاماژە نەدان بەو شیعرانەی کە ناوەکانیان گۆڕاون و لە کام یەك لە سەرچاوەکان وەرگێڕاون هەندێك تێکەڵی و پێکەڵی دروستکردووە. ئەگەر ئاماژەکردنێکی لەو شێوەیەی پێ زیاد بکرایە بێگومان لە رووی ئەکادیمیەوە کارەکە قورس و گرانتر ئەبوو. هەروەك لەسەر بەرگ و ناوەوەی کتێبەکە ئاماژەی پێکراوە بەرێزان سەید عەلیساڵحی، محەمەد رەئوف مورادی، مەریوان هەڵەبجەیی و ئەمان جەلیلیان ئەرکی وەرگێڕانی ئەم بوخچە هەمەرەنگ و فرە بۆن و جۆراو جۆرەیان لە ئەستۆ گرتووە. دیسان ئەوەی کە وا دەکات مرۆڤ پرسیاری لا دروست بێت ئەوەیە کە دیار نییە کام یەك لەم بەرێزانە وەرگێڕی کام یەك لە شیعرەکانن، لەلایەکی دیکەوە دیار نییە کە هەموویان پێکەوە شیعرەکانیان وەرگێڕاوە یان جیاجیا، چونکە لە ئاواز و دارشتنەوە و گەیاندن و تۆکمەیدا جیاوازی لە نێوان شیعرەکاندا ئەبینرێت. ئەگەر ئاماژەیەك بەشێوەی کار و ئەرکی ئەو وەرگێڕانە بکرایە ئیدی بە گشتی بڕیار لەسەر کۆی وەرگێڕانەکەو هەر چوار بەرێزەکە نەئەدرا. هەروەك سەید عەلی ساڵحی خۆی ئاماژەی پێدەکات ئەو کاتەی لە ڤیستڤاڵی گەلاوێژ بووەو لە ئوتێل میر میوان بووە، بۆئەوەی زۆرتر لە شیعرەکان تێبگات و ئاشنای زۆرتری شیعری ژنان بێت ئەڵێت: "بەم شێواز و دیاردەیە نائاشنا نییم و ئەیانناسم و خوێندومنەتەوە، تەنانەت چەندین شەو لە ئوتێل میر تاکو درەنگانی شەو و هەندێکجاریش تاکو بەرەبەیان بە هەزاران دژواری (لە زمانی کوردی تێئەگەم، بەڵام ئاخاوتنی بۆ من دژوارە) لاپەرەی کتێب و گۆڤارەکانم هەڵئەدایەوەو هەوڵم ئەدا لێیان تێبگەم".

پرسیارێکی لۆژیکی دێتە پێشەوە مامۆستایەکی وەکو سەید عەلی ساڵحی کە تێگەیشتن لە کوردی و قسەکردن بە کوردی بۆی دژوار بێت چۆن توانیویەتی بەشداری لە پرۆسەی وەرگێڕانی شیعرەکاندا بکات، یان ئەرك و رۆڵی لەم کارە دڵسۆزانەیەدا چی بووە. چونکە تاکو ئێستا مامۆستا سەید عەلی ساڵحی بەرهەم و نوسینی دیکەی لە کوردییەوە وەرنەگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی و تاکو ئەو شوێنەی ئاگادارم و پرسیارم کردووە نوسینی بە کوردی نییە. بێگومان لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە لە کار و ماندو بوون و گەورەیی و داهێنانەکانی مامۆستا سەید عەلی ساڵحی کەمبکەمەوە، بەڵکو ئەو پرسیارە لە سەر رۆڵی کاری وەرگێڕانە. بێگومان بەشداری کەسێکی دیاری وەك سەید عەلی ساڵحی لەو پرۆسەیەدا

نیـــشانەی دڵـــسۆزی و خەمخۆرییـــەتی بـــۆ ناساندنی شیعری کوردی بە کۆمەڵگایەکی نا کوردی و هەر بەشداری بوونەکەی شانازییە بۆ رۆشنبیری کوردی. لەلایەکی دیکەوە دیار نییە بەرێزان مەریوان هەڵەبجەیی و ئەمان جەلیلیان شـــیعریان وەرگێـــڕاوە یـــان تـــەنها کتێـــب و کاسێتیان بۆ پەیدا کردوون و یان کاتیبول وەگێربوون و ئەوە بۆ خوێنەر روون نییە لە چیدا هاوکار بوون و کە وەکو هاوکار ناویان هـــاتووە. هەرچـــەند ئـــەم بابەتـــە باســـی زۆر هەڵدەگرێت و وردەکاری زۆرتری ئەوێت، بەلآم ئەو چەند ئاماژە کورتە بۆ ئەم نوسینە بە بەس دەزانم.

بە گشتی وەرگێڕانەکان زمانێکی فارسیی باشیان هەیە و توانراوە کۆمەڵە شیعرێکی جوان بە خوێنەرو رۆشنبیریی فارس بناسرێت و خوێندنەوەیان بە فارسی چێژ بە خوێنەر دەدات. لە روویەکی ترەوە هەوڵ و ماندوویەتی زۆر بـــۆ ئـــەوە دراوە کـــە لـــە داڕشـــتنەوەی شیعرەکاندا مەغزا و ناوەرۆکێکی دەوڵەمەند پێشکەشی جیهانی شیعر بکرێت. بەلآم کاتێك شیعرەکان بە کوردیەکەی بەراورد ئەکرێت لاوازییـــەکان خۆیـــان دەرئەخـــەن و بـــۆ ئـــەو مەبەستەش چەند نمونەیەکتان بە فارسی و کوردی بۆ دەخەمە ڕوو.

شیعر
شیعر گمەی ئەوینێکی سپی و،
باڵی پەپولەی وشەیە و
چاوی باران.
شیعر تۆوی ئەستێرەیە و
لە دەشتی ساماڵدا ئەڕوێ
شیعر پەنجەی منداڵانە و
لە دۆزەخی کوردستان و ڕواندادا
چی لە دەست دێ؟!

ئەم کۆپلە شیعرە لە شیعرستانی ژمارە یەك، لاپەڕەی (118)دا بەو شێوەیە هاتووە و ئەمەی خوارەوەش فارسییەکەیەتی:

شعر:
اوای کبوتر است به وقت عشق
شعر
بال پروانه است به وقت باران
شعر
غبار ستاره است
که بردشت هاو دامنەها می بارد
و شعر
سرانگشتان کودکان است
دردوزخ کردستان و
در گورهای بی نشان رواندا.
* * * * * *

لە کوردیەکەیدا باسی عەشقێکی سپی ئەکرێت نەك وەك ئەوەی کە لە فارسییەکەدا کراوە بە کاتی عەشق. لە کوردیەکەیدا شیعر وەك باڵی پەپولەی وشە و چاوی بارانە، بەلآم لە فارسیەکەیدا کراوە بە باڵی پەپولە بە کاتی باران. ئیدی باڵی پەپولەی وشە و چاوی باران کراوە بە باڵی پەپولە بە کاتی باران. لە کوردیەکەیدا ئەڵێ شیعر تۆوی ئەستێرەیە لە دەشتی ساماڵدا ئەڕوێ، لە فارسیەکەیدا کراوە بە غوباری ئەستێرە کە بەسەر دەشت و

داوێنەکانـــدا ئـــەبارێ. ئـــەوەش بـــۆ خـــۆی شـــوبهاندنەکانی تـــۆوی ئەســـتێرە و دەشـــتی سـامالٚ و ڕوانـدن گـۆڕانێکی دیکـەیان بەسـەردا هـاتووە. من نـالٚێم نـەیانتوانیوە وەریبگێڕن یـان بەســـەریاندا تێپـــەڕیوە، بـــەلاٚم گـــۆڕانێکی زۆر دوورو شوبهاندنێکی جیاوازیان بۆ داتاشیوە کە دیـــار نییـــە ئـــەوەش چـــەند ڕێپێـــدراوە!. لـــە کوردیەکەیدا ئەلٚێ شیعر پەنجەی منداڵانـە و لـە دۆزەخـی کوردسـتان و ڕوانـدادا چـی لـە دەسـت دێ؟!. لـــە فارســـیەکەیدا ئـــەلٚێ شـــیعر ســـەری پەنجـەی منداڵانـە، لـە دۆزەخـی کوردسـتان و گـــۆڕە بـــێ ناونیـــشانەکانی ڕوانـــدادا. لـــە فارسییەکەیدا ئاماژە بەوە نەکراوە لە دۆزەخـی کوردسـتان و ڕوانـدادا شـیعر ناتوانێـت شـتێکی ئەوتۆ بکات و لە هەمان کاتدا شوبهاندنەکانیش گۆڕاون و وەك خۆیان نەماون!!

لـە دوابەشـی کتێبـەدا (بـۆ ننامـە) کـراوە بـە فارسی و بەپێی پێڕستەکە (27) بیست و حەوت ناونیـشان بـۆ قەسـیدەی بۆننامـە دانـراوە، واتـە کـراوە بـە (19) شـیعر، لـە پێرسـتەکەدا (27) ناونیشان بۆ بۆننامە نوسراوە بەلاٚم لە ڕاستیدا لـــە نـــاوەوەی کتێبەکـــەدا وەکـــو (19) شـــیعر هـــاتووە. خوێنـــەرانی کـــورد بۆننامـــە بـــە قەسیدەیەکی درێژ و بە یەك شیعری ئەزانن نـەك (19) شیعر و دیوانێك کە پڕ بێت لە ناونیشانی جۆراو جۆر. دیـار نییـە لـە چ ڕوانگەیەکـەوە بـۆ قەسیدەیەك (19) ناونیشان تاشراوە. جگـە لـەو گۆڕانکارییـــە کورتکردنـــەوەو پەڕانـــدن لـــە شـــیعرەکاندا دەبینرێـــت و بـــۆ ئـــەوەش نمونەیـــەکتان بـــۆ دەخەمـــە ڕوو. بۆننامـــە بەمشێوەیە دەستپێدەکات:

(با) بەشەلەشەل هەلٚئەکات!
لەم قوتبەوە با ئەگەڕێتەوە دواوە..
ئەگاتەوە یەکەم کۆلاٚنی زوبانم
لەبەر دەرگایەکی نزمی چلەکاندا.. دا ئەنەوێ
بۆنی منداڵییم ئەکات و گولٚە خەونم هەلٚئەمژێ
بۆنی منداڵییم.. چۆن بۆنی کارژۆلەیەك، پەلکە گیایەك
چۆن بۆنی دەنگە چوالەیەك
هەر زوو تێکەلٚ بە بۆنی گریانی دایکم و بۆنی لاواندنەوەی تەڕ و
بۆنی گلٚ گەچی ژوورێکی کەسیرە بوو.
بۆنی شەو بۆنی ترسێکی زستانە بوو
*******

ئـەم بەشـــە لـــە فارســـییەکەیدا بـــەم شـــێوە هاتووە.

باد
مردد می وزد
گاه رو به قفا
من رود به نخستین کوچه کلمات ام می رسد
دمی به درگاه درنگ می کند
خم می شود
کودکی مرا می بوید
در خواب های معطر من رخنه می کند..
بوی کودکی
بوی خواب
بوی گیاه و
دانه بادام بن.
چه زود می امیزد، درمی امیزد
امیزه گریەها و لالایی مادرم
امیزه عطر نمناك خانه و

بوی شب
بوی ترسی زمستانه و زمهریر،
*******

لـه فارسـیەکەدا شەلەشـەل کـراوە بـە دوو دڵی و باس لەوە ئەکات کە هەندێکجار با بەرەو رووی هاوڕێکـان هەڵئـەکات، کـە لـە کوردیەکـەدا شـــتی وا نییـــە، هـــەروەها ئامـــاژە بـــە قوتـب و گەڕانـەوە بـۆ دواوە و دەرگـای نزمـی چلەکان ناکرێت.

لـە کوردیەکەیـدا بـۆنی منـداڵی و کارژۆڵـە و پەلکـە گیـا و دەنکـە چـوالەیەك هـاتووە. لـە فارسییەکەیدا بۆنی منداڵی، خەو، گیا و دەنکە چواله هاتووە، بەلاًم بۆنی کارژۆڵـەی تێدا نییـەو خـــەویش زیادەیـــە. لـــە فارســـیەکەیدا شـوبهاندنەکانی بـۆنی گـڵ گەچـی ژورێکـی کەسـیرە ون بـووە. لـە سـێبەری بێـستانێکی (مەڵکەنـدی)دا بـووە بـە لـەژێر سـێبەری زیارتگەیەکی مەڵکەندیدا.

هەروەها: بۆنی رەزو بۆنی دایکم..
بۆنی چیا و بۆنی باوکم..
هەموو شەوێ رەزی چاوڕەش

حیکایـەتی هێـشوویەکی هـەڵوەریوی بـۆ ئەکردم تا دوایی..

لـە فارسـییەکەیدا بـۆنی رەز بـووە بـە بـۆنی گـوڵی رۆز و هێـشووی هـەڵوەریو بـووە بـە هێشووی درەوکراو.

ئەمانە چەند نمونەیەکن کە بە بەراورد لەگەڵ دەقـە کوردییەکەیـدا چـەند مانـا و شـوبهاندن و وێناکردن بەبێ سەر و شوێنکراوی ئەبینرێت. تەنانـەت ئەگـەر لـە نـاواخنی فارسـییەکەدا ئـەو مانا و شوبهاندن و وێناکردنانـە بـە شێوەیەکی دیکە بنوسرانایە ئەوە لەو کاتەدا مرۆۆ دەیگوت داڕشتنەوەو تێهەڵکێشانێکی تایبەتی بۆ کراوە، بەلاًم بەداخەوە ئەوەش نابینرێت. هەرچەند ئەم کتێبـە دراوە بـە مـن خوێندنـەوەی بـۆ بکـەم و دەبێت لە حاڵەتی ئاسایدا کار لەسەر ناساندن و لایەنـە جوانـەکان و داهێنـانی نـوێ لەسـەر وەرگێڕانـی شـیعری کـوردی بـۆ سـەر زمـانی فارسی بخەمە ڕوو، بەلاًم لەو بڕوایەدام ئاماژە کـردن بـەو خاڵانـە ئەرکێکـە لـە بـواری ئـەدەب و رۆشـنبیری و شـیعردا، چـونکە بێدەنگی و چاو نوقانـــدن لـــەو خاڵانـــە دەچـــێتە خانـــەی خۆگێلکردن و لەو حاڵەتەدا تەنها ماندووبوونی قەڵـەم و رەشـکردنەوەی کاغـەز بـە ئـەنجام گەیـەنراوە. ئەگـەر خوێنـەری فارسـی کـوردی نـەزانێت و ئـەو شـیعرانە بـەراورد نـەکات بـەو کوردییەکـەی، ئـەوە بێگومـان چـێژێکی زۆریـان لێوەردەگرێـت و شـتی تازەشـی تێدایـە بۆیـان، چـونکە ئـەم کـارە مانـدووبوونێکی زۆری پێوە دیارە.

وەرگێڕانـی شـیعر لـە کـارە دژوارەکـانی مەیدانی وەرگێڕانە و رووبەروو بوونـەوە لەگـەڵ ئـەو دژواریانـەدا ئـازایی و نەترسـیی دەوێـت. خودی ئەو ئازایی و نەترسییە کارێکی جوان و بوێرانەیە، بەلاًم نابێت لە ئەنجامدا شیعر یان هەر دەقێکی تر ببێتە قوربانی.

## خوێندنەوەیەکی دیکەی زمانی شێرکۆ و دیدارێك لە دەربەندی پە پولەدا

بیست و پێنج سالْ پێش ئێستا. هەر لەم شەقامە ئاشنایانەدا پیاسەمان ئەکرد. بۆ یەکەمجار ناوی شێرکۆ بێکەسم لەو بیست. بیست و پێنج سالْ پێش ئێستا لەگەلْ (بەرۆژ ئاکرەیی) شاعیر و چیرۆکنوسی کورد، هەر وەك ئەوەی بلێیت لە یەك چاوتروکاندا پەنجەرەیەك کرایەوەو داخرایەوە، چارەکە سەدەیەك تێپەری!

کاتێك بە رۆژ ئێرانی بەجێهێشت بە هاوکاریی (ناسر سینا) درێژەم بە گەشت لە نێو مەیدانی شیعری کوردستانی عێراقدا دا. کاتێکیش ناسر ئێرانی بەجێهێشت تەنها نەکەوتم و تاکو ئەمرۆ بە هاوکاریی حەمە رەوف موورادی و مەریوان هەڵەبجەیی (وەرگێر) پەیوەندی خۆم لەگەلْ (شیعر و ئەدەب)ی کوردا پاراستووە.

نزیك دوو دەییە پێش ئێستا شیعری کوردستانی عیراقم بە کۆمەلْگای رۆشنبیری ولاتەکەم ناساند. ئەمرۆ ئەو دەلاقە روو لە هەتاوە روناکی و کلْپەیەکی گەورەتری لە خۆ گرتووە و کەم کەس هەیە کە لە بواری رۆشنبیریدا بێت و نەزانێت کوردستانی عیراق چ خواوەند گەلێکی بە توانای لە رێبازی وشەدا هەیە.

سەرەتا لەم رێگایەدا ئەنجامی هەولْەکانم لە چاپەمەنییە ئەدەبییەکاندا رەنگیدایەوە و شێرکۆ بێکەسم ناسی و پاشان، لەتیف هەلْمەت، عەبدوللا پەشێو، رەفیق سابیر و ئەمرۆ فەرهاد پیربالْ و چەند شاعیرێکی بەرچاوی ئەو ولاتە نائاشنایە کە وەك، دلاوەر قەرەداغی، جەمال غەمبار، هیوا قادر، فەرهاد شاکەلی، ئازاد سوبحی، رێبوار سیوەیلی، کەژالْ ئەحمەد، چنور نامیق، کەریم دەشتی، دلْشاد عەبدوللا، چنار نامیق حەسەن، عەبدولا تاهیر بەرزنجی، کەژالْ ئیبراهیم خدر، بەختیار عەلی، هاشم سیراج، کۆسار کەمال پیرۆت، محەمەد عومەر عوسمان، نەزەند بەگی خانی، مەهاباد قەرەداغی، چۆمان هەردی، دانا سەعید سۆفی، قوباد جەلی زادە، ئەحمەدی مەلا، شیرین . ك، رۆژ هەلْەبجەیی...

بۆ قەلْەم بەدەستانی کورد، بۆ گەلی کورد و کولتور و ئەدەبیاتە درەوشاوەکەیان رێزێکی زۆرم هەیە. هەر ئەو رێز و خۆشەویستییە بووە هۆی هاورێیەتی من و شێرکۆ. یەکەم دیدارمان کە نزیکەی 10 سالْ پێش ئێستا بوو باسمان لەو سرودانە کرد کە لەگەلْ بلوێردا ئەوترێن، باسی حەز، گرفت، ئامانج و شتە هاوبەشەکانمان کرد و تاکو ئەمرۆ بە بروایەکی پاك و روناکەوە خەریکی کارکردنم لەسەر شیعری ئەو هەرێمە پر لە ئاواز و مۆسیقایەم. نەك گومان، بەلْکو لەو بروایەدام کە ئیدی کاتی ئەوە هاتووە تاکو زنجیرە دەفتەری شاعیرە گەورەکانی کوردستانی ئازاد لە ئێراندا بۆ فارس زمانەکان چاپ بکەین بۆ ئەمەش هەلْبەتە یەکەم شێرکۆیە!.

شێرکۆ بێکەس 1940 لە سلێمانی هاتۆتە دنیا. لە هەشت سالْیدا باوکی (واتە فایەق بێکەس) کۆچی دوایی کردووە. رەنج و ئازار

دەســت پێــدەکات. لــە ســیانزە ســاڵیدا لــە دایـك و خوشـکەکانی دوور دەکەوێتـەوە، ئیـدی کــار و نــان و وشــە و شــیعر...! لــە حەڤــدە ساڵیدا یەکـەم کتێبـە شـیعری خـۆی بـە نـاوی تریفەی هەڵبەست چاپ دەکات. لە تەمەنی 47 ســاڵیدا و بــە هــۆی زوڵــم و زۆری حکومــەتی بەغـداد، نیـشتمانەکەی بەجێهێـشت و لـە سـوید نیــشتەجێ بــوو. بــۆ ســاڵێکی دواتــر خــەڵاتی جیهــانی "تۆخولــسکی" لــەژێر ناونیــشانی "شـاعیرێك لـە مـەنفا، شـاعیرێکی ئـازادیخواز" پێشکەش کرا.

شــێرکۆ بێکــەس لــە لایــەن کۆمیتــەی مــاف مرۆڤــی ئیتالیـا نیـشانی "هـاوڵاتی فـەخریی فلــــۆرانس"[2]ی پێبەخــــشراوە. پــــاش بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی لە کوردستانی عیراق ســاڵی 1991 ئەگەڕێتــەوە بــۆ نیـشتمان و بــە وەزیری رۆشنبیری کوردستان هەڵدەبـژێردرێت. لـە دوایـین دیـدارم لەگـەڵ شـێرکۆدا پێـی گـوتم: لەبەرئـەوە دەسـتم لـە وەزارەت کێـشایەوە تـاکو نارەزایەتیەك بێت بە دژی پێکدادانی چەکداری نێــوان گروپــەکان و پێــشگرتن لــە کوشــتاری هاوڕەگــــەزەکانم...!) ئــــەو رۆژە دانیــــشت چـەند باسـێکی درێـژمان کـرد، لـە چارەنووسـی عەبـدولاَ ئۆجەلانـەوە تـاکو ئـازادیی ئەندێـشە و دەربڕین و شیعر..

شــێرکۆ بێکــەس وتــی: هــەوڵ ئــەدەم لــە کوردستاندا دوو رەوت و پرۆسە پەرە پێبدەم و رێکییان بخەم یەکەم: رێکخراوێك بۆ بەرگری لە مــاف ژنــانی کــورد و ئاشــناکردنیان بــە مافــە مرۆیـــــــی و کۆمەلاّیەتیـــــــەکانیان، دووەم بەگەڕخــــستن و گەشــــەپێدانی پیــــشەسازی سـینەما و دروسـتکردنی فـیلم لـە سـلێمانی و هەموو کوردستاندا.

شـێرکۆ بێکـەس ئێـستا سـەرۆکی یـەکێك لـە چــالاکترین دەزگاکــانی چــاپی پەخــشی لــە ئەسـتۆدایە کـە نـاوی سـەردەمە. شـیعرەکانی شێرکۆ تاکو ئەمڕۆ وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی فارسـی، ئـەڵمانی، تورکـی، عـەرەبی، ئینگلیـزی، فەرەنــسی، ســویدی، ئەرمــەنی و ئیتالیــایی و چاپکراون. چەندین دیوانە شیعری جۆراوجۆری ئــەم شــاعیرە گەورەیــە چــاپکراون و قەســیدە شـیعری دەربەنـدی پەپولـەی ئـەم شـاعیرە وەك شاکارەکەی دەناسرێت.

شـێرکۆ بێکـەس بـە یـەکێك لـە گێـڕەرەوە بـە تواناکـانی ژیـان و چارەنوسـی مـرۆڤ، جیهـان و سروشــت و پەیوەنــدی زاڵ بەســەر بوونــدا ئەژمێردرێت. شێرکۆ دەربڕی چیرۆکە (شیعری) بـێ هاوتایـە کـە لـە نـاخ و رووی نـاوەوەی هـەر ئاشـکراو روونێکـی نـا ئاشـکرا گێڕانەوەیـەکی نـوێ و خـەونێکی سەرسـوڕهێنەر ئەدۆزێتـەوە. شـیعرەکانی شـایەدی ئـەوەن کـە ئـەم شـاعیرە داد‌پــــەروەر و ئــــازادیخوازە لــــە توانایدایــــە لـە هـەر شـتێك، رووداوێـك دیاردەیـەك، وشـە و بــۆن و رەنــگ و ئاوازێــك.. بــە هەســت و ئامــــادەبوون بــــە زمــــانێکی سەرســــوڕهێنەر بگــات. ئــەو داهێنــەرێکی تــرە کــە بێگومــان ئــەتوانم نــاوی لــە پــاڵ نــازم حیکمــەت، پــابیلونرۆدا، یــانیس ریتــسوس، مــەحمود دەروێش و ئەحمەد شاملوو دابنێم.

بــەڵێ لەســــەر لــــە نــــوێ خوێندنــــەوەی شـیعرەکانی شـێرکۆ دا بـە پاراسـتنی تـەواوی مانا و مەبەستی سەرەکیی شاعیر (نەك شێوەی

بـێ جوڵـەی دەق) قەڵەمەکـەم لـە زنجـیری نـەکاو شـەرت و مـەرجی خـەم رزگـار کـرد و تـاکو ئـەو رادەیـەی کـە تەنانـەت هەنـدێك لـە ناونیـشانی شـــیعرەکان بـــە مەبەســـتی ئێرەیـــی کـــردن و خۆمانـەترکردنی هەست و وشیاری گێڕانـەوە – گۆڕیـــوە. هەڵبـــەت گومـــان لـــەوەدا نییـــە کـــە ناونیـشانی تـازەی شـیعرەکان هـەر لـە نـاخی هـەمان شیعرەوە لـەدایکبووە. هـەر ئـەوە بوو کـە ڕەنگ و دواکەوتنی لەوە زیاتر و قبـوڵ نـەکردنی کەوتنـە ژێـر کاریگـەری وەرگێڕانـی ئاسـایی و بـاوم لـە ڕوحـی ئـەم خلیـسکان و خولانەوەیـەی زمـان پـاك کـردەوە. هـەر ئـەوەی کـە بـەپێی ئەزموونی خۆم لەم کانیە ئاشنایە گوێم پڕ کرد کـە وەك ئەوەیـە دڵـۆپ دڵـۆپ لـە دەرونـی خۆمدایـەو بەمشێوەیە ئەگـەین بە مانـای فوارەو تاڤگە و هەڵقوڵانی کانیاو.

**ئەدەبی نامە**

# دڵدارە هەرە ئازیزەکەم

## نامەی نێوان ئانتوان چیخۆف و ئۆڵگاکنیپەر

**لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد**




**چیخۆف**

**21ی ئاب**

**سڤاستوبول**

**هاوسەرە دڵگیر و هەرە ئازیزەکەم، تازە لە خەو هەستاوم و کەمێك قاوەم خواردۆتەوەو بە نیگەرانیەوە گوێم لە دەنگی با گرتووە (...) دەچم بۆ "یاڵتا" و لەوێ چاوەڕوانی نامەتم، خەم مەخۆ دلۆڤانەکەم، نائومێد مەبە، تووڕە مەبە، شادبەو پێبکەنە کە جوانت لێ دێت. زۆرم خۆش دەوێیت و هەروایش دەبم (...)**

**ئانتونی مێردت.**

* * * *

**کنیپەر**

**21ی ئاب - لوزڤایا**

**لە "لۆزڤایا"وە نامەت بۆ دەنووسم ئازیزم، سەفەرەکە باش بەڕێوە دەچێت و من گەلێك**

خەمگینم، هەوا سارد و باراناویە (...) تۆ چۆنیت؟ سەفەرەکەی تۆ چۆنە؟ هەموو شتێکم بۆ بنووسە، دوێنێ لەو چرکەساتەوە کە شەمەندەفەرەکە بەڕێ کەوت بە دەگمەن لە شوێنەکەی خۆم جوولاّم. بەردەوام لە یادی تۆدام بە خەیاڵ لەگەڵتا لە وێزگەوە تا ئوتێل ڕۆیشتم.

ماچێکی گەورە، تەندروست بیت، خەمبار مەبە و لە هەموویش چاکتر ئەوەیە کە بنووسیت.

"ئۆ"کەت.

****

**کنیپەر**

**21ی ئاب**

**فارکۆف**

ئانتونی ئازیز و چکۆڵەم، پیاوە زێڕینەکەم، ڕەنگە ئێستا لە ڕستۆرانێکدا نان بخۆیت، دەتوانم وێنای دەم و چاوت بکەم کە چەند لە من نزیکە و هەست بە چاوە جوان و میهرەبانەکانت بکەم، دوێنێ لە پشت پەنجەرەوە وەستام، گریام و گریام، دەزانم حەز بەم کارە ناکەیت، لەبەر تریفەی مانگەشەودا تەماشای دەرەوەم کرد، شەقامە باریك و زیوینەکان هێند ختوورەیان دەدایتێ کە پێم خۆشبوو لە باتی ئەو واگۆنە نەفرەتیە بچمە دەرێ و پیاسەیەك لە هەوای ئازاددا بکەم. کە لەگەڵ سروشتدا ڕووبەڕوو دەبم هەستەکانم زیاتر واقیعی دەبن، زیاتر لێیان تێدەگەم. دەزانم دیسانەوە کەوتوومەتەوە فەلسەفاندنە ئەڵمانیەکەم، سەرکۆنەم دەکەیت! کە هێور بوومەوە بیرم لە خۆشەویستیەکەمان کردەوە.وام وێناکرد کە زستان لە "یاڵتا" بەسەردەبەین. چەند ڕێگایەکم دۆزیەوە کە کاتی خۆمیان پێ بەسەر بەرم. ڕەنگە بۆ ساتێکی تر بشێت، تۆ دەڵێی چی؟ باشە وا چاکە لە ئێستاوە بەرنامەی بۆ دانەنێین. ئەم زستانە دەردەکەوێت کە لە ئایندەدا چی ڕوودەدات.

ئەو ژنەی تر کە لە واگۆنەکەدایە گەلێك دەوڵەمەندە. دیارە خاوەن زەوی و موڵکدارە، بەلاّم نازانم لە چ میللەتێکە. مێردەکەی وەك خانەدان دەپەیڤێت. ژنێکی زۆر نائاساییە و زۆر کەم قسە دەکات. بۆ هاوسەفەریی بەخششێکی گەورەیە. ئێستا ئاوو هەوا گەرمتر و ڕووناکترە.

دوێ شەو باش نووستم، ڕۆژنامەیەکم کڕی کە تا ئێستا دەیخوێنمەوە. بیرکردنەوە لە مۆسکۆ نیگەرانم دەکات، هێشتا نازانم کارەکان چۆن ڕاپەڕێنم و تۆ چۆن ببینم ئازیزم. بەلاّم کاتێك کە بیر لە بێدەنگی و ئەو چاڵە پڕ لە خەمە دەکەمەوە کە لە بوونی تۆدا هەیە دڵم دەداتە ئێش. (...).

خۆشم دەوێت ئازیزم، لە شانشینە بچووکەکەی باخچەکەدا دابنیشەو بیرم بکە. پیاسە بە ناو باخچەکەدا بکە و گیاکانت بلاوێنە. ئەگەر بای نیە لە باڵکۆنەکەدا دابنیشە و هەوا هەڵمژە (...)

خەریکە دەگەینە فارکۆف.

ماچت دەکەم، ماچت دەکەم، خۆشم دەوێیت بنووسە، سلاّو بۆ "ماشا" و دایکت.

ئۆڵگاکەت

****

کنیپەر
22ی ئاب
نزیکی مۆسکۆ

دوای نیو سەعات دەگەینە مۆسکۆ، باران ناباریێت بەلاّم هەوا تەڕ و تازەیە. زۆر چاك نووستم، وام بە بیردا دێت کە ماڵەوەمان بێن بە پیرمەوە. زۆر دەمێکە ئازاری بێنامەیت دەچێژم ئازیزم، ئەمشەویش نامەت بۆ دەنووسمەوە.

ماچت دەکەم، تەندروست بیت

ئۆلگاکەت

ئۆلگا بە هۆی شووکردنیەوە بە چیخۆف ناچار بوو لە مۆسکۆ بە دوای خانوودا بگەڕێت.

****

کنیپەر
22ی ئاب
مۆسکۆ 1.30 بەیانی

خۆشەویستترین ئازیزم، من لە مۆسکۆم، سەرەگێژەمە، شەو خێرا لە نیوەی نزیك دەبێتەوەو من هێشتا نەچوومەتە ناو جێگاوە. هێشتا لە شەکەتی سەفەرەکەدا دەلەرزم و هەست دەکەم خەریکە گلێنەم لە کاسەی چاوم بێتە دەرێ، هەموو رۆژەکە، تەواویی دوایی نیوەڕۆ و هەموو کاتم باسی تۆم کردوەو وەلاّمی ئەو پرسیارانەم داوەتەوە کە پەیوەندیان بە تۆوە هەیە. گشت رووداوەکە، لەو کاتەوە کە لە شەمەندەفەری مۆسکۆوە کارتم بۆ ناردیت تا ئێستا بۆت دەنووسم.

کەس بۆ بینینم نەهات و من کەمێك بێتاقەت بووم. بە جانتا بچووکەکەمەوە چوومە ناو تاکسی و پیاسەیەکم بە مۆسکۆدا کرد. هەوا پاکژ و کەمێك سارد بەلاّم زۆر دڵگیر بوو. خۆر لە نێو هەورەکانەوە دەرکەوت (...) لە ماڵەوە بە هەراوزەناوە پێشوازیان لێ کردم (...) دایکم وایزانیبوو بە شەمەندەفەرێکی تر دێم بۆ ئێستگە بۆیە نەهاتبووە پێشوازیم (...) سەعات 12 خۆم شت. جلم لەبەرکردوو چوم بۆ شانۆ. بە شێوەیەکی هێندە ترسناك ماندوو بووم کە نەتوانی بیری لێ بکەیتەوە. پرۆڤە نەبوو، دوو سێ کەسم بینی و پاشان "نمیرۆڤیچ"م بینی کە بێگومان هەموو شتێکی لێ پرسیم (...) دەیویست بزانێت لەبارەی شانۆوە دەمەوێت چی بکەم. ئایا لێی بێتاقەت بووم؟ هەموو دەخوازن تۆ زستان لێرە بەسەربەریت (...) دوای نانی نیوەڕۆ من و دایکم چووین بۆ ئاپارتمانە تازەکە، لە کۆلاّنێکی بەرانبەر بە شانۆکەدایە، ژووری زۆر و بنمیچەکانیشی بەرزبوون، لە ڕاستیا بنمیچی دووژوور لە چوار ژووریان، ژووری پێنجەم تاریك بوو، ئەوەیان بۆ پێش خزمەت. بەلاّم شتێکی زۆر سەیر، ئاودەستی نەبوو! ئەمە یەکەم خەوشی ئەوێ بوو، دووەم، ژوورێکیان کە بڕیار بوو "ماشا" سوودی لێ ببینێت، ئەو ژوورەیشیان بچووك و بنمیچەکەی نزم بوو، بۆیە بۆ ئەو ناشێت. بە گشتی ماڵێکی چاك نەبوو، دوایی خانوویەکی گەورەمان دی بە شێوازی ئەوروپایی دروست کرابوو کە بەسەر شەقامی سینریدۆنوفکا بوو، لە ناوەڕاستی حەوشەکە و گڵ کاریەکانیدا چینێکی جوان و رێك و پێك و پێنج ژووریان تیا دروست کردووە، چێشتخانەکەی دڵگیرەو نانخواردن و مەخزەنێك و ژێرزەمینێکیان تیایەو

کرێکەی 850 ڕۆبڵە. ژوورەکان زۆر گەورە نین، بنمیچیان کەمێك نزمە بەڵام ڕەحەتن. ژوورێکی زۆر جوانیشی بۆ "ماشا" تیایە. سبەی بۆ بینینی خاوەن خانووەکە دەچم و من 800 ڕۆبڵی بۆ پێشنیاز دەکەم، ئەگەر نەهاتە خوارەوە هەر قبوولّی دەکەم. ماڵەکە گەرمە و شێی نیە، سێ ساڵە گرێ گرتەی پێشوو بەسێ منداڵەوە تیایدا ژیاوە. نمونەییە ئانتونی ئازیزم، بڕیارە حەوشە گەورەکە قیرتاو بکات. خاوێنە، خاوەن ماڵەکە کەسێکی بەڕێزە، تەلارسازە، ئەگەر ئێمە نەیگرین دایکم دەیەوێت ساڵێکی تر بیگرێت، چونکە زۆر حەزی لێ دەکات و چاوی لەسەرە، هەوای شەقامی "سینریدونوفکا"[1] زۆرباشە، باخی زۆری تیایەو خودی شەقامەکەیش پاکژە. بێگومان بە دڵنیاییەوە ئێمە دەمانەوێت بیگرین. دەیبینیت کە چەندە بێ وێنەو ئارامە(...) چەند پێم خۆشە لات بم و پاڵت پێوە بدەم و گوێم لێت بێت کە پێم دەڵێی دڵدارەکەم، چاوە پڕ لە میهرەبانی و بەسۆزەکانت ببینم. چەندم پێ ناخۆشە کاتێك بیر لەوە دەکەمەوە کە بە تەنیا بەجێماویت (...) "نمیروڤیچ" وتی دەیەوێت لە شانۆیی "قاڵەی کێوی"دا من ڕۆڵی هاوسەر ببینم، چونکە بۆشاییەك هەیە هێشتا ئەوان روونکردنەوەیەکیان نەداوە، منیش تا ئێستا وەڵامم نەداوەتەوە. تۆ دەڵێی چی؟

خۆشەویستەکەت.

تا ئێستا دایکم لەبەرئەوەی بەیانی خواردنێکی وای بۆ دروست نەکردیت کە شایانی زەماوەندەکە بێت لە خۆی ڕەنجاوە! بەڵام دەڵێت هێند لە ڕووگرژی و فەرمانەکانی من ترسابوو ئیدی ئومێدی ئەوەی نەبوو کە ئێمە دوای کڵێسا بگەڕێینەوە ماڵەوە. منیش خۆیشم پێش لە ڕێ و ڕەسمەکە ئاگاداری هیچ نەبووم.

* * * *

**چیخۆف**

**23ی ئاب**

**یاڵتا**

ژنە دەگمەنەکەم، ئازیزترین هاوڕێم، دوێنێ گەڕامەوە بۆ "یاڵتا" "سیڤاستوپۆل" باش بوو، بەیانیەکەی بایەکی توند هەڵیکرد، چاوەڕێی شەپۆلانی دەریا بووم بەڵام دەریا ئارام بوو، دوای نیوەڕۆ هەموو شتێك زۆر چاکبوو. ئێستا لە ماڵەوەم، لە پشت مێزەکەمەوەم و نامە بۆ تۆ دەنووسم، چۆنیت؟ لە مۆسکۆ چیت دەستکەوت؟ بینینی هاوکارەکانت چۆن بوو؟ لەبارەی هەموو ئەم شتانەوە بۆم بنووسە. کچە شکۆمەندەکە، هەمیشە یادت دەکەم.

کورسی ژوورەکەت خەمبار و نوقمی بیرکردنەوەیە، پێم وتوون بیخەنە ژوورەکەی من، ژوورەکەت لە قاتی خوارەوەدا بێدەنگ و هێورە، وێنەی دایکت لەسەر مێزەکەیە (...) ئەمڕۆ جلەکانم پاك نەکردۆتەوە، هەموو شوێنێك بێ تۆیی پێوە دیارە، چەکمەکانیشم پاك نەکردۆتەوە، بەڵام تووڕەمەبە ئەو کارە دەکەم "ماشا" دەیەوێت ئەم کارە بکات و هەموو شتێك پاك و ڕێك و پێك دەبێت.

زۆرم خۆش دەوێیت ئازیزم. سڵاوم بە دایکت، "خاڵە ساشا" "خاڵە کارل" "ڤیشنیڤسکی" "نمیروڤیچ" و ئەوانی تر

بگەیەنە، خوا پشت و پەنات بێت، دووعات بۆ دەکەم، بنووسە، بنووسە، هەموو رۆژێک بنووسە، ئەگینا دارکاریت دەکەم، خۆت دەزانیت من مێردێکی سەرسەخت و توند و تیژم.

ئانەکەت

دوێنێ لە "یالتا" باران باری، هەموو شتەکانی ناو باخەکە تەڕو تازەیە.

* * * * *

کنیپەر

23ی ئاب

مۆسکۆ – 1ی بەیانی

چۆنیت شیرینەکەم؟ چەند خۆشە کە دەتوانم لە کۆتایی رۆژدا دابنیشم و بۆ چرکەساتێک لەگەڵتا بدوێم ئانتۆنی ئازیز، پێش تۆزێک لە چێشتخانەکەدا لەناو تەشتێکدا سەرو لەشم شت و تۆز وخۆڵی شەقامم لە خۆم پاک کردەوە، وا دیسان ماڵەکە هێورەو منیش دووبارە نامەت بۆ دەنووسمەوە، لە ماڵەکەی تۆدا هەموو شتێک ئارامە و گەرمە و بێگومان ئێستا تۆ نووستوویت. چیت هەبوو بیخۆیت؟ (...) رەنگە بەیانی نامەیەکی تۆم پێبگات، هەڵبەت وەک خۆت بڕیارت دابوو لە "سیڤاستیوپۆل"ەوە نامەم بۆ بنووسیت.

ئانتون بۆ لێرە لەگەڵما نیت؟ نەبوونی تۆ بۆ من مایەی سەرسامی و بێ ماناییە. وا چاکترە لەم بارەیەوە هیچ نەڵێم ئەگینا تاهەتا هەتایە بەردەوام دەبم. باسی رۆژی خۆمت بۆ بکەم، پێش گزنگی خۆر لە خەو هەستام و سەعات هەشت لە ناو جێگاوە دەرکەوتم و سەعات 10 رۆشتم خانوەکە ببینم و بڕیار بدەم، داوای 850 رۆبڵ دەکەن بەلام من 800 رۆبڵم پێ وتوون و پێشەکیەکیشم داوە. لەگەڵ خاوەن خانوەکەدا قسە دەکەم بەڵکوو بێتە خوارێ (...)

خاوەن خانوەکەم هەر نەدیوە، لە سەعات یەکەوە ئاپارتمانەکە دەبێت بە هی ئێمە، پاکی دەکەنەوە(...)

لە بیرم چوو دوێنێ بۆت بنووسم کە "نمیروڤیچ" و "سانین" دەربارەی نمایشکردنی "ئیڤانۆڤ" قسە دەکەن. بێگومان تۆ ناڕازی نیت وایە؟ رەنگە بیانەوێت تۆ دەستکاریەکی کەمی بکەیت، بەلام نمایش کردنی چاک دەبێت. بەپێی چیخۆف کارمان ڕوو لە پێش نیە. وەلێ گریمانەی ئەوە هەیە کە نەهێڵن من رۆڵی "سارا" ببینم، من لە داخا دیق دەکەم.

"سانین" لێی پرسیم کە شووکردن چاکە؟ دەستم ناگرێت؟ گەمژە! دەڵێت "دڵم خاڵیە، "هەستم وایە کە دەبێت شووبکەم بەلام نازانم بە کێ"؟ کەمێک ئامۆژگاریم کرد و ئەمڕۆ لە شانۆ کارێکم نیە (...)

واتە تەماشای وێنەکەت دەکەم، شادمانم کە هەر هێڵێکی دەم و چاوتم لەبەرە، ئالکول لە قژت دەدەیت؟ بە "ماشا" بڵێ کەمێک هی تازەت بۆ دروست بکات، ماچێکی مەزن ئازیزترینم بۆم بنووسە و پێم بڵێ چۆنیت؟

ئۆڵگاکەت.

دایکم سلاو لە هەموان دەکات بەتایبەتی لە تۆ.

* * * * *

**کنیپەر**

**24 ئاب**

**مۆسکۆ – تەلگورام**

**خانوەکەم گرتوە، گەرم، هێور، بنووسە.**

* * * * * *

**چیخۆف**

**24 ئاب**

**یاڵتا**

**دڵداری هەرە ئازیزم، دوو کارت و نامەیەکی داخراوی تۆم پێگەیشت. سوپاست دەکەم. تۆ باشیت و میهرەبان و من خۆشم دەوێیت. لە بەیانییەوە سەرم دێشێت. نایەشێت، شەق دەبات، بێجگە لەمە لە بەیانییەوە تا شەو (تەنانەت شەوەکەیش) بەردەوام میوانم هەبوو، ناتوانم کار بکەم (...) ئەگەر بۆم بنووسیت و داوام لێ بکەیت لە سپتەمبەردا دێم بۆ مۆسکۆ. بێ تۆ ژیان بێتامە، من وەك منداڵێك هۆگری تۆ بووم، بەبێ تۆ کەس خۆشی و ئارامیم ناداتێ (...)**

**دەنووسیت "دڵم ئازاری تێ دەگەڕێت کاتێك کە چاڵی قووڵی خەم لە دەروونتا دەبینم" ئەمە چ قسەیەکی بێ مانایە ئازیزم، ئەسڵەن من خەمبار نیم و نەبووم تا ڕادەیەکی زۆر حاڵم باشە، کە تۆ لەگەڵما دەبیت من حاڵم زۆر خۆش دەبێت.**

**بۆم بنووسە لە شانۆ چۆن پێشوازیان لێ کردیت، دەیانەوێت چ شانۆگەریەك نمایش بکەن و چی ڕوودەدات و تۆ هەتا 15ی سپتەمبەر چی دەکەیت. تەمەڵ مەبە، هەموو شتێك بە وردی بنووسە، من هەمیشە بۆ تۆ نامەی درێژ دەنووسم، بەڵام لەبەرئەوەی ورد دەنووسم کەم دێتە بەرچاو.**

**هەوا فێنکە، وەلێ لەوە دەچێت گەرمتر بێت، هەموو شتێك هێور و جوانە، گوڵە باخەکان پشکوتوون، مەبەستم ئەوەیە کە بەڕاستیی لە ناو پەڕی قوودا دەژیم.**

**ژنە نایابەکەم لە ئامێز دەگرم و ماچی دەکەم و داوای لێ دەکەم لەبیرم نەکات و چەند دەتوانێت لە یادیدا بم، کە بێم یەك سەعات بێ وەستان لە ماچ کردنت ناوەستم، پاشان دەچمە حەمام و ئینجا لای سەرتاش و دوایی نانی نیوەڕۆ و پاشان شەوو ئینجا دەنووین، باشە؟ ئازیزم، چ وێنەیەکی سەرسوڕهێنەرت لە ڕۆژنامەدا چاپکرابوو، ئای خودایا! هەردوو گۆنات ماچ دەکەم.**

**ئانتەکەت**

* * * * * *

**کنیپەر**

**24/ئاب**

**مۆسکۆ – 1ی بەیانی**

**(...)خانوەکە لە ئێستاوە تا سەرەتای سپتەمبەر پاك دەبێتەوە. ڕۆشتم خاوەن ماڵەکەم دی. دڵنیای کردم کە ماڵەکە گەرم و هێورەو ئەو لەگەڵ سێ منداڵیدا لەوێدا ژیاوە و ئەگەر "سەرۆکەکەی" داوای چۆڵ کردنی لێنەکردایە لەبەرکار لە حەوشەکەدا زووتر خاڵی دەکرد. ئەم ماڵە بچووکەم زۆر خۆش دەوێت و بێگومانم "ماشا"یش پێی خۆشە، پێی بڵێ چێشتخانەیەکی تیایە،**

ڕوونـــاك و پاكـــژ، چـــواردەورەكەی باخـــەو هەواكەیشی بێوێنەیە.

(...)ئانتونی ئازیز، لەبارەی خۆتەوە زیاتر بنووسە، كێیت؟ چی دەكەیت، هەرە وردەكانم بۆ بنووسە. چۆن دەنوویت، دەخۆیت، لەگەڵ كێدا قسە دەكەیت؟ (...) كۆڵۆنیا لە گەردنت دەدەیت، قژت بە ئالكول ماساژ دەكەیت؟ (...)

تووتكەكەت.

* * * * * *

**چیخۆف**

25 ئاب - یاڵتا

ئەمڕۆ سێ مانگ بەسەر هاوسەریەتیماندا تێ دەپەڕێت. من پیاوێكی بەختەوەر بووم، سوپاسگوزارم شادمانیەكەم، هەزاران جار ماچت دەكەم (...) تۆ لە شەقامی "سپریدۆناڤكا" ئاپارتمانت بە كرێ گرتووە؟ ماڵت بە كرێ گرتووە؟ یانی چی؟

من زۆر ماندووم و تەواوی ڕۆژەكە میوانم هەبوو، دوێنێ سەرم دێشاو ئەمڕۆ چاكم، بەلام هەست بە شەكەتی دەكەم (...)

ئانتۆن

ئێمە كەی یەكدی دەبینین؟

* * * * *

**كنیپەر**

25ئاب

موسكۆ – 1ی بەیانی

ڕۆژباش دڵدارەكەم، ڕۆژباش ئازیزم مێردی شیرینم (...) بە پەرۆشەوە چاوەنواڕی نامەیەكتم، بۆم بنووسە و باسی هەموو شتێكم بۆ بكە، سبەینێ كەمێك "رافیا"[(2)] و دوو قردێلە بۆ چاویلكەكەت دەنێرم (...)

* * * * * *

**كنیپەر**

26 ئاب

مۆسكۆ – 12ی نیوەشەو

(...) ئەمڕۆ مۆبیلەكانم نارد بۆئەوەی ڕوەكانیان بگۆڕن، دەمەوێت لە ماڵێكی نوێدا بە جوانی و تازەیی بریسكەیان بێت، كورسیەكی زۆر چاك كە لە نەنكمەوە بۆمان ماوەتەوە لە سووچێكدا بۆم داناویت، مۆبیلەكانیش هەراون و پیانۆیەكیش دەكڕم، هەموو كارێك دەكەم بۆ ئەوەی تۆ لێرە ئاسوودە بیت، خۆشم دەوێیت، هەموو شتێكت بۆ دەكەم، خواردن و ئاوت دەدەمێ (...)

بەچكە پشیلەیەكیش هەیە "ساڤیتسكایا" پێی داوم، ئەگەر تۆ حەزی لێ نەكەیت دەتوانێت لە چێشتخانەكەدا بۆ خۆی بژی، هەرچەندە جوان و هێور و قەڵەوەو زۆر ڕەفتاری سەگانەی هەیە، دەپڕژمێت و پاشان بە پەنجەی چاوی دەسڕێت، دوو مانگەیە (...)

ئۆڵیا

* * * * *

**چیخۆف**

27ی ئاب

یاڵتا

تووتكەكەم، من باشم، بەلام ناتوانم لە جاران زیاتر كار بكەم، پاییزەو خەڵكی زۆر دێنە لام (...)

جاڵجاڵۆکەیەکی زۆر و گەورە لە ژوورەکەمدایە، خوا دەزانێت لە کوێوە هاتوون؟ زۆر بە خێرایی دێن و دەچن (...)

بە کوورەی ژووری میواندا دەکێشن، بڕیارە ئەمڕۆ قڕم بهەنووم چونکە هێشتا دەڕوتێتەوە.

بڕیارە بۆ کارێك بچم بۆ شار (...) دەبینیت ئازیزم شتە وردەکانت بۆ دەنووسم، تەنیا لەبارەی شتێکەوە بە کورتی دەیڵێم و ئەویش ئەوەیە کە خۆشم دەوێیت و ژیان بێ تۆ بێزراوە، ئەی بەختەوەریم ئەی ئەڵمانیە چکۆڵەکەم، نامەی دوەمت لەوانەی پێشوت کورتتر بوو. دەترسم لەمن سارد بوویبێتەوە و خوو بە بێ منیەوە بگریت. (...)

ئانتۆنەکەت

* * * * *

**کنیپەر**

27ی ئاب

(...)گلەییت لێ کردووم کە تەنانەت نامەیەکم بۆ نەناردوویت؟ من لە "لۆزقایا" فارکۆف، کۆرسك، وێستگەی ڕێی ئاسنی مۆسکۆ، لە هەموو ئەو شوێنانەو لە خۆرنشینی هەمان ڕۆژدا، واتا بیست و دووەم نامەم بۆ ناردوویت، دوای ئەوانیش هەموو ڕۆژێك نامەم بۆ نووسیویت و تەنانەت تاقە ڕۆژێکم لێ نەپەڕاندووە.

بێگومانم کە ئێستا هەموویانت پێ گەیشتوون(...) چی دەخوێنیتەوە؟ ڕۆژەکانت چۆن بەسەردەبەیت؟ زۆر ساکار دەنووسیت، ئەگەر بزانم چی دەخوێنیتەوە ئەوسا تێ دەگەم لە چ حاڵ و هەوایەکدایت، کە لەگەڵ تۆدا نەبم ژیانم تاڵە، ژیان بە چاوەڕوانی، هەر بە چاوەڕوانی تێدەپەڕێنم و لە ئێستادا بێ خانە و لانەم، لە مانگی مەیەوە تا ئێستا ژیانێکی کۆڵەوارم هەبووە، چاوەڕێم بگوێزمەوە خانوویەکی نوێ و جێگایەکی هێدی و ئارامت بۆ بڕەخسێنم، تۆ لە خەونمدا دەبینم، چیرۆکی دڵی من و تۆی "موپاسان"[3] دەخوێنمەوە، شەوێکی "چیخۆف"انمان هەبوو (...)

لە نێوان وێنەکانتا سیانیانم هەڵگرتووە هەموو ڕۆژێك تەماشایان دەکەم. ئانتۆن تۆ بیر لە من دەکەیتەوە؟ لەبیرت نەچوومەتەوە(...) یان لەگەڵ بێ منیدا ڕاهاتوویت.

تووتکەکەت.

*******

**چیخۆف**

28ی ئاب

**یاڵتا**

تووتەڵە ئازیزەکەم، نامەی (24 ئاب) تم تازە پێگەیشت، دوو جار خوێندمەوەو هەزاران جار ماچم کردیت. لەبارەی پلانی ئاپارتمانەکەوە پێم خۆشەو پیشانی "ماشا"ی دەدەم (...) هەموو شتەکانی باشە، بەڵام بۆ ژووری کارکردنی ئانتۆنت لە تەنیشت ژووری نوسینگەی کارەکانەوە داناوە؟ یان حەزت لە لێدانە؟

وەڵامی پرسیارەکانت دەدەمەوە، خەوم زۆر چاکە بەڵام نووستنی تەنیا زۆر ناخۆشە (ئیدی عادەتە!) زۆر دەخۆم و هەموو ڕۆژەکان لەگەڵ میواندا بەسەردەبەم (...) دوێنێ ماساژی سەرم کرد (...)

دەبینیت چ مێردێکم و هەموو ڕۆژێك نامەت بۆ دەنووسم و بەمەیش دەڵێن مێردی تەواو نموونەیی. بێ تۆ هەموو شتێك بێزراوە. پێ دەچێت بە تەواوی بووبێتمە پیاوی ماڵەوەو بێ ژنەکەم ناتوانم بژیم.

ئانتۆنەکەت

********

کنیپەر
28ی ئاب
مۆسکۆ – 12ی شەو

دەبینیت چ ژنێکی باشم ئانتونی ئازیز، هەموو ڕۆژێك نامە بۆ گەورە و سەروەری خۆم دەنووسم. لە خوێندنەوەی نامەکانم بێزار نابیت؟

بەڕاست "ماشا" نووسیویەتی کە حاڵت زۆر باشە و منیش نەمتوانی ئیرەیت پێ نەبەم. تۆ چۆن بەبێ من حاڵت ئەوەندە چاکە؟ بمبوورە کە ئەمەم نووسی. ئێستا وا هەست دەکەم کە بە گەوجە چکۆڵەکە ناودێرم بکەیت (...) هەرگیز لە هەستی خۆم تێناگەم! چاوەڕوانی، ئەمە تاقە شتێکە کە دەتوانم بیڵێم، خولقم بەرەو نامۆیی دەچێت، تەنیا لە زستاندا وام لێ دێت، بەلاَم کە لەگەڵتا دەبم زۆر هەست بە خۆشی و میهرەبانی دەکەم. چەند پەرۆشی بینینتم، کە دەڵێی خۆشم دەوێیت زۆر خۆشحاڵ دەبم..

"ڤیشنیوڤسکی" لە ڕادەبەدەر چاوەڕێی بینینتە، حەز بەوە دەکات قسەت لەگەڵدا بکات، دەتهێنێتە پێکەنین و تۆیش لەبارەی ژیانی خێزانداریتەوە، قسەی بێ مانای بۆ دەگێڕێتەوە، ئەو بڕوای تەواوی بەوەیە کە ئەگەر لێرە سەربەخۆ بژیت زۆر بۆ تۆ باشترە.

بەیانی "نمیرۆڤیچ" نمایشنامەکەی "لە خەوندا" دەخوێنێتەوە، دەڵێن "ستانسلاڤسکی" زۆر بایەخی دەداتێ و تەنانەت نەخشەی پەردەی یەکەمی بۆ ئامادە کردووە. پاشان دەیبینین باش بێت یان خراپ. بەلاَم ئەگەر نمایشنامەکە سەرکەوتوو نەبێت زۆر لەسەر "نمیرۆڤیچ" دەکەوێت (...) چ هەستێکی لا دروست دەبێت؟ تۆ لە بارەی ئەم جۆرە مەسەلانەوە زۆر فەلسەفیانە بیر دەکەیتەوە و هیچ شتێك بە هەند وەرناگریت وانیە؟ "نمیرۆڤیچ" پێی خۆشە بۆتی بخوێنێتەوە یان بۆت بنێرێت، بەلاَم هێشتا نوسخەی تەواوی لا نییە، وەرە، بیخوێنەرەوە و لە بارەیەوە قسەی لەگەڵدا بکە (...).

هەموو ڕۆژێك کەمێك گۆرانی دەڵێم، بۆم بنووسە و بڵێ بیر لە چی دەکەیتەوە، خەون بە چییەوە دەبینیت ئازیزم؟ چ دەخوێنیتەوە؟ گشت نامەکانمت پێ دەگات؟ ژوورەکەت بۆ پاك دەکەنەوە و چاکی دەکەن؟ نووسەرەکەم نابێت لە شوێنێکدا بژی کە ڕێك و پێك نەبێت، بێ تۆیی تاقەت پڕوکێنە ئازیزم، تاقەت پڕوکێنێك کە بڕواپێکردنی ئەستەمە. ماچی گەرم.

ئۆڵگا

*****

کنیپەر
29ی ئاب
مۆسکۆ – 2ی بەیانی

ئانتوانەکەم، *bonjour*! سەعات لە دەوری 2ی بەیانیدایە، هەر ئێستا لە خوێندنەوەی

نمایشنامەکەی "نمیروڤیچ" گەڕاومەتەوەو زۆر ماندووم. پەست و خەمگینم (...)

پێویستە خۆم جارێکی تر نمایشنامەکە بخوێنمەوە، وا دەزانم خەڵکەکە لایان خۆش بو بێت، زۆر چەپڵەیان لێدا (...) بۆ یەکەم جار "ستانسلاڤسکی"م بینی زۆر دڵخۆش بوو، هەواڵی پرسیت و لەباتی تۆ سوپاسی لە من کرد چونکە بیستبووی کە تۆ خۆشحاڵ و رازیت و منی بە زرنگ دانا، وتی قسەکردن لەگەڵ تۆدا بۆ ئەو دژوارە، تۆ زۆرکەم قسە دەکەیت و تەنیا ئەو شەوەی لە "دیگتیانی"[4] لەگەڵتا بووە توانیویەتی خۆمانە قسەت لەگەڵدا بکات "کوستیا"[5] کەمان زور میهرەبان بوو "ڤیشنوڤسکی" تا سەعات 2 لەوێ بوو، بە دەنگی بەرز قسەی دەکرد، بێگومان لەبارەی تۆوە، ئێستا ئیدی وا دەزانرێت کە ئەو ئەندازیاری یەکەمی رێکخستنی هاوسەریی من و تۆ بووە، چونکە ئەو وای رێکخستووە کە من "ماشا"ببینم، کە "ماشا" ئێمەی داوەت کرد و من کە هەرگیز نەدەچووم بۆ هیچ شوێنێك داوەتیەکەم قبووڵ نەکردوو ئەو بوو کە (...)

ئۆڵگاکەت.

* * * *

چیخۆف

30ی ئاب

یاڵتا

دوێنێ شەو تووشی حاڵەتێك بووم هەر لە کۆلێرا دەچوو. ڕشانەوەو شتی تر، حاڵم زۆر خراپ بوو، بۆ، خۆیشم نایزانم، بێجگە لە گۆشت هیچم نەخوارد. نزیك بەرەبەیان خەو بردمیەوە و ئێستا باشم، کەمێك ڕۆن گەرچەکم خوارد و هەست بە بێ هێزی دەکەم (...)

لەبارەی "مارتین"ی پشیلەتەوە نووسیوتە بەلاّم – وای.. من لە پشیلە دەترسم. بەلاّم سەگم خۆش دەوێت (...) وەلێ خەوشی نیە تۆ کە پێت خۆشە بۆت هەیە تەنانەت تیمساحیش رابگریت. تا ئەو شوێنەی پەیوەندی بە منەوە هەبێت تۆ حەزت لە چیە بیکە. ئەگەر پێویست بکات لەگەڵ پشیلەکەدا دەنووم.

* * * * *

کنیپەر

30ی ئاب

مۆسکۆ

نامەکەت بەو پرسیارە کۆتایی پێ هێنابوو کە کەی یەکتری دەبینین، منیش نامەکەم بە هەمان پرسیار دەست پێ دەکەم، ئەمڕۆ زۆر هەست بە ئیرەیی دەکەم، بیری خراپم هەیە بەرانبەر هەموو ئەوانەی نزیکتن، مەیلێکی ناماقووڵم هەیە کە واز لە هەموو شتێك بهێنم و دوورت بخەمەوە بۆ شوێنێك بۆئەوەی بێجگە لە خۆم کەست لەگەڵدا نەبێت، ئایا لەمە تێدەگەیت، ئایا ئەمە کارێکی خراپە لە منەوە ئانتونی؟ زۆرجار تووشی تەقینەوەی وا دێم کە ناتوانم خۆم بگرم. واتا ملکەچی بارودۆخەکە دەبم، هەتا ئێستا سێ مانگ تێپەڕیوە. سوپاست دەکەم، زۆرم پێ خۆشبوو کە لەگەڵ تۆدا بووم ئازیزەکەم مێردە خۆشەویستەکەم (...)

(...)وا چاوەڕوان دەکەم کە "ماشا" میزاجی باش بێت، من لە نێوان تۆ و ئەودا گیرم

خواردووه، گومانم هەیە کە منی وەك ژنی تۆ قبوولّ بێت، دەیەوێت کەلێنێك لە نێوانماندا دروست بکات، من هەست بەوە دەکەم. بەلاّم هەست دەکەم کە نازانم بۆ خەمبار و ناڕەحەتم (...)

هێشتا خانوەکە ئامادەنیە، دایکم لە بیّ سەرەو بەرەیی ماڵەکە بیّ تاقەت بوو. لە 1ی سپتامبەردا هەموو شتێك ڕێك دەخەن، دەست بە گواستنەوە دەکەم لەوانەیە تاقمەکە تا 6ی مانگ ئامادە نەبێت، تۆ دەتوانیت وێنای بکەیت کە چ خانوویەکی خۆشە ئازیزم، تەنیا 10 ڕۆبلّ لەو ئاپارتمانە گرانترە کە بەرانبەر بە شانۆکەیە، هەرچەند ژوورەکانی بچووکن بەلاّم دەبینیت کە چەند دلّگیرن، من لەبارەی هەموو ئەمانەوە بۆم نووسیویت، دەبێت نامەکانم گەیشتبن ئازیزەکەم، پلانەکەیشم ناردووە، بەدلّت نیە؟

ئەمڕۆ شانۆگەریەکەی "نمیروڤیچ"م خوێندەوە (...) زۆر بیّ هەستە، گەلێك دیالۆگی باشی تیایە، پەردەی دووەم و سێیەم زۆر سەرنج ڕاکێشن، پەردەی چوارەم دەگۆڕێن و کەمێك لاوازە، خۆزگا "نمیروڤیچ"ت بدیایە لە چ حالّێکدا بوو، بەلاتەوە سەیر دەبێت ئەگەر ببینیت قسە دەکرێت یان کیّ قسە دەکات. "مایرهۆلد" و "ڕۆکسانۆڤ" دانیشتبوون و هیچ لە ڕوویاندا دەرنەدەکەوت (...) ئەم بەیانیە کەش و هەوا گەرمتر بوو، بەیانیەکەی خۆشبوو، هەتاو گەرم بوو، بۆنی گەلاّی پاییز دەهات، وەرە ئانتۆن با پێکەوە لە شار هەلّبێین، بە ڕۆژی ڕووناك لە شار هەلّبێین، ئای خوا گیان جارێکی دی پێکەوە دەبین!

گوێم لێت دەبێت و دەتبینم و (...) ئاگام لێت دەبێت. ئایا ئەمە بەم زوانە دەبێت؟!!! هەر کە بروسکەم نارد ئاپارتمانەکە ئامادەیە تۆ دێیت، وانیە؟ هەموو شتێك دەکەم بۆ ئەوەی لەوە دلّنیابم کە تۆ ئاسوودەیت و سەرمات نابێت. ئازیزەکەم. جلوبەرگی گەرم لەگەلّ خۆتدا بهێنە (...)

تووتکەکەت.

ئەم نامەیە لە فارسیەکەدا نیە و لە دەقە ئینگلیزیەکەوە کراوەتە کوردی.

* * * * * *

چیخۆف

31ی ئاب

یالّتا

ژنە خۆشەویستەکەم، هەموو ڕۆژێك نامەکانتم پیّ دەگات، پۆستە ئێستا باش کاردەکات (...) کە گواستتەوە بۆ ئاپارتمانە تازەکە من دێم بۆ مۆسکۆ بۆیشم بنووسە. بەهەرحالّ دەبێت لەویّ بم پێش ئەوەی شتێك ڕووبدات، ئەگینا پرۆڤەی "سیّ خوشکەکە"م بۆ بینین بۆ ئامادە ناکەن. دەبێت لە پێش 16ی سپتامبەردا بێم، وانیە؟

ژیان بەبیّ تۆ ناخۆشە. هەر دەلّێی خراومەتە دێرێکەوە، نازانم ئەم زستانەی دێت چۆن دەبێت.

چێشت لێنەرەکە ژەمی باشم بۆ لێدەنێت. لەم چرکەساتەدا هەموو شتێك زۆر باشە، دایکم گەلێك لە چێشت لێنەرەکە ڕازیە، ڕازیەو بێگومان منیش شادمانم. یالّتا ساردە، وێنای دەکەیت؟ منیش ناتوانم بیّ پالّتاو بچمە دەرەوە.

کە دەیشنووم پەنجەرەکان دادەخەم، بە تەنیا دەنووم، وەك ڕەبەنێك یان پیرەمێردێکی کۆنەپەرست.

تۆ گلەیی دەکەیت کە نامەکانم کورتن ئازیزەکەم، من دەست خەتم وردە، لەلایەکی ترەوە بیرۆکەکانم زۆر بەربلاونین، وشەیەك یان دوان ناڵێم کە لە دوایەوە وەستان نەبێت، بەلام من هەموو ڕۆژێك بۆت دەنووسم و هەموو شتێکت پێ دەڵێم، لای من وایە. لێم زویر مەبە خۆشەویستترین و ئازیزترین ژنم (...)

ئانتونەکەت

*ئەم نامەیە نەکراوەتە فارسی و لە دەقە ئینگلیزیەکەوە وەرگێراوە.

*******

**پەراوێزەکان:**

1- *snridonovka*

2- ریشاڵی دار خورماکە دەکرێتە باقەبەند.

3- *Maupasant*

4- *degtyani*

5- هاوڕێکانی "ستانسلاڤسکی" ئەم ناوەیان لێ ناوە، بەلام بەرەو روو پێیان نەوتووە.



# دۆریس لیسینگ

**به بۆنەی وەرگرتنی خەلاَتی نۆبڵی ئەدەب**
**2007**



* دەست لەسووکایەتیی پێکردنی پیاوان هەڵگرن
* قەیرانی کێشەی مرۆڤ لەم سەردەمەدا.
* بەناو تونێلەکەدا
* دۆریس لیسینگ ئافرەتێکی یاخی دیکە پاداشتی نۆبلّ بۆ ئەدەب وەردەگرێت

# دەست لەسووکایەتیی پێکردنی پیاوان هەڵگرن

## سێ گفتوگۆ لەگەڵ- Doris Lessing- دۆریس لیسینگ،
## وەرگری خەڵاتی نۆبڵی 2007

**لە فارسییەوە: محەمەد کەریم**

دۆریس لیسینگ کە رۆژی پێنج شەممە 11ی ئۆکتۆبەر، خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی 2007 ی وەرگرت 22 ی ئۆکتۆبەری 1919 لەدایك و باوکێکی ئینگلیز لەکرماشان لەدایکبووە. باوکی ژمێریارێك بوو کە لەبانکی شاهنشایی ئێران کاری دەکردو لەجەنگی یەکەمی جیهاندا ئیفلیج ببوو، دایکیشی پەرستار بوو. ساڵی 1925 ئەم خێزانە بە خەونی دەوڵەمەندبوونەوە بەرەو باشووری ئەفریقیاو رۆدیسیا (زیمبابۆی ئێستا) کەوتنەڕێ کە لەوکاتەدا کۆڵۆنی ئینگلیز بوو. بەڵام هەر زوو خەونەکەیان بوو بەبڵقی سەرئاو. ساڵی 1949 لیسینگ بەرەو لەندەن کەوتەڕێ و لەوساوە هەتا ئێستا لەم شارە دەژی. ئەم نووسەرە ئینگلیزە گەلێ رۆمان و کۆمەڵە چیرۆك و کۆمەڵە شیعری بڵاوکردۆتەوە. بەڵام بەناوبانگترین کتێبی بریتییە لە (دەفتەرچەی یادەوەرییە ئاڵتوونییەکان) کە وەکو ژنێکی فیمینیست ناوبانگی بۆ پەیدا کرد. ئەوەی لێرەدا دەیخوێنیتەوە بریتییە لە وەرگێڕانی دەقی چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی *ABC* لەگەڵ لیسینگ و هەڵبژاردەیەك لە هەردوو چاوپێکەوتنی *San Francisco Chronicle* و *Salon* لەگەڵ ئەم خانمەدا.

### چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی *ABC* لەگەڵ لیسینگ

**سازدانی جێنیفەر بۆرنێ،**
**24 ی ئۆکتۆبەری 2001:**

*** پێتوایە ئەمرۆ خەڵك بەڕاستی تێدەگەن شەڕ یەعنی چیی؟**

+ نەخێر، تێناگەن، پێموایە نەوەیەکی تازە دروستبووە کە شەڕیان تەنیا لەبەرنامە تەلەفزیۆنییەکان و فیلمە جەنگییەکاندا دیووە. نازانم بۆچی شەڕ هەمیشە هەڵخەڵەتێنەر دێتە بەرچاو، بەڵام هەیە. لەڕاستیدا ئەو نەوەیە نازانن دەربارەی چی قسە دەکەن، ئەمە سیناریۆیەکی زۆر باشە بۆ ئەوەی لایەنگیری حەق بکەین وبیکەین بە دروشم. ئەمە شتێکە ناخی دڵم خاڵی دەکاتەوە. من لەجارێ زیاتر لەکاتی جەنگدا ژیاوم. ئەم فیکرە زۆر بەهێزە، خەڵك کۆنترۆڵ دەکات و بواری بیرکردنەوەیان نادات. ئەو خەڵکە بەروخسارێکی ئاسنینەوە تەنیا دروشمەکان دەڵێنەوەو ئەمەش ترس دەخاتە دڵی منەوە.

*** تۆ دەربارەی توانای (یزم)ەکان زۆر بەکینایەوە نووسیووتە. هەر (یزم)ێ بێت، (کۆمۆنیزم، فیمینیزم، ئایدیالیزمی بێئامانج، جۆرنالیزم و...) پێتوایە (یزم) خۆی لەخۆیدا جێگای گومانە؟**

+ بەڵێ، وایە. پێموایە ئێمە هەمیشە چەند دەستەیەکی جیاواز دروست دەکەین و ئینسانەکان دەخەینە ناو ئەم دەستانەوە. لەکاتێکدا وەك پێویست پەیوەندییان بەو دەستانەوە نییە. بۆ نموونە ئایدیالیزم، هەروەکو دەزانیت هیتلەر ئایدیالیست بوو، سەبارەت بەنەخشەکانی هیتلەر بۆ هەزار ساڵی ئەڵمانیا هیچت بیستووە؟ مۆسۆلۆلینیش بەهەمان شێوە. گومانم نییە کە هاوڕێ ستالینی پیاوچاك و پیریش چەند ساتەوەختێ باوەڕی بەئایدیالیزم هەبووە، هەڵبەتە نەك چەند ساتەوەختێکی زۆر. بێگومان لینینی تاوانباریش! ئایدیالیست بوو.

*** بەڕای تۆ بۆچی ئێمە ئەوەندە ئەمانەمان خۆشدەوێ؟**

+ بەداخەوە دەزانیت ئێمە عاشقی کەسانی دەسەڵاتدارین. عاشقیانین، ئێمە عاشقی ئینسانی بەهێزو بەدەسەڵاتین. یان زۆر کەس عاشقی کەسانێکن کەهێشتا تاقییان نەکردوونەتەوە.

*** نائومێدیت لەکۆمۆنیزم بووبەهۆی ئەوەی بەرامبەر بە هەموو (یزم) و ئایدیۆلۆجیایەك رەشبین بیت؟**

+ بەدڵنیاییەوە بۆتە هۆی ئەوەی رەشبین بم. لەنیوەی دووەمی دەیەی پەنجاکانی سەدەی رابردوودا، کۆمۆنیزم لەبەرچاوی ئێمە وەکو دوو تاوەرەکەی نیویۆرك دەڕوخا، تەماشاکردنی ئەم روخانە و ژیان لەو هەلومەرجەدا مایەی سەرسوڕمان بوو.

*** قێزەونترین کارەکتەر لەکتێبە تازەکەتدا کۆمۆنیستێکە کە ئەگەرچی زۆر کەس بە هاوڕێ بانگی دەکەن بەڵام بەرازێکی راستەقینەیە؟**

+ ژمارەیەکی زۆر لەئینسانەکانی دەوروبەری ئێمە لەو کاتەدا ئاوا بوون.

*** ژمارەیەك یان ژمارەیەکی زۆر زۆر؟**

+ هەڵبەتە ژمارەیەکی زۆر زۆر! من جارێك شوومکردووە بەیەکێ لەم جۆرە ئیسنانانە. کۆمۆنیستەکان لە هەموو جێگایەك مەئموور بوون.

***ئایا ئەوکاتەش هەروا بیرت دەکردەوە یان ئەمڕۆ کە ئاوڕ لە رابردوو دەدەیتەوە بەو ئەنجامە گەیشتوویت؟**

+ بەڵێ، دەمزانی. من دەبوو لەبەرئەوەی جیاوازبووم شەڕم بکردایە. ئەوکاتە ژنان هەموویان هەوڵیان دەدا شوو بەکۆمۆنیستەکان بکەن. بەڵام ئەوەت لەبیر نەچێ ...

***ئێستا قسەکردن لەسەر ئەوەی لەمێشکتدا دەگوزەرێ ئاسنتر بووە یان قورستر؟**

+ ئاسانترە. ئێستا هیچ کەسێ لەبەر دەربڕینی بیروڕاکانت ناتخاتە زیندانەوە یان دەربڕینی بیروڕاکانت لێ قەدەغە ناکات. خۆشبەختانە من لەم وڵاتەدا مسوڵمان نیم، بەڵام مسوڵمانەکان لەبەریتانیا رۆژگارێکی سەخت بەسەر دەبەن.

*** کاتێ بیروبۆچوونت دەربارەی فیمینیزم دەربڕی و قسەت لەسەر کرد، گرۆیایت و هاتوهاوارت کرد... تۆ وەکو دۆریس لیسینگ شەیتان بوویت؟**

+ بەڵێ، دەزانم. بەڵام نیوەی ئەو شتانەی کەسانی تر پێیانوایە من وتوومە لەڕاستیدا نەموتووە. بەڵام خەڵك حەزدەکەن بەشێوەیەکی بێگوناهانە تووڕە بن و من ئەو شانسەم دانێ.

***ئێستا خۆت بڵێ رێك و راست دەتویست چی بڵێیت؟**

+ دەمەویست دەربارەی رۆشنبیریی خۆمان قسە بکەم کەتیایدا پیاوان بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بچووك و نزمن. بەڕاستی من رقم لەم جۆرە بیرکردنەوەیەیە. ئێمە ئێستا رۆشنبیرییەکمان هەیە کە ریکلامی بازرگانی و بەرنامە رادیۆییەکانمان بەشێکە لەو رۆشنبیرییەو تیایدا سووکایەتیی بە پیاوان دەکرێ. من دەڵێم کاتی ئەوە هاتووە کۆتایی بەم سووکایەتییانە بهێنرێت. بەڵام پێموانییە ئەمە شتێك بێ کەبووبێتە هۆی تووڕەیی کەسانی تر.

*** باشە، دەبێت بڵێین ئەمە شتێکە لەئوسترالیا بۆتە بابەتی سەرووتار و بابەتی تری رۆژنامەکان؟**

+ بەڕاست؟

*** بەڵێ. مەسەلەکە ئەوەبوو کە تۆ وتووتە گێل و نەخوێندەوارترین و پیسترین ژن دەتوانێت سووکایەتیی بە باشترین و میهرەبانترین و زیرەکترین پیاو بکات و کەسیش نارەزایی دەرنابڕێت.**

+من رێك وتم کە...

*** ئەوەت وت؟**

+ بەڵێ. رێك وایە. سوورم لەسەر قسەکانم. لەگەنجیدا کچێکی بێچاوو ڕوو بووم. هەمیشە لەگەڵ پیاواندا دەستەویەخە دەبووم و لێم دەپرسین: (بۆچی داکۆکیم لێدەکەن؟ من ژنێکی بچووکی گێل نیم )، ئەوان هەرگیز لەوە حاڵی نەدەبوون من چی دەڵێم. رەفتاری ئەوان بەشێك بوو لە رۆشنبیریی. باشە ئێستاش ژنان هەمان رەفتاریان هەیەو تەنانەت ناشزانن ئەم کردەوەیەیان لێدەوەشێتەوە. من ناتوانم لەوە تێبگەم کە بۆچی ئێمە دەبێ وەکو پیاوی ئەو رۆژگارە خراپ بین (هەندێ لەپیاوان هێشتا بەو شێوەیە رەفتار دەکەن). بەراستی ئەمە مایەی شۆکە. نۆ یان دە ساڵان بووم کە لەقوتابخانە لەلایەن یەکێ لە هاوڕەگەزەکانمەوە رووبەڕووی رەفتارێکی وابوومەوە. لەوانەی مێژوودا، مامۆستاکەمان کەفیمینیست بوو پێی وتین بەدرێژایی مێژوو گەلێ جەنگی جۆراوجۆر قەوماوە، هۆکەشی ئەوەیە کەپیاوان خودی خۆیان توندوتیژیی خوازن. ئێستا دەتوانیت دیمەنەکە بهێنیتە بەرچاوت. کچە بچووکەکانی پۆلەکە بەلووتبەرزییەوە شانازیی بەخۆیانەوە دەکەن تا کوڕەبچووکەکانی پۆلەکە کە هەمیشە لەلایەن ژنانەوە سووکایەتییان پێدەکرێ رەفتارێکی ناشیرینیان لێبوەشێتەوە.

*** بـــەڕای تـــۆ هـــۆی چـــییە کەفیمینیـــستەکان سووکایەتیی بەپیاوان دەکەن؟ بۆچی بێڕەحمانە ڕەفتار لەگەڵ پیاواندا دەکەن؟**

+ باشە ئەمانە ماوەیەکی زۆر سووکایەتییان پێکـراوە و ئێـستا کەپێگـەی خۆیـان بەدەسـت هێناوەتـەوە ئەمـە تۆڵەسـەندنەوەیەکی سـادەیە. زۆربەیان پاڵنەرێکی لەم جۆرەیان هەیە. پێموایە نـاتوانن لـەوە حـاڵیبن چ ڕەفتـارێکی نالـەباریان هەیـــە. کۆمـــەڵی ســـۆزانی بوونەتـــە هـــۆی دواخستنی جووڵانەوەی ژنان. بەراستی مایەی مەترسییە. بەڵام ئەوەی کە لە (ئیدینبورگ) وتم ئەوەبوو کە سـەراپای جووڵانـەوەی شەسـتەکانی سـەدەی رابـردوو شۆڕشـێکی سێکـسی بـووە، جووڵانـەوەی شەسـتەکان وەزعـی ژنـانی باشـتر نـەکردووە. بـەڵام کـاتێ مـن کـچۆڵەیەك بـووم مۆدیلێکم هـەبوو. ئەمـەش وشـەیەك بوو کە ئەو ڕۆژگـارە هێـشتا دانـەهێنرابوو. ئـەو مۆدیلـە پێیدەوتین ( کچان بچنە دەرەوە بەمافی یەکسانو دەرفـەتی یەکـسان و وەزعـی بـاش دایـەنگاکان بەدەسـت بێـنن. لـەم حاڵەتـەدا ئێـوە لەگـەڵ پیاوانـــدا یەکـــسان دەبـــن) ســـاڵانێکی زۆرە جووڵانـــەی ژنـــان بـــیری لـــەگۆڕینی یاســـاکان کردۆتـــەوەو ئەنجامەکەشـــی جـــەنگێکی کـــۆن و پڕوکێنـــەرە. ئێمـــە ئـــەم کـــارە ناکـــەین. ئێمـــە پێمانوایـــە زۆر باشـــە ئەگـــەر کـــچێ ژیـــانێکی سێکسی باشـی هـەبێت و بـەختی بـاش بێـت. بەڵام ئەمە شتێك ناگۆڕێت.

*** سـاتەوەختێکی زۆر سـەرنجراکێش لەکتێبەکەتـدا هەیە. لەو شوێنەدا کەدەربارەی سەرنووسەری گۆڤارێك دەدوێـت کـە کـاتێ پێیـدەڵێن ژن دەبێتـە هـۆی گوێزانەوەی ڤایرۆســـی مەلاریا دەڵێت پۆخـــڵەوات و ناپاکن، فاشستن ... ئەمە ترسناکە!**

+ ئەمەم لەگێرفانی خۆم دەرنەهێناوە.

*** یەعنی ئەمە لەواقیعدا هەیە؟**

+ بێگومان.

*** ئەو سەرنووسەرە وابیری دەکردەوە ئەمە تـاوانی ژنبوونە؟**

+ کتومت وایە.

*** کەواتە دەڵێیـت ژنـان لـە شـەڕی ڕەگەزایەتیـدا سەردەکەون یان سەرکەوتوون؟**

+ بەتەواوی نازانم سەرکەوتنە یان نا. من بیر لـەو کوڕژیلانـە دەکەمـەوە کـە ڕۆژگـارێکی زۆر خـراپ بەسـەر دەبـەن. بـەڕای مـن پیـاوانیش کـە ڕۆژگـارێکی باشـیان نییـە دەتـوانن بـۆ بەدەسـت هێنـــانی مافـــەکانیان خـــەبات بکـــەن. بـــەڵام کوڕژیلـــەکان نـــاتوانن. پێموایـــە دەبـــێ ژنـــان سـەرنجی ئـەم مەسـەلەیە بـدەن و لـەم بارەیـەوە غـەریزەی دایکانـەیان هـەبێت و ئاگایـان لـەکوڕە بچووکەکان بێت.

*** ئەگەر خۆت کوڕت نەبووایە هەستێکی وا قووڵـت دەبوو؟**

+ بـەڵێ. پێموایـە لەهـەموو هەلومەرجێکـدا هەروابیرم دەکردەوە.

*** دەزانیـــت بۆچـــی فیمینیـــستەکان ئەوەنـــدە بەگەرموگوڕییەوە تۆیان وەکو گوتەبێژی بیرکردنـەوەی فیمینیستی قبوڵ کردووە؟ ئایا لەبەر ...**

+ لەبـــەر کتـــێبی (دەفتەرچـــەی بیرەوەرییـــە ئاڵتوونییەکانـە). کـاتێ ئـەم کتێبـە یەکـەمجار بڵاوبۆوە زۆر کەس وەکو پـەیامێکی فیمینیستی لەقەڵەمیاندا.

*** ئەی وا نەبوو؟**

+ باشە من پێموا نییە. چونکە لەڕوانـگەی

خۆمـــــــەوە (دەفتەرچـــــــەی بیرەوەرییـــــــە ئاڵتوونییەکان) بەڵگەنامەیەکی مێژووییە.

*** حاڵی حازر کە لەتەمەنی 81 ساڵیدای، باوەڕت بە (یزم) یان بە ئایدیۆلۆجیایەکی تایبەتی هەیە؟**

+ تاکـە شـتێ کـەباوەڕم پێیـەتی ئەوەیـە کـە ئینسانەکان بەرلەوەی دروشم بڵێنەوە، دەبێ بیر بکەنەوە.

*** هەر دروشمێك؟**

+ بەڵێ، رەنگە وابیر بکەیتەوە بەدینـەهێنانی ئـــەم مەســـەلەیە، زیـــانێکی زۆر بـــە کۆمـــەڵگا ناگەیەنێ. بەڵام وانییە. چونکە ئێستا دەتوانیت ئەوە ببینیـت کـە خـەڵك چـەند بـە ساویلکەییەوە دەستیان کردووە بەوتنەوەی دروشمەکان.

*** تۆ هەروا پیرتر دەبیت و گریمان وایە کەپیرەکان، عاقڵترن.**

+ نا گریمانێکی وامەکە.

*** نا؟ وانییە؟**

+ نەخێر. نەخێر.

*** سـەبرودانبەخۆدا گـرتن لەبەرامبـەر نـەزانی و کاڵفامی لاواندا، لەپیریدا قورستر دەبێت؟**

+ نـەخێر. قورسـتر نییـە. مەسـەلەکە تـەنیا ئەوەیـــە کـــارێ کـــەخۆتان کردوتانـــە بەباشـــی تێبیدەگـەن و مایـەی شـەرمەزارییە کـە لاوەکـان گێلـی ئێمـە دووبـارە بکەنـەوە. بـەڵام بەڕووکـەش سوونەتی ژیان وایە.

*** لەجێگایەکدا لـەزمانی تـۆوە وتـراوە (نووسـین کارێکە کە دەبێ ئـەنجامی بـدەم) لـە تەمـەنی 81 ساڵیشدا هەروا بیر دەکەیتەوە؟**

+ بەڵێ. من چیرۆك گێڕەوەم. دەبێ بنووسم. کـــاتێ نانووســـم غـــەمگین دەبم. پێویـــستم بەنووســـین هەیـــە. پێموایـــە ئەمـــە جۆرێـــك لەمیکانیزمی هاوسـەنگی بەخشی دەروونزانیـی بێ. بەڵام ئەمـە تـەنیا راسـتیی بـوونی نووسـەران نییــە. پێموایـــە ئێمـــە هەمیـــشە هـــەنگاوێك لەشێتییەوە دوورین و پێویـستمان بەشتێکە کـە هاوسەنگیمان رابگرێت.

*** ئەمە نیشانەی ساغڵەمی عەقڵی تۆیە؟**

+ کتومت وایە.

*** هەروا لەنووسین بەردەوام دەبیت؟**

+ بەڵێ. هەتا بتوانم بەردەوام دەبم.

****

## چاوپێکەوتنی *San Francisco Chronicle* لەگەڵ لیسینگ

**سازدانی جۆن فریمەن**

**15 کانوونی دووەمی 2006**

*** خوێندنەوەی رۆمانی (ژەنـەراڵ دۆن و گرایـت، خـانم مارتـا و سـەگە بەفرینەکـە) کـە چـیرۆکەکەی دەتخاتە بیرکردنەوەوە وەکو نواندنێکی ئەم سـەردەمە مایەی وەسوەسەیە.**

+ بەڵێ، دەزانیـت مـن کـاتێ رۆمـانی (مـارا و دۆن)م نووسیووە، هەندێ کەس لێی بێزار بـوون لەبـەر ئـەوەی رەفتـاری زۆر توندوتیـژ بـوو. بـەڵام مـــن (دۆن)م خۆشویـــست. هەربۆیـــە بڕیارمـــدا درێژەی رۆمانەکە بنووسم. بیرم لەوە کردەوە کە رۆمانەکە دەبێت لەجیهانێکدا رووبدات کەنیوەی چـووبێتە ژێـر ئـاوەوە. وێنـاکردنی دنیایـەکی وا قورس نییە. باشە سەراپای رۆمانی (مارا ودۆن) لەوشکەســاڵیدا روودەدات. ئــەو هەلومەرجــەی کـەمن لـە ئـەفریقا لەنزیکـەوە بینیوومـە. جـۆنی کوڕم و جوتیـارێ کە لەکێڵگەیـەکی قاوە کاریـان

دەکرد لەوێ بوون. تۆ هیچ کاتێ بەچاوی خۆت وشکە ساڵیت دیووە؟

*** نەخێر.**

+ باشە وا ئینسانەکان دەمرن و ئاوی دەوروبەریان لەحاڵەتی وشکبووندایە. درەختەکان وشك دەبن.ئەمەش زۆر ترسناکە. نەدەبوو وێنای بکەین.

*** ئەو وەسفانەی کە لە رووبەڕووبوونەوەی کۆچەراندا لەگەڵ (دۆن) لەرۆمانەکەدا دەیخەیتەڕوو ئەفغانستانی هەشتاکانی سەدەی رابردووم بەیاد دەهێنێتەوە. ئەوکاتە من بینینم کە کۆچەرە ئەفغانییەکان هەڵدەهاتن و دەچوون بۆ پیشاوەر.**

+ لەم رۆمانەدا، هەمووان کۆچەرن. بەرلەنووسینی ئەم رۆمانە، هەڵسوکەوتم لەگەڵ کۆچەراندا نەبوو. بەڵام هەموویان لەترسی وشکە ساڵی و جەنگی ناوخۆیی و لافاو رادەکەن. زۆر بیرم لێکردنەوە. هەروەکو دەزانیت شەقامێك لەم نزیکانە هەیە کە تیایدا کۆچەرانی وڵاتانی جیاجیا ریزیان بەستووەو خەڵك دەچن بۆ ئەوێ بۆ ئەوەی وەستای ئیش وکاری ئاو و دارتاش و ئەم جۆرە شتانەیان دەستبکەوێ. بەڕەسمی نییە بەڵام دەزانیت کەهەن. یەکێ لەهاوڕێیانم هەرچی دەوێ دەچێت بۆ ئەوێ. وەستاکانی ئەوێ زۆر شارەزان.

*** کاتێ لەساڵی 1949 دا هاتی بۆ لەندەن هەلومەرجەکە هەر بەم جۆرە بوو؟**

+ نەخێر. کاتێ هاتم بۆ لەندەن، هەرکەسێکم دەبینی یان سەرباز بوو یان مەلەوان و ئەم جۆرە شتانە بوو. هەربۆیە هەمووان دەربارەی جەنگ قسەیان دەکرد. هەتا ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی رابردوو هەمووان دەربارەی جەنگ قسەیان دەکرد. پاشان نەوەیەکی تازە فۆرمەڵە بوو. نەوەیەکی نوێ کەحەزی بەقسەکانی نەوەی پیشخۆی نەبوو. ئیدی کەس دەربارەی جەنگ قسەی نەدەکرد. کەمێك بەلای منەوە مایەی ئازار بوو. بەڵام ئێستا پێموایە ناکرێ هەموو ژیانتان بەبیرکردنەوە لەرابردووی ترسناکتان بەسەر بەرن. دەتوانن؟

*** سەیرە. وادیارە ئەو رۆژگارە باوەڕ بەئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیزم، کاردانەوەیەك بوو بۆ ئەم وێرانییە. بەڵام ئێستا جگە لەمەزهەب کەس باوەڕی بەهیچ ئایدیۆلۆژیایەك نییە؟**

+ کەس باوەڕی بەهیچ نییە. ئێمە لەتەلەفزیۆنەوە فیلمی زۆرمان دەربارەی قەیرانەکانی جەنگی ڤێتنام دیووە. تەماشا دەکەین و بەخۆمان دەڵێین ئەمە ئەمریکایە. ئێستا چ بەڵایەکی بەسەر هاتووە.

*** پێتوایە شۆڕشی رۆشنبیریی شەستەکانی سەدەی رابردوو تووشی زیادەڕەویی بوو؟**

+ باشە، مادە بێهۆشکەرەکان بەقوەت نەگەیشتە ئێرە. مادەی بیهۆشکەری بەقوەت (ماری جوانا)یە، ئەوی تر شۆڕشی سێکسی بوو کەمن هەمیشە لەتێگەیشتنیدا دوچاری کێشەی گەورە بووم. لەبەر ئەوەی شۆڕشی سێکسی ئەو وێناکردنە دەهێنێتە ئاراوە کە بەرلەوە شۆڕشێکی لەو جۆرە وجودی نەبووە. لەکاتی جەنگیشدا خەڵك هەر پێکەوە دەچوونە ناو جێگەوە. هەربۆیە هەڵەیە ئەگەر وابزانین شۆڕشی سێکسی شەستەکان لەئەنجامەکانی جەنگی دووەمی جیهانە.

*** دەزانیت بۆچی کتێبی (دەفتەرچەی یادەوەرییە ئاڵتوونییەکان) ئەوەندە خۆشەویست بوو؟**

+ پێموایە (دەفتەرچەی یادەوەرییە ئاڵتوونییەکان) یەکەمین کتێب بوو کە ئەندێشەی فیمینیستی تێدابوو. جگە لەوەش، ئەوکاتە بەتاقەت و توانایەکی زیاترەوە دەمنووسی. ئەم کتێبەم لەکۆتایی پەنجاکانی سەدەی رابردوودا نووسی. ئەوسا ژیانی تایبەتیم تێکچووبوو، کۆمۆنیزم لەبەرچاومان پارچەپارچەدەبوو، هەمووئەم مەسەلانە لە کتێبەکەداهەیە. ئەو وزەو توانایەش بەڵگەی بەردەوامی خۆش ویستنێتی.

*** لەیەکێك لە چاوپێکەوتنەکانتدا وتبووت کە مەترسی رووداني سەردەمێکی سەهۆڵبەندانی تر ئەوەندە مایەی نیگەرانییە کە نیگەرانیی مەترسی چەکی ئەتۆم لەبەرامبەریدا پێکەنیناوی دێتە بەرچاو ئایا رۆمانی (جەنەراڵ دۆن) ئاگادارییەکە لەم بارەیەوە؟**

+ بەڵێ. هەروایە. لەبەرئەوەی بەرلە ئێمە (چاخی سەهۆڵبەندانی) زۆر هەبووە و بەدڵنیاییەوە بەرەو (چاخی سەهۆڵبەندان)ێکی دیکە دەچین.ئەو شتەی کەدەبێتە مایەی نارەحەتی من ئەو راستییەیە کە مرۆڤ تەواوی داهێنانەکانی لە دە هەزار ساڵی رابردوو و زۆربەی لەم ساڵانەی دواییدا ئەنجام داوەو (چاخی سەهۆڵبەندان) سەراپای ئەم دەسکەوتانە لەناو دەبات. ئەم رووداوە دەقەومێ و ئێمە دەبێت دووبارە لەسفرەوە دەست پێبکەینەوەو ئەمەش کارێك نییە کە ئێمە بەردەوام دەیکەین.

***

## چاوپێکەوتنی *Salon* لەگەڵ لیسینگ

**سازدانی دوایت گارنەر**

**تشرینی دووەمی** 2007

دوایت گارنەر لە ساڵی 2001 دا دەربارەی کتێبی ژیاننامەی لیسینگ چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ دۆریس لیسینگ ئەنجامدا. بەڕای گارنەر کتێبی ژیاننامەی لیسینگ کەبەناونیشانی (لە ژێر پێستمدا)یە کتێبێکە کە ژیانی لیسینگ لەمناڵییەوە لە رۆدیسیا (زیمبابۆی) ئێستاوە (کە وەکو مناڵی باوك و دایکێکی ئینگلیز مناڵێکی خۆ بەزلزان بوو ) تا دووجار شووکردنی کە ئەنجامەکەی تەڵاق بوو و چرۆکردنی سەرەتای هۆشیاری سیاسی لەخۆ دەگرێ. ئەم کتێبە رێکردن لەسێبەرەکاندا لەتەك رووداوەکانی تری ژیانی لیسینگ لەساڵی 1949 وە کە هەندێ لەدوای کتێبی یەکەمی (گیا گۆرانی دەڵێت) لەگەڵ کوڕەکەیدا هاتن بۆ لەندەن باس دەکات.

*** لەسەرەتای کتێبی (لەژێر پێستمدا)، لەساڵی 1949 ەوە لەباشووری رۆدیسیاوە هاتیت بۆ لەندەن. تۆ لەو ساڵەدا تەنیا دایکێکی تەنیا نەبووی، بەڵکو ژنێك بوویت دووجار شووت کردبوو و تەڵاق درابووی. ئایا لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە ئایا ئەم شتانە وەکو لەکەیەکی خەوش بۆ کەسێك لەقەڵەم دەدرا؟**

+ دەستەواژەی (سەرپەرشتیاری تاك) هێشتا دانەهێنرابوو. بەڵام تاك سەرپەرشتیاری دیکەش هەبوون. ئێمە دەمانزانی کە لە روانگەی باقی خەڵکەوە سەیر دێینە بەرچاو. بەڵام من بەگشتی لەهەموو روانگەیەکەوە کاتێ

له باشووری رۆدیسیا ژیانم دەستپێکرد سەیر بووم، نەك لەبەر شووکردنەکانم، بەڵکو لەبەرئەوەی من لایەنگری (کافر)و کۆمۆنیستەکان بووم. لەو کۆمەڵگایەدا لایەنگریی کافرەکان، یەك ملیۆن جار لەوە خراپتر بوو کەکۆمۆنیست بێت. هەربۆیە زۆر کەس حەزیان لەچارەی من نەبوو. کۆمەڵگا رقیان لەوکۆمەڵە کەسە کەمە بوو کەئەم جۆرە بیرکردنەوەیەیان هەبوو و لێیان دوور دەکەوتنەوە.

مامە جۆزیف (ستالین) لای ئێمە زۆر خۆشەویست بوو، کۆمۆنیست بوون لەکاتی جەنگدا بەقازانجی ئێمە بوو. چونکە هەموومان لەبەرەیەکدا بووین. بەڵام دوای جەنگی سارد نەگبەتیی دەستی پێکرد. تەقریبەن لەشەوێکدا، ئێمە بەدوژمنی کەسانێك حساب کراین کەهاورێی نزیکی ئێمە بوون. لەسەر جادە کەدەرۆیشتن لێمان دوور دەکەوتنەوە. کاتێ گەیشتمە بەریتانیا وەزعەکە زۆر خراپ بوو. لەراستیدا لەندەن دیمەنێکی ترسناکی هەبوو. شارەکە بۆیە نەکرابوو و یەکرەنگ و خۆڵەمێشی بوو. لەبەر هۆی رۆشنبیریی لەوەی کە لە لەندەن بووم شپرزە بووم. بەڵام جەنگ چوارچێوەیەکی فیکری دیاریکراوی فۆرمەڵەکردبوو کە ئێستا زۆر سەختە کەسێك بگەرێتەوە بۆ دواوەو لەو چوار چێوەیەدا بیر بکاتەوە. پارەدەرهێنان بەلای هیچ کەسێکەوە بایەخی نەبوو. لەبەرئەوەی کەس پارەی نەبوو. ئەوەی کەئێستا زۆر باوە. ئەوەیە کەخۆت بەوەوە هەڵدەکێشی کە لەبەری دەکەی یان دەیخۆی یان موڵکی خۆتە. ئەوکاتە زۆر زۆر هیچ دەهاتە بەرچاو.

*** لەجێگایەکی کتێبەکەتدا نووسیووتە کە بۆ نووسین لەبارەی دووشتەوە رۆژگارێکی سەختت بەسەر بردووە. یەکێکیان کەش و هەوای جەنگی ساردو ئەوی تریان وێنەی بڵاوکراوەکان چەند جیاوازن لەیەکتری.**

+ پێموایە نووسین لەبارەی ئەم دووشتەوە زۆر سەخت بوو.

*** جەنگی سارد بۆچی؟**

+چونکە بالی بەسەر هەموو شتێکدا کێشابوو. جۆرێك لەترس سەبارەت بەجەنگ لەئارادا بوو. چەند رۆژێکی ترم هاتەوە یاد کە پیاوێك ئێستا کامڵە پێیوتم (دەزانی کەسەراپای منالیی من و منالیی هەموومان بەترس لەبۆمبی ئەتۆمی تێپەری؟ ) کەش و هەوایەکی ئالوودەو پر ترس و بێمتمانەییەکی لەرادە بەدەر بوو. واتە هەمووان کاردانەوەیەکی زۆریان هەبوو. چ بەقازانجی کەسێ چ لەدژی کەسێ. سیستمی سەرمایەداری لەناو چووبوو. ئێمە دەمانەویست بە شەوورۆژێ دادپەروەریی، یەکسانیی، ماف بەویژدانانە بۆژنان و کەمئەندامان و رەش پێستان بەدەست بێنین. تەنانەت کەسە هۆشیارەکانیش باوەریان بەم وڕێنانە کردبوو.منیش شەیدای ئەم دروشمانە بووم.

**سەرچاوە:**

*www. Radiozamaneh.com* ( رادیو زمانە)

**سەرنج:**

1–دۆریس لیسینگ 50 کتێبی نووسیووە.

2–بەخەڵاتی نۆبڵەوە هەتا ئێستا 18 خەڵاتی وەرگرتووە.

# قەیرانی کێشەی مرۆڤ لەم سەردەمەدا

دۆریس لیسینگ
لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

لە نێوان نووسەرانی بەریتانیادا، لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە، کەم نووسەر توانیویەتی وەك (دۆریس لێسنگ) ژیانێکی بەپیت و سەرکەوتوو لە بواری داهێناندا بەدەست بهێنێت، یان بە شێوەیەکی زۆر کاریگەر بەرانبەر بە ژیان دەربەست (ئیلتیزام)ی بە بیروباوەڕێکی دیاریکراوەوە هەبێت. ئەم ژنە ئەدیبە لە سالّی 1949 دا کە ڕۆیشتۆتە ئینگلتەرا، کۆمەڵێك نووسینی گرنگ و سەرسووڕمێنی بەرهەم هێناوە کە زۆر کەم لە هاوەڵەکانی توانیویانە بەو جۆرە بنووسن. تا ئێستا زیاد لە دە ڕۆمانی نووسیوە (ئەم دیدارە سالّی 1992 لە گۆڤاری ئافاقی عەربییدا بلاّوکراوەتەوەو مێژووی چاوپێکەوتنەکە بە ئینگلیزی نازانرێت – وەرگێڕ). هەروەها دە کۆمەڵە چیرۆك و شەش شانۆنامەی نووسیوە، دیوانێکی شیعر و پێنج کتێبی ڕەخنەیی هەیە. ئەم دیدارە (فرانك لیستەر)ی ڕەخنەگر لەگەڵیدا سازی داوە. بە بۆنەی وەرگرتنی خەلاّتی نۆبڵی ئەدەبی سالّی 2007 وە بە چاکمان زانی دیدارەکە بلاّوبکەینەوە.

**-فرانك لیستەر: هەر لە بەرهەمە بەراییەکانتەوە، بەردەوام تۆ لەو کارانەدا دەربەست بوونێکی بەهێزت بە پرنسیپە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانەوە هەیە، هۆکاری ئەو دەربەست بوون (ئیلتیزام)ە چییە:**

-دۆریس لێسنگ: دنیا گۆڕانی گەورەی بەخۆوە دیوە، زۆر گەورەیش لە گشت بوارەکانی سیاسی، ئابووری، کۆمەلاّیەتی و کلتووریدا، بەتایبەتی لە سالاّنی چل و پەنجا و شەستدا. گۆڕانەکان دوو گرووی سیاسی سەرەکی لێ کەوتەوە لە دوو بەرەی تەواو دژ بەیەکدا. مەبەستم لە سوشیالیزمە کە بانگەشەی پشتیوانی لێکردنی چەوساوەو هەژارانی دنیای بۆ خۆی دەکرد، لەسەر هەردوو ئاستی تاك و ولاّت. گەلێك لەو شەڕانەم بینی لە هەموو جێگایەکی ئەم سەر زەویەدا کە میللەتان

لــە پێنــاوی ســەربەخۆیی و مــاف چــارەی خــۆ نووسین و رزگاربوون لـە داگیرکـەر و کۆیلایـەتی شۆڕشــیان هەڵگیرســاند. ئەمــە قۆناغێکــە بــە تەواوی مانای وشە. من کە ئەو گۆڕانانـەم بینی لـە نـاخی خۆمـدا هەسـتم بـە خۆشـی و ئـازار دەکـرد. خۆشیەکە لەبەر ئەوەی کە زۆر نەتـەوە سـەربەخۆیی بەدەسـت هێنـاو پێگـەی خـۆی لـە نێـو دنیـای تـازەدا جـێگیر کـرد. ئازارەکـەیش لەبەرئەوەی هەندێك نەتەوە هـەر لـە قوربانیداندا بـوون، قوربـانی مـادی و رۆحـی، لــە پێنــاو سەربەخۆیدا. وەك ئەوەی چارەنووسی بێجگە لە قوربانی و فیداکاری لـە پێناوی سادەترین ماف مرۆڤـی سـەردەمدا چیتر نـەبێت . لێرەوە دەبـوو مـن بـە بیرو رۆح لـە هـەوڵی پتـەوکردنی گیـانی شـۆڕش گێڕیـدا بم لـە هـەر جێگایەکـدا بێـت و خۆیـشم لـە هـەر کوێیەکـدا بم، لـە ڕیـزی ئـەو شۆڕشـــگێڕانەدا کـــە لـــە هـــەموو شـــوێنە جیاوازەکانـــدا بڵاوبوونەتـــەوە، بـــە بـــڕوای تەواویانـــەوە بـــە مرۆڤـــی ئـــازاد و نـــوێ کـــە دەتوانێـــت ژیـــان بـــۆ وڵات و نەتەوەکـــەی دروسـت بکـات. بـەڵای منـەوە ئـەو ئەزموونـە شۆڕشـگێڕییە نوێیـەی لـە وڵاتـانی جیهـانی سـێدا روویانـدا شـایانی لەسەروەسـتان و لێکۆڵینـەوە و ڕامـان بـوون، ئەمانـە منیـان هانـدا بـۆ تێگەیـشتن لـە رووداوەکـانی ئـەو وڵاتانــە لــە کوبــاوە بــۆ ئەندەنووســیا، لە یوگۆسلافیاوە بۆ میسر. من سەرسام بووم بە ئەزموونی ئەوانـەی ئـەو گۆڕانـە گەورانـەیان لـە دەیــەی پــەنجادا لــە ڕێگــای سۆشــیالیزم و پــشتیوانی کردنــی مرۆڤــی چەوســاوەدا بــە ئــەنجام گەیانــد. دەمزانــی و لــەوە بێگومــان بــووم کــە گۆڕانــە گــەورەکان رووی مێــژوو دەگۆڕن.

**-فرانك لیستەر: تۆ وای نابینیت کـە ئـەدەب لـە حـاڵێکی لـەم جـۆرەدا دەبێتـە بـووقی پرنـسیپە سیاسیەکان و وەك ئەنجام بنەما سـەرەکیەکانی خـۆی لەدەست دەدات؟**

-دۆریـس لێـسنگ: هـەرگیز مـەرج نیـە دەربەسـت بوون نووسـەر لـە حاڵـەتی بێدەنگیدا رابگرێت، بەڵکوو دەربەست بوون ئەنگێزەیـە بـۆ بزوتنـەوەو رابـوون. نووسـەریش ئامرازێکـە بـۆ وەرچەرخاندنی پرۆسـەی شـۆڕش بـەرەو چاکتر. ئـەم ئـامرازی گۆڕانـە نووسـەر دەخاتـە سـەر کەڵکەڵـەی بایەخدان بەو دنیایـەی کـە لێـی جیا نابێتەوە. لە زۆر بەرهـەم و رۆمانەکانمدا هـەوڵی ئـەوەم داوە پەیوەنـدی نێـوان مـرۆڤ و ئـەو دەوروبـەرەی تیایـدا دەژی بـە روونـی دەربخـەم. هـەر لـە یەکـەم رۆمـانی چاپکراومەوە (گـۆرانیی گژو گیا) 1949 تا پێنجینەی (مندالأنی توند و تیژی) بێجگە لە بەرهەمی ترم وەك (ئەمە وڵاتـی کـۆنی سـەرۆکە) کـە کۆمەڵـە چـیرۆکێکی سـاڵی 1950 یـەو (چـیرۆکەکانی ئـەفریقا)ی سـاڵی 1953 کـە سـاڵی 1954 خـەڵاتی (سۆمەرسـت مۆم)م لەسەر وەرگرت.

**-فرانك لیستەر: (گـۆرانیی گـژوگیا) لـە ڕەوتـی داهێنانی تۆدا کارێکی پڕ بایەخـە، تکایـە کورتەیـەك لەبارەی ئەو رۆمانەوە باس بکە.**

-دۆریـس لێـسنگ: لـە خوێندنـەوەی (گـۆرانیی گـژوگیادا) لانـی کـەم دوو جـۆرە کەسـایەتی بـەدی دەکـەین. زۆرجـار ئـەو کەسـایەتیانە لـە شـوێنی تـری کارەکانمـدا دووبـارە دەبنـەوە: نـشوستی هێنـان لـە

کۆمەڵگایەکداو تێکۆشانی مرۆڤ بۆ سەلماندنی بوونی خۆی لە کۆمەڵگایەکی تردا، لەم ڕۆمانەدا کەسایەتیەکە (دیك تیرنر)ە، کەسایەتی (ماری) هاوسەری (دیك)یش هەیە کە ژنێکی بێ قەناعەتە و هەست دەکات ژیان بریتییە لە مەسەلەیەك زیاد لەوەی کە تەنیا دووبارە بوونەوەی ڕۆژانە بێت. (ماری) کە پاڵەوانی ڕۆمانەکەیە بۆ سەرکەوتنی ئەو کێڵگەیە تێدەکۆشێت کە خۆی و مێردەکەی لەسەر دەژین، بەتایبەتی مامەڵە لەگەڵ ئەو کرێکارە نیشتمانپەروەرانەدا کە لە کێڵگەکەدا کار دەکەن. (ماری) دوای ماوەیەك مەیل بە یەکێك لەو کرێکارانە دەدات، بەڵام دوای ماوەیەك لێی دەبێزرێت و سادیانە دەکەوێتە سەرکۆنەو سزادانی ئەو کرێکارە نیشتمانپەروەرانە.

ئەم وێنەیە شێوەی بابەتێك وەردەگرێت کە تەواوی ئەفریقای لە خۆی گرتووە. لەبەرئەوەیش کە مەسەلەکە پەیوەندی بە (تیرنەر)ەوە هەیە. ڕۆمانەکە لەو شوێنەدا دەگاتە چڵە پۆپە کە نۆکەرەکەیان (ماری) دەکوژێت. بە هەمان ئەو شێوازە کە فردریك ئار پێشنیازی کوشتنی سامری بۆ (مارینو) کرد لە ڕۆمانەکەی (تۆماس مان)دا.

لەم ڕۆمانەدا دەمەوێت بڵێم کە هەندێك هەن بە ئازادی نەماونەتەوە بەڵکوو بوون بە کۆیلە. دەربەست بوونیان بەم بۆشەکانی شارستانیەتەوە بوە بە هۆی وێران بوونیان، هەروەها ڕۆمانەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە سپی پێستەکان چەند بە سەختی بەرپرسیارن لەو کارەساتانەی کە بەسەر ئەفریقای ڕەشدا هاتووە.

**-فرانك لیستەر: هەندێك جار لە ڕۆمانەکەدا تایبەتمەندیەکی ڕەمزی هەیە، ئەوەیش لە شێوازی پەیوەندی نێوان سپی پێستەکاندایە لەگەڵ یەکتریدا تەنانەت ئەگەر ناکۆکی شەخسیشیان لە بەینا بێت.**

—دۆریس لێسنگ" ئەمە ڕاستە، ئەم شتانە وا دەردەخەن وەك ئەوەی ئەو پەیوەندیانەی هەموویان پێکەوە دەبەستێت دوورگەیەکی دڵنیاییە لەناو جەرگەی ئاژاوەیەکدا کە هەموو جێگایەکی گرتۆتەوە. بۆ نمونە، کە (دیك) هاوکاریی دراوسێیەکی دەکات – کە پێ دەچێت زۆر لە خودی (دیك) سەرکەوتووتر بێت. هەرچەندە هەردووکیان گەلێك ڕقیان لە یەکترە. لەمەوە تێدەگەین کە دیك یاسا بەراییەکانی سپی پێستەکان لە خوارووی ئەفەریقادا پراکتیزە دەکات کە دەڵێت: (هەرگیز مەهێڵە هاوڕێ سپییەکەت لەو سنوورە بێتە خوارێ کە بۆی دانراوە) لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ململانێی (ماری) بەهێز و سەختە، چونکە ئەو بەخۆی دەزانێت لەبەردەم چ دنەیەکی قەدەغە و تابویەکدایە لەبەردەم دانیشتواندا و، ئەو کۆمەڵگایە بە مەبەست چ ڕقێکی بەسەردا سەپاندووە.

**-فرانك لیستەر: گرنگترین ڕۆمانی بەراییت پێنجینەی (منداڵانی توندوتیژی)ن، ئەو کارە لە ڕووی قەبارە و فراوانیەوە بەکاری نووسەرانی وەك (سی بی سنو) و (ئەنتونی پاول) بەراورد دەکرێت. ئەوەی ئەم پێنجینەیە لەو کارانەی تر جیادەکاتەوە کە هاوشێوەین بەهێزی شیکارکردنی کاراکتەرەکانە کە توانای تۆ دەردەخات. تکایە هەندێك ڕووناکی بخەرە سەر ئەو کەسایەتیانە.**

–دۆریــس لێــسنگ: (مارتاکویــست) کــچە گەنجێکی نموونەییە، ئاواتی تەنیا ئازادی خۆی نییــە، بــەڵکو دەخوازێــت بــەپێی پێودانــەکانی خـــۆی دنیـــا بگۆڕێـــت، کـــە دەســـتەڵاتدارە ســـپییەکانی ئـــەفریقا ئەمـــەیان ناوێـــت. لـــە ناوەڕاســتی تەمــەنی هەرزەکاریــدا، کــە یەکــەم کتــێبی پێنجینەکەیــە، دەبیــنین (مارتــا) بــە پەرۆشــەوە ئــەو بابەتانــە دەخوێنێتــەوە کــە بەلایـــەوە زۆر گـــرنگن. ســـێکس، سیاســـەت، ئابووری. ئەوسا بۆی دەردەکەوێت کە ئەو جۆرە کتێبانــە کــەمتر کێــشەی ســێکس و دەزگــا کۆمەڵایەتیــەکانیان تیــا چارەســەر دەکرێــت. هــەروەها (مارتــا) کێــشەی لەگــەڵ دایکیایــەتی کە ڤێکتوریەکە لـە بیروڕا ئاکاریەکانیدا توند و تیژو دەمارگیرە.

ململانێی دوو نـەوە، کە لـە کارەکـانی ترمـدا دەردەکــەون، لــە بەشــی یەکــەمی پێنجینەکــەدا تیژتر خۆی دەنوێنێت. لە هەندێك لایەنی ترەوە گەلێك لەگەڵ باری سەرنجەکانمدان. بۆ نموونە. دەبینین ژیانی ئازادی (مارتا) کە بازدانە بەرەو پێــشەوە، بــەلای دایکیــەوە ژیــانێکی نــاجۆر و گەندەڵە، ئەمە وا لە (مارتا) دەکات کە نەك تەنیا مــشتومڕ لەگــەڵ گەورەکانــدا بکــات، بــەڵکوو پەیوەندی بە کۆمەڵێك کوڕ و کچەوە دەکات کە شـەیدای پەیکەرسـازین کـە وا دەردەکـەوێت بـە تـەواوی ژیـانی خۆیـان بـۆ ئـەو رێبـازە تـەرخان کردبێت، بەڵام (مارتا) زوو بۆی دەردەکەوێت کە ئەوەیش ناپەسەندە، خۆپەرستی و گەندەڵیە و قایلکەر نیە.

پاشان لە بەشەکانی تری رۆمانەکەدا (مارتا) لە سەرەتای شـەڕی گـەورەی جیهانـدا پەیوەندی بـە رێکخراوێکـی چـەپەوە دەکـات، لەوێـدا بـۆی دەردەکــەوێت کــە مەســەلەی ئــازادی بەســەریدا دەســـەپێنێت نـــەك تـــەنیا کلتـــووری ئـــاینی و کۆمەڵایــەتی خێزانەکــەی و دەوروبەرەکــەی رەت بکاتـــەوە بـــەڵکوو تەنانـــەت ئـــەو دەزگـــا کۆمەڵایەتیانــەیش رەت بکاتــەوە کــە دواتــر پـــەرۆش بـــووە بۆیـــان وەك هاوســـەرگیری و دایکایەتی.

بـە کـورتی، پوختـەی ژیـانی پاڵەوانەکـە لـە چەند ئامانجێکی دیاری کراودا کۆدەبێتەوە وەك بوونی جۆرێـك لـە ئازادی، چـەندیش دەکەوێتـە گـــەڕان و پـــشکنین هـــەنگاو زیـــاتر بـــەرەو پێش دەنێت.

**–فرانك لیستەر: لە رۆمانی (رۆژە ئاڵتونیـەکان)دا بابەخدانت بە شیکارە دەروونیەکان رەهەندی فـراوانتر وەردەگرێـــت. کەســـایەتیەکان لـــە گـــەڕانێکی بەردەوامدان. چۆن تەماشـای ئـەو کـارەت دەکـەیت دوای ئەوەی ساڵانێکی درێژە بڵاوت کردۆتەوە؟.**

–دۆریس لێسنگ: ئەو یادەوەریانە تایبـەتن بە (ئاناولف)ەوە کە ژنە ئەفریقاییەکی ئاوارەیـە. تـەلاق دراوەو کتێبێکـی سـەرکەوتوی نووسـیوە، لەگـەڵ کـچەکەیدا بـەو دەرامەتـە دەژیـن کـە لـە کتێبەکــە دەســتیان دەکــەوێت. (ئانــا) چــوار دەفتـەری هەیـە: کتـێبی رەش کە باسـی رۆژانـی ئەفریقیایـەتی، کتـێبی سـوور بـاس لـە بەشـێکی ژیـانی دەکـات لـە رێکخراوێکـی چـەپدا. کتـێبی زەرد باسی ژنێکە ژیانی تەواو تەریبـە بـە خـۆی. دوا کتێب کە شینە بریتییە لە بەرجەستەکردنی چالاکییەکانی ئێستای ئانا، هـەروەها بیر و ئەو شتانەی پەیوەندیان بـە کتێبـەکانی پێشوویەوە هەیـە بـە بـاوەڕی خـۆم ئـەو یادەوەریـە رۆژانانـە

هاوتەریبە لەگەڵ رۆمانەکانی ترمدا و گۆڕانی هەندێك لە بابەتەکان بەرەو لۆژیکیتر. هەندێك جار (ئانا) وەك (مارتا کویست) لە تەمەنێکی مامناوەندایە و لە مێژوو خولیاکانیاندا لێك دەچن. بێجگە لەوەی کە هەردووکیان هەمان ئارەزووی شیکاری دەروونیان هەیە، ئازادیی وەك ئافرەتێك لە دنیای پیاواندا، خۆتەرخان کردن بۆ ئامانجێکی دیاریکراوی ماقووڵ.

**-فرانك لیستەر: بەلایەنە گریمانەییەکەیدا ژنەکە نموونەی ژنێکی ئازادە. بایەخ بە گەلێك لایەنی زانستی وەك سیاسەت و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و شتی تر دەدات. ئەم روانینە چۆن لە یەکێکدا بەرجەستە دەکرێت کە لە سەرەتای رێگادایە بەرەو رزگاربوون و ئازادی؟**

—دۆریس لێسنگ: خودی کەسایەتی ژنەکە ئەو دۆخەی دروست کردووە، بە داهێنانی زۆرەوە ژیانە تایبەتیەکەی ئەزموون دەکات، بەرانبەر بە خۆی نائومێد نیە، وەك هەندێك کەسایەتی تر ناکەوێتە داوی سووکایەتیەوە، توانایەکی ئەقڵی و مادی وای هەیە کە خەونەکانی بە سەرکەوتوویی بەدیدەهێنێت تەواو وەك (مارتا کویست)

**-فرانك لیستەر: بۆ تەعبیر کردن لە قەیران و کێشەی مرۆڤی ئەم سەردەمە گەلێك شێواز و ناوەرۆکی جیاوازت بەکارهێناوە. پێدەچێت ململانێکەت وردە وردە بەرەو ناخی مرۆڤ سەر بکێشێت. بۆیە زۆر جەخت لەسەر لایەنە سایکۆلۆژیەکان دەکەیت و ئەو کاریگەریانەی لەسەر ئاکاری مرۆڤی دادەنێن، ئەم وەرچەرخانە چیە لە تۆدا؟**

—دۆریس لێسنگ: ئەوە وەرچەرخان نیە بەو شێوە وردە، بەڵکوو گۆڕانە لە ئەزموونی نووسینی مندا، پێش ئەوە گۆڕان لە ئەزموونی کۆی ژیاندا، حەزدەکەم پێت بڵێم هەموو ئەو نەهامەتیانەی گەمارۆی مرۆڤیان داوەو هەڕەشەی لێ دەکەن بەردەوام روویان لە زیادیە. ئەو کارەساتانە هەڕەشە لە بوونی دەکەن، لە بوون و ژیانی. لە هەموو چرکەساتێکدا مەرگ دەبینین و ناتوانین رێگای لێبگرین. لە زوربەی کاتدا مەرگەکە مرۆڤ خۆی دروستی کردووە. برسیەتی لە زوربەی کەرتەکاندا نەك لە زوربەی وڵاتدا مرۆڤ لەناو دەبات. ئەمە سەیرە، وا نیە؟ نەخۆشی، هەژاری، ئازار هەموویان مرۆڤ دەکوژن. ئەمانە هەقیقەتێکن ناتوانین چاویان لێ بنووقێنین چونکە ئێمە بەشێکین لێیان. ئێمە رۆژانە دەخوێنینەوەو دەبیستین کە هەزاران کەس لە چوارگۆشەی دنیادا دەمرن. هۆکانی راگەیاندن ئەم کارەساتانەی قووڵ کردۆتەوە و بەردەوام دێتە ناو ماڵ و ئەقڵمانەوە و ناتوانین بەرانبەری هیچ بکەین و ئەگەر ئەم کارەساتانە لە کۆندا بووبێتن، بەڵام وەك ئێستا خێرا بڵاونەبوونەتەوە، ئەمەیش بەهۆی هۆکاری راگەیاندنەوەیە کە کەرەسە ئاسا رووداوەکان دەگوێزێتەوە.

**-فرانك لیستەر: لە کارەکانی ئەم دواییەتدا زۆر روون و ئاشکرا ئەم وێنەیە دەردەبڕیت، تا چەند هیوای رزگاربوونت هەیە لەم بارە؟**

—دۆریس لێسنگ: لە هەندێك کارمدا بەتایبەتی لە (یاداشتی رزگاربووەکە)دا ویستوومە وێنەیەکی بچووکی ئەوەی ئێستا لە دنیادا هەیە بخەمە روو. ویستم بڵێم زۆر لەو مەسەلە سادانەی بە ژیانماندا تێدەپەڕن و ئێمە

بایەخی باشیان پێ نادەین دنیا لە کێشمەکێشی دوو هێزدایە. چاکە و خراپە. ئەمە ڕاستیەکی سەلماوی ئەزەلیە. بەلاّم کارەساتە شاراوەکە لەوەدایە کە ئێمەی مرۆڤ درکی ئەوەمان نیە کە ئەم دوو هێزە چەندە کاریگەریان لەسەر خۆمان، لەسەر رەفتار و بیرکردنەوەیشمان هەیە. ئێمە بە کەم و کورتی تەماشای مەسەلەکان دەکەین بۆیە وێنە تەواو کامڵەکەی ئەو وێنە ئەزەلیەمان دەست ناکەوێت. بێجگە لەمە، ئەنگێزەکانی منداڵیمان کە هەندێك پشتگوێی دەخەن تەفسیری گەلێك لە دیاردە ئاکاریەکانی دواییمان بۆ دەکەن. ئەمەیش کێشەیەکی ئاشکرایە کە لە قوتابخانە سایکۆلۆژیە جیاوازەکاندا زۆر باسی لێکراوە، بەلاّم ئەم جۆرە هۆکارانە ئەوکاتە پشتگوێ دەخرێن کە سیاسیەکان دەسەلاّتی ولاّت لە دەست دەگرن. ئەگەر لێکۆڵینەوەیەکی وردی مێژوو بکەین دەبینین گرێکانی خۆ بە بچووك زانین و کێشە سایکۆلۆژیەکان هۆکاری سەرەکین لە ڕوودانی گەلێك کارەسات و نەگبەتی کە ئەو جۆرە سیاسیانە بە سەر دنیایاندا هێناوە.

**-فرانك لیستەر: ئایا چارەسەر لەو سۆفیگەرایەتیانە کە بەم دواییە کەوتوویتەتە پەیجوری؟**

—دۆریس لێسنگ: من کاتێك سەرقاڵی ئەم قوتابخانە فیکریە بووم کە بینیم زۆر لە دیاردە خۆرهەلاّتیەکان پێویستیان بە لێکۆڵینەوە و رامان هەیە. ئەوەیش کە هانی دام هێزی بڕواو لایەنە رۆحیەکانی گەلانی خۆرهەلاّتیە. چونکە ئەم دوو فاکتە، وەك دەردەکەوێت، رۆڵێکی زۆر گرنگ دەبینن لە دروستکردنی بنەمای فیکریی ئەو گەلانە کە چەندان سەدە زوڵم و چەوسانەوەو ئازاریان چەشتووە. ئەمەیش بوەتە هۆی دەرکەوتنی گەلێك بیرمەند و فەیلەسوف کە بەرەنگاری زوڵم و زۆریان کردووە. زۆر قوتابخانەی فیکریی و ئاینەکانم خوێندەوە، ناڵێم کاریگەریان لەسەر داناوم بەو ڕادەیەی هەستم کردووە کە ئەمانە شایانی تێڕامان و سەرسوڕمانن و ئێمەی خۆراوایی زۆرمان پێویستە. بەلای منەوە گرنگیدان بەم لایەنە مەسەلەیەکە تا ئەوپەڕی بایەخپێدان. ژیانی مادیی بە تەواوی بەسەرماندا زاڵ بووە، بۆیە ئەو گیانەی تیا نەهێشتووین کە هەمیشە بەرەو دنیایەکی چاکتر هەوڵ دەدات و خۆی ڕێك دەخات.

بەڕای من ئەمە جەوهەری جیاوازی نێوان ئێمە و ئەوانە.

**-فرانك لیستەر: لە رۆمانەکانی دوایتدا هەست دەکەیت پێویستیەك بۆ ئەم جۆرە ئیمانە هەیە. تەنانەت جۆرە بانگەشەیەکی ژێر بەژێرە بۆئەوەی مرۆڤی هاوچەرخ بۆ رزگاربوون لە قەیران و کوێرەوەریەکانی ئێستای پێویستە بەدوای رەمزدا بگەڕێت.**

—دۆریس لێسنگ: ئەمە لە کارەکانی پێشوتریشمدا هەر هەیە. من ویستوومە بە چەند شێوازێك ئەمە دەربڕم، رەنگە لەبەر ئەوەبێت کە من لە سەرەتای ژیانمدا تەواو هەستم بەو قەیران و کارەساتە ناخۆشانە کردبێت. بۆیە لەو کارانەدا رەنگە دەربڕینەکەم لەو قەیرانانە روونتر و راستەوخۆتر بێت. یان ئەو فۆرمە سیاسیەی کە رۆمان و چیرۆکەکانی داپۆشیوە زیاد لەمانەی دوایيم روون و ئاشکراتر بێت. بە بڕوای من یەك بابەتن بەلاّم بە شێواز و فۆرمی جیاوازەوە.

**-فرانك ليستەر: حەزدەكەم بچينە سەر رۆمانی خەياڵی زانستی كە لەدەيەی رابووردودا بووە بە بەشێك لە دەسكەوتی داهێنانت. ئەم گۆڕانە چۆن روويدا كە بەلای هەندێكەوە كتوپڕ بوو. لە ئەدەبی ئيلتيزامەوە بۆ ئەدەبی خەياڵی زانستی؟**

-دۆريس لێسنگ: گۆڕان وەك تۆ ناوی دەبەيت، لە قۆناغێكەوە بۆ قۆناغێكی دی. بە هيچ جۆرێك بەو مانايە نيە كە تۆ وازت لەو سەرەتايە هێنابێت يان پشتگوێت خستبێت. كاتێك كۆمەڵێك رۆمان و چيرۆكم نووسی كە تەعبير بوون لە پێويستيی ئيلتيزامی سياسی لە دنيای ئەمڕۆدا، ويستم تەعبير لە قۆناغێكی دياريكراو بكەم كە دنيای پێدا دەڕوات. رۆمانەكانی خەياڵی زانستيم گۆڕانێكی تری شێوازی ئەدەبيمە. دۆزينەوە زانستيە نوێكان و ئەو دەستكەوتانەی هەموو رۆژێك لە گەردووندا دەيانبيستين يان دەيانبينين كاريگەريان لەسەر ئەو كارانەم هەيە. رۆماننووس، بەتايبەتی، ناتوانێت خۆی لەم دەستكەوتانە نەبان بكات. بەڵكو دەبێت شان بە شانيان بڕوات و لە داهێنانەكانی داهاتوويدا بەكاريان بهێنێت. وەك دەزانيت من لە بواری تريشدا دەنووسم كە زۆر جياوازە لە رۆمانی خەياڵی زانستی، ئەمەيشيان هەر گۆڕانێكە لە شێوازی نووسينمدا.

**-فرانك ليستەر: چۆن تەماشای ئەو كارانەت دەكەيت، مەبەستم رۆمانی خەياڵی زانستيە؟ ئايا قۆناغێكی گرنگە لە ژيانی ئەدەبيتدا؟**

-دۆريس لێسنگ: پێشەكی، من وای نابينم كە ئەمە قۆناغێكی دابڕاو يان تەواو جياواز بێت لە نووسينەكانی پێشووم، چونكە بە ئاسانی من بڕوام وايە كە نووسينەكانم وەك زنجيرەيەكی پێكەوە گرێدراو وان ناتوانيت لە يەكتريان دابڕيت، هەموو ئەڵقەيەكی ئەو زنجيرەيە بايەخ و گرنگی خۆی هەيە، بۆيە من وا دەزانم كە گرنگيەكەی لە رادەی كاريگەريی و نەمريەكەيدايە.

**-فرانك ليستەر: بۆ خوێندنەوە چ كاتێكت لا پەسەندە؟**

-دۆريس لێسنگ: من هەموو رۆژێك ماوەيەكی درێژم بۆ خوێندنەوە داناوە، هەرچەندە هەست بە شەكەتی و بێ هێزی دەكەم. من كاتێكی دياريكراوم بۆ خوێندنەوە نيە، هەر كە دەرفەتم دەست بكەوێت دەست بە خوێندنەوە دەكەم.

**-فرانك ليستەر: ئێستا چی دەخوێنيتەوە؟**

-دۆريس لێسنگ: هەندێك كتێبی سايكۆلۆژی و رۆمانی نووسەرێكی كەنەديی. هەروەها كۆمەڵە شيعرێكی (دوگلاس دن).

**سەرچاوە:**

گۆڤاری آفاق عربية. ساڵی حەڤدە – 1992. ل 146–149.

# بەناو تونێلەکەدا

دۆریس لیسینگ
لە ئینگلیزییەوە: سەدرەدین عارف

کــــوڕە ئینگلیزەکــــە، لــــە یەکــــەم ڕۆژی پشووەکەیدا و لە کاتی ڕۆیشتنیدا بۆ قەراخی دەریـا، لـە پێـچی ڕێگاکـەدا وەسـتاو سـەیرێکی کەنداوە بەردەلآنییەکە و دەوروبەری کرد، ئینجا چاوی بە قەراخە قەرەباڵغەکەی دەریـا گێڕا، کە بەهۆی سەردانی پارەوەیدا باش ئاشنای بوو. دایکی لـە پێـشییەوە دەرۆیـشت و جانتایـەکی خەتخــەتی بریقــەداری بــە باڵێکییــەوە بــوو، باڵەکـەی تـری، کـە بـە ئـازادی بایـدەدا، لەبـەر هەتاوەکـە زۆر سـپی و دیـار بـوو. کوڕەکـە، کـە چاودێریی ئەو قۆڵە سپییە رووتـەی دەکرد، بە مۆنییەکـەوە چـاوی بـەرەو کەنداوەکـە وەرگێـڕاو ئینجا جارێکی تر سـەیری دایکی کـرد. کاتێك کە هەستی بەوە کرد کە لەگەڵیدا نییە، ئـاوڕێکی دایەوەو پرسی: "لێرەی، جێری؟"

دایکـی بـە نائارامییــەوە ســەیرێکی کــرد. بزەیەکی بۆ کرد و وتی:

"ئـازیزم، بۆچـی لەگەڵمـدا نایـەیت، حـەز ئەکـەیت..؟" ناوچـەوانی گـرژ کـرد. بەڕاسـتی پەرۆشی زانینی ئەو ڕابواردنە نهێنیانە بوو کە لەوانە بوو حەزیان لێبکات و ئەم لەبەر سەرقاڵی یان گوێنـەدان هـەر بە خەیاڵیشیدا نـەهاتبووبن. زۆر ئاشــنای ئــەو زەردەخەنــە پــەرۆش و بوردنخـوازەی دایکی بـوو. جـۆرە پەشیمانییەك وایلێکـرد کـە دوای دایکـی بکـەوێت. لەگـەڵ ئەوەشـدا، کاتێك بـە شـوێن دایکیـدا رایـدەکرد، چاوێکی هەر لەسەر کەنداوە بەردەلآنییەکە بوو. بـە درێـژایی ئـەو بەیانییـە، کاتێك لـە قـەراخی دەریاکە بوو، هەر بیری لێدەکردەوە.

ڕۆژی دوایــی، کاتێــك کــە کــاتی ئاســایی مەلـەکردن و خۆهەڵخـستنی لەبەرهـەتاو هـات، دایکــی لێــی پرســی: "بێــزار نــەبوویت لــە مەلەکردنی ئاسایی قەراخ دەریـا، جێری؟ حەز دەکەیت بچیت بۆ شوێنێکی تر؟"

"نەخێر". خێرا وەڵامی دایەوەو هەستی بە جۆرە مەیلێکی پیشاندانی جوامێری کرد. بەڵام، کاتێك لە گەڕانەوەدا بەڕێوە بوون، لە دەمی دەرچوو و وتی: "حەزدەکەم بچمە خوارەوە و سەیرێکی ئەو بەردانەی ئەوێ بکەم.." دایکی بە بایەخەوە بیری لە مەسەلەکە کردەوە. دەیزانی شوێنێکی چۆڵەوانییە و کەس لەوێ نییە، بەڵام وتی:

"بێگومان، جێری. هەر کاتێك کە بێزار بوویت وەرە بۆ کەنارە گەورەکە، ئەگەر حەزیش دەکەیت بگەڕێرەوە بۆ ڤێلاکە."

دایکی لێی دوورکەوتەوە. سەرنجێکی دا هەتاوی دوێنێ تۆزێك باڵەکانی سوور هەڵگەڕاندبوو.

دەیویست شوێنی دایکی بکەوێت چونکە حەزی نەدەکرد بە تەنیا بڕوات، بەڵام وای نەکرد.

دایکیشی بیری دەکردەوە. بێگومان گەورە بووەو دەتوانێت ئاگای لە خۆی بێت. ئایا زۆر لە نزیکەوە چاودێریم کردووە؟ نابێت وا هەستبکات کە پێویستە لەگەڵمدا بێت. دەبێت زۆر ئاگاداربم.

کوڕەکە منداڵ بوو. یانزە ساڵان بوو. ژنەکەش بێوەژن بوو. بڕیاریدا کە ئیتر نە زۆر خۆشەویستی پیشانبدات و نە کەمتەرخەمی بنوێنێت. بەم خەم و خەیاڵانەوە روویکردە ئەو کەنارەی دەریا کە رۆژانە بۆی دەچوو. لەولاشەوە، کاتێك کە جێری دایکی بینی گەیشتۆتە کەناری دەریاکە، دەستیکرد بە دابەزین بە ڕێگا لێژەکەدا بەرەو کەنداوەکە، لەو بەرزاییەوە کە لێی بوو، لە ناو پەردە قاوەییە سوور باوەکاندا، کەنداوەکە شینێکی مەیلە و سەوزی دەنواند کە بە ڕەنگێکی سپی دەوری درابوو. کاتێك کە زیاتر هاتە خوارەوە بۆی دەرکەوت کە ئاوی کەنداوەکە بەسەر چەندەها جۆگەو لێژگەدا دابەشدەبێت و ئاوە لوولخواردووە تیژتێپەڕەکە ڕەنگێکی شینی تۆخی مەیلە و مۆر دەنوێنێت. دوایی، پاش خۆخلیسکاندن بۆ بڕینی ئەو مەترەی کە مابوو بۆئەوەی بگاتە خواری خوارەوە، قەراخە سپییەکەی شەپۆلەکە و ئاوە تەنکە جووڵاوەکەی سەر لمە سپییەکەی بەدیکرد. ئەودیوی ئەوە، ئاوێکی شینی تۆخ بوو.

راستبووەوەو یەکسەر چووە ناو ئاوەکە بۆ مەلەکردن. مەلەوانێکی باش بوو. لە ئاوەکە دەرچوو و بەسەر لمە درەوشاوەکەدا بەرەو ناوەڕاستی ناوچەکە رۆیی. بەردی ژێر ئاوەکە لە دەعبای ئەفسانەیی ڕەنگ گۆڕاو دەچوون. پاشان، گەیشتە دەریای راستەقینە — دەریای گەرم کە تەووژمە ساردەکانی قووڵایی ئاوەکە دەست و پێی رادەتەکاند.

کاتێك ئەوەندە دوورکەوتەوە کە نەك هەر کەنداوەکە بەڵکو ئەو زەوییە لێژگەیەش کە لە نێوان دەریا و کەنارەکەدا بوو لەبەرچاوی بچووك دیار بوون، بە مەلە، بەسەر ئاوەکەدا گەڕایەوە بۆ لای دایکی. دایکی، لە دوورە، لە ژێر چەترەکەیدا، بچووك وەکو قاشێکی پرتەقاڵ دیار بوو. کە نزیك کەنارەکە بووەوە هەستی بە ئاسوودەیی کرد کە زانی دایکی لەوێیە، بەڵام بەتەنیا، لەو لوتکە زەوییەی کە لێژگەکەی لە کەنداوەکە جیا دەکردەوە ناوچەیەکی بەردەڵانی هەبوو. کۆمەڵێك منداڵ لەوێ جلەکانیان

لەبەردادەکەند. بە رووتی لە نێو بەردەکانەوە بۆ ناو ئاوەکە دابەزین. کوڕە ئینگلیزەکە بە مەلەکردن لێیان نزیکبووەوە، بەلاّم بەرد هاوێژێکی لە نێوانیان هێشتەوە. هەموویان خەڵکی ئەو ناوچەیە بوون. هەموویان پێست ڕەش و بە زمانێك دەدوان کە ئەم لێی تێناگەیشت. زۆر تامەزرۆی ئەوە بوو کە لەگەڵیاندا بێت. تۆزێکی تر لێیان نزیکبووەوە. ئاوڕێکیان لێدایەوەو بە چاوە ڕەشەکانیان چاودێرییان کرد و پاشان نێوچەوانیان گرژکرد. یەکێك لە کوڕەکان بزەیەکی بۆ کرد و دەستی بۆ ڕاوەشاند. ئەو ئەوەندەی بەس بوو. لێیان نزیکتر بووەو سەرکەوتە سەر ئەو بەردانەی کە کوڕەکانی لەسەر بوون. بزەیەکی نائومێدی و پاڕانەوەی ئاراستە کردن. قیژەیەکی خۆشی پێشوازییان بۆ کرد. بەردەوامبوو لە پاراستنی زەردەخەنەکەی‑زەردەخەنەی نائارامی و لەیەك نەگەیشتن. منداڵەکان زانیان کە ئەم منداڵە بیانییە و لە ناوچەکەی خۆی، لە کەنارەکە، دابڕاوە، لەبەرئەوە بڕیاریاندا کە پشتگوێی بخەن. بەلاّم ئەو بەوە شادمان بوو کە لەگەڵیاندا بوو.

کوڕەکان دووبارە دەستیانکردەوە بە خۆهەڵدان لەسەر بەرزترین بەردەوە بۆ ناو دەریا شینەکەی نێوان بەردە تیژەکان. پاشان ئەوەی خۆیان نوقمی ئاوەکە کرد، هەندێك لەو ناوە مەلەیان کرد، ئینجا هاتنە سەر ئاوەکە و خۆیان ڕاگرت لە چاوەڕوانیدا بۆ خۆ نوقمکردنێکی تر. جێری ئەوانی بە کوڕی گەورە دانا، بە پیاو. ئەویش خۆی نوقمی ئاوەکە کرد و کاتێك کە گەڕایەوە بۆئەوەی بۆ خۆی شوێنێك بگرێت جێگەیان بۆ کردەوە. هەستیکرد کە پەسەندکراوەو ئەمەش وایلێکرد هەست بە شانازی بکات. جارێکی تر بە ورياييەوە خۆی نوقمی ئاوەکە کرد.

لەپڕ گەورەترین کوڕی کۆمەڵەکە خۆی نوقمکرد و نەهاتە دەرەوە. کوڕەکانی تر لەوێ وەستابوون و چاودێرییان دەکرد. پاش ماوەیەك چاوەڕوانکردنی دووبارە دەرکەوتنەوەی سەرە قاوەییە بریسکەدارەکە، جێری قیژەیەکی ئاگادارکردنەوەی لەدەم دەرچوو. کوڕەکان بە بێزارییەوە سەیرێکیان کرد و دووبارە ڕوویان وەرگێڕایەوە سەر ئاوەکە. پاش ماوەیەکی زۆر، کوڕەکە لەودیوی بەردە زلە تاریکەکەوە هاتە دەرەوە و بە پەشۆکاوییەوە کەوتە هەنسکدان و قیژەیەکی سەرکەوتنی کرد. یەکسەر کوڕەکانی تر خۆیان نوقمی ئاوەکە کرد. تاوێك لەوە دەچوو بەیانییەکە پڕ بێت لە کوڕی چەقەچەقکەر و تاوێکیش هەواو سەر ئاوەکە چۆڵ و هۆڵ دەبوو، بەلاّم لە ژێر ئاوە شینە تۆخەکەوە شێوەی تاریکی چەند کەسێك دەبینران کە دەجوولاّن و پەلیان دەکوتا.

جێری خۆی نوقمی ئاوەکە کردو لە تەنیشت کۆمەڵە کوڕەکەی ژێر ئاوەکەوە تێپەڕی. بەردێکی زلی هاتە پێش چاو. دەستێکی لێداو یەکسەر سەرکەوتەوە بۆسەر ئاوەکە. بەردەکە وەکو قەلاّیەکی نزم وا بوو و ئەودیوی دەبینرا. کەسی لەو ناوە بەدینەکرد، لە ژێرەوەیدا، شێوەی لێڵی مەلەکەرەکان دیار نەبوو، لەودیوی قەلاّ بەردینەکەوە یەك ‑ یەك کوڕەکان دەرکەوتن. بۆی دەرکەوت کە دەبێت بەناو

کونێکدا، یان کەلەبەرێکدا مەلەیان کردبێت بۆ ئەوەی بگەنە ئەوێ. جارێکی تر خۆی نوقمی ئاوەکە کردەوە. لەناو ئەو ئاوە سوێرەی کە چاوی دەچووزاندەوە، جگە لە بەردێکی رووت نەیتوانی هیچی تر بەدیبکات. کاتێك کە سەر ئاو کەوتەوە، کوڕەکانی بینی کە لەسەر بەردێك دانیشتبوون و خۆیان بۆ چالاکییەکی تر ئامادە دەکرد.

ترسی نشوستی بەسەریدا زاڵ بوو و بە ئینگلیزی قیژاندی: "سەیرم بکەن! سەیرم بکەن!" دەستیکرد بە لەقە لێدانی ئاوەکە و شڵپە شڵپ کردن وەکو سەگێکی گێل. کاتێك کە تووشی نشوستی دەهات، بۆ سەرنجڕاکێشانی دایکی دەستیدەکرد بە گاڵتە کردن، دایکی بەو خۆ مۆنکردنە ناخۆشە وەڵامی دەدایەوە. بە هۆی ئەو شەرمەزارییەی هەستی پێدەکرد ناچار بوو بزەیەکی پاڕانەوە بخاتە سەر لێوی کە وەکو جێ برینێك جێگیر بوو و نەیدەتوانی لایبدات. سەیری کوڕە گەورەکانی سەر بەردەکەی کرد و قیژاندی: " *Bonjour! Monsieur, monsieur!* *Au revior! Merci!*" ئاوەکە وروژمی هێنایە ناو دەمی و هەناسەی لێبڕی. نوقمی ئاوەکە بوو و دەرچووەوە. بەردەکە، کە بەهۆی منداڵەکانەوە قورس دیار بوو، ئێستا پاش نەمانی قورسایی ئەوان دەتوت تازە لە ئاوەکەوە بەرزبۆتەوە. منداڵەکان بەخێرایی بۆ ناو ئاوەکە تێپەڕین. دەنگی کەوتنی جەستەکانیان بۆ ناو ئاوەکە ئەو ناوەی پڕ کرد. بەردەکە لە ژێر هەتاوە گەرمەکەدا چۆڵ دیار بوو. دەستیکرد بە ژماردن، یەك، دوو، سێ.. کە گەیشتە پەنجا هەستی بە ترسێکی زۆر کرد. ئێستا دەبێت لە ئەشکەوتەکانی بەردەکەی ژێرەوەیدا خنکابن! کە گەیشتە ژمارە سەد، سەیرێکی لاپاڵی گردە چۆڵەکەی کرد. کەوتە تیاڕامان، ئایا هاواری یارمەتی بکات؟ بەخێراتر ژماردی بۆئەوەی پەلەیان لێبکات خێراتر سەر ئاوەکە بکەون، یان بخنکێن و لە ئازاری ئەم ژماردنە رزگاری بکەن، کاتێك کە گەیشتە سەد و شەست، ئاوی ئەودیوی بەردەکە پڕ بوو لە کۆمەڵە منداڵێك کە وەکو نەهەنگی خۆڵەمێشی هەناسەیان دەدا. بە مەلەکردن گەڕانەوە بۆ کەنارەکە بێئەوەی سەیری ئەم بکەن.

سەرکەوتە سەر بەردەکە و لەوێ دانیشت. هەستی بە گەرمی و زبریی بەردەکە دەکرد لە ژێر سمتیدا. کوڕەکان خەریکی کۆکردنەوەی جلەکانیان بوون. پاشان، بە درێژایی کەنداوەکە، بە ڕاکردن بەرەو لێژگەیەکی تر چوون. رۆیشتن بۆئەوەی لەم دوور بکەونەوە. دەستی نایە سەر چاوەکانی و بە ئاشکرا گریا. کەس نەبوو بیبینێت، لەبەرئەوە هەتا توانای هەبوو گریا.

هەستیکرد کە کاتێکی زۆر تێپەڕیوە. بە مەلەکردن بۆ ئەو شوێنە چوو کە دایکی لێبوو. دایکی هێشتا لەوێ بوو، لە ژێر چەترە پرتەقاڵییەکەیدا لە پەڵەیەکی زەرد دەچوو. بە پەلە گەڕایەوە بۆ لای بەردە گەورەکەو پیایدا سەرکەوت و خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکە و لە نێوان گا بەردە تووڕەو تیژەکانەوە نوقمی ئاوە شینەکە بوو. چووە خوارەوە هەتا جارێکی تر گەیشتە بەردەکە و دەستی لێدا، بەڵام ئاوەکە ئەوەندە سوێر بوو، ئازاری چاوی دەدا و نەیدەتوانی هیچ ببینێت.

سەرکەوتەوە سەر ئاوەکە و بە مەلە گەڕایەوە بۆ کەنارەکە. لەوێوە چوو بۆ ڤێلاکە بۆئەوەی چاوەڕوانی دایکی بکات، پاش ماوەیەك دایکی لەسەرخۆ گەڕایەوە. لەلایەکی جانتا خەتخەتەکەی بادەدا و لەلایەکی دیکەی قۆڵە سوور هەڵگەڕاوەکەی. "چاویلکەی مەلەکردنم دەوێت"، بە هەناسەبڕکێ و جۆرە پاڕانەوەیەکەوە بەدایکی وت. دایکی سەیرکردنێکی ئارام و پڕ لە پرسیاری ئاراستە کرد و بە سادەییەوە وتی: "باشە، بێگومان، ئازیز."

بەڵام ، ئێستا، ئێستا، هەر ئێستا دەیەوێت، کاتێکی تر نا. کەوتە بۆڵە بۆڵ و بێزارکردنی هەتا ناچاریکرد لەگەڵیدا بڕوات بۆ دوکانێك، هەر کە چاویلکەکەی کڕی، خێرا لە دەستی دایکی رفاند، وەکو ئەوەی دایکی بیەوێت بۆ خۆی داگیری بکات. خێرا بەرەو شوێنەکەی خۆی لە کەنداوەکە شۆڕ بووەوە.

جێری، بە مەلە بۆ ئەو بەردە گەورەیەی کە رێگر بوو ڕۆیی. چاویلکەی پاراستنەکەی لەچاو کرد و خۆی نوقمی ئاوەکە کرد. تەوژمی ئاوەکە لاستیکی دەوری چاویلکەکەی شکاند و چاویلکەکە شل بوو. دەیزانی دەبێت هەتا ژێر ئاوەکە مەلە بکات. چاویلکەکەی چاککردەوەو توند لە چاویدا بەستی. سییەکانی پڕ لە هەوا کرد و بەرەو خوار خۆی نوقمی ئاوەکە کرد. ئێستا دەیتوانی بە باشی ببینێت، دەتوت چاوی جیاوازی هەیە چاوی وەکو ماسی کە هەموو شتێکی بە روونی لەناو ئاوە رۆشنەکەدا دەبینی. بە دووریی شەش پێ لە ژێرییەوەی لمێکی بریسکەداری بینی کە تەوژمی بەردەوامی ئاوەکە توند و قایمی کردبوو. دوو شێوەی خۆڵەمێشی بەدیکرد کە لە دوو داری درێژ دەچوون. دوو ماسی بوون. ماسییەکان لووتیان دەنا بەیەکەوەو، بێ جووڵە دەوەستان، تەکانێکی تیژیان دەدا و لەیەك جیا دەبوونەوەو دووبارە دەهاتنەوە لای یەك. جووڵەکەیان لە سەمایەکی ناو ئاو دەچوو. چەند ئینجێك لە سەرووی ماسییەکانەوە، ئاوەکە بریسکەیەکی تێدا بوو دەتوت پوولەکەی تیادا دەرژێت. لەولای دوو ماسییەکەوە، بە هەزارەها ماسیی زۆر بچووك، کە هەر یەکەی هێندەی نینۆکی بوو لەو ناوە دەسووڕانەوەو خۆیان لە قاچ و قۆڵی دەدا، دەتوت بەناو تەلزمی زیودا مەلە دەکات. لەپڕ ئەو گابەردەی هاتە بەرچاو کە منداڵە گەورەکان بەناویدا تێپەڕین. بەردێکی رەش بوو لەناو لمە سپییەکەدا و گیایەکی سەوزی لەسەر روا بوو. هیچ کەلەبەرێکی لە بەردەکەدا بەدینەکرد. بەرەو خوارەوەی بەردەکە مەلەیکرد. پەیتا پەیتا سەر ئاوەکە دەکەوت و هەناسەی قووڵی وەردەگرت و دووبارە خۆی نوقم دەکردەوە. هەموو جارێك چاوی دەگێڕاو دەستی لە بەردەکە دەدا و تەنانەت باوەشیشی پێدا دەکرد. زۆر پێویستی بەوە بوو کە شوێنی چوونە ناوەوە بدۆزێتەوە. جارێکیان، لە کاتێکدا کە خۆی بە بەردەکەوە نووساندبوو لاقی بە شوێنێکدا چوو و هیچ رێگرێك نەهاتە بەردەمی. زانی کە کونەکەی دۆزیوەتەوە.

سەرکەوتە سەر ئاوەکە، ئینجا بەو بەردانەدا هەڵگەڕا کە لەسەر بەردی بەربەستەکە بوون. بەردێکی زلی گرتە باوەشی و بە تەنیشت بەردە زلەکەدا خۆی شۆڕکردەوە. بەهۆی قورسایی

بەردەکەوە یەکسەر لەسەر ئەرزە لماوییەکە دابەزی. بە توندی بەردەکەی باوەشی گرت بۆ راگرتنی لەنگەری جەستەی و بۆ ئەو شوێنەی کە لاقی پێداچوو خۆی شۆڕکردەوە. کونەکەی دۆزییەوە. کەلەبەرێك ناڕێك و تاریك بوو و ئەودیوی نەدەبینرا. بەردەکەی بەردا و خۆی بە لێواری کونەکەوە گرت. ویستی پاڵ بە جەستەیەوە بنێت بۆ ناوەوەی کونەکە.

سەری خستە ناو کونەکەوە، بەڵام شانەکانی گیریانخوارد. هەندێك خۆی بادا و هەتا ناوقەدی چووە ناو کەلەبەرەکەوە. هیچی نەدەبینی. شتێکی نەرم و لینج بەردەمی کەوت، گیایەکی ئاوی بوو کە لەبەردەم بەردەکەدا دەجوولایەوە. تۆقی چوو. وایزانی هەشت پێیە، یان ئەو گژوگیایە دەریاییانەن کە بە جەستەوە دەنووسن. لە کاتی پاشەکشێکردنیدا، کۆمەڵێك ئەندامی هەستیاری ئەو گیا دەریاییانەی بەدیکرد کە ئاو رایمالیبوونە دەمی تونێلەکە. ئەمرۆ ئەوەندەی بەس بوو. کشایەوە بۆ بەر هەتاوو هەتا کەنارەکە مەلەیکرد و لەسەر بەردی خۆ هەڵدانەکە راکشا. سەیری ئاوە شینەکەی خوارەوەی کرد. دەیزانی دەبێ لەو کونەوە، یان کەلەبەرەوە، یان تونێلەوە رێگەیەك بدۆزێتەوە بۆ دیوی ئەودیو.

بیرێکی لێکردەوە. بەر لە هەموو شتێك دەبێت فێری هەناسەدانی راست ببێت، جارێکی تر بەردێکی لە باوەش گرت و خۆی نوقمی ئاوەکە کرد بۆئەوەی بتوانێت بە ئاسانی لە ژێر دەریاکە رابکشێت، دەستیکرد بە ژماردن. یەك، دوو، سێ. لەسەرخۆ دەیژمارد. گوێی لە دەنگی جووڵەی خوێن بوو لە سنگیدا. پەنجاو یەك، پەنجا و دوو، هەستی بە ئازارێك کرد لە سنگیدا. بەردەکەی بەردا و سەرکەوت بۆ هەناسە وەرگرتن. هەتاو نزم بوو. بەپەلە گەڕایەوە. دایکی خەریکی نانخواردن بوو لێی پرسی: "خۆشت رابوارد؟" ئەویش وتی: "بەڵێ"

بە درێژایی شەو خەوی بەئاوو و ئەشکەوتی ناو بەردەکەوە دەبینی. رۆژی دوایی، یەکسەر دوای نانخواردن چوو بۆ کەنداوەکە.

ئەو شەوە لووتی پڕژا و خوێنێکی زۆری لێهات. بۆ ماوەیەکی زۆر مەشقی هەناسەراگرتنی دەکرد، لەبەر ئەوە زۆر بێهێز و گێژ بوو. دایکی پێی وت: "من لە جێی تۆ بم، ئازیز، ئەوەندە خۆم ماندوو ناکەم".

ئەو رۆژە و رۆژی دواتر جێری هەر مەشقی بە سییەکانی دەکرد، دەتوت هەموو ژیانی لەسەر ئەوە وەستابوو. جارێکی تر خوێنی لووتی پڕژاو دایکی سوور بوو لەسەر ئەوەی کە رۆژی دواتر دەبێت لەگەڵیدا بڕوات. ئەوەی بە ئەشکەنجەیەکی گەورە دادەنا چونکە رێی لە مەشقکردنی دەگرت و کات بە فیڕۆدان بوو، لەبەرئەوە لە کەناری دەریاکە لەگەڵ دایکیدا مایەوە. وای هەستدەکرد کە ئەویش شوێنی منداڵی بچووکە، شوێنێکە دایکی دەتوانێت بە سەلامەتی لە ژێر هەتاوەکەدا رابکشێت.ئەویش شوێنی ئەو نەبوو.

رۆژێ داوای مۆڵەتی نەکرد، پێش ئەوەی لە مەسەلەی ئاڵۆزی راست و هەڵەیی مەسەلەکە بکۆڵێتەوە، ئەو بۆی دەرچوو. هەتا پاشماوەی ئەو رۆژە، بۆی دەرکەوت کە دەتوانێت هەتا ژمارە دە هەناسەی رابگرێت. کاتێك کە کوڕە

گـەورەکان ڕێرەوەکـەیان بـڕی ئـەو هـەتا سـەد و شەسـت ژمـاردبووی. بـەڵام، لـە ترسـا، خێراتـر دەیـژمارد. لەوانەیـە، ئێستا، ئەگـەر هەوڵبـدات، بتوانێت توونێلەکـە ببڕێـت، بـەڵام هێشتا کـاتی ئەوە نـەهاتووە ئـەو هەوڵـە بدات. ئارەزوویـەکی کۆڵنەدان، کە لە هـی منداڵ نەدەچوو، وایلێکرد بەسەر نائارامییەکەیدا زاڵبێت.

وایلێکـرد ئـۆقرە بگرێـت و چـاوەڕوانبێت. لەسەر لمە سپییەکە بەهۆی چەند بەردێکەوە کە لەسـەرەوە هێنـابوونی لەنگـەری گـرت و کەوتـە تێفکرین لـە کونی چوونە ژوورەوەی تونێلەکە. هـەتا چـاوی بڕیـدەکرد سـووچ و کەلەبـەری توونێلەکـەی دەزانـی، لـە ئێستاوە هەسـتی بـە دەمە تیژەکانی بەردەکە لەسەر شانی دەکرد.

لـە ڤێلاکـە، کـە دایکـی لـەوێ نـەبوو، بـە تەنیشت سەعاتێکەوە دانیشت بۆئەوەی توانـای هەناسـەراگرتنی خـۆی بـژمێرێت. لـە پێـشدا گومـانی هـەبوو، بـەڵام کـە زانـی دەتوانێـت بـۆ ماوەی دوو خولـەك هەناسەی رابگرێـت هەسـتی بـە شـانازی کـرد. "دوو خولـەك"، دوو وشـەی پێویست بـوون کـە سـەعاتەکە دەسـەڵاتی پێـدا نزیکتر بێتەوە لە سەرچڵییەکەی.

لـەو چـوار ڕۆژەی دوای ئـەوە، بەیانییـەکیان، دایکـی بەسـەرپێیی وتـی دەبـێ بگەڕێنـەوە. بڕیاریـدا دەبێـت کارەکـە ئەنجامبـدات ئەگـەر بـشیکوژێت. دوو ڕۆژ پـێ ڕۆیـشتنیان ڕۆژی سـەرکەوتنی بـوو، چـونکە تـوانی ژماردنەکـەی بگەیەنێتە پانزە — لە ئەنجامدا خوێنێکی زۆری لـە لـووت بـەر بـوو. وەکو گیایـەکی ئـاوی لەسـەر بەردەکە ڕاکشا و چاودێری خوێنـە خەستەکەی دەکـرد کـە بەسـەر بـەردە گەورەکـەدا دەکـشا و بەهێواشـی دەتکایـە نـاو دەریاکـەوە. زۆر ترسـا. گریمـان لـە توونێلەکـەدا تووشـی گێـژی ببێـت؟ گریمان لـەوێ بکەوێتـە تەڵـەوەو بمرێـت؟ لـە ژێـر هـەتاوە گەرمەکـەدا سـەری کەوتـە خولانـەوە. خـەریکبوو بڕیـاری وازهێنـان بـدات. بـیری کـردەوە. باشـتر وایـە بگەڕێتـەوە ماڵـەوەو ڕابکشێت. لەوانەیە هاوینی داهاتوو باشتر بێت. ساڵێکی تر، گەورەتر دەبێت و لەوانەیە بتوانێت بـەناو کونەکـەدا تێپـەڕێت پـاش ئـەوەی لـەو بیرکردنەوانە بووەوە، ڕاست بووەوەو سەیرێکی ئاوەکـەی کـرد. دەیزانـی تـا ئێـستا، لـەم چرکەسـاتەدا کـە پـڕانی لـووتی تـازە وەسـتاوەو سـەری هێـشتا وڕە، دەبێـت کارەکـەی ئەنجامبـدات. ئەگـەر ئێستا هەوڵنـەدات ئـیتر هـەرگیز ناتوانێـت. لـە ترسـا هـەموو لەشـی دەلـەرزی، لـە ترسـی ئـەوەی نـەتوانێت کارەکـە ئەنجامبـدات و لـە ترسـی درێـژیی تـونێلی ژێـر دەریاکە. لەبەر ڕۆشـنایی هـەتاودا بەردەکـە زۆر قورس و پان و پـۆڕ دیـار بوو، کاتێك کە بەوێدا دەڕوات فـشاری هـەزارەها تـەن بـەرد لەسـەرەوەیەوە دەبێـت. ئەگـەر گیریخـوارد، لەوانەیـە هـەتا سـاڵی داهـاتوو لاشـەکەی لـەوێ بمێنێتـەوە، هـەتا یـەکێك لـە کـوڕە گـەورەکان دەیدۆزێتەوەو ڕایدەکێشێتە سەرەوە.

چـاویلکەکەی تونـد لەسـەری قـایمکرد. دەسـتەکانی دەلـەرزین. قورسـترین بـەردی هەڵبـژارد و خـۆی خلیـسکاندە نـاو ئاوەکـەوە. نیـوەی لەشـی لـە نـاو ئـاوە فێنکەکـەدا بـوو و نیوەکـەی تـری لەبـەردەم هـەتاوە گەرمەکـە. سـەیرێکی تری ئاسمانـە بەتاڵەکەی کرد و یـەك دوو کەڕەت سییەکانی پڕ لە هەوا کرد، ئینجا

خۆی و بەردەکەی باوەشی نوقمی ژێر ئاوەکە بوون. بەردەکەی باوەشی بەردا و دەستیکرد بە ژماردن. بە هەردوو دەست قەراغی کونەکەی گرت و شانی خستە ناو کونەکەوە و دەستیکرد بە لوولدانی خۆی و شەق لێدان. دەیزانی دەبێت وا بکات.

کاتێك کە بە باشی چووە ناوەوە، خۆی لەناو کونێکی بەردیندا بینی کە پڕ بوو لە ئاوی زەردی خۆڵەمێشی. ئاوەکە بۆ سەرەوە رایدەکێشا.

بەردی سەرەوەی کونەکە تیژ بوو و ئازاری پشتی دەدا. بە دەست خۆی بەناو کونەکەدا رادەکێشا و بە قاچ پاڵی بە خۆیەوە دەنا. سەری بەر شتێکی تیژ کەوت و گێژی کرد. پەنجا، پەنجا و یەك، پەنجاو دوو، رووناکی لەوێدا نەبوو فشاری ئاوەکە قورسایی بەردی هەبوو. حەفتاو یەك، حەفتاو دوو.. هێزی کشان لە سییەکانیدا نەما.

هەستی کرد وەکو میزڵدانێکی پفدراو وایە و سییەکانی زۆر سووکن، سەری پلی دەدا. ئاوەکە بەردەوام بەرەو بنمیچی تیژ و باریکی کونەکە پاڵی پێوە دەنا. دووبارە بیری لە هەشت پێ کردەوەو، هەروەها ترسا بکەوێتە داوی گیای دەریاییەوە کە لەوانەیە لە توونێلەکەدا هەبن. بە شەق لێدان لە ئاوەکە پاڵێکی بەخۆیەوە نا بۆ پێشەوە. سەری دانەواند و لە مەلەکردن بەردەوامبوو. ئێستا دەیتوانی بە ئازادی پەلی بجووڵێنێت، وەکو ئەوەی لە ئاوێکی کراوەدا بێت. لەوە دەچێت ئەوسەری کونەکە فراوانتر بێت. بیری لەوە کردەوە کە دەبێت خێراتر مەلە بکات. دەترسا لەوەی ئەگەر توونێلەکە تەسك بێت بەرسەری بکەوێت. سەد، سەد و یەك.. ئاوەکە کاڵتر بووەوە. هەستی بە سەرکەوتن کرد. چەند هەوڵێکی تری ماوەو ئیتر دەردەچێت شێتگیرانە بەردەوامبوو لە ژماردندا، گەیشتە سەد و پانزە، بەڵام پاش تۆزێك دووبارە گەڕایەوە سەر ژمارە سەد و پانزە، ئاوەکەی دەوروبەری سەوزێکی روون بوو کاتێك کە سەری هەڵبڕی قڵیشێکی رووناکی کە لە گوێچکە ماسییەکی زەبەلاح دەچوو لە بەردەکەی سەرییەوە بینی، ئەولایشییەوە تاریکایی.

گەیشتبووە کۆتایی کارەکەی. سەیرێکی قڵیشەکەی سەرەوەی کرد. دەتوت پڕە لە هەوا، نەك ئاو. هەستیدەکرد کە ئەگەر دەمی پێوە بنێت دەتوانێت هەوا وەربگرێت. گوێی لە ناوەوەی خۆی بوو کە وتی سەد و پانزە – بەڵام ئەم ژمارەیەی دەمێکە وتبوو. دەبێت بەرەو تاریکاییەکەی بەردەمی بڕوات ئەگینا دەخنکێت. ژمارە سەد و پانزە لە مێشکیدا دووبارە دەبووەوە. بە بێهێزییەوە خۆی بە بەردەکانی تاریکییەکەوە نووساند و بەرەو پێشەوە خۆی راکێشا. ناوچە رووناکەکەی بەجێهێشت، بەڵام هەستیدەکرد کە خەریکە بمرێت. زۆر ئاگای لە خۆی نەمابوو، بەڵام لە نێوان ئاگایی و ماوە کورتەکانی نائاگاییدا هەر بەردەوامبوون لە هەوڵەکانی، ئازارێکی زۆر تاساندی. رووناکییەکی سەوز تاریکییەکەی قلیشاند.دەستی لە پێشەوەی خۆیدا دەکوتا، بەڵام بەرهیچ شتێك نەدەکەوت. شەقی لە ئاوەکە دەدا بۆئەوەی پاڵ بە خۆیەوە بنێت بەرەو دەریا کراوەکە. خۆی بۆ سەر ئاوەکە راماڵی و سەری

دەرهێنا. وەکو ماسییەك، کەوتە هەناسەبڕکێ. هەستیدەکرد کە خەریکە نوقم بێت و بخنکێت. نەیدەتوانی ئەو چەند هەنگاوەی ماویەتی بۆ گەیشتن بە بەردەکە ببڕێت. پاش هەوڵێکی زۆر گەیشتە بەردەکە و خۆی پێوە گرت. کاتێك کە بە بەردەکەدا جگە لە چەند دەمارێکی سوور و رەش هیچی تری نەدەبینی. دەترسا چاوەکانی تەقیبن چونکە پڕ بوون لە خوێن. چاویلکەکەی لابرد و چەند دڵۆپێکی خوێن رژانە ناو دەریاکە.

خوێن لووت و چاویلکەکەی پڕ کرد بوو. مشتێك ئاوی ساردی بەسەرو چاویدا کرد. تامی شتێکی سوێری کرد، بەڵام نەیدەزانی هی خوێنە یان ئاوەکەیە. پاش ماوەیەك هێور بووەوەو بەر چاوی رووناك بووەوە. دانیشت. دەیتوانی کۆمەڵە منداڵێکی ئەو ناوچەیە ببینێت کە لە دوورەوە یاریان دەکرد و خۆیان هەڵدەدایە ناو ئاوەکە. ئەوانی نەدەویست. تەنها ئەوەی دەویست کە بگەڕێتەوە ماڵەوەو رابکێشێت.

دوای ماوەیەکی کورت، جێری بە مەلە چوو بۆ کەنارەکە و لەوێوە بەهێواشی بەرەو ڤیلاکە سەرکەوت. خۆی هەڵدایە ناو جێگاکەی و نوست. لە ترپەی پێی دایکی بە ئاگا هاتەوە. بەپەلە چوو بۆ ژووری خۆشتن. نەیدەویست دایکی پەڵە خوێن و فرمێسك بە روخسارییەوە ببینێت. دایکی بە روویەکی گەشەوە رووبەرووی بووەوە. دەستێکی نایە سەر شانە گەرم و قاوەییەکەیەوە پرسی: "ئەم بەیانیەت خۆش رابوارد؟"

وتی: "بەڵێ، زۆر، سوپاس."

دایکی وتی: "تۆزێك بێڕەنگ دیاریت." لێی نزیك بووەوە. پەرۆشیی پێوە دیار بوو. پرسی: "سەرت بە چیدا کێشاوە؟"

وتی: "ئیتر.." زیاتر لێی نزیك بووەوە. ناکۆك بوو لەگەڵیدا و کەوتە مەراقەوە. پاشان بە خۆی وت: شت گەورە مەکە. هیچ روونادات. ئەو دەتوانێت وەکو ماسی مەلە بکات. لە کاتی نانخواردندا، خۆی بۆ نەگیرا و بە دایکی وت:

"دایە، دەتوانم دوو – سێ خولەك لە ژێر ئاودا مێنمەوە."

"بە ڕاست"، دایکی وتی: "ئەگەر من بم زیادە رۆیی تێدا ناکەم. لاموایە ئیتر بەسە، ئەمرۆ لەوە زیاتر نابێت مەلە بکەیت."

خۆی ئامادەکرد بۆ شەڕی ویستەکان، بەڵام، یەکسەر خۆی دا بە دەستەوە. ئیتر هیچ بەلایەوە گرنگ نەبوو بچێت بۆ کەنداوەکە.

**سەرچاوە:**

*Adventures in English Literature*

# دۆریس لیسینگ

## ئافرەتێکی یاخی دیکە پاداشتی نۆبلْ بۆ ئەدەب وەردەگرێت

**ئەنیسە مەخالدی**

**لە عەرەبییەوە: باوکی ڕەهەند**

پاداشتی نۆبلی ئەمسالْ، درا بە ڕۆماننوسی بەریتانی "دۆریس لیسینگ" کە تەمەنی 87 ساڵە، بەخشینی ئەم پاداشتە بەو خانمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو زەخیرە ئەدەبییە زۆرەی ئەم ڕۆماننوسە هەیەتی کە زیاد لە 50 ڕۆمانە، ڕۆمانەکانی ئەم نوسەرە بەوە دەناسرێنەوە کە بایەخ بە کێشەکانی ئافرەت و پەیوەندی ئافرەت بە پیاوەوە دەدات. هەواڵی بەخشینی پاداشتی نۆبلْ بە "دۆریس لیسینگ" بۆ ناوەندە ئەدەبییەکان جێگای سەرسوڕمان و چاوەڕوان نەکراوبوو، نەك لەبەرئەوەی "دۆریس لیسینگ" شایەنی وەرگرتنی ئەو پاداشتە نییە، بگرە بە پێچەوانەوە، چونکە ناوی ئەم نوسەرە لە هەشتاکانەوە و بەشێوەیەکی بەردەوام کاندید کراوە، بەبێ ئەوەی وەریگرتبێ. بەڵام دواجار ئەکادیمیای سویدی بڕیاریدا پاداشتەکە ببەخشێتە ئەم خاتوونە گەنجە کە تەمەنی لە 90 سالْ نزیکبووەتەوە، بەمەش لە سەرەتای دامەزراندنی پاداشتی نۆبڵەوە لە ساڵی 1901، "دۆریس لیسینگ" بووە یازدەمین ئافرەت کە ئەو پاداشتە وەربگرێ.

نوسەری بەریتانی "دۆریس لیسینگ" لە شاری (کرماشان)ی ئێران لەدایکبووە، دوای ئەوەی تەمەنی دەگاتە پێنج سالْ، بەماڵەوە دەڕۆن بۆ زیمبابۆی لە ئەفریقا کە پێشتر موستەعمەرەیەکی بەریتانی بووە و پێیوتراوە (ڕۆدیسیا)، لەوێ بەشێکی زۆری ژیانی لەگەڵ دایکی کە پەرستار بووە و باوکی کە فەرمانبەری بانك بووە، بردووەتەسەر. باوکی لەماوەی جەنگی دووەمی جیهانی بە سەختی برینداردەبێ. "دۆریس لیسینگ" هەر لە منداڵییەوە یاخیبون لە کۆت و بەندە کۆمەڵایەتییەکانی تێدا دەردەکەوێت. لە تەمەنی 14 ساڵیدا دێری ڕاهیبەکان کە وانەی تێدا دەخوێند و قوتابخانە بەیەکجاری بەجێدەهێڵێت و ناڕازیبونی خۆی لەسەر داب و

نـەریتی کۆمـەڵگای بۆرجـوازی کـە خـۆی سـەر بەوان بوو ڕادەگەیەنێت. دوای ئەوە دەچێتە ناو جیهـانی چـینی زەحمەتکێـشانەوە، دەبێـت بـە بەخێوکەری منداڵ، پاشان وەك کرێکارێك ئیش لـە بەشـی تەلەفۆناتـدا دەکـات، دواتـر دەبـێ بـە سـکرتێرە. لــە ســاڵی 1950 لــە ئــەنجامی بڵاوبونـەوەی ڕۆمـانی (کـچە ڕاونراوەکـەی نـاو دارســـتان) نوســـینەکانی ڕێگـــای نـــەمری دەگرنەبـــەر، پاشـــان ڕۆمـــانی (منـــداڵانی توندوتیژی) کە پێنج بەشەو لە نێوان ساڵانی 1952/1969دا نوسیویەتی بڵاودەکاتەوە.

"دۆریس لیسینگ" ماوەیەکی دووردرێژ لە فیکـــری کۆمۆنیـــستییەوە نزیکبـــوو، بـــە چالاکییەکانی لەناو حیزبی شیوعی بەریتانیدا دەناســـــرا، بـــــەڵام لەســــاڵی 1956دوای سەرکوتکردنی یەکێتی سۆڤیەت بۆ ڕوداوەکانی شۆڕشی بۆدابست لە هەنگاریا، واز لە حیزبی شـیوعی دێنێـت. خـاوەنی پاداشـتی نۆبـڵ، نوسـینەکانی لـە چـەند جـۆرێکی ئەدەبییـەوە کۆکردوەتەوە، کتێبەکەی (منداڵانی توندوتیژی) تێکەڵەیەکــە لــە مێــژوی هاوچــەرخ و ئــەدەبی کۆمەڵایـەتی، دوای ئـەوە زنجیرەیـەکی درێـژ لـە ڕۆمـانی زانستی خـەیاڵ دێت، لەوانـە چیرۆکی (شیکاســـتا)ی ســـاڵی 1981، یـــان ڕۆمـــانی (کـانوبوس ان ارغـوس) کـە لـە پێـنج بـەش پێکهـاتووەو لـەنێوان سـاڵانی 1979/1983دا نوسـیویەتی، لـەو ڕۆمانـەدا بـاس لـە بـارودۆخی جیهان دەکات دوای ڕودانی جەنگێکی ئەتۆمی و ڕودانی کارەساتی ژینگەیی. هەروەها "دۆریس لیـسینگ" ڕۆمـانی نوسـیوە زیـاتر لـە زانـستی دەرونشیکارییەوە نزیکە، وەك ڕۆمانی (هاوینی پـێش شـەو). ڕۆمـانی دیکـەی نوسـیوە لـە سیاسـەتەوە نزیکـە، لەوانـە ڕۆمـانی (تیرۆرسـتە باشـەکان) سـاڵی 1986، پاڵەوانـەکانی ئـەو ڕۆمانە لە ڕیزەکانی چەپی توندڕەودا سەرقاڵی تێکۆشـانن. ڕۆمـانی (ڕایـخ بەقسەمان دەکـات) سـاڵی 1987، ئـەم ڕۆمانـە وەك گەواهیـدەرێك وایـــە لەســـەر نەهامەتییـــەکانی جـــەنگی ئەفغانستان.

"دۆریس لیسینگ" لـە نەوەدەکانـدا بایـەخی بە نوسینەوەی بەسەرهاتی ژیانی خـۆی دا، لـە ســاڵی 1995و لــە ڕێگــەی ڕۆمــانی (لــەژێر پێـستەکەمدا) دەســتیکرد بــە نوســینەوەی بەسـەرهاتەکانی ژیـانی، پاشـان بەهـەمان شـێوە ڕۆمـانی (ڕۆیـشتن لـە خەیاڵـدا)ی نوسـی کـە لەلایـەن ڕەخنەگرانـەوە پێـشوازییەکی باشـی لێکـرا. لـەم ڕۆمانەیـداو لەڕێگـەی پەنابردنەبـەر خـەیاڵێکی بـەرزەفڕەوە، گـرنگترین ڕوداوەکـانی ژیانی خۆی کە دەکەوێتە نێوان ساڵانی 1949 بـۆ 1960دەگێڕێتـەوە. گەرچـی ئـەم ڕۆمانـە سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا "دۆریس لیسینگ" بە ڕۆژنامەکانی ڕاگەیاند کە چـیتر بەسـەرهاتی ژیـانی خـۆی نانوسـێتەوە، پاساویـشی بـۆ ئـەو کـارە ئـاوا دایـەوە: (دوای نوسـینەوەی سـیرەی ژیـانی خـۆم، زیـاتر خـۆم ناسی و بۆم دەرکەوت تاکو چ ئاستێك دەتوانین گومان لە بیرەوەریـەکانمان بکـەین، هـەروەها بۆم دەرکـەوت یـادەوەری وەك شـوناس وایـە، ئەمـە مەسـەلەیەکە پێویـستە زۆر بـە باشـی بـیری لێبکەینـەوە، مـن ئـەوەم نـەکردووە. گێڕانـەوەی بەسـەرهاتی ژیـان، تەنانـەت ئـەو بەسـەرهاتانەی کـە سـەرکەوتووبووە، خاوەنەکـەی لـە حاڵـەتێکی

ناخۆشدا دادەنێت، چونکە بۆی دەردەکەوێ ئەو ڕوداوە سەرنجڕاکێش و ئاڵۆزانەی بە درێژایی ژیانی تێدا ژیاوە، دوای بڵاوکردنەوەیان دەبێتە شتێکی ڕقهەڵاتوی بێ ژیان. من لەسەر دەیەی پێش شەستەکانم نوسیوە، بەڵام لەسەر دەیەی دوای شەستەکان نانوسم، چونکە زۆربەی ئەو کەسانەی لەو ماوەیەدا ناسیومن، هێشتا هەر لە ژیانــدان، منــیش نامــەوێ وردەکــاری ژیــانی تایبەتی ئەوان باسبکەم).

ڕۆمانــەکانی "دۆریــس لیــسینگ" ناوەنــدی ڕەخنــــــەگرانی بــــــەریتانیا و وڵاتــــــانی ئەنگلۆساکسۆنییان بۆ دوو بەرە دابەشکردووە، بەرەیەکیان سەرسامە بە کارەکانی ئەم نوسەرەو بەرەکەی دیکەیان ڕەخنە لە شێوازی نوسینی دەگرن. بەڵام هەر هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی "دۆریس لیسینگ" بە شێوازێکی کلاسیکی نانوسێت. "دۆریــس لیــسینگ"لــە دواهــەمین کتێبیدا (درز) 2007، هەمو کارەکتەرەکانی ناو ڕۆمانەکــەی ئافــەرۆز کــردووە، واتــە هــیچ کارەکتەرێك لەناو ڕۆمانەکەیدا نییە، بۆیە ئەم کتێبەی بریتییە لە گێڕانەوەی کۆمەڵێ فیکری بەهێزو بوێرانەو بەشێوازێك دەیانگێڕێتەوە لە خستنەڕوویەکی زارەکیانە دەچێت. ئاشکرایە ناوەڕۆکی چیرۆك بێ بوونی کارەکتەر زۆر بە زەحمەت لێیتێدەگەی. ڕوداوەکانی ئەم ڕۆمانە لە جیهانی بەراییدا ڕودەدەن، جیهانێك تەنها ئافرەتی تێدایە، تاکو ئەو ڕۆژەی ئەو ئافرەتانە نێرینەیان دەبێ، ئیدی ژیانی ئەو ئافرەتانە گۆڕانی بەسەرداد‌ێت و پیاوان و ئافرەتان بۆیان دەردەکــەوێ چــەند پێویــستیان بەیــەکترە. "دۆریس لیسینگ" بیرۆکەی ئەم ڕۆمانەی لە دوای خوێندنەوەی هەواڵێکی زانستییەوە بۆ هات، هەواڵەکە دەڵێ یەکەمین دانیشتوانی سەر گۆی زەوی لەوانەیە لە ڕەگەزی مێ بوبێت. دوای بڵاوبونــەوەی ئــەو کتێبــە، ڕەخنــەگران دەستخۆشــــــی ئــــــەو (هەست وســــــۆزە سەرســــوڕهێنەرە) و (وەســــفە زۆر وردانــــەی ئیحساس) و (بایەخدانە تایبەتەی بە گەنج و پیر) لێکرد. هەروەها دەستخۆشی شێوازە دەگمەن و ناوازەو جوانەکەیان لێکرد کە لە میانەیدا زۆر بە وردی باس لە پەیوەندییە مرۆڤایەتیەکان دەکات، تاکو تێڕوانینمان بۆ جیهان بگۆڕین. ئەمە لەکاتێکدا هەندێك لە ڕەخنەگران بە ڕەخنەلێگرتنێکی بریندارکەر پێشوازیان لێکرد. چــەند ڕەخنــەگرێکی بــەریتانی ســەبارەت بــە هەمان ڕۆمان دەڵێن: (هیچ ئامانجێك لەپشت کتێبەکانی "دۆریس لیسینگ"ەوە نییە، تەنها چاندنی دڵەڕاوکێ و ترس و تۆقاندن نەبێت لە دەرونی خوێنەراندا، ئەمەش دوای ئەوەی لە سەرەتای هەشتاکاندا ئەو شێوازەی لە نوسین هێنایە ناو ڕۆمانەکانییەوە کە بریتییە لە بڵاوکردنەوەی ترس و تۆقاندن).

ئەم ڕۆماننوسە بەریتانییە ئەو دابەشبونە ئاشــکرایەی کــە کارەکــانی هەڵدەســەنگێنن ڕەتناکاتــەوە، بــەڵکو ئــەو وایــدەبینێ ئــەو دابەشبونە جێگای شانازی و بەڵگەی باشی کارەکانیەتی و لەم بارەیەوە دەڵێ: (گەر هەندێ کــەس چــاوەڕوانی گوتــارێکی ئاشــتیخوازانەی تــەوافوقی لــەمن دەکــەن، بــەو پێیــەی مــن ئــافرەتێکم و ژیــانم تێپەڕانــدووەو کــاروانی ئەدەبیم کۆتایی پێهاتووە، ئەوا ناونیشانەکەیان بــە هەڵــە وەرگرتــووە). مــشتومڕی ناوەنــدە

ئەدەبییەکان لەسەر کارەکانی، تەنانەت یەکێك لە بەناوبانگترین ڕۆمانەکانیشی گرتەوە، ڕۆمانی (یاداشتە ئاڵتونییەکان) کە ساڵی 1962 بڵاوکراوەتەوەو ساڵی 1976 پاداشتی (مدیسین)ی فەرەنسی بۆ ئەدەب وەرگرتووە. ئەم کتێبە بە مانا کلاسیکیەکەی ڕۆمان ناچێتە خانەی ڕۆمانەوە. خودی "دۆریس لیسینگ" پێیوایە ڕۆمان دەبێ ڕەهەندێکی کۆمەلآیەتی هەبێت: (مەسەلەکە تەنها بۆ گێڕانەوەی چیرۆکێك کورتناکرێتەوە، بگرە لەگەڵ ئەوەشدا گواستنەوەی شارەزاییە).

ئەو ڕۆمانەی سەرەوە بەسەرهاتی "ئانا وۆڵف" دەگێڕێتەوە کە نوسەرێکی کۆمۆنیستەو لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردودا لەگەڵ کوڕەکەی لە لەندەن دەژی. کتێبەکانی ناوبانگێکی گەورەی بۆ پەیدادەکەن و پارەیەکی زۆریشی لێیانەوە دەستدەکەوێ، ئەمەش توشی گرێی گوناهی دەکات، ئیدی پەکیدەکەوێت و ناتوانێ چیتر بنوسێ، لێرەوە هەمو بایەخی خۆی دەداتە یاداشتکردنی کارەکانی ڕۆژانەی کە هەمو هەست و سۆزو هەڵوێستە ڕۆژانەیەکانی تێدا دەنوسێتەوە. ڕۆمانەکە بەشێوەیەکی گشتی باس لە کۆمەڵگای بەریتانی دەکات لەم سەردەمەی ئێستادا، باس لە هەمو ناکۆکی و گۆڕان و وەرچەرخانەکانی کۆمەڵگای بەریتانی دەکات کە ڕەنگدانەوەیان لەسەر ئافرەت هەبووە. هەروەها ئەم ڕۆمانە چارەسەری (قەیرانەکانی ناوەڕاستی تەمەن) کە وادەکات مرۆڤ نائومێدانە دەستبەرداری خەون و خولیاکانی گەنجی ببێت، دەکات.

خوێنەر بە ماندوبون و شەکەتییەوە لە خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانە دێتەدەرێ، چونکە "دۆریس لیسینگ" ڕوداوی ناو ڕۆمانەکەی بەکۆمەڵێ چیرۆکی پەرت وبلاو بونیاددەنێ، کە تاڕادەیەك ئاڵۆزەو خوێنەر لە سەرەتادا ناتوانێ بچێتە ناو کرۆکی چیرۆکەکەوە. بەمەش خوێنەر دەبێتە وابەستەی نوسینێکی شیکاری سەرسوڕهێن و لە بازنەیەکی بەتاڵی داخراودا دەسوڕێتەوە، تاکو دواجارو لە کۆتایدا دەگاتە ئەوەی لە هەموو لایەنی ڕۆمانەکە تێگەشتووە، بەلآم لەسەر حسابی ماندوبونێکی فیکری گەورە.

ئەو مشتومڕەی نوسینەکانی "دۆریس لیسینگ" دەیوروژێنێ، کەسێتییە سەربەست و بێلایەن و زۆرجار یاخییەکەی لە چارەسەرکردنی کێشەکانی ئافرەت، یارمەتی وروژاندنی ئەو مشتومڕە دەدات. ئەمەمان بە تەواوی لە ڕۆمانی (مذکرات من ذهب) بۆ دەردەکەوێ کە لە ناوەندی بزوتنەوەکانی ئافرەتاندا سەرکەوتنی تایبەتی بەدەستهێنا، ئەو بزوتنەوانە وایان بینی ئەم ڕۆمانە بانگەشەکردنێکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ یاخیبوون دژ بەهەمو داب ونەریتێك کە ئازادی ئافرەت کۆت وبەند دەکات.

تەنانەت وایلێهات نوسەری ڕۆمانەکەیان لەسەر ئەو ناوەندانە حسابکرێ و بە نوسەرو ڕۆشنبیری فەرەنسی خاتو "سیمۆن دی بۆفار"یان چواند، چونکە ئەویش نوسەرێکە بە بیروڕا ڕزگاریخوازانەکەی ناسراوە.

"دۆریس لیسینگ" تاڕادەی دڵڕەقی بوێرو ئازایە، ئەوە ئەو خانمەیە کە دەڵێ ناتوانێ

ســـەرەکی" بەگـــشت یەهودییـــەکانی عـــراق دەبەخشی، ئەو کارەی یەهودییەکانی والێکرد لە هەمو قۆناغەکانی بوونی بریتانیا لە عـراق هاوپـەیمانیان لەتەکدا ببەسـتن. بۆیـە کاتێـك بەڕاك قسە لەسەر سەردەمی نوێ دەکات، ئەوا پـشت بـە بەڵگەنامـەی ساختەی دژە سامییەت دەبەستێت کە پۆلیسی نهێنی تزاری ئامادەی کردبـو، هـەروەها ئامـاژە بـە پرۆتۆکۆڵـەکانی پیرانـی زایـۆنیش دەکـات. بـەڕاك دەڵێـت: ماسۆنییەت ئەو پەیوەندییە توندو تۆڵەی نێوان بـەرخوازی سـەرکردایەتی زایـۆنیزمی جهـانیو ئیمپریالیزمی بریتـانی پێکدەهێنێتو چالاکی یەهودیـەکانی عـراقیش لـە خزمـەتی ئـەو سـێ کوچکە بیانیەدا بوە.

بەڵام نابێت ئەوەمان لەیادمان بچێتەوە کە خودی ماسۆنییەت لەلایەن پیرانی زایۆنیزمەوە رێبەرایـەتی دەکـرا، ئەوانـەی پرۆتۆکۆڵـەکانیان لەشـاری بـال ی سویـسری واژۆ کـرد. ئەوانـەی پیلانیـان دەگێـڕا بـۆ ئـەوەی لەشێوەی بیرۆکـەی نادروست سود لە زانستو پەروەردە وەربگرنو بەیارمـەتی ئـەم ئامرازە گرنگـەش پـیلان لـەدژی عـراق بگێـڕن. بۆیـە سەرچـاوەکانی پۆلیـسی نهێنی کە لە کتێبەکەی بەڕاکدا ئاماژەی پێدراوە ئەوە دەردەخات "بۆ ئەوەی پیلانی زایۆنیەکان لە داگیرکردنی فەلەستین جێبەجێ بکرێ، فێرگە یەهودیەکانی عراق گرنگیەکی زۆری بە زانستی ســـەربازی دەدا، هەڵبەتـــە بەشـــێوەیەکی تێکدەرانە"[22]، هەمان ئەفسانەش سەبارەت بە ئێـران کـە وەك تـابوری پێنجەم لـە عراقـدا کـاری کـردوە لـە کتێبەکـەی بـەڕاك ئامـاژەی پێـدراوەو دەڵێت لەساڵی 539 پێش زایینەوە ئێران پیلان لە دژی عروبەی عراق دەگێڕێت[23].

لە سەرتاسەری جیهاندا پۆلیس لە روانگەی پۆلیسییەوە روداوەکان دەخوێنێتەوە، هەروەها تیـورەی یـەکێتی عـەرەب کـە سـەرلەبەری روداوەکـان لـە پـینی دەرەکـی دەبینێـت لەلایـەن ئایدیۆلۆجیستو بیریـارانی نـەوەی پێـشو زۆر لێزانانـە دانـراوە. لـە راسـتیدا بـەڕاك جگـە لـە پیـاوی پـۆلیس شـتێکی دی نیـە، لـە روانگـەی ئەویـــشەوە مێـــژوو جگـــە لـــە پەردەیـــەك بۆ داپۆشینی کارە راستەقینەکەی شتێکی دی نیـە. ئـەم تیورەیـە لـە کتێبـە سـێ سـەد لاپەڕەییەکـەی بـەڕاك تـەنها دە دەرسـەدی کتێبەکەی گرتۆتەوە، بۆیە دەپرسین مەبەست لە نوسینی ئەم کتێبە چییە؟

### ئامانجی راستەقینە لە کتێبی هەوالگری:

بـەڕاك بەشـێوەیەکی سـەرەکی سـەرقاڵی ناونانی خەڵکیو پۆلین کردنیانو ئامادەکردنی لیست بو، هێنـدێك کـەڕەت بـە نوسـراو زانیـاری شەخسی پێشکەش دەکردو هێنـدێك کـەڕەتی دی بەشێوەی خشتە لیستی لەسەر ئەو فێرکارو ئیداریو فەرمانبەرانە پێشکەش دەکرد کـە لـە فێرگـە ئێرانیـەکانی عـراق کاریـان دەکـرد، بەڕاك تـوانی لەسـەر 553 کـەس وردەکاری شەخـسی کۆبکاتـەوە، هـەروەها تێزێکـی دەربـارەی بیـانیی بـونی بنەچـەی ئـەو کەسـانەش ئامـادەکردبو، لـەپاڵ لیـستێك لەسـەر هـەمو فێرگـە یـەهودیو ئێرانیـەکان هـەر لەسـەردەمی عوسمانیـەوە لـە عـراق دەژیـان لەگـەڵ مێژوویـەکی ورد لەسـەر ئەوەی کردویانە بە ژمارەی دەرچوانیشیانەوە، نـاوی هـەمو خێرخـوازو بەرپرسـی فێرگـەکان، ناوی ئەو یەهودیانەی بەکاری تێکدەرانەو تیرۆر تۆمەتبار کرابون یا سیخوریان بۆ زایۆنیزمەکان کـردوەو پەیوەنـدییان بەفێرگـە یەهودیەکانـەوە هەبوە، نـاوی ئەوانـەی لەچەندین دەیـەی ڕابردو

لە سنوری ئێران پەڕیونەتەوە، پاشان بەشێوازی نادیارو ناشەرعی رەگەزنامەی عراقییان بەدەست هێناوە، ئەوەش بەمەبەستی بەدەست هێنانی وەزیفەیەكی سەرەكی ئیدی چ لە حكومەتدا بێت یا لەبواری بازرگانیدا یا پەیوەندی كردن بە ئۆپۆزسیۆنەوە، گەمارۆدانیماڵو موڵكی ئەوانەی زیانیان بە ئابوری عراق گەیاندوە، رۆڵیان لە مایەدانی پەڕگیرەكانی حیزبی دەعوە لە ساڵانی دواییدا، لەگەڵ گفتوگۆیەك دەربارەی چۆنێتی گەیشتن بە 140 كەسی بەئەسڵ ئێرانی كە بۆ بانكی نێوەندو دەزگا داراییەكانی دی دزەیان كردبو، هەروەها گەمارۆدانی هەمو بازرگانە یەهودیو ئێرانیەكان لە قۆناغە جیاوازەكاندا كە بەپێی جۆری كاڵا بازرگانیو ئاستی دەسەڵاتیانو كاریگەرییان لەسەر ئابوری عراق لەسەرەتای پەنجاكاندا، ناوو چالاكی كۆمەڵە نهێنیە ئێرانیو یەهودییەكان، لەگەڵ لیستێكی 245 كەسیو زانیاری لەسەر كەسێتی ئەو یەهودانەی لە حیزبی شیوعی عراق ئەندام بون.

## لیستی پۆلێن كردنی هاوڵاتیان:

لە عراقدا ناو پەیوەستە بەخێزانەوە نەك بە تاكەكەسەوە، بۆیە پێویستە ئەوە لەبەرچاو بگرین كە ژمارەی ئەو كەسانەی لەم كتێبەدا ناویان هاتوە زۆر لە هەزار كەس زیاترە. لە پاڵ ئەوەشدا كاتێك بەڕاك ژمارەیەك تۆمار دەكات، بۆ نمونە كە دەڵێت لە حەفتاكاندا تەنها لە بەغدا 3245 بازرگانی ئێرانی هەبون، دەبێ ئەوەشمان پێقبوڵ بێت كە بەلانیكەمەوە 3245 فایل لەسەر ئەو خێزانانە لە ئەرشیفی پۆلیسدا هەبوە كە هەمویان بە بەشێك لە تابوری پێنجەم دەژمێردران، خودی بەڕاكیش جەختی لەسەر ئەوە دەكردەوە كە ئەو كۆمەڵانەی ناوی تابوری پێنجەمی لێنابون خزمو مناڵەكانیان لە پێگەی ستراتیجی گرنگ دانابو تا بتوانن خراپەكاری زیاتر بكەن.

پێویستە ئەو هەوڵەی تەرخانكرا بۆ ناولێنانو پۆلین كردنی خەڵكی لەگەڵ شەپۆلە یەك لەدوای یەكەكانی دەركردن كە بەعس لە وڵاتدا پیادەی دەكرد لەبەرچاو بگیرێت. ساڵی 1971 . 1972 یەكەم شەپۆلی راگواستن چل هەزار كوردی شیعە (فەیلی) گرتەوە، ئەو شیعانە كەمایەتیەك بون لەناو كەمایەتییەكو لەناوچە سنورییەكانی ئێراندا ژیانیان دەگوزەراند. لە نیوەی دوەمی حەفتاكاندا دوو سەد هەزار كەسی دی بەبیانوی ئێرانی بوونیان جیاكرانەوەو وەك تابوری پێنجەمو سەرەنیزەی چاوچنۆكی فراوانخوازییەكانی ئێران تاوانبار كران، ئەم راگواستنەش پێش شەڕی عراق . ئێران ئەنجامدراو "بەڵگەنامەكانیش ئاماژە بەوە دەكەن كە دەركراوەكان بەزمانی عەرەبی قسەیان دەكرد. بەڕاكیش ناراستەوخۆ دانیپیادەنێتو دەڵێت زۆربەیان خاوەنی رەگەزنامەی عراقی بون كە"[24] بەزۆری بەشێوەیەكی ناشەرعی بەدەستیان هێنابو، ئەم دانپیانانەی بەڕاك بوە مایەی قەڵسبونو ئازاری دەرونی كۆمەڵێك خەڵك، بەڵام لەدیدی خودی بەڕاك ئەوە بەڵگەیەكی حاشاهەڵنەگرە لەسەر رازو نیازی دەستدرێژیكارانەی ئەو خەڵكانە لەسەر ئەمنو ئاسایشی وڵات. بەڕاك بۆئەوەی شتەكان رونبكاتەوە، هەوڵدەدا بیگرافیایەكی كورت لەسەر ئەو خەڵكانە پێشكەش بكات،بەڵام ئەوەندە خۆی ماندو ناكات بەڵگەیەك لەسەر رازو نیازی خیانەتئامێزی ئەو خەڵكانە بهێنێتەوە، رەنگە ئەم بەڵگەیەی لەو

"شیکردنەوە" ئایدیۆلۆجیاوە هێنابێتەوە کە ئەو لێکۆڵینەوەیە پێوەی پەیوەست بو، ئەمەش حیکایەتی خراپەکارێکە: "ئیبراهیم محەمەدی ئێرانی ساڵی 1954 هاتۆتە عێراقەوە، سەرەتا لە ناوچەی شۆرجە وەك حەماڵ دەستی بەکار کرد، پاشان دەستی بە کڕینو فرۆشتنی سندوقی بەتاڵو گونی کرد، ئنجا لەگەڵ دۆستێکی خۆیدا لەپشت بینایەی دەمەرچی کۆشکێکی بچوکی کردەوە. لە ساڵی 1958 بەدواوە دەستی کرد بە بازرگانی چا، بەهۆی قۆرخکردنی چای ئەبو غەزالە کە لەو دەمەدا داواکاری زۆری لەسەربو، بازرگانیەکەی برەوی پەیداکرد. بۆئەوەی درێژە بەکارە ناڕەواکانی بدات وەك ئیماندارو چاکەخوازێك خۆی دەردەخست، ڕێورەسمی پرسەنامەی لەخانوە گەورەکەی لە عوتەیفیە دەگێڕا، پێشئەوەی لەوڵات دەربکرێ خاوەنی سەد هەزار دینار بو، لەپاڵ ئۆتۆمۆبیلێکی میرسدیسی 280 ئێس، نرخی خانوە گەورەکەشی خۆی لە سەد هەزار دینار دەدا"[25].

جیاوازی هەیە لە نێوان پۆلیسی نهێنی کە تاوانبارو ئۆپۆزیسیۆنی بوونی دەسەپێنێتو ئەو پۆلیسە نهێنییەی کە ئەو ئەرکەی نیە، لە حاڵەتی ڕژێمی *F. B. I* و *C. A. I*ئەمریکی یا تەنانەت ساواکی بەدناوی ئێرانیو هەواڵگری میسریشدا، دەبێ کەسێك هەبێت پروپاگەندەیەك بخاتە بواری لێکۆڵینەوەوە، چونکە دەربارەی ئەو کارەی ئەو دەزگایانە ئەنجامیان داوە یا مەبەستیانە ئەنجامی بدەن گوتەی ڕاستو نادروستی زۆر دەوترێ، تەنانەت سەبارەت کاروکرداری ئەوانەی تاوان ئەنجام دەدەن، ئەوا تاوانەکە ئاراستەی ئەوانی دی دەکەن، چونکە دەستگیرکردنی کەسێكو سزادانی لەسەر بنەمای گومان کارێکی نادروستە.

### شۆڕش دوژمنەکانی خۆی هەڵدەبژێرێت:

پۆلیسی نهێنی لە عراق بە پێچەوانەوە لە دوای ساڵی 1957 دوژمنانی خۆی دادەهێنێت. بۆیە پۆلیس وەك هێزێکی کاریگەرو بزوێنەر کاری نەدەکرد، چونکە قوربانییەکانی پێویستیان بەوە نەبو کارێك بکەن بۆئەوەی تاوانبار بکرێن. کاتێك پۆلیسی نهێنی وەك بەهێزترین دەزگا لە عراق بەدیارکەوت، ئیدی هەمو جۆرە بەرگرییەکی ڕێکخراو بوونی نەما. کورد لە ساڵی 1975و دوای پەیماننامەی جەزائیر شکستیان هێناو حیزبی شیوعی عراقیش بە پێڵاوی قورس کەوتنە ویزەیانو لە پۆستەکانیان دەرکران، ئەو پۆستانەی لەدوای ئەوەی ساڵی 1973 وەك حیزبی پێشەنگی سوسیالیستی دانیان بەحیزبی بەعسدا نا، پێیان بەخشرا بو.

بەڵام ئەمرۆ پێویست ناکات تاوانباران کارێك بکەن بۆئەوەی ببنە قوربانی لەبەرئەوەی هەروەکو سەدام دەڵێت هەڵبژاردنیان بە ئاگاداری شۆڕش دەبێت: "شۆڕش دوژمنەکانی هەڵدەبژێرێت، ئێمە دەڵێین دوژمنەکانی هەڵدەبژێرێت، چونکە دوژمنانی شۆڕش لە نێو خەڵکانێکەوە کە دژایەتی بەرنامەی دەکەنو دەیانەوێت زیانی پێبگەیەنن، هەڵدەبژێردرێن. شۆڕش دوژمنانی لە نێو خەڵکانێکەوە هەڵدەبژێرێت کە دەیانەوێت حیزب والێبکەن لە پرەنسیپە سەرەکییەکانیو خاڵی دەسپێکی لابدات، بەڵام سەبارەت بەو خەڵکانەی شۆڕش دەپارێزن، ئەوا شۆڕش وەك دۆستی خۆی هەڵیاندەبژێرێت"[26].

لەبەرامبەر ئەوەشدا شتێكی نالۆجیكی نیە كە لە ئایندەدا بەو كەسە گومانلێكراوانەی مەبەستیانە زیان بە شۆڕش بگەیەنن ئاگادار بكرێنەوە كە چ شتێك چاوەڕوانیان دەكات. بەڕاك دەڵێت كتێبەكەی تەنها بەشێكەو هیچی دی، چونكە وادیارە بەشی دی هەیە كە ئامادەباشی بۆ كراوە لەسەر "بوونی فێرگە بیانیەكانی دی كە رۆڵی خراپیان لە كۆمەڵگەی ئێمەدا گێڕاوە، ئەو فێرگانەش بریتین لە فێرگەی ئەمریكی و زانكۆی حیكمەت و سەرجەم فێرگەو پەیمانگەكانی دی كە هاولاتیانی عراقی بە خودی خۆی نامۆ كردوە بەمەبەستی لاوازكردنی ورەی نەتەوەكەمان"(27). بێگومان ئەگەر بتوانیت مەبەستێكی ئایدیۆلۆجی بە واقعێك بگۆڕیت، ئەوا تۆ كارێكت كردوە كە هێركولی (هرقل) ناتوانێت ئەنجامی بدات.

## پەراوێزەكان:

1 . سەربوردێكی راستەقینەیەو تەنها گۆڕان لە وردەكارییەكانیدا كراوە.

2 . دیڤید هێرست لە 26 / تشرینی دوەم / 1971 لە گاردیان ئاماژەی بە دەزگای "حەنین" كردوە. دەزگای حەنین لە گەشتی ژیانی نیمچە رەسمی ئەمیر ئەسكەندەردا هاتوە، بەناونیشانی "سەدام حسێن: تێكۆشەر، بیریارو مرۆڤ"، پاریس هاچیت، 1981، ل101, 104,105.

3 . بڕوانە راپۆرتی عەلی هاشم لە ئەلنەهار، 8 / تەموز / 1973، ل8.

4 . هەمان سەرچاوە.

5 . ئەم بەڵگەنامەیە لە هەشتەمین كۆنگرەی هەرێمایەتی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراكی،ساڵی 1974 لە بەغدا بڕیاری لەسەردا، ئەم بەڵگەیە لە دەقە ئینگلیزییەكەیەوە وەردەگرم، شۆڕشی 1968ی عراق.. ئەزمونو دوارۆژ (لەندەن، چاپخانەی ئاتاكا، 1979، ل106 . *The 1968 Revolution in Iraq: Experience and Prospect (London: Ithaca press, 1979). 106*). لێرە بەدواوە وەك راپۆرتی سیاسی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراكی ئاماژە بەم راپۆرتە دەدرێ.

6 . سەدام حسێن: دەربارەی رووداوەكانی عراق (لەندەن ـ لۆنگمان، 1973) ل17. 18

7 . بڕوانە ئەلنەهار، 8/ تموز/ 1973، ل8.

8 . گۆڤاری *Now* لەندەنی، 14/ ئەیلول/ 1979، ل62.54.

9 . هەمان سەرچاوە.

10 . رۆژنامەی ئەلغەد، 6 / نیسان / 1982.

11 . سەنداى تایمز 29 / اب / 1982، ئیكۆنۆمیست 9 / تشرینی یەكەم /1982، گاردیان 7 / ئازار/ 1983

12 . گاردیان 7 / ئازار / 1983.

13 . لە بلاوكراوەكانی یەكێتی خوێندكارانی عراق لە بریتانیا.

*14- CARDRI, Iraq Solidarity Voice, London, No 10 (Spring, 1983); Nahnu Nudeen (paris French Committee Against Repression in Irag, 1981)*

*15* ـ میلەتێكی بێ نیشتمان.. كوردو كوردستان، عیسمەت فانلی، لەندەن، 1980.

16 . گۆڤاری *Now*، 14/ ئەیلول/ 1979.

17 . نیویۆرك تایمز، 21/ حوزەیران / 1985.

18 . ئەم بەشەم لە دەقە عەرەبییەكەوە بۆ ئینگلیزی وەرگێڕاوە. لە وەرگێرانەكەی ئاتاكاوە جهاز الخاص وەرنەگێڕاوە. جهاز الخاص تا پێش ساڵی 1968، ناوی جهاز حنین بو. بڕوانە شۆڕشی 17 تەموز: ئەزمونو

ئاسۆ (بەغدا، حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، 1974، ل139).

19 . راپۆرتی سیاسی حیزب، ل40 . 41، ل110 . 111.

20 . فازیل بەڕاك، فێرگە یەهودیو ئێرانییەکانی عراق، بەغدا، 1984، ل13. بەڕاك لە یەکێتی سۆڤێت دکتۆرای وەرگرتوە، تێزی دکتۆراکەی لەسەر ئەزمونی یەکێتی عەرەبیی ساڵی 1941 لە عراق نوسیوە. بڕوانە بەشی پێنجەم.

21 . هەمان سەرچاوە، هێندێك کەڕەت ڕەگەزپەرستی بەعس دەکەوێتە گەمژەییەوە، بۆ نمونە "دار الحریە"، نێوەندی پەخشی دەوڵەتی عراق، ساڵی 1981 لەسەر ئاستێکی بەرفراوان نامێلکەیەکی بڵاوکردەوە بە ناونیشانی: ئەو گیانەوەرانەی نەدەبوایە خوداوەند دروستیان بکات: ئێرانی، یەهودو مێش. خێروڵلا تولڵفاح نوسەری ئەو بەرهەمە بو کە پێشتر پارێزگای بەغدا بو، خاڵو خەزورو بەخێوکەری سەدام حسێنیش بو. تولڵفاح دەنوسێت "ئێرانییەکان گیانەوەرێکن کە خوداوەند بە بیچمو پەیکەری مرۆڤ دروستی کردون". یەهود"تێکەڵەیەکن لە پیسیو پاشماوەی مرۆڤی جۆراوجۆر"و مێشیش گیانەوەرێکی حەقیرە "نازانرێ خوداوەند بۆچی دروستیکردوە". لە "نحن ندین" وەرگیراوە، ل64 . 72.

22 . گشت ئەو وتانە لە فێرگە... وەرگیراوە، ل20, 26, 48.

23 . ڕەگوریشەی ئەم دوژمنایەتییە دەگەڕێتەوە نارۆدیزمی (شعوبیە) ئێرانی کە رقی لە عەرەبگەرایی دەبوەوە. بگەڕێرەوە بۆ بەشی شەشەم.

24 . فازیل بەڕاك، فێرگە یەهودیو ئێرانییەکان. ل143.

25 . بەڕاك، فیرگە، ل157.

26 . سەدام حسێن، عراقو سیاسەتی دەولی (بەغدا، دار الحریە، 1981)، ل164.

27 . بەڕاك، فیرگە، ل 13.

# وێستگەکانی سەردەم

 وتووێژەکانی پاریس..
سیستمە تۆتالیتاریەکان لە دیدی ئەدیبانەوە

محەمەد م. ئەرنائوت
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانیع

 مێژوی ریفۆرمی ئایینی

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

 دانتی شاعیری جیهانێکی سیکولار

لە ئینگلیزییەوە: عەزیز رەئووف

 بتهۆڤن لەنێوان نەمریو ئێشوئازاردا

هاشم سالح
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

# وتووێژەکانی پاریس..

# سیستمە تۆتالیتاریەکان لە دیدی ئەدیبانەوە

**محەمەد م. ئەرنائوت**

**لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانیع**

خاتوو"برانکا بۆگافاتش" نوسەرو ڕۆژنامەنوسێکی کۆماری (مۆنتینیگرۆ)یە، ئەو لەبەر ئەوەی سەر بە یۆگسلافیای پێشووە، بۆیە بایەخی بە ئەدەبی ئەوروپای ڕۆژهەلات داوە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەستە بە هەڵوێستی نوسەران سەبارەت بە سیستمە تۆتالیتاریەکان. ئەم خاتوونە ماوەیەك لە پاریس ژیاوە، کۆمەڵێ نوسەری ئەوروپای ڕۆژهەلاتیش پەنایان بۆ ئەو شارە بردووەو تێیدا ناوبانگیان پەیداکردووە، بۆ نمونە"ئیسماعیل کاداری"و




"میلان کۆندێرا"، ئەمەش دەرفەتێکی بۆ ئەو خانمە ڕەخساندووە تاکو لەوێ گرنگترین نوسەرانی سەدەی بیستەم ببینێ، چ ئەوانەی

پاداشتی نۆبڵیان بەدەستهێنابوو، یاخود ئەوانەی ماوەیەکی درێژە بۆ وەرگرتنی ئەو پاداشتە کاندید کراوون، وەك "تشاسلاف میلۆش"، "کلۆد سیمۆن"، "ئیسماعیل کاداری"، "میلان کۆندێرا"، "خۆرخێ لویس بۆرخێس"، "ناتالی ساروت"، "یۆجین یۆنسکۆ"، "جۆرج ئامادۆ"، "ماریۆ فارگاس یۆسا". خاتوو "برانکا" هەمو ئەو وتووێژانەی کە لەگەڵ ئەو نوسەرانەدا ئەنجامیداوە، کۆکردوەتەوەو بەم دوایانە لە پاریسو لەژێر ناونیشانی (وتووێژەکانی پاریس)

بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بەخێرایی لە (تیرانا)ش بڵاوکراوەتەوە، بڵاوبونەوەی کتێبەکە لە تیرانا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پانتاییە فراوانەی "کاداری" لەو وڵاتەدا داگیریکردووە.

ئەوەی لەم وتووێژانەدا تیبینی دەکرێ ئەوەیە "برانکا بۆگافاتش" وەك نوسەرێك دەردەکەوێ نەك وەك ڕۆژنامەنوسێك، واتە پرسیارەکان تەنها گوزارشتکردنێکی فزوڵیانەی ڕۆژنامەنوسێك نییە، بۆ وروژاندنی کۆمەڵێ بابەتی سەرنجڕاکێش کە خوێنەری ئاسایی بەلایخۆیدا ڕادەکێشێ، بەڵکو زیاتر گوزارشتکردنە لەو سەرقاڵییەی نوسەر بۆ چارەنوسی ئەدەب لە سەدەی بیستداو لەژێر سایەی چەتری سیستەمە تۆتالیتارەکاندا کە دەیانەوێ ئەدەب لە خزمەتی خۆیاندابێت. لێرەوە کتێبی (وتووێژەکانی پاریس) دێت تاکو ئەزمونی نووسەرە گەورەکان لە مامەڵەکردنیان لەگەڵ سیستەمە تۆتالیتارەکاندا ڕونبکاتەوە، دێت بۆ ئەوەی سەرنەکەوتن و بێنەوبەردەی ئەو نوسەرانە لەگەڵ ئەو سیستمانەدا ئاشکرابکات، چ ئەو سیستمانەی تێیدا ژیاون یاخود ئەوانەیان کە ڕۆژانە لە دوورەوە ئاگاداریبوون.

شاعیری پۆڵەندی "تشاسلاف میلۆش" کە پاداشتی نۆبڵی وەرگرتووە، لەم کتێبەدا دان بەوەدادەنێ کە: (لە ساڵی 1983 هەستێك هەبوو لە مارکسیەتی نزیك دەکردمەوەو پەیوەستی دەکردم لەگەڵیدا، بەڵام لەهەمان کاتدا لایەنێکی دیکە لە مارکسیەتدا هەبوو، لایەنە تۆتالیتاریەکەی کە حەزم پێنەدەکرد، لەبەر ئەوە ئالەم حاڵەتەدا هەستم بە نائارامی و پەشێوی دەکرد). سەبارەت بە پەیوەندی نێوان نوسەرو سیستمی تۆتالیتار، "میلۆش" دەستەواژەی شاعیرێك دەهێنێتەوە کە دەڵێ: (دەکرێ شاعیر هەڵە بکات، بەڵام ناکرێ ساختەچی بێت). سەبارەت بە ئەزمونی خۆشی دەڵێ: (کاتێ قەسیدەی (فیکرە دیلکراوەکە)م نوسی، ئاسودەنەبووم، چونکە لەوبڕوایەدابوم ئەم شیعرە نابێت تەنها لە چوارچێوە سیاسییەکەیدا یاخود لە چوارچێوە سیاسی/ مێژوییەکەیدا بمێنێتەوە، لەکاتێکدا لە شیعرەکەدا ڕەگوڕیشەی سیستمە تۆتالیتاریەکان ئاشکرادەکرێت).

"ناتالی ساروت" دەڵێ خودی نوسەران ڕۆڵیان هەیە لە دەرکەوتن و جێگیربونی سیستمە تۆتالیتاریەکاندا: (زۆر بەسادەیی لەو بڕوایەدام هۆکاری گەشەکردنی سیستمی تۆتالیتار، لەوەدایە هەمومان لەناوەوەی خۆماندا هەڵگری تۆوی ئەو سیستمەین. سیستمی تۆتالیتار سەرەتا بەشێوەیەکی کاڵ وکرچ دەردەکەوێ، بەڵام لە ژیانی ڕۆژانەداو تەنانەت لەو وڵاتانەش کە نەریتی ئازادییان تێدایە، بەشێوەیەکی گەورە دەردەکەوێ. ئەمە بۆیە ڕوودەدات، چونکە هەر یەکێك لە ئێمە لێکبوردنی نییەو ئارەزوی دەستبەسەراگرتن و سەپاندنی بیروڕاکانی هەیە. من ویستومە لە کتێبەکەمدا (گەمژەکان ئاوا قسەدەکەن) گوزارشت لەوەبکەم. چونکە (زیرەکییەك) لە بیروڕای ئەوانەدا هەیە کە خەڵکی بێ بیرکردنەوە کەوتونەتە شوێنیان.

لــە کتــێبی (وتووێــژەکانی پــاریس)دا، پانتاییــەك هەیــە باس لـەو نوسـەرانە دەکـات لە سیـــــــستمی تۆتالیتـــــــار جیابونەتـەوە، هـەروەهای باس لــە ئــەدەبی ئــەو نوســەرانە دەکــات لـــە ڕۆژئـــاوادا و لـــە چوارچـێوەی جـەنگی سـارددا ناوبانگیــــان پەیـــداکردووە. لــەبارەی ئەمـــەوە نــاودارترین نوســـەری مونـــشەق "مـــیلان کۆنـــدێرا" قـــسەدەکات کـــە ڕازینییـە لەسـەر ئـەو بنەمایـە پۆلین بکریٚ: (من ناولێنـانم بە مونشەق ڕەتدەکەمەوە، چونکە من ڕازینیم هونـەرو ئـەدەب لە تێزێکی سیاسی ڕوتەوە بگلیٚ. گوزارشـتی ئـەدەبی مونـشەق، دەبێتـــــــە هـــــــۆی بـــــــە سیاســـیکردنێکی گەمژانـــەی هونەرو ئەدەب و ژیـان. کتێبی نوسـەرە مونشەقەکان شـایەنی ئـەوە نییـە پێـی بـوتریٚ ڕۆمـان، چـــونکە لـــەپێناو شـــتێکدا، ڕاســـتییەکدا نوســـراوە. ئـــەم ئەدەبـە بریتییـە لـە جیابونـەوە لە واقیعی ریالیزمی و هیچیتر. لەگـەلْ ئەوەشـدا مـن هاوسـۆزم لەگـــەلْ مونـــشەقە ڕوســـەکان، گەرچی من دەلێم کۆمۆنیستی ڕوســـی زیـــاتر بـــۆ "ئیفـــانی تۆقێنـەر" دەگەڕێتـەوە تـاکو بۆ مارکس).

نوسـەری شـانۆیی "یـۆجین یۆنسکۆ" لـە بەشـداریکردنیدا لــــە کتــــێبی (وتووێــــژەکانی پـــاریس)، دەربـــارەی تـــەواوی سـەدەی بیـستەم قـسەدەکات و بـــە (ســـەدەی ئایـــدۆلۆژیا)ی دادەنــیٚ و دەلـــیٚ: (شۆسـیالیزم بریتییە لـە شکست، وەك چۆن ڕزگـــاربون لـــە سۆشـــیالیزم بـــە شکست کۆتـایی پێهـات. بـەلام لــە شــانۆنامەکانمدا کۆمــەلیٚ بابەتی گرنگتر هەیە، کۆمەلیٚ بابەت قسەی لەسـەر نـەکراوە.. ئێستا هەستدەکەم میتافیزیقا لـــــە سیاســـــەت گـــــرنگترەو سیاسەت بە پلەی دووەم دێت، بەتایبـــەتی لـــە ئێـــستادا کـــە سیاسەت بووە بە کارەسات بۆ خـــەلك. هۆکەشـــی ئەوەیـــە سیاسییەکان بۆ کۆنترۆلکردنی خـــەلکی بەشـــوێن ئـــامرازدا دەگـەڕێن، مەسـەلەکە شـایەنی پێکەنینییـە. مـن گوزارشـت لـەو مرۆڤـــە دەکـــەم سیاســـەتی خۆشـناوێت، بـەلام مامەلــەی لەگەلدا دەکات).

بـەلام ئایـا تـاکی/نوسـەر ڕۆلـی هەیە لە جێگیربونی ئەم سیـــــــستمە تۆتالیتـــــــارە/ دیکتاتۆریانـــــەدا، یـــــاخود تـەواوی مەسـەلەکە بـۆ میللـەت دەگەڕێتــەوە؟ ئەمەیــە "مــاریۆ فارغـاس یۆسـا"ی نوسـەر لـە بەشـداریکردنەکەیدا و لـــەژێر ناونیـــــــشانی(میللـــــــەت دیکتاتۆریـــەتیان خۆشـــدەویٚ) قسەوباسیان لەسـەر دەکـات. "یۆسـا" لـە قسەکانیدا دەلـیٚ: (میللـــــەت دیکتاتۆریـــــەتیان خۆشدەویٚ. حەزی میللـەت بە ڕازیبـون بـە ژیـانی ملکەچـی و ڕیـــسوایی، نیـــشانەی بـــونی دیـاردەی مازۆشـییە..ئەوانـەی نـــاڕازیبون لەبەرامبـــەر ئـــەم سیـــستمانەدا، ناچـــاربوون ولاتـــەکانیان بـــەجێبێلن. مـــن لێـرەدا دەمـەویٚ جیاکارییـەك بکـەم لـە نێـوان ڕۆشـنبیرێك بـــــەردەوام پابەنـــــدی بیروڕاکانییـــــەتی و بـــــەرگری لێدەکات و شـایەنی ئەوەیـە لـە منـەوە ڕێـزی لێبگـرم، لەگـەلْ ڕۆشـــــنبیرێك لـــــەپێناو دەســتکەوتێکی هــەرزان یــان لەپێناو پاداشتی جۆراو جۆر، هەلوێستی خۆی دەگـۆڕیٚ، ئەم جـــۆرە ڕۆشـــنبیرە شـــایەنی ڕیـــسواکردنە. ئـــەم شـــێوە ڕۆشـنبیرە تـەنها لەگـەلْ خۆیـدا ناپـــاك نییـــە، بـــەلکو لەگـــەلْ ســـەرجەم کـــاری ڕۆشـــنبیری ناپاکەو ئاماژەیـە بـەوەی تـاکو چ ئاســتێك ئەوانــە زەرەر بــە ژیانی ڕۆشنبیری دەگەیەنن).

شـــتێکی سروشـــتییە لـــەم کتێبـەدا "ئیـسماعیل کـاداری"

لەبەر زیاد لە هۆکارێك، ئامادەبونێکی تایبەتی خۆی هەبێت. تێکەڵاوبونی ڕەگەزو ڕۆشنبیری لەنێوان کۆماری مۆنتینیگرۆو ئەلبانیا و ئەو لێچونەی پێشوتری نێوان ئەلبانیای خواجەو یۆگسلافیای تیتۆ، وایکرد خاتوو "برانکا بۆگافاتیش" لە کتێبەکەیدا دوو وتوویژ بۆ "ئیسماعیل کاداری" تەرخانبکات، تاکو سەبارەت بە ئەزمونی خۆی لەگەڵ سیستمی حوکمڕانی تۆتالیتار لە ئەلبانیا و ڕۆشتنی بۆ پاریس لە پایزی 1999، قسەبکات. "کاداری" دەڵێ: (لە ئەلبانیا تەنها لەبەر ناخۆشی نەچومەدەرەوە، بەڵکو لەبەر ئەوە چومەدەرەوە تاکو پەلەبکەم لە گۆڕاندا. بە دەربڕینێکی دیموکراتیانە دەرکم بەوەکردووە کتێبەکانم لە ئەلبانیا بە ئامادەنەبونی خۆم کاریگەرییان زیاتر دەبێ، وەك لەوەی ئامادەبم. لەگەڵ ئەم هەڵسوکەوتەمدا، هیوام بە گەلی ئەلبانی و ئەو هەزارەها خوێنەرەی جیهان بەخشی، بەوەی سەرەتای پەسەندکردنی سیستمی تۆتالیتار، لەرێگەی ڕازیبونییەتی بەوەی بەشداربێت لە هاوکاریکردنی لەگەڵ ئەدەبی ڕاستەقینە. بەڵام دواتر زانیم وەهم هەر وەهمە. گەرچی لەو خەونەدا شتێکی ڕەسەن هەبوو. بۆ ئەوەی ئەو خەونە بگۆڕدرێ بۆ واقیعێکی هەستپێکراو، دەبوا ئەو هاندانە بەشێوەیەك ببەخشم تابڵێی دووربێت لەخۆمەوە. لەبەر ئەوە بڕیارمدا لەئەلبانیا دوورکەومەوە، لەسەر ئەو بنەمایەی ئەم دوورکەوتنەوەیەم کاریگەری کارەکانم زیاتردەکات..بەم شێوەیە ئەوەی لە ژیانمدا نەمتوانی لەو واقیعەدا بەدەستیبێنم، ویستم بەهۆی دوورکەوتنەوەم لەو واقیعە بەدەستیبێنم).

لەگەڵ کتێبی (وتووێژەکانی پاریس)دا، ئاشنادەبین بە ئەزمونی نهێنی نوسەرە گەورەکان و مۆتەکەی داهێنانەکانیان و شکستو ناخۆشییەکانی پێشتریان و خۆشبینیان بەوەی کە دواتردێت. وەلێ شتێکی هاوبەشمان هەیە، ئەویش بریتییە لە پێداچونەوەیەکی ڕەخنەگرانەی توند لە خۆمان و لە پەیوەندی نێوان ڕۆشنبیرو سیستمە تۆتالیتارە/ دیکتاتۆریەکاندا. ئەمەشە وادەکات ئەو کتێبە وەربگێڕدرێتە سەر زمانی عەرەبی و بخوێنرێتەوە.

سەرچاوە:
دار الحیاة 2007/9/4

# مێژوی ڕیفۆرمی ئایینی

له عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

***The reformation: ahistory Patrick Collinson***
***Modern Library – London, New York. 2006.***
***p.272***

نووسەری ئەم کتێبە پرۆفیسۆر "پاتریک کۆلینسۆن"ە، کە یەکێکە لە مامۆستا دیارەکانی زانکۆی کامبردج لە بەریتانیا. پێشتر چەند کتێبێکی مێژوویی گرنگی نووسیووە، لەوانە: (دەربارەی سەردەمی شاژنە ئەلیزابیسی یەکەم، واتە سەردەمی شکسپیر و ڕیفۆرمی ئایینی لە ئینکلتەرا). وەکی ئاشکراشە ئەو ڕیفۆرمە ئایینیە لە سەردەمی ڕێنیسانسدا رویدا، کاتێك ئنکلتەرا لە ئاینزای کاتۆلیکی لایدا و چووە سەر ئاینزای پرۆتستانتی و هەموو پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ پاپای رۆماو ڤاتیکاندا کۆتایی پێهێنا. ئەمەش بۆ خۆی ڕوداوێکی سەیر و ترسناکە لە مێژووی ئینکلتەرادا و تەنانەت دەکرێت بەسەرەتای مۆدێرنەی ئایینی و فەلسەفی و سیاسی دابنێین لەو وڵاتەدا. پرۆفیسۆر "کۆلینسۆن" پێیوایە ئەو ڕیفۆرمە ئایینیەی لە سەدەی شازدەهەمدا ڕویدا، چرکەساتێکی گرنگە نەك تەنها بۆ ئینکلتەرا، بەڵکو بۆ تێکڕای شارستانیەتی ئەورووپی. چونکە ئەم ڕیفۆرمە بوو توانی ناسنامەی ئەوروپای مۆدێرن دیاری بکات، کاتێك کۆتایی بە دەسەڵاتی کڵێسای کاتۆلیکی هێنا کە بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئارەدا بوو، کۆتایهاتنی ئەم دەسەڵاتەش دەرگا کردنەوە بوو لەبەردەم دروستبوونی نەتەوەی نوێ لە ئەڵمانیا و ئنکلتەراو فەرەنسا و.. هتد. بەر لەمە هەموو میللەتانی ئەوروپا سەر بە جیهانی مەسیحی بوون و جیاوازیەکی ئەوتۆ لە نێوانیاندا نەبوو، بەڵام دوای ڕیفۆرمی ئایینی ئەو کیشوەرە بوو بە دوو بەشەوە: بەشێکیان لەگەڵ ڕیفۆرمەدا بوون و بەشەکەی تریشیان لە دژی

بوون. بەشێك لەگەڵ پاپای ڕۆمادا بوون كە لە دژی چاكسازی ئایینی بوو، بەشەكەی دیكەیان دژی پاپا بوون و ئەمانەش پێیان دەوتن پرۆتستانت مەزهەبەكان.

ئیتر لەگەڵ هاتنە پێشی ئەم هەلومەرجە تازەیەدا، ئەڵەمانەكان بەرلەوەی هەست بكەن مەسیحین هەستیان دەكرد ئەڵەمانین. بەڵام ئاخۆ كێ وایلێكردن ئەو هەستەیان تێدا دروست بێت؟ بێگومان ئەوەی ئەو هەستەی تێدا دروستكردن رابەری گەورەی ریفۆرمی ئایینی "مارتن لوتەر"بوو.

ئەم پیاوە كە لە ڕۆما یاخی بوو پاپای بەوە تاوانبار كرد كە هەلپەرستەو ئایین بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بەكاردێنێت، هەر ئەو بوو كە ئەڵەمانەكانی لە خەونی غەفڵەت زەدەیی بە ئاگا هێناو وایلێكردن هەست بە ناسنامە و كارەكتەری مێژوویی خۆیان بكەن.

لە ڕاستیدا پاپا لە ڕووی مادیەوە گەلی ئەڵەمانیای دەچەوساندەوە یان ئەگەر بكرێت دەتوانین بڵێین گاڵتەی پێدەكردن. بەڵام چۆن چۆنی؟ لە رێگەی ختوكەدانی هەست و سۆزی ئایینیانەوە و قەناعەت پێكردنیان بۆئەوەی لە ژێر ڕكێفی كڵێسای كاتۆلیكیدا بمێننەوە، ئەمەش لەپێناو ئەوەدا كە سالآنە پارەو پولێكی زۆریان لێ بكێشێتەوەو بەو پارەیەش كۆشك و تەلاری لە ڕۆمادا پێ دروست بكات بۆ قەشە و كاردینال و پیاوە ئایینیە گەندەڵەكان.

بەڵام دواتر "مارتن لۆتەر" دێت و بە ئەڵەمانەكان دەڵێت: (ئەم پاپایە سەدان ساڵە گاڵتەتان پێدەكات و بە ناوی ئایین و خوا پەرستیەوە خوێنتان دەمژێت و خۆشیی ژیانێكی پڕ خراپەكاری دەژی كە مەسیح نەفرەتی لێكردووە. بەسە خۆ خەڵەتاندن و گوێرایەڵیكردنی پاپاو ڤاتیكان. ئەوانە خەڵكانێكن لە ئایین لایانداوەو خواپەرستیان ناشیرین كردووە، لەبەر ئەوە گوێرایەڵیكردنیان دروست نییە).

پاشان "لوتەر" هێرشی توندی كردە سەر ئەو (صكوك الغفران)ەی، ڤاتیكان بە خەڵكی هەژار و بێچارەی دەفرۆشت و وای تێگەیاندبوون كە هەر كەسێك بیكڕێت دەچێتە بەهەشتەوە.

پاپای ڤاتیكان پیاوەكانی خۆی ڕەوانەی هەموو ئەڵەمانیا دەكرد، تا ئەو (الصكوك)ە هیچانەی بۆ بفرۆشن كە هیچ پەیوەندیەكی بە ئایین و خواپەرستی ڕاستەقینەوە نییە و پاپا ئەوەی تەنها بۆ كۆكردنەوەی زۆرترین ماڵ و سامان بوو لە خەڵكی.

بەمجۆرە موڵك و سامانی گەلی ئەڵەمانیا دەچوو بۆ وڵاتانی بیانی كە ڕۆما و ئیتاڵیا و ڤاتیكان بوو.

بەڵێ "لوتەر" وایكرد گەلی ئەڵەمانی هەست بە ناسنامە و كارەكتەری نەتەوەیی و بەرژەوەندی خۆی بكات كە لە مەسیحیەكانی دی جیاوازە. ئیتر لەو چركەساتەوە ماڵ و سامانی گەلی ئەڵەمانی نەدەچوو بۆ كۆشكەكانی ڤاتیكان، بەڵكو لە پێناو هەستانەوەو ئاوەدانكردنەوەی ئەڵەمانیا خۆیدا بەكاردەهێنرا.

لە شوێنێكی دیكەی ئەم كتێبەدا نوسەر دەڵێت: (لوتەر پەردەی لەسەر فرت و فێڵ و جامبازی پیاوانی ئایینی لاداو بە میللەتی گوت: ئاگاداری ئەو خەڵكە گەندەڵانەبن كە ئایین بۆ مەبەستی خۆیان و بەشێوەیەكی هەلپەرستانە

بـەکاردێنن و هەرچـی ئەوانـە دەیکەن دژی ناوەڕۆکی ئایینە. هـەروەها پێیـان دەڵێـت: ئێـوە پێویستان بەوانـە نییـە تـا لـە ئایینەکـــەتان تێبگـــەن و تـــا کتـێبی پـیرۆز شـرۆڤە بکـەن، چـونکە ئیمانـدار پەیوەنـدی ڕاســتەوخۆی لەگـــەڵ خـــوای خۆیدا هەیـە و پێویستی بـەوە نییـە ناوەنـدێك لـەو بەینـەدا هـــەبێت. ســـەردەمی ئەوانـــە بەسەرچـوو کـە بازرگانیـان بـە ئایینـــەوە دەکــرد و خــەڵکیان هەژارتر و بەدبەختتر دەکرد).

دوای ئـــــەوە "لوتــــەر" دەســـتیکرد بـــە وەرگێڕانـــی کتـێبی پـیرۆز بـۆ سـەر زمـانی ئەڵـــمانی. وەکـــی ئاشــکرایە بەرلـەوە کتێبی پیرۆز تـەنها بە زمـانی لاتـینی دەخوێنرایـەوە، واتە بە زمانی کڵێسا بوو، ئەم زمانـەش زمـانی میللـەتانی بـە چاوێکی سوك سـەیر دەکرد و زمانی ئینگلیزی و ئەڵەمانی و فەرەنـسی بـە زمـانی بـازاڕی دەزانـــی. "لوتـــەر" بوێرانـــە توانی کتێبی پیرۆز وەرگێڕێتـە ســەر زمــانێکی بــازاڕی، بــەم کارەشـــی زمـــانی ئەڵـــەمانی دروســتکرد بــەو جــۆرەی کــە لەمڕۆدا هەیـە. کەواتـە "مـارتن لوتـەر" هـەر بـە تـەنها ڕابـەری ڕیفۆرمی ئایینی نەبوو، بەڵکو لەگـەڵ ئەوەشـدا دامەزرێنـەری ناســـیۆنالیزمی ئەڵـــەمانی و زمانی ئەڵەمانیش بوو.

پاشـان "لوتـەر" یاسایەکی دیکـەی لـە یاسـاکانی ڤاتیکـان شـکاند، کـە ئـەویش یاسـایی ڕەبەنی پیـاوانی ئـاییني بـوو. بۆ ئـەم مەبەسـتەش خـانمێکی جـوان و قەشـەنگی خواسـت و بـە مەسـیحیەکانی ئەڵـەمانیای وت: (خوا وەکـی ئـەوەی پاپـای ڕۆمـا باسـی دەکـات ناچـاری نـــەکردووین تـــا هـــەتا هەتایـــە ڕەبـــەن بـــین و ژن نـــەهێنین). بەمجۆرە ژن هێنان لە ئاینزای پرۆتـستانیدا بـوو بـە شـتێکی شـەرعی، بـەڵام تـا ئێـستاش لـە ناو ئاینزای کاتۆلیکیدا یاساغ و قەدەغەیە.

یـــەکێك لـــەو شـــتانەی لـــە پاپـــای ئێـــستا داوا دەکرێـــت ئەوەیـە ڕێ بـە قەشـەکان بـدات ژن و ژنخـوازی بکـەن، بـەڵام تـا ئێـــستاش ڤاتیکـــان ئـــەو داواکارییـــە ڕەتدەکاتـــەوەو ناچـــێتە ژێـــر بـــاری، لـــە ڕاستیـشدا ئەمـە هەڵوێـستێکی کۆنەپەرستانەیەو هیچ دەقێکی ئـــاینیش نییـــە پاســـاوی بداتـــەوەو ڕێگـــەی پێبـــدات. ئەمـــەش گـــەورەترین بەڵگەیـــە لەســـەر ئـــەوەی کـــە "لوتـــەر" چـــــــوار ســـــــەدە بـــــــەر لەســــــــەردەمەکەی خـــــــۆی کـەوتووە، چـونکە لـە سـەدەی شـانزەهەمەوە بڕیـاری لەسـەر ژنهێنان داوە لە مەسیحیەتدا.

دوای ئەڵـــــەمانیا بـــــیرو بۆچوونەکانی "لوتەر" گەیشتە ئـــەوروپا و بـــە سەرتاســـەری وڵاتـــانی ئـــەو کیـــشوەرەدا بڵاوبـووەوە. بـەمجۆرە تـەواوی ئەو وڵاتانـە بەسـەر دوو بەرەدا دابەشبوون: بەرەیەکیان لەگەڵ "لۆتـــەر"بـــوون و بەرەکـــەی دیکـەیان لەگـەڵ پاپـای ڕۆمـادا مانـــەوە. بـــە گـــشتی وڵاتـــانی بـاکوری ئـەوروپا دایانـە پـاڵ "مـــارتن لوتـــەر" و لەگـــەڵ ڕیفۆرمی ئایینیـدا بـوون. وەك وڵاتـانی: (ئەڵـەمانیا، سـوید، دانیمـارك، نـەرویج، هۆڵەنـدا، ئینگلتـەرا و.. هتـد). هەرچـی وڵاتانی باشووری ئەوروپاشـە، لەســـەر ئـــاینزای کـــاتۆلیکی مانـــەوەو پـــشتی پاپـــای ڤاتیکانیـــــان بەرنـــــەدا. نمونـــەکانیان وەك وڵاتـــانی: (ئیتاڵیـا، فەرەنسا، ئیسپانیا، پرتوگـال). دوای ئـەوە ئیتر بـە درێـــژایی ســـەدەی شـــانزەو حەڤـدە، شـەڕی مەزهـەبی لـە نێـــوان ئـــەو دوو بەرەیـــەدا دەســـتی پێکـــرد. بـــەمجۆرە ئـــەوروپا توشـــی شـــەڕێکی نـاوخۆیی سەرتاسـەری بـوو،

لەسەر بنەمای مەزهەبی. واتە لە هەموو جێییەك شەڕ لەسەر شوناس و ناسنامە هەڵایسا. لە ئینکلتەر قەسابخانەی گەورە لە نێوان پرۆتستانت و کاتۆلیکەکاندا قەوما، ئەمەش بیری ئەو کوشتارگانەمان دەخەنەوە کە هەنووکە لە عێراق و ئەفغانستان و پاکستاندا، لە نێوان سونە و شیعەدا ڕوودەدات.

هەموو ئایینێکی گەورە بەسەر چەند ئاینزایەکدا دابەشە و ئەو قەسابخانەیەی "کرۆموێل" لە دژی کاتۆلیك مەزهەبەکانی ئیرلەندا دروستیکرد، تا ئێستاش لە یادەوەری دەستەجەمعیدا زیندووە و بیرنەچۆتەوە، ئەگەرچی چوار سەدە بەسەریدا تێپەڕیووە.

هەروەها ئەو وڵاتانەی کە زۆرینەیان کاتۆلیك مەزهەب بوون، ناهەقی گەورەیان لە دژی کەمینەی پرۆتستانت مەزهەبی وڵاتەکە ئەنجام داوە.

چاکترین نمونەش بۆ ئەوە فەرەنسایە. لە سەردەمی پادشای بەناوبانگ "لویسی چوارده"دا، کوشت و بڕی مەزهەبی وا ڕویداوە کە سەر سپی دەکەن. بەناوبانگترین ئەو قەسابخانانەش قەسابخانەکەی (سانت بارتیلمی)یە کە تا ئێستاش لە بیر خەڵکی فەرەنسا نەچۆتەوە. ئەم تراژیدیایە لە بیست و چواری مانگی ئابی ساڵی $1572$ دا رویدا، واتە بەر لە چوار سەدە و سی و پێنج ساڵ بەر لە ئێستا و تیایدا تەواوی سەرانی ئاینزای پرۆتستانتی و هەزاران هەزار کەسی دی لە پیاو و ژن و منداڵ بەبێ جیاوازی، قەتڵ و عام کران. فەرەنساییەکان تا ئەمڕۆش هەست بەشەرمەزاری دەکەن لە بەرامبەر خۆیاندا دەرهەق بەو مەسەلەیە.

دواجار "پاتریك کۆلینسۆن" دەڵێت: (پێویستە ئەوە بزانین کە ڕابەری دووەمی ریفۆرمی ئایینی لە ئەوروپادا و دوای مارتن لوتەری ئەڵەمانی، جۆن کالڤنی فەرەنسی بوو. کالڤن لەدایکبووی شاری ئامیان بوو. کەواتە ڕیفۆرمی ئایینی سەرچاوەکەی فەرەنساییشە و هەر بە تەنها ئەڵەمانی نییە).

وەکی ئاشکرایە "کالڤن" زوو فەرەنسا جێدێڵێت و ڕوو لە شاری جنێڤ دەکات و لەوێدا نیشتەجێ دەبێت و دەبێتە ڕابەری روحی پرۆتستانتەکان لەوێدا. لەبەرئەوە شاری جنێڤی سویسرا بە پایتەختی پرۆتستانتیەت دەدرێتە قەڵەم، تەواو وەك چۆن ڕۆما پایتەختی کاتۆلیکیەتە. لە سویسراشدا شەڕی بێئامان لە نێوان دوو ئاینزاکەدا قەوما و ئەم دۆخەش بەردەوام بوو تا لە سەدەی هەژدەهەمدا دەنگی ئەقڵ و ڕۆشنگەری سەرکەوت. ئەو کات ئیتر لێکدانەوەیەکی نوێ بۆ ئایینی مەسیحی هاتە ئارا، جیاواز لەوەی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەبوو.

بەمجۆرە ئەوروپا توانی لە شەوەزەنگی دەمارگیری ئایینی ڕزگاری بێت و پێبنێتە ناو سەردەمی ڕۆشنگەری و مۆدێرنەی فیکری و تۆلێرانسی ئایینیەوە. واتە ئەوروپاییەکان توانیان بەسەر دەمارگیری ئایینی و مەزهەبیدا زاڵ بن، دوای ئەوەی ئەقڵیان ڕوناك بووەوە و لە هەموو ئەو ئاقارە ئسوڵیە دەمارگیرانەش قوتاریان بوو کە شەڕ خۆش دەکەن و مرۆڤ بێچارە و سەرگەردان دەکەن.

**سەرچاوە:**

بيان الكتب – 2007/10/3.

# دانتی

# شاعیری جیهانێکی سیکولار

**له ئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف**

"دانتی شاعیری جیهانێکی سیکولار" کتێبێکی دانسقەی نوسەر" ئیریك ئۆرباك"ە کە بە یەکێك لە کتێبە نایابەکانی جیهانی ئەدەب دادەنرێت کە لەبارەی شاعیری گەورە"دانتی"یەوە نوسرابێت.

ئەم کتێبە خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی نوسەرە سەبارەت بە دانتی. ئەوەی نوسەر لەم کتێبەدا پێی هەستاوە، شیکردنەوە و ڕاڤەکردنی دەقەکانی دانتیە، نوسەر لەپاڵ تەفسیرەکانی سەبارەت بە شیعرەکانی دانتی، هەستاوە بە خوێندنەوەی جیهانبینی ئەم شاعیرە لە سات و سەردەمی خۆیدا.

سیۆدۆر سیلڤەرستین لە زانکۆی شیکاگۆ سەبارەت بەم کتێبە دەڵێت:" ئەم کتێبەی ئیریك ئۆرباك یەکێکە لەو کتێبە باشانەی کە لەم چرکەساتەدا ڕەخنەی ئەدەبی و ناوەندە ئەکادیمیەکانی زانکۆ سەبارەت بە تێگەیشتن لە شاعیرێکی وەکو دانتی پێویستیان پێیەتی. بۆیە دەڵێم ئەم کتێبە زەخیرەیەکی باشە سەبارەت بە تێگەیشتن لە دانتی".

ئەم کتێبە هەوڵدانە بۆ شیکردنەوەی مانا و دەلالەتی چەمکی ڕەخنەی ئەدەبی و دواتر لەبارەی پێویستی ڕەخنەی ئەدەبی لەپانتایی دەقەکاندا هەڵوێستەیە دەکات.

ئەستەمە بتوانین لەمانا شاراوەکانی دەق تێبگەین بەبێ تەفسیرکردنی دەقەکان. ئەستەمە بتوانین دەقەکان لەیەکدی جودا بکەینەوە بەبێ بونی ڕەخنەیەك کە لە توانایدا هەبێت لەنێوان دەقە جوان و ناشیرینەکاندا جیاکارییەك بخولقێنێت. بەبۆچونی ئیریك ئۆرباك وەزیفەی ڕەخنەی ئەدەبی بەر لەهەر شت ڕاڤەو تەفسیرکردنی دەقەکانە. بێگومان زۆرێك لەتێکستە ئەدەبیەکان هەڵگری مانای شاراوەن و خوێنەر ناتوانێ هەروا بەسانایی لەمانا

شـاراوەكانی تێبگـات. بۆیــە وەزیفـەی رەخنـەگر بـەر لەهـەر شــــت كەشــــفكردنی مانــــا شـاراوەكانی ئـەو تێكستانەیە كـە بەسـانایی مانـا تەسـلیم بەخوێنەر ناكات.

لێـــرەوە خوێنــــەر بــــۆ تێگەیـشتن و كەشـف كردنـی مانــــا شــــاراوەكانی دەق پێویـــستی بەخوێندنــــەوەی تێكستە ڕەخنەییـەكان هەیـە، ئەمەش بەر لەهەموو شت ئەو رەخنەگرانــــە دەتــــوانن تێكستەكان كەشـف كـەن كـە تــەواو هــەڵگری مەعریفـــەی رەخنــەن و لــە تـوخم و مانـا و دەلالەتـەكانی رەخنـەی ئـەدەبی باش تێگەیشتوون.

ئۆربــــــاك دەڵێـــــــت: بەشــــــێوەیەكی گـــــشتی تەفسیركردنی دەق بـە جۆرێك لــە جۆرەكــان بریتییـــە لـــە بەخشینی وێنە بە دەقەكە. بە مانایـــەكی تـــر تەفـــسیر كارئاسـانی بـۆ خوێنـەر دەكات كــە بتوانێــت بـــە ئاســـانی مانایــەكی نــوێ بــە دەقەكــە ببەخـــشێت كـــە بـــەلای خوێنەرەوە مانایـەكی شاراوەو نامۆیە.

خاڵێكی تر كە لـەم كتێبـەدا نوســـەر لـــەبارەی تەفـــسیری ئەدەبیەوە دەریـدەبڕێت ئەوەیـە كــــە تەفــــسیر دەتوانێـــت كارئاسـانی بـۆ خوێنـەر بكـات بریتییـــە لـــە زمـــان . نوســـەر خــاوەنی زمــان و دەربڕینــی تایبــەت بەخۆیــەتی. هەربۆیــە نوسـەر پێی وایە وەزیفەیـەكی تـری ڕەخنـەگر شـیكردنەوەی نادیــاری دەقەكانــە، یــاخود بــــــــەجۆرێكی تــــــــر تەرجەمەكردنـەوەی دەقەكەیـە بە زمانێكی ساناتر بۆ خوێنەر لـــەپاڵ كەشــفكردنی لایەنــە شاراوەكانی دەقەكەدا.

نوسـەری ئـەم كتێبـە پێـی وایــە كــە بــەبێ پروپاگەنــدە ئــەدەب دەتوانێــت زیــاد لــە مانایــــەكمان پێببەخـــشێت. هەربۆیە ڕەخنەگریش دەتوانێ زیاد لە تەفسیرێك لەسەر دەقە ئەدەبییــــەكان بخوڵقێنێــــت بــــەجۆرێك كـــــە وەزیفــــەی ڕەخنــــەگرتن ڕێگەیەكــــە بــــۆ كەشفكردنی ئاڵۆزی.

خوێنـەر بەرلـەوەی دەقێكی ڕەخنـەیی بخوێنێتـەوە لەسـەر بەرهەمێكی ئەدەبی، جا شیعر، چـیرۆك، یـاخود درامـا بێـت، هـــــەڵگری بیروبۆچــــوون و ڕوئیایــەكی تایبــەتترە لەســەر دەقەكـە. بـۆ نمونـە كاتێـك تـۆ دەقێك دەخوێنیتەوەو هـەڵگری تێڕوانینێكـی لەسـەر دەقەكـە، بەڵام گـەر ڕەخنـە لەسـەر دەقی نـاوبراو بخوێنیتـەوە بێگومـان تۆ زیاد لە بۆچوونێك و زیاد لـە ڕوئیایەكت لەسـەر دەقەكە لەلا گەڵاڵە دەبێت.

دواجار نوسەری ئەم كتێبە پێمـان دەڵێـت ڕەخنـە جگـە لـە بەخـشینی مانایـەكی تـر بـە تێكست چـیدی نییـە، ڕەخنـە جگـە لـە جیهانبینییـەكی تـر لەسەر دەق چیترمان پێناڵێت، چـونكە دەرئـەنجام ڕەخنــەگر مانایــــــــەكی ترمــــــــان پێدەبەخشێت.

دانتــی شــاعیری گــەورەی ئیتالی لە ساڵی 1265 لەدایك بـووە و بـە یـەكێك لـە ئەدیبـە هـەرە گـەورەو بەناوبانگـەكانی ســـەردەمی خـــۆی هـــەژمار دەكرێــت و چــەندین شــیعرو شـاكاری ئـەدەبی هەیــە كــە بـەناوبانگترینیان" كۆمیـدیای خواوەنـدی *The Divine Comedy* "یە كە بە یەكێك لە شـاكارە هـەرە بەناوبانگـەكانی دنیای ئەدەب دەناسرێت.

**سەرچاوە:**

*Bookreview.com*

# بتهۆڤن لەنێوان نەمری و ئێش وئازاردا

**هاشم سالح**

**لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع**

"بتهۆڤن" هەر لە منداڵییەوە بلیمەتی تێدادەرکەوت، لە تەمەنی هەشت ساڵییەوە پیانۆی لێدەداو لەبەردەم گەورەکاندا ئاهەنگی مۆسیقی پێشکەش دەکرد. لە تەمەنی دوازدە ساڵییەوە مامۆستاکانی لەبارەیەوە دەیانوت: ئەم بلیمەتە بچوکە شایەنی ئەوەیە کۆمەك بکرێ، تاکو سەفەر بکات و خەڵکی ببینێ. گەر بەم شێوەیە بەردەوامبێت، ئەوا دەبێتە "مۆزارت"ی ژمارە دوو. بەلاَم با ئێمە بگەڕێینەوە بۆ سەرەتاکانی ژیانی.

"بتهۆڤن" لە ساڵی 1770 لە شاری (بۆن) لە ئەڵمانیا لەدایك بووە، واتە لە هەمان ئەو ساڵەدا کە "هیگڵ"و "هۆڵدەرلین" لەدایك بوون، بەم شێوەیە گەورەترین مۆسیقار، گەورەترین فەیلەسوف، گەورەترین شاعیر، لە یەك ساڵدا لەدایك بوون و دواتر دەبنە شکۆمەندی ئەڵمانیا. ئێمە ئەمە دەڵێین گەرچی "بتهۆڤن" لە تەمەنی بیست و دوو ساڵیدا نیشتیمانی خۆی




بەجێهێشت و ڕۆشت تاکو لە (ڤییەنا)ی پایتەختی نەمسا نیشتەجێ ببێت و بوو بە نەمسایی. بەلاَم چ جیاوازییەك لە نێوان نەمسا و ئەڵمانیادا هەیە؟ باوکی پیاوێکی سەرخۆش بووە، لەگەڵ "بتهۆڤن" دڵڕەق بووە. وەلێ هەر لە سەرەتای منداڵییەوە "بتهۆڤن"ی فێری مۆسیقا کردووەو لە پەروەردەکردنیدا مانەوو بووە. "بتهۆڤن" لەلایەنی دەروونییەوە منداڵییەکی کەساس و تاریك ژیاوە، دایکی تاقە تروسکایی ڕوناکی بووە لەو منداڵییە کەساس و تاریکەدا، بەلاَم دایکی زۆر نەژیاوە.

گەرچی کۆشکی پاشایەتی لە شاری بۆن دەرگاکانی خۆی بۆ کردەوە، گەرچی بەخت بەدەمییەوە پێکەنی و ئاهەنگی مۆسیقی پێشکەش دەکرد و پارەیەکی زۆری دەستدەکەوت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەساس و داماو بووە، بەدەست تەنگەنەفەسییەوە ناڵاندویەتی و لەوە ترساوە توشی نەخۆشی سیل ببێت، نەخۆشی سیل لە سەدەی نۆزدەهەمدا ترسناکترین نەخۆشی بووە و لەو سەردەمەدا چارەسەری نەبووە. جگە لەوە "بتهۆڤن" توشی نەخۆشییەکی دەروونی بووە پێیدەوترێ (خەمۆکی)، واتە کەئابەیەکی نادیار کە هیچ کەسێ نە نهێنییەکەی دەزانێ و نە سەرچاوەکەشی. بەڵام "بتهۆڤن" خۆشەویستییەکی زۆری بۆ ئازادی هەبووە کە لەو زەمانەدا باهۆزەکەی بەسەر ئەوروپادا هەڵیکردبوو. "بتهۆڤن" لە لایەنگرانی ڕۆشنگەری و شۆڕشی فەرەنسی بووە کە سیستمی پاشایەتی کۆنی ڕوخاند. ئاشکرایە شۆڕشی فەرەنسی ساڵی 1789 بەرپاکرا، لەکاتی بەرپاکردنی ئەو شۆڕشەدا "بتهۆڤن" تەمەنی حەڤدە ساڵ بووە، بە چەند پارچە مۆسیقایەکی نایاب یادی ئەو شۆڕشەی بە نەمری ڕاگرتووە.

"بتهۆڤن" کاتێ دەگاتە ڤییەنا دەچێتە ناو جیهانێکی تەواو تازەوە، شاری بۆن بە بەراوردکردن لەگەڵ پایتەختی نەمسای ئیمپراتۆریەت، شارێکی لادێی بووە. ڤییەنا جگە لەوەی پایتەختی سیاسەت بووە، پایتەختی هونەریش بوو، بەتایبەتی هونەری مۆسیقا. لەوێ بەهرەکانی "بتهۆڤن" بە تەواوی دەردەکەون و سەمفۆنیا گەورەکانی تەواودەکات. هەر لەوێ دەرگای پاشاکان و شازادەکانی بەڕودا دەکرێتەوە. وانەی مۆسیقای بە کوڕوکاڵی خێزانە ئەرستۆکراتی و بۆرجوازییە گەورەکان وتووەتەوە. "بتهۆڤن" لە ساڵۆنە گرانبەهاکانی شاری ڤییەنادا، پیانۆی دەژەنی و سەرانی گەورەی خانەدانەکانی لە ژنان و پیاوان سەرسام دەکرد. بەشێوەیەك نەمری و ناوبانگی پەیداکرد کە پێشتر هیچ کەسێك بەو شێوەیە بەدەستی نەهێنابوو، بێگومان تەنها "مۆزارت" نەبێ. ناوبانگ پارەیەکی باشی بەسەردا ڕژاند. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا هەمیشە لەوە دەترسا هەژار بکەوێت یاخود کاتێ گەورەدەبێ و دەچێتە ساڵەوە، پارەی نەبێت!.

"بتهۆڤن" لە ڤییەنا هەموو شتێکی بەدەستهێنا. مۆسیقارەکانی دیکە ئیرەییەکی زۆریان پێدەبرد. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا بەردەوام سێبەرێکی ڕەش دەوری گرتبوو، بەسەر سەریەوە ڕاوەستابوو. لە ترۆپکی هەڵکشان و سەرکەوتنەکانیدا توشی مەترسیدارترین نەخۆشی هات کە مۆسیقارێ بیگرێ، ئەویش نەخۆشی (کەڕ)ی بوو. بەم شێوەیە "بتهۆڤن" هێدی هێدی هەستی بیستنی تادەهات کزدەبوو، ئیدی دواتر بەتەواوی کەڕ بوو. ئەوەش بەڵا هەرە گەورەکەی ژیانی بوو. ئەوە باجی ئەو ناوبانگە گەورەو فراوانە بوو کە ئاسۆی داپۆشیبوو. "بتهۆڤن" خەریکبوو شێت ببێت، چونکە باوەڕی نەدەکرد بەڕاستی کەڕ دەبێ. وەلێ ئەوە حەقیقەتێکی واقیعی بوو. لە ڕاستیدا

نەخۆشییەکە تاڕادەیەک لەکاتێکی زوودا دەرکەوت، پێش ئەوەی تەمەنی بگاتە سی ساڵی. سەرەتا هەستی کرد گیزە گیزێك و دەنگێك وەك هاش وهوشی ڕەشەبا لە گوێچکەیدایە، ئەوە شتێك بوو شەوو ڕۆژ خاوەنەکەی ئازاردەدا. دواتر نەخۆشییەکە پەرەیسەند تاکو بە تەواوی هەستی بیستنی لەدەستدا. بەم شێوەیە ئەو سی ساڵەی دیکەی تەمەنی کە لەبەردەمیدا مابووەوەو دەبوایە تێیدا بژی، کۆمەڵێ ساڵی ژەهراوی بوون. بەوە "بتهۆڤن" لەسەرەتای گەنجیدا، خۆشەویسترین شتی لەدەستدا. خۆی پیشانی چەندین پزیشکی گەورە دا، بەڵام هەمویان دەستەوەسانبوون لەبەردەم ئەم نەخۆشیە پیسەدا کە بەخێراییەکی سەرسوڕهێن پێشدەکەوت، بەشێوەیەك هیچ چارەسەرێکی نەبوو.

"ریز" کە قوتابی "بتهۆڤن"بوو، چیرۆکێکی ئازاربەخشمان بۆ دەگێڕێتەوە، کاتێ پێکەوە لە دەوروبەری ڤییەناو لەناو سروشتێکی لادێیانەی سیحراویدا پیاسەدەکەن، شوانێك لە دوورەوە شمشاڵێك دەژەنێ، "ریز" وایزانیوە گەر ماموستاکەی لەو دەنگە خۆشە ئاگاداربکاتەوە، ئەوا دڵی خۆشدەکات، بەڵام "بتهۆڤن" گوێی لە هیچ شتێك نەبووە. لەناکاو سیمای "بتهۆڤن" بەشێوەیەك ڕەش دادەگەڕێ کە پێشتر شتی وای بەخۆیەوە نەبینیوە، ئەودەم زانیویەتی ئەو بەڕاستی کەڕ بووە، قوتابییەکەی لەو کارەی زۆر پەشیمان بوو، بێ مەبەست نەخۆشییەکەی خستەوە بیری "بتهۆڤن".

ڕوداوێکی دیکەش ڕویدا، ڕۆژێکیان کۆمەڵێ میوان دوای ئەوەی لە دەرگا دەدەن، دەچنەژورەوە. بەڵام "بتهۆڤن" تەواو بە چونە ژورەوەکەیان سەرسام دەبێ، چونکە گوێی لێ نەبووە لە دەرگایان داوە. لەوکاتەدا "بتهۆڤن" بەسەر پیانۆکەیدا دانەویبووەوە، بۆیە بە توندی دەکێشێ بە جێگا پەنجەکانی پیانۆکەو بە شپرزەییەوە دەڵێ: خەڵکینە من هیچ شتێك نابیستم! گوێم لە هیچ شتێك نییە، من کەڕم، کەڕ.. ئابەم جۆرە ئەم دەردە لەجیهانی دابڕی. چیتر نەیدەتوانی لەرێگەی قسەکردنەوە بەشێوەیەکی سروشتی پەیوەندی بە خەڵکییەوە بکات. نوسین بووە تاقە ئامرازی پەیوەندیکردن. ئیدی (دەفتەرەکانی قسەکردن)ی بەکاردەهێنا بۆ قسەکردن لەگەڵ هاورێکانی یاخود لەگەڵ خەڵکانی سادەوساکار، کەسەکە پرسیارەکانی خۆی لە دەفتەرەکەدا دەنوسیو "بتهۆڤن"یش بە نوسین وەڵامی دەدایەوە. "بتهۆڤن" لە دوای خۆی بە سەدان دەفتەری قسەکردنی بەجێهێشتووە. دواتر ئەم دەفتەرانە دەبنە سەرچاوەیەکی بنەڕەتی بۆ نوسینەوەی سیرەی "بتهۆڤن". پێدەچێ ئەم دەفتەرانە تاکو ئێستا بەشێوەیەکی باش سودیان لێوەرنەگیرابێ. چونکە زانیارییەکی زۆری سەبارەت بە بیروڕا فەلسەفییەکانی یان ئیلهامە مۆسیقییەکانی یاخود تەنانەت گاڵتەوگەپ و نوکتە ڕەشبینییەکانی تێدایە. ئەو گەرچی توشی ئەو دەردە هاتبوو، گەرچی کەسێکی ڕەشبینبوو، بەڵام هەستی نوکتەکردنی لەدەست نەدابوو. "بتهۆڤن" نەوەکو لە ڕێگا یاخود لە گازینۆ یان لە هەر جێگایەکی دیکەدا، توشی خەڵکی ببێت،

بۆیە دەفتەری قسەکردنەکانی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت.

بەڵگەنامەیەکی بەناوبانگ هەیە پێیدەوترێ (وەسیەتنامەی بتهۆڤن)، لە ناوچەیەك نوسیویەتی ناوی (هیلیجنستادت)ە، یەکێکە لە گەڕەکە جوانەکانی دەوروبەری ڤییەنا. "بتهۆڤن" پێیخۆشبووە لەو گەڕەکەدا دانیشێت، چونکە ئەو گەڕەکە خاوەنی سروشتێکی دڵڕفێن و هێمن بووە کە وەك هێمنی و بێدەنگی لادێ بووە. ئەوکات "بتهۆڤن" هەستیکردووە ئەو کەڕییەی کە پێش شەش ساڵ گرفتاری بووە و تادەهات ئازاری دەداو لە زیادبونیشدابوو، هیچ چارەسەرێکی نییە. ڕاستە ئەو وەك هەمو کەڕەکانی دیکە، دەیویست کەڕیەتییەکەی بشارێتەوە. بەڵام ئەوە سودی نەبوو. جگە لەوە "بتهۆڤن" هەستیکردبوو کۆتایی ژیانی نزیکە، لەو چرکەساتەدا بۆ یەکەمینجار بیر لە خۆکوشتن دەکاتەوە. ئەمە وادەکات دەستبکات بە نوسینەوەی وەسیەتنامەکەی بۆ هەردوو براکەی. لەم دەقە زۆر گرنگەکەدا دەڵێ:

(خەڵکینە! ئێوە لەوبڕوایەدان من دژی مرۆڤم و ڕقم لە کۆمەڵگا دەبێتەوە، بۆیە خۆم دوورەپەرێز گرتووە و بە تەنها دەژیم. وەلێ ئێوە بە تەواوی حەقیقەتی من نازانن. ئێوە شتە ڕواڵەتییەکان دەتانخڵەتێنێ و هۆکاری ئێش وئازارو خەمی من نازانن. من بە جۆش و خرۆشێکی گەرم و ئارەزویەکی بێ پایانەوە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی و تێکەڵبوون لەدایکبووم، بەڵام بێ ویست و حەزی خۆم و بەهۆی ئەم دەردەوە ناچاربووم دوورەپەرێزبم و بە تەنها بژیم. کاتێکیش هەوڵمدا لەو تەنهاییەم دەرچم و لە خەڵکی نزیکببمەوە، ئەم دەردەم بۆ دواوە ڕایدەکێشام و نەیدەهێشت تێکەڵ بەوانی دیکە ببم. من شەرمیان لێدەکەم. دەتانەوێ چی بکەم؟ ناتوانم بە خەڵکی بڵێم: بە شێوەیەکی قایم قسەبکەن تاکو گوێم لێتانبێت! ناتوانم بڵێم من کەڕم!..ئابەم شێوەیە تێکەڵبون و ژیانم لەگەڵ ئادەمیزادەکان ئازارەکانم زیاتر دەکەن، چونکە ئەوان گەر زانیان من نابیستم، ئەوا فیکرەیەکی خراپم لێ وەردەگرن. چیتر لە ژیانمدا شوێنێك نەماوە بۆ تێکەڵبون و پێکەوە ژیان لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا، ئیدی هاوسۆزی برادەران و خزمان بەسەرچوو.. من ناچارم بە تەنها بژیم، دەبێ وەك مەنفییەك لە خانوەکەی خۆمدا، لە دەرونمدا، لە قوڵایی ماڵەکەمدا بژیم. کاتێکیش هەستدەکەم حەزملێیە تێکەڵ بە کۆمەڵگا ببمەوە، ئەوا دەترسم و پاشەکشەدەکەم، چونکە من سڵ لەوەدەکەمەوە خەڵکی بزانن کەڕم. چەندینجار لە لێواری نائومێدی نزیکبومەتەوە، خەریکبووە سنورێك بۆ ژیانم دانێم، وەلێ خۆشەویستیم بۆ هونەر، ڕێگەی ئەوەی لێگرتوم کە کەس نازانێ دەرئەنجامەکەی چییە؟ وادەهاتە بەرچاوم پێش بەخشینی ئەوەی لەتوانامدا هەیە بیبەخشم، مەحاڵە بڵێم ماڵئاوا لە جیهان. براکانم من هیواداری ئەوەم ژیانتان لە ژیانی من باشتربێت، ژیانێك لە ژیانی من بەختەوەرتر. بە منداڵەکانتان بڵێن شوێن چاکەکاری بکەن. چونکە تەنها ئەوە بەختەوەری مسۆگەردەکات، نەك پارە.

تەنها چاکەکاری و هونەر لە خۆکوشتن رزگاریان کردم).

ئەم دەقەی "بتهۆڤن" چەند جوانەو چەند پڕ مانایە! یەکەم بیرۆکەی سەرەکی کە لەم دەقەدا دەستماندەکەوێت بریتییە لەوەی کە زۆربەی داهێنەران گەر داهێنانە چاوەڕوانکراوەکانیان نەبوایە، ئەوا خۆیان دەکوشت. کەواتە بەلای ئەو داهێنەرانەوە، داهێنانەکانیان لە ژیان بەنرخترەو لە مردن بەهێزترە. من ئەمە دەڵێم و بێگومان مەبەستم داهێنەرە گەورەکانە: واتە بە پلەی یەکەم بلیمەتەکان. هەرچی بیرۆکەی دووەمە کە لە کۆتایی ئەم دەقەدا دەستماندەکەوێت بریتییە لە جەختکردن لەسەر چاکەکاری: واتە لەسەر ئەخلاق، لە تێڕوانینی "بتهۆڤن"دا کەسی بێ ئەخلاق، هیچ مانایەکی نییە، تەنانەت گەر ئەو کەسە لە هەرە دەوڵەمەندەکان یان لە هەرە مەزنەکان بێت.

لە ساڵی 1812 یەکتربینینە مێژوویەکەی نێوان "بتهۆڤن" و "گۆتە" ڕوویدا: واتە لەنێوان لووتکەی مۆسیقاو لووتکەی ئەدەب. ئەم یەکتربینییە خانمێکی ئەڵمانی ڕێکیخستبوو کە هاوڕێی هەردوکیان بوو. بەڵام هەموو شتێك ئەو دوو پیاوەی لەیەکتر جیادەکردەوە. "گۆتە" پیاوێکی هاوسەنگ بوو، لە کەسایەتییە پڕکێش و توندڕەوەکانی وەك "بتهۆڤن" دەترسا. "گۆتە" شەفافییەت، ڕوناکی، هێمنی خۆشدەویست. لەبەر ئەوەیە یەکێك ئاوا وەسفی "گۆتە" دەکات: (گۆتە لە ئەوروپادا لە هەموو کەسێ زیاتر شەفافترە. هەموو ئەمانەش زۆر زیاتر لەوەی ئێمە پێمانوایە لە "بتهۆڤن"ی دووردەخستەوە. "بتهۆڤن" هەورەبروسکەی درەوشاوەو هەورەگرمەی ناوەڕاستی تاریکییەکان بوو! چاوەڕێی دەکرد ئیلهامی لە حاڵەتی هەڵچونێکی دەرونی کە وەسفناکرێ، بۆ بێتەخوارەوە. جگە لەوانە "بتهۆڤن" زۆر لە دژی ناخۆشییەکان و کارەساتە درێژەکانی ژیان تێدەکۆشا. کەچی "گۆتە" ژیان هەر لەسەرەتاوە تاکو کۆتایی بەڕویدا پێکەنی. بەباشترین شێوە لەپاڵ نەمری و ناوبانگەکەیدا ژیا. توشی هیچ نەخۆشییەکی بێ چارەسەر یان هیچ دەردێکی درێژخایەن نەبوو. ئەمە لەکاتێکدا "بتهۆڤن" لەگەڵ چاوکردنەوەی بۆ دنیا، ئاشنای خراپەکاری و نەهامەتی بوو. وەك ئاماژەمان پێدا باوکی کەسێکی سەرخۆشی بەرباد بووەو لە "بتهۆڤن"ی داوەو مامەڵەی لەگەڵدا خراپ بووە. دایکی ئافرەتێکی باش و نەرمونیان بووە، بەڵام بەزوویی بەجێیهێشت. پاشان بەڵای کەڕی دێت تاکو ئەوەندەی دیکە ژیانی بشێوێنێ و گەنجییەتییەکەی وێران بکات. ئەو بەڵایە لە کۆمەڵگای مرۆڤەکانی تەریککرد و دەرگاکانی بێدەنگی، تاریکی، خەمی قووڵی بەڕودا داخست. سروشت کە بۆ "گۆتە" وانەیەك بوو لە وانەکانی حیکمەت، بۆ "بتهۆڤن" دوای هونەر بووە شوێنی دڵدانەوەیەکی گەورە. دوای مردنی گۆتە ساڵی 1832، ڕاوێژکاری ئەڵمانیا لە پرسەنامەیەکدا دەڵێ: (هەموو ژیانی خۆی لەپێناو گەیشتن بە خۆشی و ڕوناکی بەسەربرد). بەڵام کێ هەیە بتوانێ ئەم وشانە بەسەر "بتهۆڤن"ی تاریك و خەمباردا جێبەجێ بکات؟ گومانی

تێدانییە "بتهۆڤن" بۆ ئەوەی بگات بە ڕوناکی، هەوڵێکی هێجگار زۆریدا، بەڵام ئەو هەوڵانە هەوڵێکی نائومێدانەو نیمچە مەحاڵ بوو.

نەخێر، هیچ پردێك لەنێوان ئەم دوو پیاوەدا نەبوو. بۆ ماوەیەکی کەم بەیەکگەیشتن، بەڵام لەیەکتر حاڵی نەبوون. بینینەکە بەخێرایی کۆتایی پێهات. دواتر "گۆتە" دەربارەی "بتهۆڤن" وتی: بلیمەتییەکەی سەراسیمەو سەرسامیکردم، تاکو ئێستا لە ژیانمدا هونەرمەندێکم نەبینیوە ئەو هەمو تەرکیزە چڕو مەزنەی هەبێت، ئەم تەرکیزە بەهێزە، ناوخۆییە. بەڵام بەداخەوە ئەو کەسێکی دەستەمۆنەکراوەو ناشکرێ دەستەمۆی بکەی. ڕاستە حەقی ئەوە شۆڕش بەسەر جیهان و ناشرینییەکانیدا بکرێ، بەڵام ئەم گۆشەنیگایە واناکات جیهان بۆ ئەو باشترو جوانتربێت، هەروەها بۆ خەڵکانی دیکەش. ڕقلێبونەوەی لە جیهان چارەسەر نییە. گومانی تێدانییە "بتهۆڤن" دوای ئەوەی توشی ئەو دەردە هات، ئەو ڕقلێبونەوەیەی لێناگیرێ کە بەرامبەر بە جیهان هەیبوو.

بەڵام ئەمە زەرەر لە داهێنانەکانی نادات، بەقەدەر ئەوەی زەرەر لەژیانی کۆمەڵایەتی ئەدات. ڕاستە "بتهۆڤن" بە تەبیعەتی خۆی کەسێکی بێدەنگ بوو، بەڵام ئەو دەردە وایلێکرد زیاتر بێدەنگ ببێت.

هەرچی "بتهۆڤن"ە، گلەیی ئەوەی لە "گۆتە" دەکرد کە دەرباری پاشا و شازادەکانی خۆشدەوێ‌و دەڵێ شاعیر نابێت ئەوەندە سەرسامی دەرباری پاشایەتی‌و فەخفەخەکانی ببێت. بەڵکو دەبێ مامۆستای میللەت‌و ڕێنیشاندەری بێت. "گۆتە"ی خاوەنشکۆی ڕاوێژکار حەزی بە قسەکردنە لەگەڵ شازادەکان‌و پیاوە گەورەکانداو سودێکی زۆریشی لە دیاری‌و بەخششەکانیان وەردەگرێ. کەچی بەلای "بتهۆڤن"ەوە کار گەشتە ئەوەی قسەی سوك بە یەکێك لە شازادەکانی نەمسا بڵێ کە دوای لێکردبوو لەماڵەکەیداو لەبەردەم ئەفسەرە فەرەنسییەکاندا، پیانو لێبدات. "بتهۆڤن" ئەوەی ڕەتکردەوەو قسە بەناوبانگەکەی وتی: ئەی شازادە، پلەوپایەکەت لە ڕێگەی لەدایکبوون‌و ڕێکەوتەوە پێیگەیشتویت، واتە بەبێ هەوڵ‌و تێکۆشان، بەڵام من بە هەوڵ‌و توانا تایبەتییەکانی خۆم گەیشتومەتە ئەم پلەوپایەیە، گەر لە جیهاندا هەزارەها شازادەو کوڕوکاڵی خانەدان هەبێت، ئەوا تەنها یەك "بتهۆڤن" لە مێژودا هەیە!...

"بتهۆڤن" کاتێ توشی خەم‌وخەفەت یان ناخۆشییەك دەهات، لە ڤییەنا دەچووە دەرەوەو خۆی دەخستە باوەشی سروشت. زۆرجار خەڵکی لەوێ تارماییەکیان بینیوە، بەتەنها باوەشی بە درەخت‌و گوڵەکاندا کردووە، هەوای هەڵمژیوە یان لەسەر لێواری دەریاچەکە دانیشتووەو بۆ ماوەیەکی تابڵێی درێژ تەماشای ئاسمانی کردووە. تەنانەت لە وەرزی زستانیشدا سڵی لە سروشت نەدەکردەوە، وەرزی باوبۆران‌و بروسك‌و هەورەگرمەو ڕەشەبا. بەپێچەوانەوە بە تەواوی خۆی لەگەڵ تەقینەوەکانی سروشتدا ڕاهێنابوو کە زۆر لە تەقینەوەکانی خۆی دەچوو لە بواری مۆسیقادا. "بتهۆڤن" پێدەچوو بەو کەڕییەی

خۆیــەوە گــوێی لــە دەنگــی سروشت بێت.
"بتهۆڤن" ساڵی 1824 بە جیهــانی وت ماڵئــاوا. بــۆ دواجار سەرپەرشتی ئەو تیپی مۆسیقای کرد کە سەمفۆنیای (نـــۆ)یـــەمیان دەژنـــی، سەمفۆنیای نۆیەم یەکێکە لە ســەمفۆنیاکانی "بتهــۆڤن". کــاتێ ژەنــینی ســەمفۆنیاکە تەواوبوو، جەماوەر دەستیان کرد بە چەپڵەلێدان و هەمویان وەك ڕێزلێنانێك هەستانەوەو سوپاســـێکی شـــکۆداری مۆسیقارە مەزنەکەیان کرد. بەڵام بێگومان "بتهۆڤن" گوێی لەهیچ نەبووەو لەبەرهۆیەکی سادە هیچیشی نەبینی، چونکە ئەو پشتی لە جەماوەرەکە بوو. خانمێکی ئەکتەر دێت و شانی "بتهۆڤن" دەگرێ و بەرەوڕووی جەماوەر دەیسوڕێنێ تاکو بەلای کەمەوە ئەو دەستانە ببینێ کە چەپڵە لێدەدەن. ئیدی ئەوکات "بتهۆڤن" دادێتەوەو دەگری و بۆ دواهەمینجار دەکشێتەوەو جیهان بەجێدەهێڵێ.

**سەرچاوە:**
2007/7/17
***www.kwtanweer.com***

